

کەمال فاروق

# لە پەراوێزی کەسێتی دا

## خوێندنەوەیەکی
## سایکۆسۆسیۆلۆژی ڕەفتار





**خانەی موکریانی بۆ چاپ و بڵاو کردنەوە**

● **لە پەراوێزی کەسێتی دا، خوێندنەوەیەکی سایکۆسۆسیۆلۆژی رەفتار.**

● نووسینی: کەمال فارووق نەسرەدین

● **نەخشەسازی ناوەوە: رێدار جەعفەر**

● بەرگ: رێمان

● نرخ: (٤٠٠٠) دینار

● چاپی یەکەم: ٢٠١٣

● تیراژ: ٧٥٠ دانە

● چاپ: چاپخانەی موکریانی (هەولێر)

● لە بەڕێوەبەرایەتیی گشتیی کتێبخانەکان ژمارەی سپاردنی (٧٤٧) ساڵی (٢٠١٣) ی پێ دراوە.

**زنجیرەی کتێب (٧٦٦)**

**ماڵپەڕ:** www.mukiryani.com

**ئیمەیل:** info@mukiryani.com

# ناوەڕۆك

## بەشی دووەم

## ژن و پیاو:..................١٣٧

## بەشی سێیەم

## له جیاتی پێشەکی:

ئەگەر مرۆڤ وەکو خۆی، پێش شارستانیەت و مەدەنیەت و پێش دەرکەوتنی ئایینەکان و پێش سەقامگیری کۆمەڵایەتی وەکو بوونەوەرێکی وێڵ بەدوای غەریزەو ئارەزووە هەوەسبازیەکانیدا، وەك بوونەوەرێکی بایۆلۆژی و کێوی ماڵی نەکراوی چاخەکانی بەستەڵەك، یان چاخی بەردین مامەڵەی لەگەڵدا بکرێت ئەوا کارێکی سادەو ساکار دەبێ بەهۆی سادەو ساکاری پێویستیەکانیەوە، کە هەوڵەکانی تەنها بۆ بەدەستهێنانی ژەمەخۆراکێك بووە، وەلی لەگەڵ دەرکەوتنی راوچێتی پێش ۱۲۰۰۰ساڵ گیانی زەبروەشاندن و رەفتاری راوچییانە تیایدا بەرجەستە بوو، قۆناغی راووشکار رۆڵی گەورەی بینی لەدابەشکردنی کار کە رەگەزی پیاو خۆی کرد بەراوچی و ژنەکەشی کۆکەرەوەی بەروبووم و رێکخستنی ئاگرو پاراستنی منداڵەکانی، ئیدی لەوساتەوە دەسەڵاتی نێرسالاری و هێزو دەسەڵاتخوازی هاتە مەیدانەوە بۆ خۆسەپاندن و بەیاساکردنی ئەو دەسەڵاتخوازیە بۆ قازانجی هێزوبازو لەژێر ناوی هۆز، عەشیرەت، تایفە، بنەماڵە، دەوڵەت یان هەر ناوێکی تری دەسەڵات، قەڵای ئەم دەسەڵاتە لەسەر بنەمای هێزو بازوو و فرت و فێڵ و تەنافبازی بەڕێوەچووە، خۆ ئەگەر لەژێر سایەی دەستورێکی لۆژیکیانە بەڕێوە چووبێ ئەوا جۆرە ساغلەمیەکی پێوە دیار دەبێت، وەلی کێشکە لەوەدایە سایکۆلۆجیای راوچی دەسەڵات بەڕێوەببات، کەتاموچێژی راوچی لەگرتنی نێچیرەکەیدایەو دوماهیش هەر ملکەچپێکردن و کوشتنێتی، بۆیە دەسەڵاتداران لەسایەی نەبوونی دیموکراسی و یاسا دەیانەوێ تاك کوێرانە ملکەچی خواستی ئەوان بێ و رەفتاری بەو ئاراستەیە ببەن، کە لەبەرژەوەندی ئەواندا بێ و بەویست و خواستی ئەوان بێ، ئەوەشی لەو دەسەڵاتەوە بەرهەم بێشك کەسێتێکی بازاڕی دەبێ وەکو ئەو کاڵاو شمەکانەی، کەلەبازاڕدا سەوداسەرییان پێ دەکرێ هەروەکو ئەریك فرۆم پەی بۆ دەبات، کەبەتەواوی ئەو کەسە بکەوێتە ژێر رکێفی دەسەڵاتەوەو داوا ناڕەواکانی ئەوان جێبەجێ بکات و لەژیانیدا ئامانجی

نەبێت تادەگاتە ماڵیکردنی سۆزو ئیدراك و قەناعەتپێکردنی بەو چەشنە، کە دەسەڵاتداران بۆخۆیانی تاپۆی بکەن و وشیاری و ئەزمونی بۆ خزمەتی خۆیان بێ و لێکدانەوەی عەقڵی لێ بسێننەوەو وای لێبکەن بەو شێوەیە بڕوانێتە خۆی، کەسیستمەکە دەیەوێ و واهەست بکات ئەو هەڵەیە ئەگەر لەگەڵ ئەواندا نەبێ، بەو شێوەیە ژیان بۆ ئەو دەسەڵاتە دەبێ بەمورخی ماهی و سادەو ساکار، دەسەڵاتداران دەیانەوێ مرۆڤ لەسروشتدا نگرۆبێ، نگرۆی پێویستیە بایۆلۆژیەکان بێ خودێکی مرۆیی و بێ شوناس و ناسنامەو بێ خەیاڵکردن، ئاواش بێ کەواتە وشیاری بوونی نییەو تاکەکان لەئاسودەیی خۆڕسکیدا دەژین، کە نازانن ئاریشە چییە، ئەوا سروشتیش لەتاك داگیر دەکرێ لەپیسبوونی ژینگەو تێکدانی سەیرانگاکان و بەموڵککردنی زەوی و زاری کشتوکاڵی و هەموو ئەو شتانەی، کەلەسروشتەوەیە موڵکی هەموانەو هەموو شتێکیشمان هەروەکو کارل یۆنگ دەڵێ لەسروشتەوەیە، ئەوەی ڕێخۆشکاری ئەو جۆرە بیرکردنەوانەی دەسەڵات بێ ئامرازو خۆشکردنی کەشوهەوای لەوجۆرەی بۆ تەختکردبێ ڕووداوە سیاسی و ئاژاوەکانە، کەکایەیەکی ئەوتۆی ئیکۆنۆمی وادێنێتە ئاراوە ئەستەمە تاك لەو قاوغە نامۆیە، کەنامۆکردنی خودەکانە سەردەربێنێ، جیاوازی نێوان ئاژەڵ و مرۆڤ لەڕووی ماڵیکردنەوە هەروەکو مستەفا حجازی دەڵێ ماڵیکردنی ئاژەڵ بەندە بەرەفتاری جوڵەوە بۆ ئەنجامدانی ئەرکە پێویستەکانی، بەڵام مرۆڤ لەوە پترە واتە ماڵیکردنی مرۆڤ لەلایەن دەسەڵاتەوە ڕەفتاری بینراوو دەگرێتەوە تادەگاتە ئیدراك و هزرو قەناعەت و سۆزەوە بەو شێوەیەی، کەمرۆڤ لەناوەوە کۆنترۆڵ دەکات و لەسەر ئاستی وشیاری خودی ماڵی دەکرێ و کەسێتی دەسڕدرێتەوە وەك ماڵیکردنی پەلەوەر هەر لەدەرچوونی لەناو هێلکەوە، کەچیتر هەستی ئازادی لەلا نابێ چونکە تامی نەکردووە، لەکۆمەڵگای وەکو عێراق و کوردستان، کەهەرگیز سەقامگیری سیاسی بەخۆیەوە نەبینیوە هەر لەشۆڕشی ١٤ی تەموزی ١٩٥٨ەوە تا نها، کەهەر لەو ساتەوە هیچ دەیەیەك تەواو نەبووە ئەم وڵاتە ئاژاوەیەکی سیاسی تێکەوتۆتەوە، بێگومان باری سایکۆلۆژی مرۆڤیش ڕەنگدانەوەی ڕەوشی ئابوری و کۆمەڵایەتیە، کەئەویش لەسێبەری ڕەوشە سیاسیەکەیدایە، خاڵە وەرچەرخانە نەرێنیەکانی عێراق و کوردستانیش ڕوون و ئاشکران لەوانەش شۆڕشەکەی عەبدولکەریم قاسم لە ١٩٥٨و کۆدێتای بەعسیەکان ١٩٦٣ و دیسان کۆدێتای بەعسیەکان ساڵی ١٩٦٨و دوای ئەویش ڕاستەوخۆ شەڕی حکومەت بەکوردو نسکۆی شۆڕشی ئەیلول و سەرهەڵدانی شۆڕشی گوڵان و

شۆڕشی نویٚ وئەوجا هەڵگیرسانی شەڕی عیٚراق و ئیٚران و دواتر داگیرکردنی وڵاتی کویٚت لەلایەن سوپای عیٚراق لەسەردەمی سەدام حسیٚن و ئەوجا راپەرینی بەهاری ١٩٩١و دواتر ئابلۆقەی ئابوری و شەڕی ناوخۆو شۆڕبوونەوەی ئاسەواری شەڕ بەناخی تاکەکاندا و رەنگدانەوەی لەسەر مامەڵەی سیاسی و رەفتاری رۆژانە، هەروەسا روخانی رژیٚمی فاشیستی سەدام حسیٚن، کەلەنیٚوان هەر خاڵیٚکی میٚژوویی لەوانەی ئاماژەمان پیٚدان ماوەکەی نەگەیشتۆتە یەك دەیەو هیٚشتا برینیٚکی تاك سارێژ نەبۆتەوە برینیٚکی دیکە جەستەی کون کردووە، ئەو ماوەیەش هەرگیز بەس نییە بۆ سەقامگیری باری سیاسی، بەوشیٚوەیەش باری ئابوری شڵەژاوەو بارو ئاسایشی کۆمەڵایەتی و دەروونی تاکەکانیش رەنگدانەوەی ئەو بارە شڵەژاوو ناهەموارەیەو ناسەقامگیر دەبیٚت و پەروەردەو فیٚرکردیش ناسەقامگیر دەبیٚت و کاریگەری خۆی لەسەر کەسیٚتی و رەفتاری تاکەکان دەبیٚت و نائاسودەیی دەرونی و دڵەڕاوکیٚ بەرۆکی کەسیٚتی تاکەکان بەرنادا، پەیوەندی دەسەڵاتیش لەگەڵ خەڵك ناهاوسەنگ و لاتەریبەو بەگویٚرەی پەرەسەندنی سروشتیانەی کۆمەڵایەتی نابیٚت، کە لەجیاتی ئەوەی گرنگی بەدروستبوون و کەسیٚتی تاك بدریٚت ئاوەژووانە مامەڵە لەگەڵ چین و تویٚژەکانی کۆمەڵگادا دەکریٚت، کە گرنگی بە زیندووکردنەوەی پایەو پلەی عەشایەری دەدریٚت، کە هۆزیٚك بەرز دەکەنەوە هەر جارەو بەناویٚك گرنگی پیٚ دەدەن و گیانی عەشایەرچیٚتی و تایەفەگەری و ناز ناو و لەقەب زیندوو دەکەنەوە، زۆرجاریش کیٚشە کۆمەڵایەتییەکان لەدەرەوەی یاساو دادگا چارەسەر دەکەن و یاساکانی ناو ئەنجوومەنی یاسادانانیش تەپوتۆزی لیٚ دەنیشیٚ و ئیدی پیٚشکەوتن بەخۆیەوە نابینیٚ، یاسا لەوڵاتی ئیٚمە هەروەکو پەندیٚکی ئەمریکی دەڵیٚ وەکو هیٚلانەی جاڵجاڵۆکە وایە، کەباڵندە بچوکەکان دەگریٚ و باڵندە گەورەکانیش هیٚلانەکە دەڕفیٚنن، ئەم جۆرە رەفتار دروستکردنە لەنیٚوەندی راستکردنەوەی تەکنۆلۆژیای رەفتاردا شکستیٚکی گەورەیە بۆ تاك و بارە سایکۆلۆژیەکەی، ئەگەر تاك بەو شیٚوەیە ماڵی بکریٚ و نەزانیٚ ئازادی چییە ئەوا ژیان زۆر سادەو ساکار دەچیٚتە سەر بۆ ئەوان، چونکە ئەو جۆرە ستایلەی ژیان فیٚربوونی تیٚدا نییەو هەوڵ و تەقەلای ناویٚ و لەبەشە پەنهانەکانی مرۆییەوە دوورەو هیٚشتا هیچی نەچەپاندووە، ئەو ستایلە ئەدگاریٚکی خۆڕسکانە دەبیٚت وەکو ئەدگارەکانی کرم و حەلەزون و خشۆکەکان وپەلەوەر، کەبیٚ پەنهانن، مرۆڤیش ئەگەر خۆڕسکانە مامەڵە لەگەڵ ژیاندا بکات بیٚ مۆڵەتی شۆفیٚری، بیٚ مۆڵەتی کیٚشانی بۆڕی ئاو بۆ

ماڵەوە، بێ هەڵکردنی گڵۆپی سەوز لەترافیکەکاندا، دواکەوتن لە دامودەزگاکانی دەوڵەت، ملکەچکردن و ریاکاریی بۆ گەیشتن بەپایەو پلەی باش‌و چوونە پێشەوە بەناوی نوێنەرایەتی هۆزو عەشیرەت، هێنانە دەرەوەی ئۆتۆمبێلی حکومی بۆ کاروباری تایبەتی و خەرجکردنی سووتەمەنیەکی زۆری بێ پارەو ناسینی بەرپرسێکی گەورە بۆ وەرگرتنی پۆستێك و گۆڕینی ژمارەی زەوی بە ژمارەیەکی باشترو گوێ نەدانە پاراستنی ژینگەو چەندین شتی دیکە لەم جۆرە کارە سادەو ساکارانە، ئەوا ژیان بەو شێوەیە هەوڵ و تەقەلای فێربوونی ناوێ و مرۆڤ ماندوو نابێت و پێویستی بەتەرکیز نابێت و پێویست بەوە ناکات مێشکی خۆی بەرنامە رێژبکات‌و بڕوانامەو پسپۆڕێتی بێ ئەمەك دەبێت و ژیانیش بەو شێوە ئاژەڵیانە پێ پەسەندەو چیتر زانایان و کۆمەڵناسان خۆیان بەکۆمەڵایەتیبوونی مرۆڤەوە خەریك ناکەن و نەسیگمۆند فرۆید و نەکارل گوستاف یۆنگ بەدوای پەنهانەکانی مرۆڤدا نەدەگەڕان، بۆیە هەندێ جار گێلێتی‌و ساویلکەیی دەرمانە بۆخەمۆکی و رەشبینی‌و هەستکردن بە بێ وڵاتی و ترسان و دڵەڕاوکێی دوارۆژ، چوون ئەگەر مرۆڤ گێل و ساویلکە بێت خەمی رووداو دیاردەکانی دەورووبەری ناخوات و نەخۆش ناکەوێت، کە نەخۆشیش نەکەوت پێویستی بە داوو دەرمان نابێت، ئەگەر شێتیش بێت ئەوا هەستی دادپەروەری نامێنێ و هەست بەگەرماش ناکات و سپلیتی ناوێ، کە کارەبای بۆ چەتاڵ بکات، بەلایەوە گرنگ نییە کارەباو ئاو بەهەدەر بەرێت ئەوسا مرۆڤ ئەوەشی بەلاوە گرنگ نییە ئەگەر دەوڵەمەندێك پرۆژەیەکی خێرخوازی بکات یان نا، لە دڵی نەیەت خوێندنگەیەك بۆ منداڵانی وڵاتەکەی بکاتەوە، کەپێشتریش زێڕو زیوی دەستی ژنەکەی پێشکەش جەنگی قادسیە دەکرد، یان ئەوەش گرنگ نییە، کە جووتیارێکی ناوچە دابڕێنراوەکانی کوردستان ۳۵ ساڵ زەوی وزاری بەجێ هێشتبێ و دەسەڵاتدارێك دەستی بەسەر زەوی و زارەکەیدا بگرێ و یاسایەك نەبێ جوتیارو گەدا پەنای بۆ ببەن ئەگەر هەشبووبێ ئەوا لەترسان خۆی مات کردووە، یان وایان ماڵی کردبێ و تێیان گەیاندبێ کەئەو هەڵەیە داوای مافی خۆی بکات و زەویەکانی ئەوان بۆ بەرژەوەندی گشتییەو بەلاشییەوە گرنگ نییە دەسەڵاتدارێك کوڕەکەی خۆی یەکەم بکات و پێی عەیب بێ ئەگەر کوڕەکەی ئەو یەکەم نەبێ و نەخرێتە خوێندنی ئەهلی و دواجاریش دەرەوەی وڵات، بەڵام ئەگەر مرۆڤ پابەند بێ وەکو ئەوە وایە لە قسەی ئەمریکا یان وڵاتانی هەرێمی دەرنەچیت و زۆر عاقڵ بێت و گیانی شۆڕشگێڕی بوونی نەبێت و گوڕوتینی تاکێتی مرۆڤ بەهەدەر بچێ تاکات لەکات ئەترازێ،

وەلی ئەگەر پابەند بێ بێ زمان و بێ گوێ و بێ هۆش بێ ئەو کات تۆ ئاقڵی، بەڵام چ ئاقڵییەك؟ئەگەر ئاقڵی ناو شێتەکان بی ئەوا بە گوێرەی تەندرووستی دەروونی تۆ کەسێکی نامۆی چونکە تەنها تۆ ئاقڵی، ئەمیش نابێت، پیاو ئەگەر ژن چووە شاری کوێران دەبێ دەست بەچاوی خۆیەوە بگرێ واتە تۆ ئەوە بی کەئەوان دەیانەوێ، کە دەبێ چاو لەو خەڵکە بکەی کەفەرمایشتیان نواندووەو ملکەچ بوونە وەکو مەیمونەکانی گۆردن ستیفنسون ١٩٧٦، کە پێنج مەیمونی هێناو لەقەفەزێکدا ئاخنینی، لەناوەڕاستی قەفەزەکە پلەکانەیەکی جێگیر کردبوو لەبنمیچی قەفەزەکەش بڕێك مۆز هەڵواسرابوو، کاتێك یەکێك لەمەیونەکان هەوڵیدا بەپلەکانەکەدا سەربکەوێ بۆ ئەوەی مۆزەکەی دەستبکەوێ، ستیفنسون و لێکۆڵەرەوانی هاوڕێی لەو کاتەدا کەمەیمونەکە سەردەکەوت ئاوی زۆر ساردیان دەڕشت بەسەر مەیمونەکانی تردا، دوای ماوەیەکی کورت ئەم سینارۆیە دووبارەکرایەوە، بۆیە مەیمونەکانی تر نەیانهێشت هیچ مەیمونێکی ترسەربکەوێ بۆ مۆزەکەو هەر مەیمونێکیش سەربکەوتایە تێر لێدانی دەخوارد لەلایەن مەیمونەکانی هاوڕێییەوە بۆ ئەوەی چیتر ئاوی ساردیان بەسەردا نەکرێ، پاشان لێکۆڵەرەوان هەستان بەگۆڕینی هەر مەیمونێك سەردەکەوت بەمەیمونێکی دیکە لەدەرەوە، چونکە ئەو مەیمونە تازەیە نازانی مەسەلە چییەو لێدان هەیە پاشان (٥) مەیمونی ناو قەفەسەکە وا راهاتن بێ ئەوەی ئاویان بەسەردا بکرێ لە هەر مەیمونێك بدەن کەسەردەکەوت ..ئیدی ئەم شێوەیە هەر بەردەوام بوو وای لێ هات بووە رەفتارێکی پەیڕەوکراو وەکو رەفتاری مێگەل (**قطیع**) کە دووبارەکردنەوەی رابردووی باوباپیرانەوە بێ ئەوەی بیری لێبکەنەوە کەهەڵەیە یان نا، هاوکات ناشوێرن گۆڕانی بەسەردا بێنن لەبەر ئەوەی لەسەری راهاتوون کە وەکو ئەوەیە لەگۆڕینی رۆتین بترسێن و بەو شێوەیە رەفتار بکەن، کەهەروەکو لەناو قەفەزەکە فێرکرابوون و وەکو خۆیان بمێننەوە وەکو ئەوەی گەلێك لەئەشکەوتدا بژی بێ ئەوەی گۆڕانیان بەسەردا بێ و نەزانن مەسەلە چییەو لەوەش بترسن کەخراپتر روونەدات.

لەمەیدانی شیکردنەوەی دەروونیدا تەندروستی دەروونی تاك لەمەترسیدایە هەروەکو فرۆم دەڵێ، واتە ئەگەر هەموو خەڵك شێت بوون ئەوا دەبێ تۆش شێت بیت، پابەند بوونیش لەم شێوەیە نیشانەی ئەوەیە ویژدان مردووەو (من ego) دەستەمۆی سەروی خۆیەتی وەك ئاشی بێ ئاو وایە، وا لەم خودانە دەکرێ دووچاری خەمۆکی و داهێزرانبێ و تۆزقاڵێ وزەی سایکۆلۆژی خۆی نەخاتەگەڕ تەنانەت بۆ لادانی پەردەی خەمۆکی سەر سەری خۆی و منداڵەکانیشی، ئەم

کەسانە سایکۆپاتی نین بەڵام (من) یان تاپۆ کراوە، گەمژەش نین وەلی بێهۆشکراون، کەواتە تۆ ئەگەر ئەوە نەبی ئەوان دەیانەوێ دڵ لە دڵ مەدە، چونکە تۆ خەیاڵت وافێرکراوە کەوا بی، ئەم هاوکێشەیە یاسای سرووشتییەو وەکو ئەو یاسایانە نین، کە ناویان هەیەو ناوکییان نییە وەکو تری بن گۆم تەنها ئەو ساتەیە کەبەپەنجە هەڵبڕین دەنگی بۆ دەدرێ و لەسەر کاغەز دەمێنێتەوە تا تۆزی لێ دەنیشێ و دەسەڵاتی جێبەجێکاریش لەگەڵی دەنوێ و تا خەڵك لەخەوی خۆش رایدەپەڕێنێ، مرۆڤ ئەگەر بەکەڵکی ژیانی خۆی نەیەت و ژیانی خۆی رێك نەخات و نەزانێ چۆن سوود لەموچەکەی و کاتەکەی دەکات وافێر نەکرابێ ئەوا بۆخودی خۆی کەسێکی گەندەڵ دەبێت، ئەم گەندەڵییە کاتیك مەترسیدارە، کە بووبێتە رێبازێکی پەیڕەوکراو و لەویژدانەوە سەرچاوەی هەڵگرتبێ و بەمنداڵی فرچکی گرتبێ، کە درۆو دزی و گزی بووبێتە نەخۆشی لەگیانیداو رەقیبی دەروونی دەسەڵاتی بەسەر ئەو کەسەوە نەمابێت و هاوسەنگی تێکچوو بێ، ئەم جۆرە ویژدانە کە منداڵدانی گەندەڵییە، بەهۆی پاڵپشتی و پایەو پلەو زەمینە خۆشکردن ئەو گەندەڵیەی لەدایك دەبێت ئەو ویژدانە چاك دانەمەزراوە، رەنگە لەناخی کۆمەڵگادا پیر بووبێ و رەگی داکوتابێ، بەهۆی بوونی دەرفەت و پاڵپشتیکردنیەوەو زەمینەبۆ خۆشکردنی زیاتر گەشەدەکات و ئیختبوتیانە پەل دەهاوێ، بەڵام هەندێجار ئاشکرا نابێ بەهۆی بچووکی کار وشوێنەکەی، بەڵام کە کارەکەی یان پیشەکەی لەپایەو پلەیەکی بەرزدایە ئەوا دەرکەوتنی زیاترە، ئەگەری دەرکەوتنی گەندەڵی زیاتر دەبێ رەنگە بەڕێوەبەرێکی بچووکیش گەندەڵیی خۆی هەبێ، بەڵام بەهۆی کەمیی پارەو پولی بەردەستی گەندەڵیەکەی کەمتر دەردەکەوێ، گەندەڵییش بەزۆرو کەمی نییە، کەمەکانیش وردە وردە گەورە دەبن، کەواتە گەندەڵیی ویژدان کاریگەرترین جۆری گەندەڵییە کە لەناوەوە هەرەس بە مرۆڤ دێنێ، ئەو کاتە قوڕەکە خەستر دەبێت کەگەندەڵی بووبێتە کارێکی رکابەری، کەکەسێك زۆر بەلایەوە ئاساییە واسیتە دەکات بۆ کارێکی ناڕەواو ناهەق لەسەر حەسابی کەسێکی دیکە کارەکەی بۆ رایی بکرێت و کەسی نەشیاو لەشوێنی شیاو دابنرێ، تاکی کۆمەڵگەی ئێمە وافێرکراوە کەشانازی بەوەوە دەکات کەسێك لەدەسەڵات دەناسێ و کارێکی ناهەقی دەکات، زۆرن ئەوانەی کەسی ویژدان گەندەڵ ئەگەر پایەی هەرچیەك بێ لە کارەکەی و پەیڕەوی نیازخوازی خراپ بکات، ئەگەر هەست بەو نیازخوازییە بکات، یان نەکات، هەر گەندەڵە، بەڵام تاوانبارێکی گەورەشە، گەر هەستیشی پێنەکرد ئەوا گێلێکی گەندەڵچیە، لەم پەرتووکە سادەیەدا خوێندنەوەیەکی سایکۆکۆمەڵایەتیانەم بۆ رەفتارەکانی تاك کردووە

کەزادەی هزرو تێگەیشتن و تێڕوانینی جیاوازە بەرامبەر مرۆڤەکان کەبەشێوەی وتار یان لێکۆڵینەوەی ئەکادیمی هەندێك لەم بابەتانە لەگۆڤارو ڕۆژنامەکانی کوردستان بەناوی کەمال فاروق یان کەمال فاروق نصرالدین بڵاوکردۆتەوە وەلی پێم خۆش نییە نازناوێك یان لەقەبی هۆزێك یان ناوچەیەك بەخۆمەوە بنێم تەنها وەك ئەرکێکی نەتەوەیی و نیشتمانی کەبەشداری گیانی تایەفەگەری و ناوچەگەری و عەشیرەتگەری نەکەین کەتۆوی ململانێ و کێشمەکێش بووە لەدیرۆکی کوردستاندا و هەروەکو چۆن تەقەبولی گۆڕانی تەنکنۆلۆژیا دەکەین دەبا گیانی تایەفەگەری و بیرکردنەوەی خێڵەکییانەش لەناوببەین و هەوێنی تایەفەگەری و دەمارگیری نەگوزاینەوەو چیتر گا بەگونەوە نەناسین و مرۆڤ وەك کەسێتی خۆی بناسرێ و لەسەر بنەمای مرۆڤبوونیەوە مامەڵەی لەگەڵدا بکرێ نەك هۆزو تایەفەو پێگەی چینایەتی، بەپێویستم زانی ئەو وتارو لێکۆڵینەوانە ببنە بناغەی ئەم پەرتوکەی بەردەستی خوێنەران، کەهەرگیز بی کەموکورتی نییەو کێشەی گەورەش لەنوسینی بواری کۆمەڵایەتی و سایکۆلۆژی ئەوەیە هزرەکان دووبارە دەبنەوە کەئەوەش پێویستبوونی دووبارەبوونەوەیە هەروەکو ئەریك فرۆم دەڵێ (کێشەیەك کەچارەسەری نییە دووبارەبوونەوەی هزرەکانی و تێکەڵبوونیان لەگەڵ یەکترە، بەگوێرەی پێویستیش ڕۆ نەچوومەتە قوڵایی ناخی مرۆڤەکان و زاتی ئەوەشم نییە، چونکە هەر لەناونیشانی کتێبەکەوە کەلەپەراوێزی کەسێتیدایە هەر لەپەراوێزی کەسێتیەوە قسەم کردووەو ڕێگە بەخۆم نادەم پتر بڵێم، لەوانەشە لایەنی نەرێنیم لەمرۆڤەکاندا زیاتر زەقکردبێتەوە کەهاوکات مرۆڤی ئەم کۆمەڵگایە خاسیەتگەلێکی ئەرێنی باش و مرۆییانەیان تێدا بەرجەستە بووە لەئارامگرتن و هاریکاری و بەتەنگەوە هاتنی یەکدی سەرەڕای غەدرو جەورو ستەمی مێژو و کارەساتی گەورەی جەرگبڕ لەجینۆسایدو کیمیاباران و ئەنفال و شەڕی ناوخۆو پەرتەوازەکردن و لێکدابڕانی کەسوکارو ئاوارەیی و خەمی ژیان و ئیستغلالکردنیان لەلایەن دۆخی سیاسیەوە، ڕەنگە خوێندنەوەکانی نووسەر بۆ تاکەکان هەمان خوێندنەوەو هەستی خوێنەر نەبێت بەقەد ئەوەی هەستی نووسەر خۆی بێت بەرامبەر کۆمەڵگەو واهەستیش دەکەم هەر بابەتێك لەبابەتەکانی ئەم پەرتووکە سادەو خاکەڕاییە خۆی لەخۆیدا پەرتوکێکی سەربەخۆ بێت و ئەگەر بوار هەبێت و تەمەن مەودا بدا پەنا بەخوای گەورەی تاك و تەنیا پەرتوکی دیکە لەم پەرتوکەوە لەدایك دەبێ و ڕووناکی دەبینێ بەتایبەتی ئەو بابەتانەی کەمایەی پرسیارکردن و هەڵوەستەکردنە بەتایبەتی سەبارەت بەلایەنی شاراوەو سەرهەڵنەدراوی نەستی کۆمەڵایەتی تاکەکانی ئەم کۆمەڵگەیە، کە

ڕژێمە سیاسیەکان وەك بەرداش هاڕیوونی و سەقامگیریان لەژیانیاندا بۆ نەهێشتۆتەوەو وایان لێکردوون ئەمەندە بەدوای ناندا وێڵ بن ئەمەندە خولیای دۆزینەوەی خودی خۆیان نەبن، کە هەروەکو زانایانی بواری دەروونی ئاماژەیان پێداوە کە سێ چارەکی کەسێتی مرۆڤ لەپەنهاندایەو ئەو بەشەی کەئاشکراو روونە رێژەیەکی زۆر کەمی کەسێتی تاکە، چونکە بەشێکی کەسێتی نەتاك خۆی دەیزانی و نەخەڵکانی دەوروبەری، بەشێکیشی رەنگە خۆی بیزانێ و بەشێکی تریشی رەنگە خەڵکی تر بیزانێ و ئەو نەیزانێ، بەڵام هیچ لایەنێك تەواو پەی بەشاراوەیی نهێنی و نەستەکانی ئەو تاکە نابەن، چونکە تاکی کۆمەڵگەی ئێمە ئەمەندە ئارەزوو و حەزەکانی چەپاندووە بۆ رازیکردنی دەوروبەری خۆی ئەمەندەی بەئاشکرا نەدرکاندووە، ئەو نەدرکاندنەش بووەتە خەونێك لەخەونە بەدینەهاتووەکانی کەرۆژێك لەرۆژان ویستبێتی بیانتەقێنێتەوەو ئەوەشی هەر پێنەکراوە لەبەر مەرغوبیەتی کۆمەڵایەتی و سنورنەبەزاندنی منی باڵاو هێشتنەوەی لەکۆگای پەنهاندا، بۆیە لەپاڵ ئەو حەزە شاراوانەو خەوو خەیاڵ و مەیلە جۆراوجۆرو چەپێنراوەکانی خۆی پەنای بۆ رەفتارگەلێکی دزیوو فرت و فێڵی دەروونی بردووە کەهۆکارەکەی لەدووتوێی دەرونی قوڵیدا پەنگی خواردۆتەوەو بەئەستەم زانایەك بتوانی بگاتە قوڵایی ئەو نەست و پەنهانە، کەبەشێکی پەیوەندە بەئەزمونی تاك خۆی و بەشێکیشی پەیوەندە بەکۆمەڵگاوە، هەر ئەم نەدرکاندنەو هەر ئەم تێئاخنینەی دەروونە لەپشت هەر دوو روویەك و هەر ترازانێکی دەرونی و کۆمەڵایەتی و هەر خاسیەتێکی کەسێتی تاکەکان کەدەرەنجامی پەستان و گوشاری منی باڵاو حەزەکانی ئەودایە، کە (من) ەکانیان خستۆتە نێوان هەردوو بەرداشی خۆیانەوە، کەتا پێیان کرابێ تاکیان گوشیوەو لەخشتەیان بردووەو کاریگەری ئەم گوشین و لەخشتەبردنەشی گواستۆتەوە بۆ نەوەکانی دواتر کەکارل گۆستاف یۆنگ بەپەنهانی کۆمەڵایەتی ناوزەدی کردووە.

**کمال فاروق نصرالدين**
**مامۆستای دەروونناسی**
**پەیمانگەی پەروەردەی وەرزشی هەولێر**
**بەهاری٢٠١٣**

**مەدەنیەت:**

## سازان و دادپەروەری و یەکسانی سیمای کۆمەڵگەی مەدەنین، بەڵام ململانێ و کێشمەکێشیش پێویستە.

پێش ئەوەی بزانین کۆمەڵگەی مەدەنی چییە، دەبێ بزانین کۆمەڵگەی پێش بڕینی قۆناغەکانی مەدەنی چیە، کەهێشتا قۆناغی پێویستمان بەرەو مەدەنیەت نەبڕیوە، بەڵام بەرەخساندنی بارودۆخە بابەتی و خودییەکان گیان و وزەی دەروونی ئەوتۆ شك دەبەین کەپێشوازی لەگۆڕان هەنگاو بەرەو مەدەنیەت بکەین، تاکژی چۆن وەڵامدەرەوەی یاساو کۆمەڵگە دەبێت، کۆمەڵگەی پێش قۆناغەکانی مەدەنی واتە کۆمەڵێك بەهاو هزرو ئایدۆلۆژیا کەتاك تیایدا رەفتاری تاکڕەوی و دوور لەکۆمەڵایەتی بوون دەنوێنێت لەبەرەنگاربوونەوەی ژیان و رەزامەندی ئارەزووە خۆڕسکییە بایۆلۆژییەکان لەلایەك و پەروەردەو کۆمەڵ لەلایەکی دی، کۆمەڵگەی پێش قۆناغی مەدەنی بەزەبروزەنگ و بەمیلیتاریکردنی کۆمەڵ و بوونی یاسای سەرکوتکارو زاڵبوونی بەها تایەفەگەرییەکان و بزربوونی مافی مرۆڤ و زوڵمکردن لەژن و نەبوونی ئازادیەکانی تاکە کەس، کەبەدەخالەت لەهەڵبژاردنی شوێنی حەوانەوەو پۆشاك و بەها تایبەتیەکانی خۆی و خێزانەکەی جیا دەکرێتەوە، تاك دەبێت هەوڵی رەزامەندی نەستی

کۆمەڵایەتی بدات، کەتەمەنی لەتەمەنی ئەو زۆر پترەو لەمنداڵدانی کۆمەڵگەکەی دێتە کایەوەو لەمێژووی سەروەری و نەهامەتیەکانی فرچك دەگرێ و مەلاشووی هەڵدەدرێتەوە، ئەو نەستەی کە ئەقلانیزم ناتوانێت لەشەوو رۆژێکدا بیهێنێتە رووناکی و جێی بگرێتەوەو ببێتە پردێك بۆ پەڕینەوەی بەرەو کۆمەڵگای مەدەنی ئەقلانی و مافخوازو یاساپارێز، واتە خولقاندنی چاودێرو سانسۆر لەخودی تاکداهاریکاری و برایەتی و سازانی کۆمەلایەتی و سیاسی وئابوری و تەنانەت دەروونیش، پاش چێکردنی ئەو یاساو چاودێرییانە ئەقلانیزم دەبێتە سیماو نەستێکی نوێی کۆمەڵگا، کەکۆمەڵگای مەدەنیە، ململانێکانی نێوان خودو چێژو لەزەت هەموار دەکات و رێگەی ناداتێ ببێتە فاکتەری هەڵوەشاندنەوەی کۆمەڵایەتی ئەگەر یاساکانیش لەئارادانەبن، ئەوا سازان و ئەقلانیزمە گەوهەری کۆمەڵگای مەدەنییە، کەیاساو بەها نوێیەکان لەناخی تاکەکانی کۆمەڵ دەخولقێنێت و هاوسەنگی نێوان تاك و بەها کۆمەڵایەتیەکان چێ دەکات، هاوکات رۆڵی دەوڵەتیش دەبینێت لەدەستنیشانکردنی ئازادییە مەدەنیەکان و بەزاندنی هێڵە سورەکان بێ ئەوەی پەنا بەرێتە بەر یاسایەك لەدەرەوەی خودی تاکەکان، چونکە یاساکان بەهەوڵی ئەقلانیزم لەناخدا نەخشەی دەڕێژێت، نەخاسمە لەکاتێکدا چیتر ئەو تاکانە لەململانێدا نەبن بۆ دارشتنی نەخشەی وەدەستهێنانی نان و دۆزینەوەی دەسەلاتێك، پەناگەیەك، دادگایەك، تاقمێك بۆ پاراستنی مافەکانیان.

غەریزەکانی مرۆڤ بەهۆی سروشتی کۆمەڵگای دەرەبەگایەتی و سیستمە هۆزگەریەکانی کۆن و نوێ و لۆژیکی هێز سیمایەکیان بەتاك بەخشیوە، کەهەمیشە وەك عەلی وەردی دەڵێت ماف بۆ لای خۆی رادەکێشێت و نەرگزیانە مامەڵەو رەفتار بکات، وەلی ئەو ماف راکێشان و رەفتارە نەرگزییانە لەکۆمەڵگای مەدەنی چیتر نابێتە سیمای تاك بەتایبەتی کە ماف و ئازادیەکان پارێزراو بن و کێشمەکێشی بەهێز لەئارادا نەبێت، ئەوپەڕی کۆمەڵایەتی بوونی مرۆڤیش (مەبەست لەکۆمەڵایەتی بوونیش ـ واتە تاك تەنها حەسابێك بۆ ئەنگیزەکانی خۆی نەکات، بەڵکو کۆمەڵ و دەوروبەر بەهەند وەربگیرێت و توانای پەیوەندی هەبێت) بنوێنێت، کەسیمای کۆمەڵگەی مەدەنیە لەکاتێکیشدا کەدەوڵەت قەرەبووی نان و ئاسایشی بۆ بکاتەوە کەلەبازنەی ململانێکانی تاك و کومەڵ رزگاری بێت، بەبێ ترس و بێ خۆبەکەم زانین ملکەچی راستیەکان بێت و هەست و سۆزی بەرامبەر نیشتمان هەمان هەست وسۆزی بێت بۆ جگەر گۆشەکەی، هەروەکو چۆن مرۆڤ ملکەچی هەستی ئاینیەو خاکییە لەئاستیداو لەناخیدا ئاین

وەك سایكۆلۆژیایەكی چەق بەستوو بەرەو راستیەكان و بێگەردی و ئینساف و ویژدان بەرێوەی دەبات، ویژدان و چاودێر و یاسایە كەلەنەستیدا وەك دەوڵەت رێ پیشاندەرێتی، ئاسایش و دڵنیایی بەمرۆڤ دەبەخشێت و سكالاكانی بەململانێ لەگەڵ تاكەكانی تردا گوزارشت ناكات، بەڵكو پەیوەندیەكی بێ گەردی رۆحی لەگەڵ خوای پەروەردگار دروست دەكات، ئەو یاسا رۆحییە بەرامبەر مەدەنیەت كەیاساو دادگا لەناخی مرۆڤ خۆی لەخۆیدایە، بێ ئەوەی یاساكانی سەر زەوی بیترسێنێ، ئەو ئاژاوەیە بەخێرو خۆشی وەڵام دەداتەوە، كۆمەڵگا چەند بەرەو تەكنۆلۆژیاو كەرەستەسازی هەنگاو بنێ پەیوەندیە رۆحیەكان دەبنە قوربانی پەیوەندییە مەتریالیەكان و خەیاڵ بەرەو دونیایەكی بێهودە كۆچ دەكات و لەمرۆڤ دەتۆرێت تا تەمەن تیری خۆی دەهاوێت و ئەو مرۆڤە رەنج بەخەسار سەر دەنێتەوە، بۆیە هەمیشە مرۆڤ هەرچەندە هەق بۆ لای خۆی رادەكێشێت پێی خۆشە هێزێك هەبێت یان یاسایەك هەبێت پەناگەیەك بێت بۆ ئەو، بەلایەنی كەمەوە هەستی گەشبینی بداتێ و فریادڕەسی بێ، هێزێك یان دادوەرییێك هەبێت لەهەموو یاسا تۆز لەسەر نیشتووەكانی سەر زەوی و پێش كۆمەڵگای مەدەنی بەهێزتر بێت، ئەویش میكانیزمی ئاینیی ناسیاسی و مەدەنیەت و وشیارییە كەسانسۆر لەخوددا چێ دەكات نەك ترسی سزاو گوزەران و پایەوپلە، ئەوژی بەمانا ئەخلاقی و روحیەكەی نەك سیاسیەكەی كەمرۆڤ لەنامۆبوون و ململانێكان رزگار بكات و بەرەو مەدەنی بوون بیبات و لەبازنەی تێركردنی غەریزەكان و ململانێكانی رێساكانی كۆمەڵگای نامەدەنی دەربازی بكات و وەك پێویستیەكی دەروونی بیگەیەنێتە ئاستی تێربوون و لەنائاسودویی فریادرەسی بێ، كە ئەویش ئاسایش بوونی تاكی مرۆڤە، ئاسایشی تاكی مرۆڤ دەمانگەیەنێتە ئاسایشی كۆمەڵ كەلەپێناسیەكی كۆمەڵگەی مەدەنیدا دەردەكەوێت كەدەڵێت: (كۆمەڵگەی مەدەنی بریتیە لە كۆمەڵێك رێكخستنی ئازاد كەبواری گشتی نێوان خێزان و دەوڵەت پڕ دەكاتەوە، ئەویش بەئامانجی بەدیهێنانی بەرژەوەندی تاكەكانی بەرێزگرتن لەبەهاو پێوەرەكانی یەكسانی لێبوردەیی و بەڕێوەبردنێكی ئاشتیانە، سەرەنجام رێكخستنەكانی كۆمەڵگای مەدەنی بریتین لە (كۆمەڵەكان، یانەكان، كۆمەڵە هەرەوەزیەكان و هەر كۆمەڵەو رێكخستنێكی ناحكومی و ناخێزانی، كەرۆڵی خۆیان بگێڕن لەوشیاركردنەوەی تاكەكان سەبارەت بەئازادی و مافەكانیان و رێزگرتن لەیاساو دەستور)، هۆبز لەكتێبەكەیدا بەناوی اللیفیتان دەڵێ رزگاركردنی مرۆڤ پێویستی بەفەلسەفەیەكی نوێ هەیە لەسەر بنەمای واقیع وەستا بێ، كۆمەڵگەی مەدەنییش

واپێویست دەكات بارێكی ئاسایی بێت دژی سەركوتكردن و دیكتاتۆریەت و ڕەهایی، مافی سروشت لای هوبز ئازادی تاكە كەسە لەبەكارهێنانی توانا خودییەكانی بۆئەوەی ژیانی تایبەتی خۆی بپارێزی، هوبز تەنها لەسەر دۆزینەوەو دانانی یاسا ناوەستێ، كەرەنگە دەیان یاسا لە هەر پەرلەمانێك دەربچێ بەڵام گرنگ ئەوەیە چۆن ئەو یاسایە بخەیتە گەڕ بۆ دەوڵەتی ئازادو هاوڵاتی ئازاد، لەپێناسەكەدا بۆمان روون دەبێتەوە كەتاك كۆڵەگەیەكی كۆمەڵگای مەدەنیە، كەلەپێناو بەدیهێنانی ئامانجەكانیدا كۆمەڵێك ڕێكخستنی ئازاد لەئارادایە بەمەبەستی بەمەدەنی بوونی تاك و لەئەنجامدا ئەو تاكانە دەبنە بەردی بناغەی چێكردنی كۆمەڵگەی بانگەشەبۆكراو، هەر بۆیەشە پێویستە ئازادیە مەدەنیەكانی تاك بەنانیشەوە دابین بكرێت و ئەو ڤاڵاییە گەورەیەش پڕ بكرێتەوە كەدووچاری كۆمەڵێك وەك كۆمەڵی كوردستان بووە بۆ ئەوە لەئەنجامی بێكاری و پەرتەوازەبوونی لاوەكانی و برسیەتی شارستانی، كەلاوی كورد لەئەنجامی خۆبەراوردكردنی لەگەڵ لاوانی دیكەی دونیاو دەوروبەر لەرێگەی ئەنتەرنێت و هێرشی بەربڵاوی كەلتورەكانی گەلانی دیكەو سەفەركردنی بەوڵاتانی رۆژاوادا هەست بەو كێماسییە دەكات و بۆشایەكی رۆحی تێدا دروست بووە.

هەموو یاساكانی سەرزەوی بۆ دەستەمۆكردنی و بەكۆمەڵایەتیكردنی تاكەكانی كۆمەڵ هاتونەتە ئاراوە، بەڵام باپرسین كام بەكۆمەڵایەتی بوون؟!كۆمەڵایەتی بوونێك كەچیتر هەڵچوونەكان و سروشتی بایۆلۆژی تاك لەجیاتی ئەقڵ و مەنتیق بڕیاری وەدەستهێنانی پێداویستیەكانیان نەدەن، بەڵكو تاكەكان لەچۆنێتی وەدەستهێنانی ئەو پێداویستیانە بێ ئەوەی یەكتر ببەزێنن سەرپشك بن، هەروەها بۆ ئەوەی (من) ەكان بتوانن رەزامەندی نێوان (ئەو) و (منی باڵا) جێبەجێ بكەن و هاوسەنگییەك لەنێوانیاندا دروست بكەن و هەر خۆشیان سەرچاوەی ویژدان بن، نەك دەوڵەت و دەسەڵات ویژدانیان بۆ دابڕێژێ، بۆ ئەوەی بەدیارنەبوونی دەوڵەت و دەسەڵات ئەوان شیرازەی كۆمەڵگا تێك نەدەن و مرۆڤەكان مەدەنیانە هەڵسوكەوت لەگەڵ گۆڕانكاریەكان بكەن، بۆ ئەو مەبەستەش ئەركی دەوڵەت لەوەدا دەردەكەوێت كەئاسایش یان راستر هەستی ئاسایش بەتاكەكان ببەخشێت و تووشی دڵەراوكێ و خەمی نەوەكانی داهاتوویان نەكات، ئاسایشێك كەسایكۆلۆژیای تاك بڕیاری لەسەر بدات و لەرەفتاریدا رەنگبداتەوە، كەبێ ئەوەی یاساو دەسەڵات ئامادەبن ئەو دژی شەپۆلەكانی مەدەنی مەلەنەكات، بێگومان ئەو ئاسایشە بەتێركردنی یان نیوەتێركردنی پێداویستیە بنەڕەتیەكانی مرۆڤە وەكو خۆراك و پۆشاك و حەوانەوەو جنس و هەستی ئینتیماو خۆشەویستی و خۆبەدیهێنان، بۆئەوەی

خەمی نان دیسان تاکەکان بەرەو بازنەی ململانێ سەرەتاییەکان پەلکێش نەکات و کەفوکوڵی هەڵچوون و غەریزەکان پردی ئەقڵ و مەنتیق نەڕوخێنن، ئەگەر واش نەبێت، کەواتە تاك بەکۆمەڵایەتی نەبوو یان بەمەدەنی نەبوو، لەبازنەی گیانداریکی بایۆلۆژی چەق دەبەستێت و واتای دیموکراسیەتیش بۆ ئەو هیچ ناگەیەنێ، بۆیە لێرەدا دەسەڵات پەنا دەباتە بەر زەبروزەنگ و دەوڵەتی عەسکەرو یاسای قەرەقوشیی، قۆناغی ئاسایش و بەکۆمەڵایەتی نەبوونی تاك بەو پێداویستیە ژیانی و ژیارییانە هیچ نەبێت نیوە دابینکراوی سەقامگیر بێت، لێرەشدا مرۆڤ هەست بەنامۆبوون ناکات و ویژدانی دەحەوێتەوە، بێ ئەوەی داری لێهەڵبڕن ئەو ملکەچی یاساکانە، ملکەچبوونی یاساش، واتە دەربازبوون لەبازنەی هەڵچوونەکان ملکەچی بۆ مێشکی باڵای بەهێزترو شارستانی ترو بەرەحمتر، کە زۆر ئاقڵانە دەتوانێت هەڵچوونەکانی تاك دژ بە مەدەنیەت دامرکێنێتەوەو بیگوازێتەوە بەرەو قۆناغی ئەقڵانیزم و ئیتر لەململانێی نامۆبوون لەماڵی خۆی و پێداویستیە روحی و ژیاریەکان رزگاری بێ، بەڵام ئایا ئەگەر تاك لەڤاڵاییەکی بێ هودەدا ژیا هاوسەنگی تێدا دروست دەبێت لەنێوان سیستمی هەڵچوون و سیستمی عەقڵدا!.

مرۆڤ لەروانگەی ئیبن خەلدونەوە پاڵنەرێکی کۆمەڵایەتی هەیەو خۆرسکانە بوونەوەرێکی مەدەنییە، واتە پێویستی بەکۆبوووونەوەهەیە لەگەڵ دەوروبەری و پێویستی بەئاوەدانکردنەوە هەیە، چونکە توانای تاکێکی مرۆڤ ئەمەندەیە کەپێویستیەکانی خۆی دابین بکات بۆیە پێویستی بەکۆکردنەوەی تواناکانی ئەو تاکانەیە کەبەهاوکاری و هەرەوەزی پێویستیەکانی خۆیان دابین دەکەن، هەروەها هەرتاکێك پێویستی بەوانی تر هەیە بۆ بەرگریکردن لەیەکتر کەئەمیش بەچەسپاندنی قۆناغ بەقۆناغی دیموکراسیەت و چەسپاندنی مافەکانی تاك دەبێت و خەیاڵی تاکیش بەو شێوەیە بێت کەهەست بەخەیاڵی دەوروبەری بکات، هەرچەندە ئاوایە کۆمەلچگەی مەدەنی و هزرمەندانی تۆباویش بەو شێوەیە دەڕواننە مەدەنیەت کەهەمووشێوەیەکی سازانی کۆمەڵایەتی و سیاسی و برایەتی لەگیانی تاك و کۆمەڵگە چێ بووبێ بەڵام زۆر رای دیکە هەیە دەڵێ ئەگەر ناخی کۆمەڵگە هەمووی سازان و رێککەوتن و برایەتی و بێ کێشە بێ ئەوا کۆمەڵگە بەرەو پێشەوە ناچێ بۆیە ژمارەیەك لەکۆمەڵناسان و هزرمەندانی کۆن و نوێش لەوانەش عەلی وەردی و ئیبن خەلدوون ئاماژەیان بەبوونی ناکۆکی داوە لەکۆمەڵگا کەهەبێت لەپێناو بەرەو پێشڤەچوون و دەقنەگرتن بەوەی باوە لەکەسێتی تاك و کۆمەڵگەش.

## هەڵوێستی سایکۆرامیاری:

**هەڵوێست لەژیانی ئادەمیزاددا دووسەرچاوەی هەیە، یان هەستە لەبەرامبەر روداوێکدا کەتازە سەری هەڵداوە، یان نەستە بەرامبەر روداوەکانی مێژوو بە وروژاندنی رووداوە هەنوکەیەکان.**

ناچاربوونی سایکۆلۆژی یەکێکە لەبنەماکانی بیردۆزی سیگموند فروید کەهەموو هۆکارێك ئەنجامێکی هەیەو هەموو ئەنجامێکیش هۆکارێکی هەیە، ئەمە یاسای ژیانە، ئەگەرچی ئەو ئەنجامە دوابکەوێت، بەڵام ناچاربوونی بەدیهێنانی هەیەو لەوانەشە کاردانەوەکەی زۆر بەهێزتر دەبێت، لەوەی ئەگەر لەکاتی خۆیدا روویدابوایە ئەوەش هەڵوێستە لەبەرامبەر هەڵوێستێکی لەپێشینە، هەڵوێستیش لەژیانی ئادەمیزاددا دووسەرچاوەی هەیە، یان هەستە لەبەرامبەر روداوێکدا کەتازە سەری هەڵداوە، یان نەستە بەرامبەر روداوەکانی مێژوو بەوروژاندنی رووداوە هەنوکەیەکان، هەستە رەفتار لەبازنەی رامیاریدا لێکۆڵینەوەو بەدواداچوون و رەخنەگرییە، لەبیردۆزو رەوتە رامیاریەکان و شێوازی بانگەشەکردن بۆی، وەکو هەڵبڕبینی دروشمە رامیاریەکان (مافی چارەی خۆنوسین، فیدرالیزم، لیبرالیزم، دیموکراسی، سۆشیال دیموکرات و فرە لایەنی..تد) بەڵام دەرکەوتنی بەرژەوەندیەکان وەکو بەرژەوەندی نەتەوەیی، نیشتمانی، رامیاری

کەمەبەستی زۆر لەحکومەت و گەلان بووەو لەپێناویدا خەباتیان کردووەوو کەوتونەتە ململانێوە لەسەر شێوازی هاوکێشەی:

هەڕەشە ⟵ بەرەنگاربوونەوە (توینبی) .

ئەم چەوساندنەوە دەروونی و کۆمەڵایەتی و بەگژداچوونەوەیە کەچین و توێژەکانی کۆمەڵ توشی دەبن، دەبێــتە هەڵوێستێك دژی نالەباری دەرونی گەلێك، لەوانەش گەلی کورد کەهەستی نەتەوەیی لەلادا درووست بووە هەر لەسەردەمی زوحاك و دەوڵەتی میدیاو دواتریش، وایکرد گیانی بەرەنگاربوونەوە لەو گەلەدا دروست ببێت کەئاکامەکەی شۆڕشەکەی کاوەو سەرجەم شۆڕشە یەك لەدوای یەکەکانی ئەم گەلە بووە.

ئەو گیانە هەوێنی پێکهێنەری دەروونی نەتەوەیی لەتاکی کورددا چ نێر و چ مێ دروستکرد، هەڕەشەکانی سەر نەتەوەی کورد کەتاکی کوردی خستۆتە هەموو جۆرە ململانێیەکەوە، جارێك بەشۆڕش و راپەڕین جارێك بەکۆڕەو جارێك بەکۆچکردن، گیانی بەرەنگاربوونەوەی دروستکردووە، لەسەر بنچینەی (هەموو بەگژداچوونەوەیەك بەرەنگاربوونەوەی هەیە) ئەو کەسایەتیە زیاتر لەگەڵ سەرهەڵدانی بیری نەتەوەییدا پەیدابووە بۆ پاراستنی ئەو نەتەوەیە، بەڵام پێش بەرجەستەبوونی هزری نەتەوەیی لەجۆرێکی تری ململانێدا بووەو توانوێتی نوێنەرایەتی دەوروپشتی خۆیشی بکات و وەڵامدانەوەی تێدا درووست بێت.

لەهەموو کاتێکدا تاکی کورد بۆ مانەوە توانیوێتی خۆی بگونجێنێت، ئەگەر سەربەخۆبوونی کورد تەنها خۆگونجاندنی کەمبوایە، ئەوا دەمانگوت گرفتەکە لەکەسایەتی تاکی کورددایە.

عەقڵی شاراوەی تاکی کورد دەرهاویشتەی ململانێکانی دەرەبەگایەتی و بێگانە بووەو، یادەوەرییە تاڵەکانی سەردەمی سەفەوی و عوسمانلی و عەرەب کەسەرکوتیان کردووە، وێرای ئەوەش هەروەکو دکتور شاکر خەسباك لەکتێبەکەی (الاکراد) دا دەڵێت: ئەم نەتەوانە کوردەکانیان دەکردە داردەستی خۆیان و تۆمەتی کوشتنی مەسیحیەکانیان دەخستنە پاڵ، بەوەشەوە نەوەستان تادابەشکردنی وڵاتەکەیان، بەتایبەتی پاش شەڕی یەکەمی جیهانی و

پاشان پەناشیان دەبردەبەر لەباربردنی هەوڵەکانی کوردو خاوەن ویژدانانی جیهان لەمەڕ پەیمانامەی سیڤەر.

وێڕای چەوساندنەوەکانی سەردەمی نوێی پاش شەڕی جیهانی دووەم کەبەسەردەمی رزگاری نەتەوەیی دێتە ئەژمار، چەندین وڵات و نەتەوە سەربەخۆییان وەرگرت و لەبەرامبەریدا کورد حەسرەتی رزگاربوونی هەڵدەکێشا، ئەوانە هەمووی هەستی پەیوەستبوونی نەتەوەیی لەلای تاکی کورد چاند، ئەو هەستەش لای هەموو تاك و لاوێکی کورد بەرجەستە بوو، چونکە لەئاکامی ئەو هەرەشەو چەوساندنەوانە یەك پێکهێنەری دەرونی لەلایان دروست بوو، کەئەمیش بۆتە هەوێنی شۆڕش و راپەرینەکانی کورد لەهەموو پارچەکاندا، نەك تەنها لەکەسایەتی تاکەکاندا رەنگیداوەتەوە، بەڵکو سەرتاپای ژیانیشی گرتۆتەوە لەوێژەو هونەرەکانیدا دیارە، کەهزرڤانان هونەرمەندانی سەدەی پێشوو خۆیان بۆ بەرهەمی رامیاری و نەتەوەیی و نیشتمانپەروەری تەرخانکردووە، لەگۆرانی وتابلۆ هونەریەکانیشدا رەنگیداوەتەوە، سرودی ئەی رەقیب بەئاشکرا گیانی تورەیی و شۆڕشی تێدا بەرجەستەیە کەنموونەی ئەدەبی بەرەنگاربوونەوەو واقیعی بەرەنگاربوونەوەی تاکی کوردە، کەبەبیستنی مووی راست دەبێتەوە، بەئاشکراش دەردەکەوێت کەگیانی خۆبەختکردن و شۆڕش و راپەڕین لەهەموو تاکەکانیدا بەئافرەت و منداڵیشەوە رەنگیداوەتەوەو خۆشەویستی دەزگیران و خۆشەویستی نیشتمان هەمیشە دەست لەملانێی یەکتر بوونە، ئەوەتا شاعیری مەزن دەڵێت...

بڵێن بەبووکی تازەی یەك شەوەم کەهاتە سەر نەعشم
نەڵێ خۆی بۆ وەتەن کوشت و لەرێی عەشقی پاکی منا نەژیا
وەزیفەم بوو لەپێناو وڵاتێکدا سەرم بەخشم
کەتۆی پەروەردەکرد لەدامێنی چیاو کەژیا
عاشقی چاوی کەژاڵ و گەردنی پڕ خاڵی نیم
عاشقی تەلارو بەندەنم مەردم ئەمن
قەد لەدەست ئەم چەرخە سپڵەیە نابەزم مەردم ئەمن...تد.

تەنانەت کەسایەتی نیشتمانپەروەری ئەو تاکانە لەبەرامبەر دوژمندا ئەوەندە بەهێزە، هەمیشە سووربووە لەسەر نیشتمانپەوەری و خۆ رادەست نەکردن و هەڵبژاردنی ژیانی کولەمەرگی و بێ دەرەتانی و هەڵبژاردنی ژیانی ئاوارەیی و دەردەسەری.

وێرای چەوساندنەوەی نەتەوایەتی و نیشتمانی، کەدووچاری تاك دەبێت و سایکۆلۆژیەتی بەرەنگاربوونەوەی لەلادەخولقێت، چەوساندنەوەی چینایەتی و رەگەزەپەرستی کەدووچاری زۆر لەگەلانی گەردوون بووە، بەرەنگاربوونەوەی لەگیانی ئەوانیشدا دروستکردووە، لەوانەش رەشپێستەکانی ئەفریکیا کەبەدەستی رژێمی پریتوریای رەگەز پەرستەوە دەناڵێنن، بەرەنگاربونەوەیەکی لەگیانی ئەو تاکانەدا دروستکردوو کەسانی وەکو نیلسون ماندیلای هێنایە سەر شانۆ، کەئەمیش درێژەپێدەری روبەروبوونەوەکانی مێژووی چینایەتی بوو، هەر لەسەردەمی ئیمپراتوریەتی رۆمانی کەبووە هۆی هەڵگیرسانی شۆڕشی کۆیلەکان بەرێبەرایەتی سپارتاکۆس هەر هەمان چەوساندنەوەیە، بەڵام لەسەر شێوەی نەتەوایەتی شۆڕشەکانی کوردی هەڵگیرسان، هەروەها چەوسانەوەی نەتەوایەتی و ئاینی دووچاری زۆر لەگەلانی جیهان بووە، ئەگەر بۆ زەوتکردنی ئابوری بووبێ، یان بۆداگیرکردنی نیشتمان، ئەوا بەرپەرچێکی نەستیانە لەناخی قوربانیاندا دروستکردووە، ئەگەر نەیانتوانیبێ دەستبەجێ وەڵامی داگیرکەران بدەنەوە، لەئاکامی ئەوەشدا یەکێتیەکی دەروونی لەگیانی نەتەوەو ئاشتیخوازو ئەو گەل و کۆمەڵاندا دروستبووە، هەر بەو شێوەیەش ژینگەیەکی دەروونی بەرپەرچدەرەوە لەگیانی تاکەکاندا دروست دەبێت، کەهەمیشە ئەو تاکانە یەك خەون دەبینن، ئەویش رزگارکردنی نیشتمانەو شەکانەوەی ئاڵاکەیەتی، نیشانەی بڵاوبوونەوەی ئەو ژینگە دەروونیە لای هەموو خەڵکیش ئەوەیە، کە زۆر لەخێزانەکانی ئەو نەتەوەیە ناوی منداڵەکانیان بەناوی شۆڕشگێرو سەرکردە رزگاریخوازەکانیان دەنێن و هەندێجاریش گیانی توڕەیی پاڵیان پێوە دەنێت ناوی نەشیاوو بەباری دەروونی لەمنداڵەکانیان بنێن وەکو رێگرو جەنگاوەرو سەربازو هەڵمەت و سەنگەرو جەنگی و ...تد، ئەو خەونە بۆتە بویەرێك کەناوەو دەرەوەی ئەو تاکانە یەك دەخات و بۆشایی نێوان هەست و نەست زۆر کەم دەبێتەوە، کەهەموو تاکێکی ئەو گەلە یان ئەو نەتەوەیەی پێ جیادەکرێتەوە، ئەمەش نیشانەی ئەوەیە هەر هەموو بەدەستی ئازارێکەوە دەناڵێنن کەچەوساندنەوەی نەتەوەییە، بۆیە هەر تاکێك لەو تاکانە دەکەونە مەترسیەوە، خۆڕسکانە یەکدەگرنەوە.

ئەو ماوەیەی کەکەسێتیەکی شۆڕشگێڕی تورە دەگوازێتەوە بۆ کەسایەتیەکی شارستانی گەلێ زۆرە، چونکە باری دەروونی کەسێك کەحزبێك یان کۆمەڵێك پێکدێنن، بەشێوەیەکی پلەبەندی و نەوە لەدوای نەوە گەشەدەکات، کەئەمیش پاشکۆی ژێرخانە کۆمەڵایەتیەکەیە، جگە لەباری رۆشنبیری و کۆمەڵایەتی خێزان کەجیاوازی لەنێوان تاکەکان دروست دەکات، تاك جلەوی رامیاری یان کارگێڕی دەگرێتە دەست، یان لەپێگەی ململانێی حزبایەتیدایە لەگەڵ کەسێکی تردا، یان لایەنێکی تردا، ئەوا ئەنگێزە هەستی و نەستیەکانی ئەو کەسە بزوێنەری رەفتاری ئەو کەسەن، بەتایبەتی لەولاتانی رۆژهەلات کەچەسپاندنی حەزو ئارەزووەکانی خۆی بەشێك لەژیانی گرتۆتەوە، ئێستاش ماف و بیروڕای خەلکانی تر بەڕەواو پەسەند دەزانێت و بانگەشەی پێکەوە ژیان دەکات لەگەلیاندا.

ماوەی نێوان هەست و نەستی تاك لەچینەکانی ژێرەوە تا کەم بێتەوە ئەوە دەگەیەنێ کەوشیاری دیموکراتی بوونی هەیە، ئەگەر گۆڕەپانی دیموکراتی والا بێت، ئەوا دەبێ تاکەکانی چینی ژێرەوەش بگرێتەوە، چونکە ئەوانە دەبنە پێوەر بۆ دیموکراسیەت لەو کۆمەڵگەیەدا، واتە بەدیموکراتیەتی ئەو کەسانە دەزانین دیموکراتیەت چەند هەنگاوی ناوەو بوونی هەیە، چونکە ئەو تاکە سادانە زۆرترین کاتیان دەوێ بۆ هەرسکردنی رەفتاری دیموکراسی بۆیە بۆ هەڵسەنگاندن و لێکۆڵینەوە دەبێ لەوانەوە دەست پێ بکەین هەروەکو کۆمەڵناسان جەختیان لەسەر کردۆتەوە.

ئەو ماوەیەی کەلەنێوان هەست و نەستیاندایە واتە ئەو ماوەیەی کەمرۆڤ دەگوازێتەوە لەگیاندارێکی سۆزداریەوە بۆ گیاندارێکی عەقلانی تر کەعەقڵ و هۆش دادوەری بڕیارەکانی بێ، نەك حەزو ئارەزوەکانی ژێرەوە کەلەنەستەوە سەرهەڵدەدەن، وەکو حەز لەزاڵبوون یان لەدەسەلات، جگە لەبارە دەرونیە رووتەکانی کەسێك بۆماوەی کۆمەڵایەتیش کەلەخێزانێکەوە بۆ خێزانێکی ترو لەدەوربەرێکی نالەبارو شەڕو ئاژاوە دەژیت، کاریگەری هەیە لەسەر چۆنێتی بیرکردنەوەی ئەو کەسە، واتە سروشتی مرۆڤ و ئەو سروشتە کۆمەڵایەتیەی تێیدا ژیاوە رۆڵی خۆی هەیە، لەدروستکردنی بۆچونەکانی سەبارەت بەدیموکراتیەت، لەهەمانکاتدا پێویستییە بنەڕەتیەکانی مرۆڤ لەخۆراك و حەوانەوەو نیشتەجێبوون کە زانا ماسلۆ خاوەنی تیۆری پێویستیەکانە ئاماژەی پێداوە، دەڵێت تا ئەو پێویستیانە تێر نەبن یان نیوە تێر نەبن مرۆڤ ناچێتە قۆناغی ئارامی دەرونی و ناتوانێ بیر لەئازادی و دیموکراتی بکاتەوە، چونکە دۆخە هەڵچوونەکانی مرۆڤ زیاد دەکات، ئەمیش بەرەو نەست پەلکێشی دەکات و لەرەفتاری

ناوەزەی رامیاری و دیموکراسی دوور دەکەوێتەوەو بۆچونەکانیشی بەرامبەر شارستانیەت و جیهانگیری دەگۆڕێت.

دەبێ ئاماژەش بەوە بکەین کەقۆناغی بڵاوکردنەوەی هزری دیموکراسیەت لەکوردستاندا هاوکات بوو لەگەڵ ئابڵۆقەی ئابوری و دەرهاویشتە نەرێیەکانی و گرفتەکانی نەوەدەکانی سەدەی بیست، بۆیە شتێکی ئاساییە، هەڵسوکەوت و رەفتاری دیموکراسیانە هەرس نەکرێ، چونکە وەکو گرێدانی دیموکراتیەت و ئازادی بیروڕا لەگەڵ ئابڵۆقەی ئابوری وای بەخەڵکی سادەو هەژار پیشاندا، یان بەشێوەیەك لەنەستیاندا چەکەرەی کرد، کەدیموکراتیەت زۆر تاڵ و ترشی لەگەڵدا دەبێت و ئەو تاڵ و ترشیە گەورەتر دەبێت لەخودی دیموکراتی، وەکو قەیرانی نیشتەجێ و نەبوونی ئارامی و ئاسایش و پێکدادانی هەندێ بەهاو دابونەریتی گوندو شار، سەرباری ئەوەش هیچ قەوارەیەکی رامیاری سەربەخۆ یان نیمچە سەربەخۆ لەئارادا نەبێت، یان هەنگاوی بۆ نەنرێت، بەم شێوەیەش ئەرکی پاراستنی نەتەوەیی کارێکی ستەم دەبێت، چونکە دەبێ گیانی بەرەنگاربوونەوە لەتاکی کورددا دروست بێت، واتە بتوانێ هەموو کاتێك هیچ نەبێ بەتوڕەیی و گوڕوتین و رکوکینەش بێ بەرپەرچی دوژمنانی بداتەوە، ئەم بەرەنگاربونەوەیەش گەوهەری ناوەڕۆکی گیانی نەتەوەییە، بەپێچەوانەشەوە لەبارێکی نەزۆك و چەقیوو لەدەوروبەی خۆماندا دەسوڕێتەوە، لەئەنجامی بارگرژی و هەڵچوونە سایکۆرامیاریەکانی نێوان هەست و بویەرو نەستی هیواخوازی ماوەی نێوان رەفتاری دیموکراتی و شارستانیە، وەکو لەجێبەجێکردن دوور دەکەوێتەوە، واتە ئەو بانگەشەیەیە بۆی دەکرێت، وەکو دروشمی حزبێك یان رێکخراوێك، سەبارەت بەخۆگونجاندن و شارستانیەت گەلێ دوورەو زۆری ماوە بۆ بەرجەستەکردنیان، چونکە تاکەکان کەکۆمەڵ یان نەتەوە پێکدێنن، هەوڵدەدەن خودی خۆیان رازی بکەن لەنێوان ململانێکانی خۆیان و پێداویستەیکانی گەردوونگەرایی، کەئەوە دەخوازێت مرۆڤ بتوانێت گیانی هەرەوەزی هەبێت و لەهاریکاری نێودەوڵەتی بەشدار بێت، چ وەکو نەتەوە چ وەکو حزب و لایەن، لەمبارەیەشەوە پێویستە لەئاوازی جەنگی ساردو بیروباوەڕخوازی دوور کەوێتەوە، چونکە گۆڕانکاریەکانی ژیان خێرایەو، ئەوەی دوێنێ پەسەند نەبووە، بەپێچەوانەشەوە راستە، ئەمەش هاوتەریبە لەگەڵ هاوکێشەی (بەرژەوەندی-بەرژەوەندی) بۆ ئەوەی شوێنی هاوکێشەی (دەستبەسەرداگرتن-ملکەچبوون) بگرێتەوە، واتە بەرژەوەدی گۆڕینەوەو رەچاوکردنی ستراتیژیەتی نەتەوەیی بەتایبەتیش بۆ نەتەوە ژێردەستەکانی وەکو کورد سیمای سەردەمی جیهانگەراییە.

ئەم هاوكێشەیەش توانەوەی بەستەڵەكی ئەو دیوارە دەرونیەیەو عەقڵیەتی نەگۆڕی پێ جیادەكرێتەوە، كەلەسەر تیشكی رابردوو و لایەنە نەرێیەكانی سەردەمی پەڵهاویشتن و فراوانخوازی بەرِیوەدەچن، نابێ ئەوەشمان لەبیر بچێت كەكوردستان زۆرجار لەمێژوودا ئێستاشی لەگەڵدا بێ گۆرەپانی شەڕ و یەكلاكەرەوەی حەساباتی داگیركاران بووە، وێرای پەیوەندیەكانی دەرەبەگایەتی و تایەفەگەری و شەڕەكانی ناوخۆو نەبونی قەوارەیەكی رامیاری و نامۆبونی دانیشتوان گومانیشی تێدا نییە، شەڕوشۆڕ و ململانێی تایەفەگەری و حزبایەتی ناتەندرووست شوێنەوارو ئاكامی خراپی لێدەكەوێتەوە لەدابەشكردنی كلتورو جوگرافیاو بەرِێوەبردن و وتاری سیاسی، لەوانەش گرنگتر هەستی نامۆبوون لای تاكەكان و نەمانی متمانەو رەشبینی بەرامبەر كێشە نەتەوەییەكانی وەكو خاك وئاو (كەركوك و خانەقین و...) .

كۆچكردنی لاوانیش وەنەبێ هەستێكی تازە بێت، بەڵكو حەزو ئارەزوویەكی لەمێژینەی لاوانی كوردستان بووە، بەڵام دوای راپەرِین پتر رێی بۆخۆش بووە، مرۆڤیش كەكۆچی كرد، واتە كۆمەڵێ رێورەسم و دابونەریت و بەهاو ئاكارەكانی كۆمەڵایەتی بەجێ دێڵێت، دەچێت ناو كۆمەڵێ دابونەریتی نوێ و زیاتر نامۆبوونی تاكەكان، سەرباری ئەوانەش مۆركی نەتەوایەتی خۆیان لەدەست نادەن، چونكە هەر ئەو كێشە نەتەوایەتیە بووە حەزی دەربازبوونی بندەستی داگیركەران كەلەكەسایەتیاندا چێندراوە، ئەوەش جۆرێكە لەرەسەنایەتی و پەرتەوازەنەبوونی ئەو تاكانە، شەرِی ناوخۆو براكوژی كەئازادی و دیموكراسیەتی خستە ژێر هەرِەشەوە فاكتەرێكی نەرێنی بوو لەنەرِەوینەوەی شوێنەواری پەروەردەی داگیركەران و رەخساندنی كەسایەتیەكی سەربەخۆ، لەناخیشەوە تاكی كورد كەهەمیشە سەرقاڵی ئابوری كشتوكاڵی بووە كەگیانی هەرەوەزی و كۆمەڵایەتی دەنوێنێ دژی شەرِو شۆرِ بووە، بەڵام داگیركەران وایان بۆ رەخساندنووە شەڕوشۆڕ لەنزیكیانەوە هەبێت و تیشكی ئاگرەكەی بەر ئەمانیش بكەوێت.

بۆیە دەبینین لاوانی كورد لەوڵاتی خۆیاندا میوانن و جانتای سەفەریان بەدەستەوەیەو هەستی نامۆبوون و ئاوارەیی لەناخیاندا چەكەرەی كردووە، كە چ وەكو توێژ چ وەكو قۆناغی تەمەن دووچاری نەهامەتی دەستی داگیركەران بوونە، بۆ ماوەیەكی دورودرێژو هەمیشە لەدەروازەیەك گەرِاون ئارامی تێدا بدۆزنەوە، وێرای خۆبەختكردنیان بەدرێژایی مێژووی میللەتەكەیان.

## راگواستن:

**کۆچکردنی دانیشتوان لەلادێوە بۆ شار پەرەسەندنی کۆمەڵایەتیە، بەڵام راگواستنی زۆرە ملیێ قەیران دەخولقێنێت و پێکدادانی بەهاکانی لێدەکەوێتەوە.**

کۆچکردن لەلادێوە بەرەو شار دیاردەیەکی ئیکۆنۆمی کۆمەڵایەتی حەتمیە لەئەنجامی پەرەسەندنی مێژوویی هۆیەکانی بەرهەمهێنان سەرهەڵدەدات، کەدەبێتەهۆی گۆڕانی وشیاری کۆمەڵایەتی و ئامادەباشی دانیشتوان و ئارەزووی لەگەڵدایە، واتە ئارەزوویەك هەیە بۆ هەڵبژاردنی گوزەرانی شار بۆیە بێ نەخشەو پلان نییە، کەبێ نەخشەو پلانیش نەبوو، ئیدی دانیشتوان دووچاری گرفتی نیشتەجێ بوون و ناکۆکی بەهاو پێوەرە کۆمەڵایەتیەکان نابنەوە، بەپێچەوانەوە بەشێوەی راگواستنی زۆرەملێی پتر دووچاری ئەو گرفتانە دەبنەوە چونکە کۆچکردنی ئاسایی و سروشتی خەڵك لەئەنجامی کارلێککردنی کۆمەڵایەتی لەگەڵ دانیشتوانی شاردا دەتوێنەوە، بەڵام کۆچکپێکردنی زۆرەملیی لادێکان و راگواستنیان دانیشتوانەکەی دووچاری گرفتی نیشتەجێ و ئاو کارەباو خزمەتگوزاریەکان و رووبەرووبونەوەی بەها جیاوازەکانی کۆمەڵایەتی دەکاتەوەو رەوشی نالەباری دەروونیان لەلادرووست دەکات.

دانیشتوانی راگوازراوی سەدان گوند بەرەو شارەکان لەبەهاو رەوشتیاندا جیاوازییان هەبووە، سەرەڕای جیاوازی ئەوان لەگەڵ دانیشتوانی شارەکان کەئەوانە کێشمەکێش (ململانێ) ی بەها کۆمەڵایەتیەکان دروستی دەکەن.

بەها کۆمەڵایەتیەکانی شارو لادێ هەندێکیان پاڵ بەهەندێکی تریانەوە دەنێن، منداڵان و مێردمنداڵانیش دەکەونە نێوان ئەو دوو جیهانەوە، جیهانی بەهاو دابونەریتی دەرەوەی شارو جیهانی یاسا کۆمەڵایەتیەکانی شار، بەشێوەیەکیش پێویستە رەفتار بکەن بەلانی کەمەوە نەبنە گرفت و ئاریشە بۆ ئەوانی تر، چونکە بەئارەزووی خۆی و لەسەر رەوتی پێوەرە کۆنەکە یان باوەکەی خۆیان ململانێ لەگەڵ بەهاکانی شاردا دروستدەکەن و ئەوژی دەبێتەهۆی چێکردنی هەستی نامۆبوون و رووبەروبوونەوە، بەتایبەتی کەکاتی ڤاڵا زۆرەو جیاوازە لەکات بەسەربردنی لادێ کەبەخێزانەوە سەرقاڵی کشتوکاڵ و ئاژەڵ بەخێوکردن بوونە، لەوەش گرنگتر دانیشتوانی گوندەکان بەپێچەوانەی شارەکانەوە دانیشتوانیان کەمترەو هەمووان یەکتر دەناسن و کەمتر پەیوەندی کۆمەڵایەتی بەهێزترە کەئەمیش رێگرە لەبەردەم روودانی رەفتارگەلێك لەلایەن تاکەوە کەرەنگە لەشار روودات، رەنگە هەندێ جاریش هەست بەڤاڵایی نەکەن، چونکە کاتی ئیش وپشودان تێکەڵەو هەستی پێناکرێت.

وێڕای ئەوەی کەرووبەرێکی فراوانیان بەدەستەوە بووە کەچاودێری خێزان و بەها کۆمەڵایەتیەکانی کاراتر کردووە لەرووی رەفتاری تاکەکانەوە، لەگەڵ راگواستنی ئەوانەو هاتنیان بەرەو شارەکان پیشەو ئەو خەڵکەی لەگەڵیاندا راهاتبوون لەدەستدا، هاوکات گوزەرانی شاریش گرانترەو خۆگونجاندنی دەروونی و کۆمەڵایەتی و قیەمی دەوێ.

سەبارەت بەمێرد منداڵانیش کوچەو کۆڵانەکان تەسکترن و جموجوڵێکی کەمتر دەخوازێت و بەهاکانیش جیاوازن، لەئاکامدا کەسایەتی پەراوێزەیی (الشخصیە الهامشیە) دروست دەبێت، لەکاتێکدا هۆیەکان و کەلوپەلەکان لەشاردا زۆرترو قەرەباڵغتر حەزو ئارەزوەکان زیاتر دەجولێن، ئەو کەسانەش لەپێش چاونین شەرمیان لێبکات، جگە لە فشارو گرفتەکانی تری وەکو نیشتەجێبوون و کەمی ئەو رووبەرەی ئێستا لەسەری دەژی.

لەئەنجامی ئەوانە مێردمنداڵان رووبەروی کۆمەڵێ مێردمنداڵی شار دەبنەوە لە رێی قوتابخانەکان بێت یان لە رێی بازاڕو کۆڵانەکان، کە شتی نوێی چاوەڕواننەکراو دێتەپێشی لەوانەیە زەبری دەروونی لەلا دروستبکات و پاشان نائومێدی و نامۆبوون باڵ بەسەریدا

دەکێشێت و هەست بەبوونی خۆی ناکات، یان ڕێزی لێناگیرێ، لەئاکامدا بۆ ئەوەی سەرنجی دەوروبەر رابکێشێ گفتوگۆی توندوتیژ لەگەڵ کۆمەڵی نوێ سازدەدات، بۆئەوەی بچێتە ناویان و دانیپێدابنێن و بوونی کەسێتی خۆی بسەلمێنێت گرنگیش نییە ئەو بوونە ئەرێنی بێت یان نەرێنی، ترازانی کۆمەڵایەتی پەیوەندی بەراگواستنی خێراو بەکۆمەڵ هەیە، چونکە بەهۆیەوە دانیشتوانێکی زۆر لەگەڕەکە میللیەکان کۆدەبنەوەو ئەمیش دەبێتەهۆی خڕبوونەوەی زۆر لەدابوونەریتەکان و رووبەرووبونەوەیان لەگەڵ یەکتردا، کەقەیرانێکی کۆمەڵایەتی و رەوشتی دروست دەکات، بەهۆی خڕبوونەوەی ئەو ژمارە زۆرەی دانیشتوان و مێردمنداڵان گوێ نادەنە خەڵکی ترو بەلایانەوە گرنگ نییە بەها کۆمەڵایەتیەکان پێشێل بکەن، چونکە ناناسرێن و لێیان ناپێچنەوە.

سەرەڕای ئەوەی کەهێشتا لەقۆناغی گەشەو جێگیر نەبووندان، پاشان فێری ئەو هەڵسوکەوتە دەبن و دەستبەرداری نابن، جگە لەوە لەپێش چاوی کەسوکاریان دوورن و دەسبەجێ سزا نادرێن، ئەمەش رێخۆشکەرێکە بۆ ترازانی کۆمەڵایەتی.

بەو شێوەیە ئەو دیاردە بزێو و لاسارانە تەشەنە دەکات و پێویستی بەچارسەر دەبێت، بۆ کەمکردنەوەی رووبەرووبونەوەی کۆمەڵایەتی و لادانی کۆمەڵایەتی، بۆئەوەی فشار لەسەر شارەکان کەمبێتەوەو قەرەباڵغی کوچەو کۆڵانەکانیش سووکبکرێن، ئەمیش بەدانانی بەرنامەیەکی نیشتەجێبوون و هۆیەکانی ژیان و گوزەرانی لادێکان بڕەخسێ، رێ بۆ هاندانی گەڕانەوەی لادێنشینەکان و کردنەوەی کارگەی گونجاو لەنزیك گوندەکان بۆ سەرقاڵکردنی خەڵکەکەی خۆشبکرێ، نابێ ئەوەش لەیادبکرێ کەلادێنشینەکانیش تاموچێژیان لەگوزەرانی شار وەرگرتووەو لەسەری راهاتوون و سەرەڕای ئەوەش خودی گلۆبالیزم جیاوازی ئەوتۆی لەنێوان شارو لادی نەهێشتووە کەئەوەی لەشاردا هەبێ لەتەکنۆلۆژیاو ئینتەرنێت و سەتەلایت و پێویستیە شارستانیەکانی سەردەم لە تەوالێت و گەرماوی رۆژاوایی و یاریگای منداڵان و سوپەرمارکێت و بنکە وەرزشی و هۆڵەکانی موزیك و جادەو بانی قیرتاوکراوو تا رادەیەك لەگوندەکانیش هەس، کەپێویستە ئەمانە زیاتر بگوازرێنەوە بۆ گوندەکان بۆ ئەوەی هەمان سیمای شاریان هەبێ و دانیشتوان لەسەنتەری شارەکان کۆنەبنەوەو هاوکات دانیشتوانی ئەو گوندانەش سەرقاڵی کشتوکاڵ و بەخێوکردنی ئاژەڵ بن لەسەر شێوازی مۆدێرن، کەئەگەر جوتیاریش گشتکاریی نەکات کەراهاتووە لەسەر گوزەرانی شارو چیتر دەستبەرداری نابێت

ئەوا کرێکاری زۆر هەیە لەکێڵگەی بەخێوکردنی ئاژەڵ کاربکات و بەروبوومی کشتوکاڵ و ئاژەڵیش بەرادەیك فەراهەم بکرێت پێویستمان بەهاوردەی دەرەکی نەبێت، بەهۆی ئاوەدانکردنەوەی گوندەکانی کوردستان و هاندانی گەڕانەوە بۆ لادێنشینی مۆدێرن رەنگە بتوانرێ ئاسایشی خۆراك بۆ دانیشتوان تارادەیەکی باش دابینبکرێ و لەوەش گرنگتر کەشوهەوای لادێنشینی بارێکی دەروونی ساغلەمتر بۆ تاکەکان درووست دەکات و لێکۆڵینەوەکانیش سەلماندوویانە قەرەباڵغی ناوشارەکان نەخۆشی دەروونی زیاتر لەخۆ دەگرێت، لەکوردستان خەڵکێکی زۆر دووچاری هێدمەی دەروونی و گرفت و کێشە دەرونیەکان بوونە کەدەکرێ ژینگەی لادێ نشین کایەو فەزایەکی وا بڕەخسێنێت لەو کێشەو گرفتانە کەم ببێتەوە بەتایبەتیش بۆ ناوچە داگیرکراوەکانی کوردستان لەکەرکوك و خانەقین و شەنگال و ئەوانی دیکەش کەخەڵکی ئەو ناوچانە کەئێستا لەشارەکانی هەولێرو سلێمانی و شارەکانی تر نیشتەجێن بەڵام ئەوان لاشعوریانە هەست بەدابڕان دەکەن و باجی ئاوارەیی و غوربەت دەدەن کەلەزێدی باوباپیرانی خۆیان دوورکەوتونەتەوە، ئەم هەستەش زیاتر لەکاتی بۆنە ناخۆشەکانی وەکو پرسەو نەخۆشی تیایاندا دەردەکەوێ کەپرسەو بۆنەکانیان ساردوسڕی پێوە دیارەو لەوکاتەشدا هەست بەغوربەت و نامۆیی زیاتر دەکەن و زۆر لەمردووەکانیشیان پێش مردنیان وەسیەتی ئەوە دەکەن بیانبەنەوە بۆ زێدی خۆیان بەخاکیان بسپێرن، ئەمە راستیەکی حاشاهەڵنەگری مرۆڤە لەهەر رەگەزێك و لەهەر ئاین و رەنگێك بێ، بۆیە هەست بەنامۆیی و غوربەت دەکەن، چونکە بۆنی خاکی شوێنی لەدایکبوون هەمیشە لەخەیاڵی تاکدایە،بیرەوەریەکانی منداڵیی هەمیشە لەیاددایە.

# رەفتاری سیاسی

**رەفتاری سیاسی رەنگدانەوەی باری دەروونیە کەئەمیش پەیوەندی بەنەستەوەهەیەو بەکردەوە لەکاری سیاسیدا دەردەکەوێ.**

کۆمەڵناسان دەڵێن رەفتاری سیاسی جۆرێکە لەرەفتاری کۆمەڵایەتی، بەو پێیەش کارو ململانێ سیاسی و حزبیەکانیش رەنگدانەوەی باری دەروونی و کەسێتی تاکە، کە ئەویش کوڕی کۆمەڵگاکەیەتی، رەفتاری دیموکراسیش وەك هەر جۆرە رەفتارێکی سایکۆسیاسی لای هەر حزب و رێکخراوێك و وەکو هەر چەمکێکی دیکەی سیاسی و ئایدۆلۆژی دووقۆناغ یان دوو لایەنی هەیە، لایەنێکی تیۆرییە کەدیاریکردنی پرەنسیبەکان و رۆشنبیری و پڕوپاگەندەی دیموکراسیەتە، کەئەو حزب و رێکخراوانە هەریەکەیان بەشێوەیەك بڵاوی دەکەنەوە، لایەنی دووەمیش پراکتیزەکردنێتی کەکات و ساتێکی زۆرتری پێویستە بۆ بەرجەستەکردنی چوارچێوەی ناوەڕۆك و پەلوپۆی بیردۆزەکە، چونکە ئەو بەرجەستەکردنە لەوڵاتێکەوە بۆ وڵاتێکی دیکە بەپێی جیاوازی ژێرخان وسەرخانی کۆمەڵایەتی دەگۆڕێ، ئەو ماوەیەی کەلەنێوان تیۆرو پراکتیکدا دەبێ، واتە ئەو ماوەیەی کەکەسێك هەڵگری تیۆری دیموکراسیە تادەبێتە کەسێکی بەرەفتار دیموکراسی گەلێك زۆرە، چونکە باری دەرونی تاك کەئەم تاکانەش حزبێك یان کۆمەڵێك پێکدێنن بەشێوەی پلەبەندی و نەوە لەدوای نەوە گەشە دەکات،

کەئەمیش پاشکۆی ژێرخانە کۆمەڵایەتیەکەیە جگە لەباری رۆشنبیری و کۆمەڵایەتی خێزان کەجیاوازی لەنێوان تاکەکان درووست دەکات، لەمانەش گرنگتر کەدەبێتە دەروازەی سەرچاوەی رەفتاری تاك کاتێك ئەو تاکە جڵەوی کارێکی سیاسی یان ئیداری دەگرێتە ئەستۆ یان لەمەوقیعی ململانێی حزبایەتیدایە دگەڵ کەسێکیتر یان حزبێکی تردا، یان لەکاتی گوڕوتینی شۆڕشگێری و توندڕەوی حزبایەتی دا هەڵسوکەوت دەکات پاڵنەرە هەستی ونەستیەکان بزوێنەری رەفتاری ئەو کەسەن یان بەلانی کەمەوە رۆڵی کاریگەریان هەیە لەسەر ئەو رەفتارانە، ماوەی نێوان هەست و نەستی کەسێك با ئەو کەسەش لەتوێژێکی زۆر سادەش بێ مەبەست لەتوێژی سادەش کەلەنزمترین ئاستی بژێوی و رۆشنبیری و کۆمەڵایەتی و ژیاریدا بێ، چونکە گۆڕەپانی دیموکراسی ئەگەر والا بێت ئەو توێژانەش بگرێتەوە.

واتە ئەو ماوەیەی کەمرۆڤ دەگوێزێتەوە لەگیاندارێکی سۆزیاریەوە بۆگیاندارێکی عەقلانی بەستراوەتەوە بە رادەی ماڵیکردن (ترویچ) ی ئەو کەسە لەکۆمەڵدا، جگە لەبارە دەروونیە روتەکانی تاك، بۆماوەی کۆمەڵایەتی واتە سروشتی مرۆڤ و ئەو سروشتە کۆمەڵایەتیەی وەریگرتووە لەباوانەوە رۆڵی خۆی هەیە لەدروستبوونی بۆچوونەکانی سەبارەت بەژیان و چالاکییە کۆمەڵایەتیەکان لەوانەش تێڕوانینی بۆ دیموکراسیەت و مامەڵەکردنی لەگەڵ رای جیاواز.

هەروەها پێویستیە بنەڕەتیەکانی مرۆڤ لەخۆراك و پۆشاك و حەوانەوەو نوستن و سێکس و پێویستیە لاوەکیەکانیش وەکو دەروون ئارامی خۆشەویستی و ئینتیما، خود رەچاوکردن و خود بەدیهێنان، تاکو ئەم پێویستیانە یەك لەدوای یەك تێرنەبن یان نیوەتێر نەبن ئەوا مرۆڤ ناچێتەقۆناغی بەدیهێنانی کەسێتی و مرۆییانەی خودەوە، کەبتوانێ زیرەکی و توانای خۆی بخاتەگەڕو بیر لەئازادی و دیموکراسی بکاتەوە، بەڵکو زیاتر بەرەو حاڵەتە هەڵچوونی و نائاساییەکانی دەبات بەپێی خولیاو ئارەزووە سەرەتای و چەپێنراوەکانی رەفتار دەکات و لەلۆژیك دوور دەکەوێتەوەو بۆچوونەکانیشی سەبارەت بە دیموکراسیەت و ئازادیش دەگۆڕێ، ئەگەر باری سەرنج بدەینە رای گشتی خەڵکی کوردستان باس لەگەندەڵی و پاشماوەکانی شەڕی براکوژی دەکەن و بەشێوەی جیاواز گوزارشتی لێدەکەن، کەسەرسوڕمانی خۆیان لەدیموکراسیەت دەردەبڕن!چونکە لەسەرەتاوە ئابلۆقەی ئابووری و پڕوپاگەندەی دیموکراسیەت لەیەك کاتدا هاتنە ئاراوە، سروشتی مرۆڤیش ئاوایە کاتێ تووشی دوو شت پێکەوە دەبێتەوە ئەوا لەدوارۆژیشیدا یەکێکیان ئەوی دیکە وەبیردێنێتەوە هەروەکو لەبیردۆزی پەیوەندی مەرجداری

بافلۆفدا روونکراوەتەوە لەئەزموونی سەگەکەدا، کاتێ زەنگەکەی لێ دەدا لیکاوی دەڕژێ بێ ئەوەی خواردنیشی بۆدابنرێ، چونکە لەئەنجامی راهێنان لەسەر پێکەوە گرێدانی زەنگ و خواردنەکە سەگەکە لیکاوی دەهاتەوە، کاتێکیش زەنگەکەی بۆ لێدەدرا بێ خواردن، خواردنەکەی وەبیر دەهاتەوە دیسان لیکاوهاتنەوە دەستی پێدەکردەوە.

کاتێ باس لەحکومەتی ناوەند دەکرێت مرۆڤ واهەست دەکات سەردەمی دیکتاتۆریەتەو تاك دەخاتە حاڵەتی ترس و ئامادەباشیەوە، هەروەها کاتێك باسی دیموکراسی فرەحزبی و ئابلۆقەی ئابوری پێکەوە کەوتنە سەر زمان سەرەڕای رامالینی دیکتاتۆریەت، ئەو ئابلۆقە ئابوریەی دوو لایەنە کارێکی زۆری کردە سەر خەڵك، چونکە تاکو خەڵکی برسی بن و کەمترین رادەی تێرکردنیان نەبێ ئەوا ناتوانن بیر لەئازادی و دیموکراسی بکەنەوەو لەبارێکی چەقبەستوو بەدەوری خۆیدا دەمێننەوەو دەکەونە بارگرژی و هەڵچوونی دەرونیەوە بەمەش ماوەی نێوان هەست ونەست گەورەتر دەبێت بەقازانجی نەست، لەئاکامی ئەمەشدا ماوەی نێوان دیموکراسیەت وەکو رەفتار گەورە دەبێت واتە ئەوەی بانگەشەی بۆ دەکرێت وەکو دروشمی سیاسی حزبێك یان رێکخراوێك سەبارەت بە دیموکراسیەت گەلێ دورەو زۆری ماوە بەرەو بەرجەستە بوون بڕوات، هەمان کێشە دووچاری مارکسیەکان دەبۆوە کاتێك وەك فەلسەفە باسیان لەمارکسیەت دەکرد بۆ خەڵك، ئەو خەڵکە دەسبەجێ باسیان لەوە دەکرد کە چۆن لەواقیعدا جێ بەجێ دەکرێت و دەیانوت و لەگەڵ واقیعی کۆمەڵایەتیدا ناگونجێ چونکە پاساویشیان بۆئەمە بەپیشەسازی نەبوونی عێراق بوو وەك وڵاتانی ئەوروپاو وڵاتانی دیکەی جیهان، ئەم ناکۆکیە لەرەفتاری تاکو کۆمەڵ رەنگی دەدایەوە.

لەململانێی نێوان پاڵنەرە نەستیەکان کە (ئەو-الهو) و فشاری منی باڵا (الانا الاعلی) و درووستبونی ویژدان، ئەم ویژدانەش لەئەنجامی دەسەلات و پەروەردەی کۆمەڵایەتی و ئاینی لەنەستدا دروست دەبێت و فشار دەخاتە سەر من (الانا) کەواقیعیانە ئاگاداری ئەو (الهو) بێت و زیادەرۆیی نەکات، ئەو ململانێیە تا بەهێز بێت لەقازانجی نەستدایە واتا تای تەرازووەکە بەلای ئەودا دەشکێتەوەو رەفتارو هەڵسوکەوتی ئەو تاکە نالۆژیکیانەو ناژیرانەتر دەبێت چونکە تاکیش وەکو فرۆید دەڵێ زیاتر مەیلی بەرەو بنەمای چێژە نەك بنەمای واقیع چونکە بنەمای یەکەم زیاتر تاموچێژ بەتاك دەبەخشێت ئەم حاڵەتەش زیاتر مەیلی نەستەو لەوکاتانەدا دەردەکەوێت کەدوو رای سیاسی جیاواز یان دژ بەیەك لەململانێدا بن هەریەکەو

دەمارگیریانە پێ لەسەر رای خۆی دادەگرێ، ئەگەر هەستیشی کرد راکەی ناپەسەندە تادەگاتە توڕەبون و هەڵچوون زیاتر سوردەبێ لەسەر ئەو رایە کورد واتەنی بشفرێ بزنە، هەر ئەم جۆرە دەمارگیرییە دەروونیانەشە دەبێتە مایەیە ناکۆکی و شەڕو کوشتارو نەسازانی سیاسی، ئیتر حەز لەزاڵبوون یان حەز لەدەسەڵات لەو جۆرە ململانێیانە رەنگ دەداتەوە ئەگەر لەناو یەك رێکخراویشدا بێ، ئەم جۆرە حاڵەتانە رەنگە بگاتە چاو لەیەك سورکردنەوەو زەبرز زەنگیش تا بەناو کۆمەڵ و دامودەزگا پەروەردەییەکانیش، بگرە رەفتاری نالۆژیکیانەو دوور لەنەریتی سیاسی باوی ناو کۆڕو کۆمەڵی سیاسی، چونکە لەپاڵنەرە نەستیەکانەوە کەهەستی پێناکرێ سەرچاوە هەڵئەگرێ، رەنگە لەمیدیاشدا رەنگ بداتەوە وەکو شەڕەجوێن و توانج و پلاری سیاسی و تەنانەت کۆمەڵایەتیش لەدواجاریشدا بڵاوبونەوەی لەناو توێژەکانی کۆمەڵدا ئەمەش رەفتاری نادیموکراسییانەو نامەدەنیانەیەو نەرێیانە کارلە گەشەی دیموکراسی دەکات.

لێرەوە پاڵنەرە نەستیەکان زاڵترن لەحوکمی لۆژیك، چونکە مامەڵە لەگەڵ پەروەردەی دیموکراسیانەو چەکەرەکردنی گیانی دیموکراسی وەلانراوەو مرۆڤ لەقۆناغی ناوشیاری دەمێنێتەوەو واهەست دەکات، کە هەموو شتێك دەزانێ کەهۆکارەکەی دەمارگیری و خۆبەپەسەند زانینە، چونکە ژینگەیەکی تایبەت بەخۆی دروست دەکات ئەمەش تێکچوونی باری دەرونێتی، یان لەژینگەیەکی حزبایەتی تەسکدا دەژی ئەمیش ئەو کەسە دەگەیەنێتە لایەنگیری کوێرانەی رای کەسێکی سیاسی یان حزبێك بێ ئەوەی لێکبدرێتەوە، ئەمەش دەبێتە سەرەتایەك بۆچاندنی گیانی دەمارگیری حزبایەتی و پەسەندنەکردنی بیرو هزری بەرهەڵستکارو بەڵکو دژایەتیکردنیشی، ئەمیش مەیلی تاکڕەوانەیەو وردە وردە دەچەسپێ بێ ئەوەی هەستی پێبکرێ و بەشێوەی نهێنیش هەوڵ دەدرێ بۆلەناوبردنی کەسانی لای دووەمی ململانێ یان کەسانی هەمان لا کەلەململانێدان لە نێوخۆیاندا لەسەر شێوەی تیرۆری سیاسی یان نەخشەی سیاسی گلاو و شەڕی ناوخۆ و نەبوونی وتاری یەکگرتووی نەتەوەیی، هەر ئەم حاڵەتە هەڵچونیانە ماوە نادەن پرەنسیبەکانی دیموکراسیەت لەگیانی خەڵکیدا بچەسپێنن و فشار دەخەنەسەر کەسانی ئاشتیخوازو و بخوازی دیموکراسی بۆئەوەی لەواقیع رابکەن و باری گرژی و نائارامی بمێنێ و پەرەبسێنێ و رەتنەکردنەوەی رای خۆسەپێن یان لەبەر ترس یان لەبەر خۆشەویستی ئەمەش خۆی لەخۆیدا پەسەندنەکردنی نەستیانەی خۆسەپاندنە بۆ بەرژەوەندی

خودی و مانەوەی پایەوپلەو تەکامولبوونی هەردوولا بەیەکتر واتە لای خۆسەپێن و ملکەچبوو کەپەسەندکەرو قبولکردنی رای خۆسەپێنە.

هەردوولا (خۆسەپین_ملکەچبوو) دەگەنە حاڵەتی تێربوون لەحەزەنەستیەکانیان بەرامبەر بەیەکتری، یەکەمیان دەستبەسەرداگرتنە بۆی دێتەدی، دووەمیان پەسەنکردنی نەستیانەی ئەو دەستبەسەرگرتنەیە، رەنگەلەسەر شێوەی ریاییکردن و چەندەها جۆری تر بێت، ئەم حاڵەتە بەئەسپایی دەچەسپێن و بەرەردەوامی کاریان پێدەکرێ تادەگەنە دیکتاتۆریەت و تاکڕەوی، ئەگینا هیچ رژێمێکی دیکتاتۆری لەجیهاندا دروشمی دیکتاتۆری بەرزنەکردۆتەوە لەدژی خەڵکیدا بەڵکو کاری دیکتاتۆریانە هەر بەم شێوەیە خۆی سەپاندووە لەرووی دەرونیەوە، هەموو حزبێك یان هەموو رژێمێك دروشمی باشو گونجاو بۆخۆی بەرزدەکاتەوەو لەدواجاریشدا رژێمێکی دیکتاتۆری لەدایك دەبێ کەپێشتریش بەساوایی لەناو کۆمەڵانی خەڵکدا دەژیا، بەڵام لەبەر رەفتاری چەواشەیی و دیموگۆجیانەی ئەو حزب و رژێمانە خەڵکی چەواشە بوونەو چاوپۆشیان لەهەڵەو کەم وکورتییەکانیان کردووە لەسەر شێوەی گەندەڵی و هاوشێوەکانی چونکە نەتوانراوە دەستبەجێ بەرچەرچ بدرێنەوە لەبەر بەرژەوەندی تاکەکەسی و رێزو ترسی مەکیافیلیانەی کەسانی بەرزتر کەدەبنەپەردەیەك بۆ نەدیتنی نەستیانەی بەرامبەر کەمکوریەکانیان، راستیەکانیش کەپێویست بوو بوترێن لەسەر شێوەی رەخنەو رەخنە لەخۆگرتن دواخران و کاریان پێنەکراوە.

زانای دەروونناسی ئەمریکایی ئەلپۆرت سەبارەت بەکاری پەروەردەیی دەروونی دەڵێ: زۆربەی ئەو حەزو مەیلانەی کەمرۆڤ وەریان دەگرێ لەئەنجامی کاری نێوان تاك و دەوروبەر دەبنە پاڵنەر لەنەستی ئەو کەسەداو مرۆڤیش لەهەموو قۆناغێك لەقۆناغەکانی گەشەدا هەندێ بیروبۆچوون و دابونەریت کەتووشی دەبن لەرێگەی کۆمەڵەوە دەبنە پاڵنەرو دەچنە نەستەوە کەپێشتر بوونیان نەبووە لەوکەسەدا، ئەو کەسە دەیتوانی شێوەیەکی تر بێت لەئەنجامی چالاکی کۆمەڵایەتی و لەگەڵ دەوروبەردا، هەر بەم شێوەیەش پەروەردەی دیموکراسی کاری خۆی هەیە لەدروستکردنی مەیلی دیموکراسی و ئاشتی وپاراستنی مافی مرۆڤ و بیرکردنەوەی لۆژیکیانەو پێکەوە ژیانی ئاشتیانە لەم روانگەیەشەوە پەروەردەی دیموکراسیانە بەشێوەیەك جێ پێیی خۆی دەکاتەوە کە پڕوپاگەندە هەنگاو نان بەرەو چەسپاندنی رەفتاری پێدەکرێ، یان بەرژەوەندی تاك یان کۆمەڵی تیا حەشار درابێ، چونکە کۆمەڵ سەبارەت بە

هەرسكردنی پرەنسیبەكانی دیموكراسیەت و هەر سیاسەتێكی تری نهێنی و ئاشكرا وەكو مندالْ وایە سەرەتاكانی تەمەنی زیاتر لەهەر قۆناغێكی تری تەمەنی گوێڕایەلی دەبیٚ و دەكەوێتەژێر كاری پەروەدەی (كۆمەلاٚیەتی سیاسی رۆشنبیری..تد) و سازو ئامادەیە بۆ لەباوەش گرتنی ناوەڕۆكی راستەقینەی دیموكراسی كەپێی ئاشنا دەبیٚ بەدوور لەتێكهەلْكێشانی بەرژەوەندی تەسكی رژێمەكان و كەسانی تامەزرۆی پایەو ناوبانگ، ئەم قۆناعە گرنگەو هەستیارەی كۆمەلْ كە مندالْییە دەبیٚ بەباشی بقۆزرێتەوە بۆ چاندنی تۆوی دیموكراسی و رەفتاری دیموكراسیانە بەو شێوەیەی كەمرۆڤ دێنێتە هۆش و بەردی بناغەی شارستانیەتێك لەدیموكراسی و كۆمەلْێكی لۆژیكیانەو وریا كە دیموكراسیەت و مافی مرۆڤی تێدا زامن بكریٚ.

دەركەوتنی بەرژەوەندی نیشتمانی و نەتەوەیی و ئاینی كەوا ئامانجی كۆمەلاٚنی خەلْكەو لەپێناویدا كاردەكەن بۆ بەدیهێنانی، كۆنەست (اللاشعور الجمعی) ی كەلْەكەبووی چەوسانەوەی دەروونی و پاشماوەكانی پەروەردەو ئەو بەگژداچوونەوە دەرەكی و چەوسانەوەیە، كەكۆمەلْ بەگشتی تووشی دەبێت وەكو چەوسانەوەی نەتەوەیی، كەتووشی زۆر ئاینزاو نەتەوە ژێردەستەكان بووە وەكو چەوسانەوەی كورد لەلایەن رژێمە یەك لەدوای یەكەكان و بەتایبەتی رژێمی دیكتاتۆری بەعس و رژێمە سیاسیەكانی پارچەكانی تری كوردستان كەهەستی نەتەوایەتی لای كورد بەهێزتر كردوو بووە هۆی دەركەوتنی حزب و رێكخراوە سیاسیەكان، هەروەها چەوسانەوەی چینایەتی و رەگەزی كەكۆیلەكانی ئیمپراتۆریەتی رۆما كرا لەلایەن ئیمپراتۆریەتەوە بووە هۆی گەلاٚلْەكردنی تۆوی شۆڕشێكی گەورە لەلایەن كۆیلەكانەوە بەرابەرایەتی سپارتاكۆس ئەو شۆڕشە تەقیەوە بەگیانی دەسەلاٚتدارانی ئیمبراتۆریەتەوە، هەروەها چەوسانەوەی رەگەزی رەشپێستەكانی ئێستای ئەفریكیا هەربەردەوامەو ئەمانیش لەخەبات نەوەستاون، بەهەمانشێوە چەوسانەوەی شیعەكانی عێراق لەلایەن رژێمی دیكتاتۆری عێراق و ئەمازیغیەكان لەجەزائیرو مەسیحیەكانی باشوری سودان و هیتر، ئەم چەوسانەوەیەش وا لەخەلْكی دەكەن بەرپەرچی بدەنەوەو ململانێی لەگەلْدا بكەن، ئەویش بەپێی ئەو كۆنەستیە، كەپێشتر لایان دروست بوو و بووە بەرجەستەكردنی رای گشتی و بۆچوونی دەروونی گشتی لەرووی سەرچاوەی ئەو چەوساندنەوانە، هەرچەندە ئەو حالْەتە دەرونیە بەكۆمەلْیە كەوا لەمێشكی ئەو كۆمەلْ و نەتەوەو ئایینانە بەشێوەیەكی گشتی درووست بووە، ژینگەی دەرونی

(البيئه النفسيه) ەکەوا تاك بۆخۆی دروستی دەکات و حوکمی لەسەر کەسایەتیەکەی هەیەو بەتایبەتی کاتێك بەپرسینەوەیەکی سیاسی یان ئیداری دەخرێتە ئەستۆو گۆڕانکاری لە ژیانیدا بەپێی ئەوە دروست دەبێت و بەگوێرەی ئەم ژینگەیە کۆمەڵێ بۆچوون و لێکدانەوەو هەستی لەناوەوەی ئەم کەسە درووست دەبێت و دەبێتە بزوێنەری چالاکیەکانی کەهەمووی واقیعی ناوەوەی یان دەروونی دروست دەکات و ئەوەی تەمەنای دەکات کەبەپێی هەست و مەشاعری لێکدانەوەی ئەبێت کەدەبێتە هۆی بەدیهێنانی خەیاڵیی (التحقق الهلوسی) بۆ حەزو تێرکردنی ئارەزوو و ئامانجە دەرونیەکانی ئەوەیش لەئەنجامی ئەوەی بۆی ماوەتەوە لەنەوە یەك لەدوای یەکەکان، کەپێش خۆی لەناوەندێك کەپێش کەوتنی کۆمەڵایەتی و زانستی بەخۆیەوە نەبینیوە بۆ پاڵنەرە پەروەردە نەبووەکانی وەکو کوشتارو خڕکردنەوەو حەز لەزاڵبوون و حەزی دەسەڵات و پەنهانەکانی نەست هەرچەندە پێشکەوتنی شارستانی و پەورەردەی بیری مرۆڤایەتی بەرپابووە، هێشتا ئەوەی جڵەوی سیاسی یان کارگێڕی لەئەستۆدایە ململانێ دەکات بۆ ملکەچکردنی واقیع لەسەر حیسابی پاکی و راستی خۆی لەرێگەی بەهێزکردنی نفوزی سیاسی ئەگەر لەرێگەی ناشەرعیشەوە بێت بۆ بەهێزکردنی پێگەی سیاسی و دەست بەسەرداگرتنی کەسانی ترو لەرێگەی خۆدەرخستن و خۆسەپاندن بەهەر شێوەیەك بێت ئەگەر کار لەشیرازەو بەرژەوەندی مەسەلە سیاسیە سەرەکیەکەش بکات وەکو گواستنەوەی ململانێ لەدژی چەوسانەوەی دەرەوە بۆ  ململانێ لەگەڵ لایەنەکانی ناوەوە لەوانەش شەڕی براکوژی یان شەڕی ناوخۆیی و رێکنەکەوتنی سیاسی و نەبوونی وتارێکی یەکگرتووی سیاسی و نیشتمانی و نەتەوەیی، کەشوێنەوارەکەی گوازرایەوە بۆ ناو جەماوەرو دامودەزگاکان و خوێندنگاو شەقام بەگشتی، ئەویش بەهۆی دارمانی دەروونی کەئەگەڕێتەوە بۆ ژیانی منداڵی خۆی کە لەلاشعوری دایەو رەفتارێکی شەڕانگێزی بۆ دروست کردووە لەئەنجامی ئەوەی کەتووشی بووە لەنەبوونی خۆشەویستی و چەوسانەوەو بەدی نەهاتنی حەزو ئارەزوەکانی و بەربەرەکانی ئەو ململانێیەی کەدژی ژینگەکەیەتی بەتایبەتیش بەربەرەکانی لەگەڵ دەسەڵاتی وەکو دەسەڵاتی دایك وباوك و ئەوجا دەسەڵاتی ئیدارەی قوتابخانەو تادەگاتە دەسەڵاتی گەورەتر لەوانەش دەسەڵاتی سیاسی، هەرکاتێ دەرفەتی بەدەست کەوت پەلاماری ئەم دەسەڵاتانە دەداتەوە ئەویش بەگژداچوونەوەی خەڵك و گەندەڵی و بەربەرەکانی خێڵەکی و حزبایەتی تەسك، کەلەوانەشە هەستی پێنەکات، زۆر لەسیاستمەداران یان دەسەڵاتداران کەوتونەتە ئەم گێژاوەوە

کەململانێی ناوەوەی خودە بەدەرەوەدا دەتەقێتەوە بەتایبەتی کاتێك دەسەڵات لەدەست دەگرن، ئەفلاتۆن رەچاوی باری دەرونی دەسەڵاتدارانی کۆمارەکەی کرد بەدابینکردنی ژیانیان و رزگارکردنیان لەتەڵزگەی حەزو ئارەزو و پاڵنەرەکانیان بۆ دوور خستنەوەیان لەتەرازووکردنی مەسەلەکان بەشێوەی کەسی و تایبەتی و دادوەری لەئیشوکارەکانیان بۆخزمەتکردنی کۆمارەکەی، چونکە ململانێی ناوەوەی تاکەکان ناهاوسەنگ و لاتەریبە بەدوای بەرژەوەندییە تایبەتیەکانیان کەلەوانەیە سیاسی بن یان هەر شتێکی تر بۆ هەرکەسێك، کەمەیلی بەرەو ئەو سۆزو ژیانە نەگریسە بێت، کەلەکاتی چەوسانەوەی دەروونی و کۆمەڵایەتی و وروژاندنی هەڵچوونەکان و ئەوجا بڕیارە کەسی و تایبەتیەکان، کەرەنگە زەرەرمەند بێت بەبەرژەوەندی گشتی ئەو ململانێی سیاسیەی ئەمڕۆ لەئارادایە لەسەر هەموو ئاستە جیهانی و هەرێمی و ناوخۆییەوە، کەجیهانی خستۆتە گێژاوەوەو رژێمەکان دێنە سەر تەخت و دەڕوخێن و دیسانەوە رژێمی تازەیەو کەوتونەتە دوای ئەو کەسانەوە کەبەدوای دەسەڵات و سامانەوە رادەکەن، رۆڵی لاسەنگی کەسانی دەسەڵاتـداره بۆتێرکردنی مەیلەسادیەکان لەدەسەڵات و خۆسەپاندن.

فرۆم دەڵێ بۆجەنگە ناوخۆییەکان کاریگەرترە لەجەنگە جیهانیەکان، جەنگی جیهانی نوێ ئامانجی لەناوبردنی دوژمن نییە بەڵکو ئامانجی ناچارکردنی دوژمنە کەبەمەرجەکانی یان داواکانی رازی بێت و هەروەها هەڕەشە نییە بۆ سەر گەلی دوژمن نموونەش بۆ ئەمە ئەڵمانیا کە دوای دۆڕاندن زۆر نەرم بوو لەهەڵویستەکانیدا، ئەمە جگە لەو شەڕانەی کەئامانجی لەناوبردنە، وەکو ئەو شەڕانەی کەرۆمانیەکان ئەنجامیاندا بۆ لەناوبردنی دوژمنەکانیان لەشەڕی ناوخۆ ئامانجی هەردوولا لەناوبردنە ئەگەر لەناوبرنەکەش جەستەیی نەبێت ئەوا لەناوبردنی ئابوری و کۆمەڵایەتی و سیاسیە، لەجەنگی ناوخۆدا لایەنێك لەو وڵاتە هەر دەمێنێ و رکوکینەو ناکۆکی سیاسی و حزبایەتی و دەسەڵاتخوازی هەر دەمێنێ بەمانەوەی لایەنە شەڕکەرەکان و ئاسەواری ئەم ناکۆکیانە دەگوازرێنەوە بۆ ناوخۆو ناو هاوڵاتیان و دابەشبوونی دەروونیی نێوان خەڵك و دابەشبوونی کلتورو زمان و داب و نەریت و زەقکردنەوەیان.

## بەرەنگاربوونەوەو گیانی شۆڕشگێڕی

**مرۆڤ خۆڕسکانە ئەگەر بەهەستیش بێ بەرەنگاری پەلاماردانی دەبێتەوە، بەوەش گوڕوتینی نەتەوەیی لەنەوەکانی خۆیدا درووست دەکات**

فاکتەرە بۆماوەییەکان میکانیکە وەڵام بەسەرجەم گیانداران لەوانەش مرۆڤ دەبەخشن، کەپێی دەوترێ رەفتارە وەڵامگۆ، ئەویش ئەو کردارانەیە، کەبەرووداوێکی پێشتر دەوروژێن و پێیان دەوترێت وروژێنەری وەڵامگۆ، کاتێك تەنێك دەکەوێــتە گەرووتەوە دەستبەجێ خۆت کوڕ دەکەیتەوە بۆ فڕێدانەوەی، یان هەر کە لەماڵ هاتیتە دەرەوە، یان پەنجەرەکەت کردەوە بەشێوەیەکی میکانیکی گۆشەکانی چاوت لەئەنجامی لێدانی تیشکی خۆر بچووك دەبێتەوەو دەچنەوە یەك، یان بێ ئەوەی ئاگات لێ بێت و دەرزییەکی تیژ لەدەستت رابچێ دەستبەجێ ئاوڕ دەدەیتەوە ئەویش پێی دەوترێت پەرچەکرداری مەرجدار، سەرچاوەی ئەو وەڵامگۆیانە، یان ئەو پەرچەکردارانە خۆڕسکین و مرۆڤ لەژینگەوە فێریان نەبووە، مرۆڤ هەر لەیەکەم رۆژی لەدایکبوونیەوە توانای وەڵامگۆی تیشك و دەنگەکانی هەیە، کەزانا بافلوف بەم هاوکێشەیە بەرجەستەی کردووە:

وروژێنەر (stimulus ) ⟵ وەڵامگۆ (respondent)

تیشکی خۆر (وروژێنەر) ⟵ بچوکبوونەوەی گۆشەی چاو (وەڵامگۆ)

ئەو ڕەفتارە وەڵامگۆیانە بەم خاسیەتانەی خوارەوە جیادەکرێنەوە:

١-ڕەفتارێکە لەدەرەوەی ویستی مرۆڤەو هەر لە لەدایکبوونەوە لەگەڵێدایە خۆڕسکانە فێریان دەبێ.

٢- ئەو ڕەفتارانە وروژێنەر بەڕێوەیان دەبات یان بەسەریاندا زاڵە:

وروژێنەر ⟵ وەڵامدانەوە

تیشکی خۆر ⟵ بچووکردنەوەی گۆشەی چاو

٣-بەمەبەستی پاراستنی لەلەشی مرۆڤدا خۆڕسکانە بەرنامەی بۆ دانراوە.

هەندێ گیاندار هەن وەك کیسەڵ بۆ پاراستنی لەشیان سیفەتی تایبەتی خۆیان هەیە، کاتێك کەهەست بەمەترسی بکات جۆرە (بۆن) ێکی ناخۆش دەردەدات کەس نزیکی ناکەوێت، هەروەها ژووژك بەجۆرێك گیانی داپۆشراوە هیچ گیاندارێکی تر بەئاسانی پەلاماری نەدات.

بەم شێوەیە ئێمە دەتوانین لەژیانی ڕۆژانەماندا بەرنامەیەك بۆ وەڵامگۆ مەرجدارەکانی ژیانمان دابنێین، کەواتە دەتوانین مەرجە وەڵام لەگەڵ یان لەجیاتی ڕەفتارە وەڵام بۆ هەڵوێستەکانی ژیانمان بگوازینەوە، لەبواری پەروەردە وەکو ستایش و خۆشەویستی بۆ خۆشویستنی خوێندن یان وەکو لێدان و ڕکوکینە بۆ دوورکەوتنەوە لەخوێندن، یان سزاو پێبژاردن بۆ سەرپێچینەکردن لەیاساکانی هاتووچۆ، یان هەر جۆرە فێرکردنێکی پەروەردەیی لەژینگەپارێزی و یاساپارێزی و خۆشەویستی نیشتمان، یان لەهەر پەیامێکی میدیایی کەبەخەڵك بگەیەنرێ ..تد.

مەبەست لێرەدا ئەوەیە سەرەڕای وروژێنەرە سروشتیەکە، کەدەبێــتە هۆی وەڵامدانەوەی سروشتی کەلەژینکەو دەوروبەرەوە مرۆڤ بەرنامەی بۆ دانەڕشتووە، دەتوانین وروژێنەرێکی نوێ دروستبکەین، یان بخولقێنین، کەوروژێنەری مەرجداری پێ دەوترێت بۆ ئەوەی وەڵامدانەوەیەکی مەرجدار بخولقێنین، بەم شێوەیە: بۆنمونە ئەگەر بمانەوێت منداڵێك شیری دایکی بخوات:

شیر (وروژێنەر) پێش مەرجاندن ⟵ نەخواردن (ڕەفتارە وەڵام) .

شیری دایك + لاواندنەوە (وروژێنەری مەرجدار) پاش مەرجاندن ⟵ مەرجە وەڵام (خواردنەوە)

ئەو پرۆسەی شیرپێدانە لەگەڵ لای لایەی دایك بۆ منداڵەکە دەیان جار دووبارە دەکرێتەوە تا بەتەواوی فێری خواردنی شیرەکە دەبێت، پاشان کە لای لایەش هەڵبگیرێ ئەوا منداڵەکە لەسەر شیرەکە راهاتووەو دەیخوات.

گرنگی ئەم تیۆرە دۆزینەوەی یاسای وروژاندن و وەڵامدانەوە نییە تەنها، بەڵکو گرنگیەکەی لەوەدایە لە کارو ژیانی رۆژانەماندا دەتوانین وروژێنەرە نوێیەکان بخولقێنین بۆ ئەوەی بۆ ئەوەی وەڵامدانەوەی خولقاومان دەست بکەوێت، کەچەندان گیروگرفتی دەروونی و کۆمەڵایەتیمان هەیە بەتایبەتی سەبارەت بەمنداڵان و فێربوون و ترساندنیان و گرفتەکانی هاتووچۆو تێکدانی ژینگەو پێشێلکردنی یاسا، ئەمانەش بەچەند پرەنسیبێك دروست دەبێت:

- وەرگرتن (فێربوون) : لەگەڵ بەکارهێنانی بەهێزکردن یان پاڵپشتیکردن و هاندان، کەپێی دەوترێت پرۆسەی گرێدانی وروژێنەرە سەربەخۆکان لەگەڵ وروژێنەرە سروشتیەکان، کە زۆرجار روودانی دووبارە دەبێتەوە تا مەرجە وەڵام بەفێربوون دروست دەبێت.

زۆرجاریش وروژێنەری سەربەخۆ، هاوکات لەگەڵ وروژێنەرە سروشتیەکە، یان پاشتر، هەردووکیشیان پێکەوە کۆتایی دێت و پێی دەوترێ مەرجاندنی کاتی ( simulancous conditioing)، ئەمەش دەبێتەهۆی مەرجاندنی جێگیرو داشدەنرێت بەکاریگەرترین رێگای راهێنان بە نیسبەت تاکی مرۆڤ و ئاژەڵە ئالۆزەکانەوە، بۆنموونە: منداڵ خۆرسکانە لەدەنگی گەورەو ئازار لەسەرەتای تەمەنیاندا هاوسەنگییان تێکدەچێت و دەبێتە ترس، زۆرجار ئەو ترسەش لەئەنجامی شتی نامۆو ناماقوڵ دروست دەبێت، لەوانەشە هەندێك لەو ترسانە هەر لەزگماکیەوە بەرنامەرێژ کرابێت، بەڵام ترسەکانیتر کەلەژینگەوە توشی منداڵ دەبێت، چۆن دروست دەبێت و چۆن چارەسەر دەکرێت بەپێی تیۆری مەرجە فێربوونی بافلوف؟نموونە: بۆ ئەوەی منداڵ لەوە بترسێت کەدەست بۆ کتلی سەر ئاگرەکە نەبات، هەر کەدەستی بۆ برد دایك یان باوك دەنگێکی وا یان هەر هاوارێکی وای بەسەردا دەکەن رادەچەڵەکێ بۆ ئەوەی پاشەکشە بکات و چیتر دەست بۆ ئەو کتلیە گەرمە نەبات، ئەگەر ئەو کردارەش دووبارەکرایەوە، یان بەهێز کرا ئەوا ترس لەو منداڵەدا چەکەرە دەکات و چیتر نزیکی ئەو سەرچاوەیە ناکەوێت کەترساندنەکەی لێوە هاتووە لەوانەش کتلی ئاگرەکە، ئەو ترسەش کاریگەری خۆی دەبێت لەسەر کەسایەتی، بەم شێوەیە:

کتلی ئاوی گەرم (وروژێنەر) ⟵ ڕەفتار ( وەڵامدانەوە) .
هاوارکردن (وروژێنەری مەرجدار) ⟵ ترس و دوورکەوتنەوە (وەڵامدانەوەی مەرجدار) .
سزادانی شۆفێر ⟵ پابەندبوون
سزادانی تێکدەری ژینگە ⟵ پابەندبوونی بەپاراستنی ژینگە
پاداشتکردنی پارێزەری ژینگە ⟵ پاراستنی ژینگە

تا ئەو ترسە بەهێز بکرێت بەدووبارە کردنەوە ئەوا زیاتر دەچەسپێت، بەهێز نەکردنیشی لاوازی دەکات.

کەواتە دەبێت ڕێگایەکیش هەبێت بۆ ئەوەی ئەو جۆرە ترسانە کە بوونەتە هۆی هێدمەی دەروونی لای منداڵان دەرکەین، چونکە زۆربەی ئەو مەترسیانە لەئەنجامی خەیاڵ و چیرۆکی ترسناکی گوێی ئاگردان، یان هەندێ جۆرە فیلم هەیە بەدیمەنە ترسناکەکانی منداڵ دەترسێنێ، هەر با ئەو نمونەیەی پێشەوە وەربگرین کەمنداڵەکە سەبارەت بەکتلییە گەرمەکە ترسێکی سروشتی لای خولّقا، بۆ ئەوەی لێی ڕزگار بێت پرۆسەیەك بەکاردێنین پێی دەوترێ سڕینەوە (extinction)، کەلەگەڵ وروژێنەرە سەربەخۆکە، کەلێدان و هاوارکردن بوو، ئەوجا لەجەژنی لەدایکبوونیدا کراسێکی جوانی بەدیاری بۆ دێنین و ئاهەنگێکی خنجیلانەی بۆ سازدەدەین، پاشان شتی خۆش و جوان لەنزیك (کتلی) یەکە کەئاگرەکەی کوژابێتەوە دادەنێین، سەرەتا هاورێکانی نزیك دەبنەوە پاشان ئەمیش چاو لەوان دەکات و وردە وردە نزیك دەبێتەوە لەگەڵ دوبارەکردنەوەی هاوارەکە، بەڵام بەشێوەیەکی کۆمیدیانە تا ئاسایی دەبێتەوە، بەو شێوەیە کتلی و هاوارکردن لەگەڵ ئاهەنگ تێکەڵ دەبن و دەبنە مایەی خۆشحاڵی: بەم شێوەیە:

یەکەم: دەنگ و هاوارکردن ⟵ دروستکردنی ترس (مەرجە وەڵام)
دووەم: دەنگ وهاوارکردن لەگەڵ ئاهەنگ و شیرینی ⟵ تێکەڵبوون (ترس و خۆشی)
سێیەم: دەنگ و هاوار لەگەڵ ئاهەنگ و شیرینی ⟵ سڕینەوەی ترس (مەرجە وەڵام) . تد

لەوانەیە مانەوەی مەرجە وەڵام، کەترسەکەبوو تارادەیەك بمێنێ تاکو وروژێنەرە مەرجدارەکە (ئاهەنگ) بەوروژێنەرە سروشتیەکەوە بەسترابێت، هەر چەندە جارجارێك دەربکەوێ لەوانەیە ئەویش وردە وردە لاواز بێت بەشێوەیەك، کە ڕودانی لەکاتی پێش مەرجاندنی زیاتر نەبێت، ئەمیش دیاردەی سڕینەوە (reinforment) یە:

هەرچەندە مەرجە وەڵامەکان بەتێپەڕبوونی کات نامێنن، بەڵام بەیەکجارەکی ناسڕێتەوە، واتە ئەو ترسەی کەتوشی منداڵەکە بوو دەرەوەێتەوە، بەڵام نەك بەیەکجاری، ئەمیش پێی دەوترێ گەڕانەوەی ئاسایی (respontuneous recovery)، بۆ ئەوەی پرۆسەی مەرجاندن بەردەوام بێت پێویستە ئەو کارە زۆر دووبارە بکرێتەوە، ئەگینا بارودۆخەکە ئاسایی نابێتەوە تا جێگیر بێت و بەردەوام بێت، پاشان توشی کرداری راگرتن (inhibition ) دەبێت، واتە دەرکردنی ترس لەو منداڵە دەوەستێت.

-گشتیکردن: گشتیکردن (التعمیم) خاسیەتێکی دیکەی مەرجە وەڵامە، کەلەژیانی رۆژانەماندا دووچاری دەبینەوە، بۆ نموونە وروژێنەرە سەرەکیەکان کە دەنگ و هاوار بوو وەبیر ئەو منداڵە دێتەوە هەرکاتێ ئەو کەش و هەواو هەڵوێستەی بۆ رەخسایەوە، لەوانەیە ئەو جۆرە دەنگە، یان ئەو جۆرە کتلیە لەهەر جێگایەك ببینێتەوە بارودۆحی جارانی وەبیر بێتەوە، ئەمیش لەزۆر شتی تری رۆژانەماندا دەردەکەوێت، ئەگەر کەسێکمان خۆش بوێت و جۆرە کراسێکی لەبەردا بێت، ئەوا لەهەر جێگایەك ئەو جۆرە کراسە ببینین یان لەبەری هەر کەسێکدا بێت ئەوا ئەو کەسەمان خۆش دەوێت، زۆر جاریش گوێمان لەئاوازێك یان پارچە موزێکێك بووە، کەپاشتر گوێمان لێدەبێتەوە هەمان کەشو هەوامان دێتەوە یاد .....تد

ئەو شتەلای منداڵی ساواش بەدی دەکرێت بۆ نموونە ئەگەر باوکی ئەو منداڵە جامانەی لەسەردابوو ئەو ئەو منداڵە هەرکەسێکی تر بەکڵاو جامانەوە ببینێ وا دەزانێ باوکێتی، زۆرجاریش کەسێکمان خۆش دەوێت یان رکمان لێ دەبێتەوە هۆیەکەی هەر بۆ ئەوە دەگەڕێتەوە، هەروەها پرۆسەی جیاکردنەوە (discrimination) هەیە کە یەکێکە لەپرانسیبەکانی ئەم تیۆرە، کەجیاکردنەوەی ئەو وروژێنەرانە دەگەیەنێت، کەهەڵوێستەکەی درووست کردووە، منداڵەکە دەتوانێت هەڵوێستەکان لێك جیابکاتەوە کەتووشی بووە، وەڵامی ئەم وروژێنەر زیاتر دەداتەوە کەلەکاتی پرۆسە مەرجدارەکە درووست بوو (دەنگ و هاوار+ئاگر)، بەڵام ئەو وەڵامدانەوەیە ناکاتە ئەو وەڵامەی کەبۆ وروژێنەرێکی نزیك دەیداتەوە، کاتێك بافلوف دەنگی زەنگەکەی برێك کەمتر کردەوە، یان برێك زیاتر کردەوە، بەهەمان شێوەش رێژەی لیکی سەگەکە کەم و زیادی کرد واتە سەگەکە توانی ئەوە جیابکاتەوە، کەواتە تا جیاوازی نێوان وروژێنەرە مەرجدارە ئەسڵیەکەو وروژێنەرەکانی تر هەبێت رێژەی جیاکردنەوەکە زیاتر دەبێت بەهەمان شێوەش بەسەر مرۆڤدا دەچەسپێت.

- دژەمەرجاندن: ئەمیش جۆرێکی تایبەتە لەمەرجە وەڵام، کەوەڵامدانەویەکی مەرجدار بەوەڵامدانەوەییەکی مەرجداری دیکە ئاڵوگۆڕ دەکرێت، کەدژ بەیەکن بۆ نموونە حەوانەوە لەگەڵ دڵەراوکێ ناگونجێ، بەختەوەری و غەمگینی پێکەوە ناگونجێن، ترساندنی منداڵەکەو ئاهەنگی لەدایکبوون ناگونجێن، ئەم جۆرە مەرجاندنە بەشێکی زۆری ژیانمانی داگیرکردووە، لەوانەشە رۆژانە دەیان هەڵوێستی وامان تووش بووبێت، ئەم جۆرە مەرجاندنە بەلاوازکردنی رێکخراو (الاضعاف المنظم) ناسراوە، کەبە شێوەیەکی فراوان شیکەرەوەی دەروونی جوزیف دولب لەخوارووی ئەفریکیا بۆ چارەسەرکردنی نەخۆشەکانی بەکارهێنابوو ئەویش بەدانانی ستراتیژێك بەناوی لابردنی حەساسیەت بەمەبەستی کەمکردنەوەی دڵەراوکێ، ئەم رێگەچارەیەش پشتی بەمەرجە وەڵام بەستووە بۆ نموونە:

دڵەراوکێ بۆ نەخۆش مەرجە وەڵام دەکرێ بەحەوانەوە لەجێی ترس دابندرێت ئەویش بەمەشقکردن، بۆ نمونە گرێدانی نەریتێکی خراپ وەك جگەرەکێشان بەتەوژمێکی کارەباوە.

سەبارەت بە یاخیبون و بەرەنگاربوونەوەش هەمان یاساکەی بافلوفی بەسەردا جێبەجێ دەبێت، هەڕەشە سەرچاوەکەی هەرچییەك بێت ئامانجی لاوازکردن و لەناودانی هەڕەشە لێکراوەکەیەتی، ئەگەر دژ بەتاك بێت یان کۆمەڵ (نەتەوە، ئاین، شارستانیەت، قەوارە..) بەڵام بەپێی یاساکانی سروشت هەموو کارێك کاردانەوەیەکی هەیە، ئەوا هەڕەشە وەڵامگۆ لەلایەن هەڕەشە لێکراوەوە دەخولقێنێت، ئەنفالکردنی خەڵکی سڤیلی گەلی کوردو زیندەبەچاڵکردنی رۆڵەکانی و کیمیابارانکردنی خەڵکی سڤیلی هەڵەبجەو قەتلوعامکردنی ئەرمەنەکان و هاڕینی جولەکەکان و وێرانکردنی شاری لینینگرادو زوڵمکردن لەگەلی فەلەستین و دەیان کارەساتی دیکەی لەو جۆرە وەڵامگۆی خاوەنەکەی لێ بەرهەم دێت هەروەکو مێژوو نووسی گەورە ئەرنۆڵد توینبی دووپاتی دەکاتەوە کەهەموو دەستدرێژییەك وەڵامگۆیەکی دەبێت:

وروژێنەر ⟵ وەڵامگۆ

واتە: دەستدرێژی ⟵ وەڵامدانەوە

هەڕەشەکانی سەر نەتەوەی کورد کەتاکی کوردی خستۆتە هەموو جۆرە ململانێیەکەوە، جارێك بەهەڕەشەو جارێك کوڕەو جارێك کۆچکردن و ئەنفال و...تد وەڵامگۆی لەکەسێتی

تاکی کورددا دروست کردووەو هەموو تاکەکان وەکو جەستەیەکی یەکگرتوو هەست بەئازاری یەکتر دەکەن، ئەو کەسێتیە زیاتر لەگەڵ سەر هەڵدانی هزری نەتەوەییدا پەیدا بووەو قەوارەی بوون بەدەوڵەت لەمێشکیدا وروژاوە بۆ پاراستنی نەتەوەکەی، بەڵام پێش بەرجەستەبوونی هزری نەتەوەیی کورد لەجۆرێکی تری ململانێدا بووەو توانیویێتی نوێنەرایەتی دەوروپشتی خۆیشی بکات و وەڵامگۆی تێدا درووست ببێت لەرزگارکردنی قودس بۆ یەکەمین جار لەمێژوودا، بەڵام پاش بەرجەستەبوون و خۆبەزلزانینی نەتەوەکانی تر، کورد ناچار بووە بکەوێتە قۆناغی بەرگریکردنەوە بۆ پاراستنی خۆی و دروستبوونی هەوێنی شۆڕش لەگیانی تاکەکانیدا، ئەگەر بۆی نەڕەخسابێ شۆڕش بەرپا بکات، ئەوا لەناخیدا وەکو غەریزەی نیشتمانپەروەری لەناخیدا پەنگی خواردۆتەوەو ئامادەباشی پتر بووە بۆ وەڵامگۆی هەڕەشە دەرەکیەکان، ئەو هاوکێشەیە کەهزرڤانی گەورەی رۆژاوا (توینبی) ئاماژەی بۆ کردووە لەکاتێکدا کەکۆمەڵ دەکەوێتە داوی ململانێوە ئەوا وەڵامدانەوە لەشۆڕشەکەیدا بەرجەستە دەکات، لۆرنتس ئەوە دووپات دەکاتەوە کەدەڵێ یەکێتی کۆمەڵایەتی کە خود لەگەڵیدا یەکدەگرێتەوە هەردەبێ خۆی قیت بکاتەوە کاتێك دوچاری مەترسیەکی دەرەکی دەبێتەوە .

هەڕەشە ⟵ وەڵامگۆ

پەلامار ⟵ شۆرش

پیلانی سەرکوتکردنی شۆڕش ⟵ سەرهەڵدانەوەی شۆڕش

ئەنفالکردن ⟵ وشیاربوونەوەو گەڕان بەدوای دیموکراسیەت و پاڵپشتی و زەمانەتی نێو دەوڵەتیولڵدانی و هەوڵدان بۆ بەجینۆسایدناساندنی ئەنفال و کیمیابارانکردنی هەڵەبجەبیەکانی لێکەوتەوە.

راگواستنی زۆرەملێ و وێرانکردن ⟵ ئاوەدانکردنەوەو ژیانەوەی کوردستان سەرەڕای کەمتەرخەمی وسستی لەکارەکانیدا.

ئەمەش ئەوە دەگەیەنێت کەژیانی نەتەوە لەململانێدایە، سەرنەکەوتنی لەململانێکان واتای توانەوە دەگەیەنێت، چونکە هەمیشە شارستانیەتە بچوکەکان یان لاوازەکان لەشارستانیەتە گەورەکان تواونەتەوە، شۆڕش و بەرگریکردن و وەڵامگۆی دەست درێژییەکان

وشیاری تاکەکانی ئەو نەتەوەیە دەگەیەنێت کەسەرکردایەتی شۆڕش دەکەن و مێژوو درووست دەکەن، تاکی کورد هەمیشە لەململانێدا بووەو مانەوەشی نیشانەی سەرکەوتنێتی لەو هاوکێشەیە، هەرچەندە کورد چووبێتە شاری کوێرانیش دەستی بەچاویەوە گرتووە، بەڵام چاوەکانیشی نەدۆڕاندووەو کەسایەتی تاکەکانی کەسایەتی خۆگونجاو بوون و مەرجەکانی درووست دەرونی تێدا بەدی دەکرێت، هەرچەندیشە تاکەکانی لەنازی دەوڵەتی خۆیان بێبەش بوون، بەڵام کەسایەتیەکی پشتبەستوو نەبووەو شێوازی شۆڕشەکانی و سەرکرداتیان لە ئەزمونی شۆڕشەکاندا نموونەیە بۆ ئەوە، ئێستاش لەو قۆناغەدایە کەئاسایشی دەروونی بەگوێرەی قۆناغەکانی بۆ خۆی پەیدا بکات وهەستێکی واشی بەجیهانی دەوروبەر ببەخشێ، کەئەم واتەکورد قۆناغی بێنازیی دەوڵەت و پێش سەربەخۆبوونی خودی هەرزەکاریی بڕیوەو بەرەو قۆناغی کامڵبوون دەچێت لەهەڵچونەکانیداو زەبروزەنگی ناپێویستی فەرامۆش کردووە، بۆیە چیتر بڕوای بەوە نییە ماڵەکەی خۆی لەدەرەوەی بازنەی دیبلۆماسیەتی جیهانی رێکبخاتەوەو ئەو رێککەوتننامانەش مۆری دەکات دەبێ بەوشیاری و ئاگای مللی بێت، بەڵکو قۆناغی بەرەنگاربونەوەشی کردۆتە وەڵامی هەمیشەیی دەست درێژییەکان و رەفتارو هەڵسوکەوتی وای لەتاکەکان درووست کردووە کەسایەتی ئەوتاکانەی هاوسەنگ کردووە.

دەروونناسی لای سکنەر بریتیە لەئەندازەی رەفتار (هندسه السلوك)، ئامانجیشی لەمە دۆزینەوەی پاڵپشتی گونجاوە بۆ بەرهەمهێنانی ئەو رەفتارەی کە پەسەندە، لەجیاتی ئەوەی پاداشتی رەفتاری مەرجی بکەین وەکو مەرجیەکانی بافلوف دەکرێ مەرجی کاریگەر دابنێێن، واتە رەفتارێکی نامەرجیش ئەگەر پەسەند بوو کەواتە پاداشت دەکرێ، لێرەدا سکنەر پێیوایە پاداشت لەسزا باشترە بۆبەرهەمهێنانی رەفتار، دەرەنجامیش ئەو مرۆڤە بەردەوام دەبێت لەسەر رەفتارەکەی بۆ نمونە ئەگەر حکومەتی عێراق لەجیاتی ئەوەی گوندێکی کوردستان بڕوخێنێ ئاوەدانی بکردایەتەوە بۆ قیرتاوکردن و راکێشانی ئاوی خواردنەوەو خزمەتگوزاری پێویستی بواری خوێندن و هەر خزمەتگوزاریەکی دیکەی مرۆیی وێڕای رەچاوکردنی مافی نەتەوەیی و رێزگرتن لەئیرادەی بزوتنەوەی کوردایەتی ئەوا سەرنجی تاکی کوردی و تێڕوانینی دەرەکی زیاتر بۆ لای خۆی رادەکێشا، سکنەر دەڵێ ئەگەر پاڵپشتیەکانی رەفتاری باش لەکاتی خۆیدا بوو ئەوا رەفتاری ئاژەل و مرۆڤیش گۆڕانی بەسەردا دێ، رژێمە سیاسیەکانی رۆژهەڵاتی ناوەڕاست بەتایبەتی ئەوانەی کوردو کەمە نەتەوەکانی دیکەیان تێدایە دەتوانن خۆشەویستی تاکی کورد

بۆ خۆیان رابکێشن و رەچاوی ئەو مافانە بکەن بۆ کورد کەبۆ خۆیان بەڕەوای دەزانن و پەنا بۆ کوشتن و داگیرکاری و ترساندنی کورد نەبەن و ئەو پارەو پولەی بۆ ئەو مەبەستە خەرجی دەکەن ئەگەر کەمتر لەوە بۆ راکێشانی سۆزو خۆشەویستی کورد خەرج بکەن ئەوا دەتوانن لەکورد نزیك ببنەوە، هەر لەقۆناغی منداڵی و لەریگەی پەروەردەی قوتابخانەکانەوە ئەو رژێمانە دەتوان لەجیاتی دەمارگیری و رەگەز پەرستی دەتوانن گیانی خۆشەویستی و پێکەوە ژیان لای منداڵان درووست بکەن و رۆژ دوای رۆژ ئەو هەستە ئەرێیانە درووست دەبێت، بەپێچەوانەشەوە چەند بەرنگاری تاکی کورد ببنەوە بەتوندوتیژی ئەوا هەر توندوتیژی لەدایك دەبێت چونکە بەرەنگاربوونەوەی تاکی کورد بەرنگاربوونەوەی بەرگریکردنە لەخود و خۆپاراستن و هەوڵەکانی مانەوەیە بۆ مانەوەی خۆی و سیاسەتی رەگەزپەرەستی گومان لەناخی تاکەکانی ئەو وڵاتە درووست دەکات و هەمیشە بیر لەوە دەکەنەوە چۆن بتوانن خۆیان ونەوەکانی داهاتویان لەو سیاسەتە بپارێزن بەهەمان شێوەش ئەگەر سیاسەتی کوردی بەرامبەر تورکومانەکانی عێراق و نەتەوەو ئاینزاکان بەشێوەیەك بێ خۆشەویستی ئەوان بۆلای خۆی رابکێشێ ئەوا بێگومان وەڵامگۆی ئەوانیش خۆشەویستانە دەبێت و ئەو خۆشەویستیە رۆژ دوای رۆژ گەشە دەکات، لەبەر ئەوەی مرۆڤ توانای پێشبینی وخەیاڵکردنی هەیە، تەنها وەڵامگۆی هەڕەشەکانی ئێستا یان بیروەری مەترسیەکان و هەڕەشەکانی نابێت بەڵکو وەڵامگۆی ئەو مەترسی و هەڕەشانەش دەبێت کەوێنای دەکات لەئایندەدا روو بدەن (فرۆم)، باوەڕ ناکەم تاکێکی کورد نەبێ گومانی لەژێمە سەرکوتکاریەکانی وڵاتەکەی نەبێ و هەر لەبەر ئەوەشە هەمیشە نائاسودەیەو دەترسێ بۆیە هەوڵی هەڵاتن لەوڵاتەکەی دەدات و بێ متمانەیی لەلا دروست دەبێت، کەم ماڵی کورد هەیە چەکی لەماڵەوە نەبێ، کەم تاکی کورد هەیە لەخەرجکردنی پارەو کڕینی خانوو رەچاوی ئایندەی نەکات و ترسی لەئایندەی منداڵەکانی نەبێت، بۆیە وتوێتی ماڵی سپی بۆ رۆژی رەش چونکە بەدەست بێگانەو بەدەست جوگرافیاوە ستەمی بینیوە، هەمیشە تاکی کورد رەشبینیانە بیر لەدوارۆژی دەکاتەوە ئەویش دەرەنجامی ئەو بارە دەرونیەیە، کەبۆی درووست بووە بەهۆی شەڕو هەڕەشەو داگیرکاریەوە.

## ڕەفتاری شارستانی:

### کەسێتی مرۆڤ مۆرکێکی دینامیکی هەیە و لەگەڵ گۆڕاندا هەڵدەکات ومۆرکی شارستانی وەردەگرێت

لەژیانی مرۆڤدا هیچ شتێك ڕەها نییە بەتایبەتیش ڕەفتارە کۆمەڵایەتیەکان، کەپاشکۆی گۆڕانکاریە گەوەرەکانی سیستمی ئابوری و سیاسین و نەخاسمە لەسەردەمی گلۆبالیزمدا کەسنورە سایکۆلۆژییەکان رووەو درزبوون مل دەنێن ئەگەر نەڵێین بەرەو توانەوە مل دەنێن، بۆیە نابێ بەرەهایی ڕەفتارو مامەڵە لەگەڵ دۆخی سایکۆلۆژی تاکەکان بکرێت بەتایبەتیش نەوەی پێشوو (باوك) لەگەڵ نەوەی ئێستا (کوڕ)، کەبەردەوام ململانێ لەنێوانیاندا هەبووەو هەیە، کەئێستا ئەو ململانێیە خەسترەو بەهێزترە بەهۆی سەرهەڵدانی دۆخێکی دەروونی شپرزە لەگەڵ گۆڕانکاریەکی لەپڕی تەکنۆلۆژیای ئینتەرنێت و مۆبایل و فەیسبوك و توەیتەر و تۆڕەکۆمەڵایەتیەکانی تر میکانزمی کارپێکردن و خۆگونجاندن لەگەڵیدا، ئەو ململانێیە نێوان دوو نەوەی جودا ڕەنگدانەوەی ململانێی نێوان دوو جۆر کۆمەڵگەیە کۆمەڵگەی شارستانی و ناشارستانی، تێڕوانینی ڕەهایی بۆ ژیان لەبەستەڵکبوونی هزرو بیری تاکەکاندا خۆی مەڵاس داوە هاکا بەو تاکانەوەی دا بەهۆی باوەڕ نەبوونیان بەگۆڕانی ژیان و هەرسنەکردنی گۆڕانکاریەکانی ئەمڕۆ، هیچ کۆمەڵگەیەکیش نییە لەسەر ئەم زەمینە (بەوڵاتانی ڕۆژاوەشەوە) بەتەواوی نموونەی کۆمەڵگەی مەدەنی بن ئەگەر لەسەر حەسابی بەهاو کلتوری متبووی کۆمەڵگەی باو سالاری مامەڵە بکات، ئێمە کەمانەوێ پاگیری کۆمەڵگەیەکی تەژی

لەبەهاو داب و نەریت بین ئەستەمە کۆمەڵگەیەکی نوێ بین کەقۆناغی مێژوویی جێی بگرێتەوە تەنها لەو کاتانەدا نەبێ کەبەهاو داب و نەریت و کلتوری مەلاٌسدراو بین بەقوربانی ئەو کۆمەڵگە نوێیەی کەگلۆبالیزم ڕێی بۆ خۆش دەکات و دەیهێنێتە کایەوە، کەواتە ڕەنگە ئەمەش بگەڕێتەوە بۆ خودی مرۆڤ و کەسێتی کە مۆرکێکی دینامیکی هەیەو لەگۆڕانی بەردەوامدایە، زۆر ئەستەمیشە وێنای کۆمەڵگەیەکی تەواو مەدەنی بکەین لەئایندەدا، چونکە تاك وەکو بوونەوەرێك ئەگەر چی لەوپەڕی تایبەتمەندی کۆمەلاٌیەتیدا بێت بێ کێشمەکێش و ململانێ ناژی، چ ململانێکانی ناوەوەی خودی خۆی بێت بۆتێرکردنی حەزو ئارەزووەکانی، چ ململانێیەکانی لەگەڵ دەرەوەیدا بۆ ڕازیکردن و پابەندبوونی بەدابونەریت و یاسا گشتیەکان بێت، واتە تاك دەبێت هەوڵی ڕەزامەندی نەستی کۆمەلاٌیەتی بدات و ڕۆحی باوباپیرانی بنوێنێ و لەرووی سایکۆلۆژیاوە ڕەچاوی پەیمان نەشکاندنی ئەوان بێت، ڕەچاوی داب ونەریتی ئەوان بێ، کەپێشتر لەکۆمەڵگەدا خولقاوە، ئەو نەستەی کەئەقلاٌنیزم ناتوانێت لەشەو و ڕۆژێکدا جێی بگرێتەوەو ببێتە پردێك بەرەو کۆمەڵگەی مەدەنی و لەهەمان کاتدا پێویستی بەدەیان ساڵ دەبێت تا بگاتە ئەو قۆناغەی کەقۆناغی پێگەیشتنی کۆمەلاٌیەتیەو بەهەموو ئەو قۆناغانەدا بڕوات کەکۆمەڵگا پێشکەوتووەکانی دیکە پێیدا گوزەریان کردووەو ژێرخانی کۆمەلاٌیەتیان بەشێوەیەکی ڕادیکالیانە گۆڕانی بەسەرداهاتووە، پاش چێکردنی ئەو یاساو ژێرخانە سایکۆلۆژی و سۆسیۆلۆژیانە کەروخساری کۆمەڵگەی شارستانی دەیەوێ، ئەقلاٌنیزم دەبێتە سیماو نەستێکی نوێی کۆمەڵگە، کە کۆمەڵگەی مەدەنییە، ململانێکانی نێوان خودو پرەنسیبی تاموچێژو هەموار دەکات و نابێتەهۆی هەڵوەشاندنەوەی کۆمەلاٌیەتی، ئەگەر یاساکانیش لەئارادا نەبن، کەواتە ئەقلاٌنیزم گەوهەری کۆمەڵگەی مەدەنییە، کەیاساو بەها نوێیەکان لەناخی تاکەکانی کۆمەڵ بنیات دەنێ و پشکێکی زۆری دەکەوێتە ئەستۆی ڕێکخستنەکانی کۆمەڵگەی مەدەنی (کۆمەڵە و گروهەکان، سەندیکاکان، پارتەکان، یانەکان...تد) و ڕۆڵیان لەدروستکردنەوەی تاك و کۆمەڵ، کە زیاتر ڕێ خۆشدەکات بەرەو کۆمەڵگەی مەدەنی، ناشکرێت لەهەر کۆمەڵگەیەك تاکەکان تەنیا بیر لەبەرژەوەندی گشتی بکەنەوە، ئەو جۆرە بیرکردنەوەیە نەزۆك و بێ گیانە، ئەمەش پێویستی بەبەهای نوێ هەیە بۆ زاڵبوون بەسەر هەوەس و حەزوو ئارەزووی خودپەرستی و منایەتی، چونکە (من) ە کان دناقبەر دوو بەرداشدان، دەبێت ڕەزامەندی هەردوولا وەربگرن، بەرداشی هەوەس (ئەو)،

کەحەزو ئارەزووەکانەو بەستراوە بەگۆڕانکاریەکانی ژیان و ستایلی قژو جلوبەرگی هۆبزییانەو جۆری جلوبەرگی نویٰ و جۆرێك لەپەیوەندی نێوان رەگەزەکان، کە نەوەی پێشووی هەراسان کردووە، هەروەسا بەرداشی منی بالاٌ کەنابێت تاك لەیاساکانی دەربچێت، هەروەها بەپێچەوانەشەوە بیرکردنەوە تەنیا لەخودو هیچی دیکە، دیسان نەزۆك و بێگیانە بۆ ژیانی ئایندە، ناکۆکی لەنێوان خەڵکی و دەستپێشخەری تاکەکانی لەگەڕان بەدوای (خود) وململانێکانی لەگەڵ ئەو دووبەرداشەدا، پێویست و توێشەبەرەی ژیانن، چونکە ناکریٰ کۆمەڵ بیٰ ململانیٰ و رکابەری بەرەو پێشەوە هەنگاو بنێت، بەپێچەوانەشەوە کۆمەڵ لەجێی خۆی دەوەستێت و مارکس ئاسا تۆوێك دەبیٰ بەرەگ بۆ ئەوەی خۆی نەفی بکاتەوە بۆ سەرهەڵدانی گوڵێك و تۆوێکی نویٰ، ئەو ململانیٰ رکابەریانەی باسمانکرد، دەتوانن بەشێوازی شارستانیانەو دەرچوون لەبازنەی بونەوەری بایۆلۆژی رەفتار بکەن، کەپێویستی بەقوربانیدانە بۆ ئەوەی خۆبسازێنن لەگەڵ کۆمەڵ بەرجەستە ببیٰ و مرۆڤ بتوانیٰ سایکۆلۆژیانەو بایۆلۆژیانەش هەڵبکات، مەبەست لەقوربانیدان دەستبەرداربوونە لە جێبەجێکردنی نامەدەنیانەی هەندێك لەئارەزووەکان، زۆرجاریش ئەو ململانێیانە دەگەنە ناو زانکۆو سەنتەرەکانی روناکبیری و ئۆرگانەکانی کۆمەڵگەی مەدەنیش، رەوتە جیاوازەکانی سیاسەتیش بەرێگەی جیاواز خۆیان لەو کێشەیە دەدەن، بڕیارو راسپاردە لە زانکۆکانی ئەمریکاو هەروەها زانکۆکانی کوردستانیش پتر لەهەر دامەزراوێکی دیکە دەکەوێتە ژێر کاریگەری راستەوخۆ یان ناراستەوخۆی حزب و کەسانی حزبی ناو حکومەت و حەزی دەسەڵات و خۆسەپاندنیان پێوە دیارەو پەیوەندە بەو داوایانەی کەوا لەحیسابی بەرژەوەندی گروپەکانی دیکەیە، هەندێکیشیان لەکاتی وانە وتنەوەیان لەناو زانکۆ، لایەنگیری هەڵوێستێکی ناشارستانی دەکەن و نکوڵی بوونی کۆمەڵگەیەکی مەدەنی دەکەن و بەڵگەش بۆ ئەمە پشتگیریکردنی یاسا وەکو تیۆرو پێشێلکردنی وەکو کرداری واقیعی، تەنانەت زاراوەکانی ئەدەب و وتنەوەی لەم سەردەمەدا لەزۆر لەزانکۆکانی کوردستان بوونەتە حزبایەتیەکی ناشارستانی و پاشماوەی خۆی لەنەستی تاکەکاندا جیٰ هێشتووە، لەبەر ئەوە زۆرێك لەروناکبیران و کەسانی ئاسایی ناو هەوێنی کۆمەڵگا جەخت لەسەر ئەوە دەکەنەوە کەچەوساندنەوە لەبنەڕەتدا لەزمان و کارە ئەدەبیەکاندا هەیە، هەروەها وتنەوەی ئەدەب لەزانکۆکاندا بووەتە حزبایەتی سیاسی دژ بەرەفتاری شارستانی، هەنگاوی رەفتاری شارستانی بەهزری خێڵەکیانە و زمانی دیبلۆماسیەت نایەتە

کایەوە، بەڵکو هەنگاونان بەرەو شارستانیەت و چێکردنی کۆمەڵگەی مەدەنی رۆڵی تاك و رۆشنبیری و سیستمی سیاسی و ئابوری و کۆمەلایەتی دەویٚ کەئەمیش مۆرکێکی مێژوویی بابەتیانەی گەرەکەو ئەمڕۆ یا سبەی سەرهەڵدەدات هەروەکو شاعیری مەزن دەڵێت:

ئەی درِك و داڵی سەر رێم
دانە جیرەی چیتانە لێم
سەد هەزار ئەمەندە بن
بەسەرتانا هەنگاو دەنێم.

لەئاکامی دەیان ساڵی خەباتی ژێرزەمین و سەر زەمینی گەلی کوردستان، دژ بەچەوسانەوەو حکومەتە نامەدەنیەکان هاتۆتە ئاراوەو تاکیش لەنەتەوەی کوردیش لەبناغەدا هەوڵی رەوینەوەی مەترسیە نەستیەکانی دەدات و بۆ رزگاربوونیش لەدێوەزمەی ترس و دڵەراوکیٚ و راچڵەکاندن پەنا بۆ کەفی ئاویش دەبات و دەیەویٚ پاپۆڕەکەی لەکەناری ئارامیدا بگیرسێتەوە، زانکۆکانی کوردستان لەگەڵ زانکۆکانی ئەواندا لەرووی پەرەسەندن و چەق بەستنی مێژوویی بەراورد ناکرێن، وێڕای ئەوەی شوێنەواری داگیرکەرانی هێشتا لەسەرماوە، لەبەرئەوە نابیٚ پاساوی ئەوە بدەین کەرەفتاری شارستانی لەزانکۆکاندا نەنوێنین، بەڵکو لەبەرئەوەی بەئاسانی نەگەیشتوینەتە ئەم رۆژە، دەبیٚ پتر رەفتاری شارستانی بنوێنین و بەپێی توانا شەقڵی حزبایەتی بەزانکۆکانەوە نەهێڵین و مۆرکی مەدەنیەتیان پێببەخشین و بڕێك قوربانی بدەین بەدەسکەوتی مادی شەخسی و پایەو پلە، ئەو حزبایەتیە شاراوەیەی ناو دەسەلاتیش کار لەرەوتی خوێندن و پرۆگرامەکانی خوێندن دەکات بەهۆی خولقاندنی دۆخێکی سایکۆلۆژی ناهەموار و بیٚ متمانە بەخود، زۆر لەولاتانی دونیاش کەسەدان ساڵ لەپێش ئێمەوەن ئەدەب لەزۆر لەزانکۆکانیاندا بوونەتە حزبایەتی سیاسی دژ بەرەفتاری شارستانی، دەبیٚ ئەوەش بزانین هیچ کۆمەڵگەیەك بەتەواوی نابێتە کۆمەڵگەی مەدەنی لەکاتێکدا، کەمرۆڤ تەنها بوونەوەرێکی کۆمەلایەتی نییە بەتەنها، بەڵکو تا رادەیەك بونەوەرێکی بایۆلۆژیشە، ستەمیشە بەهیچ شێوەیەك کۆمەڵگەیەکی مەدەنی هەبێت بیٚ رەفتاری شارستانی و ئەو پەیوەندیانەی پاڵپشتی دەکەن، رەنگە تاك لێرەدا رۆڵی کاریگەری خۆی هەبێت بۆ نواندنی رەفتاری شارستانی وەکو پابەندبوونی تاکەکان بەرێنمایی شارەوانی و هاتوچۆو ئاسایش و پابەند بوون بەچۆنێتی بەکارهێنانی مۆدێرنانەی

مۆبایل و ئینتەرنێت و نەقۆزتنەوەی تێکەڵبوونی هەردوو رەگەز لەبواری خوێندنی زانکۆ بۆ مەرامی شەخسی و پێشێلکردنی ئەخلاقی کۆمەڵگەی مەدەنی و بوونی بەرنامەی تاك بۆ چۆنێتی بەکارهێنانی ئینتەرنێت هەر لەلێکۆڵینەوەی زانستی تا دەگاتە ناسینی هونەرو ئەدەب و سیاسەتی گەلانی دونیاو شێوازی ژیانیان، ئەو پابەندبوونەش لەهەر وڵاتێکدا نیشانەی بەشارستانی بوونی ئەو تاکانەیە، با لەخۆمان بپرسین ئایا ئێمەی کورد تا چ ئاستێك پابەندی ئەو رێنماییانەین؟ بەرسڤی ئەو پرسیارەش پێوەرێکە، هەر تاکێك بۆخۆی دەزانێت تا چ ئاستێك شارستانیە، هەر تاکێکیش دەتوانێت رۆڵی خۆی هەبێت بۆ چەسپاندنی مەدەنیەت، واتە رەفتاری شارستانی بەو پێیەش حکومەت پاڵپشتی ئەو دامەزراوانە دەکات هەر لەرێنمایی یاساکانی هاتوچۆوە تا دەگاتە پەروەدەو شارەوانی، وێرای دەرکردنی چەند بڕیارێکی تایبەت بە باری ژنان وەکو وەستاندنی یاسای ژمارە ١٨٩ی ساڵی ١٩٨٠ کەرێگە بەپیاو دەدات ژنی دووەم بێنێت (ئەگەر ژنەکە بێوەژن بوو) بەبێ وەرگرتنی رەزامەندی دادگا، وەستاندنی یاسای ژمارە ٢١١ساڵی ١٩٨٤، هەورەها بڕگەی ١ی مادە ٤١لەیاسای سزاکانی ژمارە ١١١ساڵی ١٩٦٩و هەمووارکراوەکانی لابرا، کەتایبەت بوو بەمەسەلەی تەمێکردن (تادیب) ی ژن لەلایەن مێردەکەیەوەو قەدەغەکردنی هێنانی ژنی دووەم بێ رەزامەندی ژنی یەکەم و چەندین بڕیاری دیکە...تاد.

بۆ چەسپاندنی ئەو یاسایانەش شتێکی سروشتیە حکومەت هەندێ کۆت و بەند لەسەر ئازادی هەڵسوکەوت کردن و سانسۆر لەسەر هەندێ لەبوارەکانی ژیان دابنێت، بەڵام سنوری خۆی هەبێت، چونکە دەبێتە زیان بۆ رەفتاری شارستانی، هەندێ کەس لەو باوەڕەدان کەنەهێشتنی موڵکایەتی تایبەتی لەوڵاتانی کۆمۆنیزمدا مەرجێکە وەلانانرێت بۆ پەرەپێدانی کۆمەڵگەی شارستانی هەمە لایەن، رەفتاری مەدەنیانەی راستەقینە سەبارەت بەموڵکایەتی ئەوەیە پاڵنەری موڵکایەتی یان موڵکداری لاواز بێ بۆ ئەوەی سەرمایەی تاکیش بەشداری بونیاتنانی کۆمەڵگە بکات، لەکوردستان موڵکایەتی و موڵکداری بووەتە پێویستیەکی نەخۆشیانەی دەروونی زۆر کەس و رکابەری ژمارەی گەورەی باڵەخانەو کۆمپانیاو هوتێل و موتێل دەکەن و کەس ئامادە نییە قوتابخانەیەك یان نەخۆشخانەیەك بکاتەوە، کەچی لەوڵاتێکی وەکو ئەمریکا بەپێی هەواڵی رۆژنامەکان دەیان گەورە دەوڵەمەندی ئەو وڵاتە بڕیاریان داوە بەشێکی زۆری سەرمایەیان پێشکەش وڵات بکەن بۆ گەشەپێدانی زیاتری پەروەردەو فێرکردن و دۆخی کۆمەڵایەتی و پرسی منداڵ و هەروەها چەندین یاریزانی جیهانی

و روناکبیری گەورەی ولاتانی دونیا پشکێك لەسەروەتی خۆیان تەرخان کردووە بۆ یارمەتیدانی هەژاران و بەشداریکردن لەپرۆسەی پێشخستنی پەروەردەیی ولاتەکانیان، ئەم بەخشینە جۆرێکە لەرەفتاری راستەقینەی مەدەنیەت چونکە شتی شاراوە لەکەسێتیدا نامێنی کەئامانجی گەشەسەندنی مرۆڤ و رەفتارە مەدەنیەکەی بێ، بەلام واقیعی کۆمەڵگەی کوردی و بەهۆی ترس لەئاینده ئارەزوی کۆکردنەوەو مولکداریتی زۆر لەلای بەهێزە بۆ زامنکردنی ئەو ئاینده‌یه لەسەر ئاستی تاك (کوڕ-نەوە)، ئەمەش ئەوە دەگەیەنێت مالیکردنی تاك هێشتا ماوێتی بۆ مەدەنی بون و رەفتاری شارستانیانە، تاك هەلگری هەر ئایدۆلۆژیایەك بێ ئەوە رەت دەکاتەوە ناخی خۆی لەخلتەو خەوشەی خۆپەرستی دەرباز بکات و بێ دڕك لەناو کۆمەلگاکەی ژیان بگوزەرێنێ و هەروەها دەبێ بەهێزو کارامە بێ ئەگینا کۆمەل رەتی دەکاتەوە، تاك چەند بەلایەوە گرنگە کەبەشێر ناوی دەبەن و شانازیشی پێوە دەکات، بەلام کاتێك چاوی بەزەیی و سۆز و مرۆییانەی شێرێکی دڕندە دەبینێ گیاندارێکی بێ هێز دەپلیشێنێتەوە ئەوجا مووی مەدەنیەت و کلتوری دادپەروەری لای رەنگە تۆزێگ ببزوێ، سەرباری ئەوەش هەر رازی نییە شێر نەبێ، قبولکردنی دەسەلاتی هێزو خۆ بەشێرزانین دۆخی سایکۆلۆژی تاکە و لەنەستیدا مت بووە ئەمیش جۆرێکە لەدیکتاتۆریەتی شاراوە خۆی بەسەر خۆی و دەوروبەردا سەپاندوەو ملکەچکردنێکی شاراوەش لەلایەن خەلکەوە دەرگەی خستۆتە سەر پشت و تا لۆژیکی هێزیش لەئارادا بێ رەفتاری شارستانی لەنگ و پڕ دلەراوکێ و پەشێوە، ئەگەر ئازادیش هەبوو ماقوول نییە هەموو توێژو چینەکانی کۆمەل بەیەك شێوە بیربکەنەوە، بۆیە فرە لایەنی و فرە ئایدیا لەدامەزراوە شارسیتانیەکاندا راستیەکە نکولی لێناکرێ، رەخنەو رەخنە گرتنیش رەچاو دەکرێن، ئەو شێوازەی کەپەرلەمان و حکومەتی کوردستان رەچاو کراوە بەبەراورد لەگەل پەرلەمان و یاساکانی لەولاتانی کەنداوی عەرەبی کەلەرووی ئابوری و سیاسیەوە لەپێش ئێمەوەن مەرجێکی گرنگە بەرەو کۆمەلگەی شارستانی، ئەگینا دەسەلاتداری تاکڕەوی بیروڕای هەرچییەك بێت کۆمەلی کوردستان بەهەمان دەردی کۆمەلگەی سیستەمی کۆن دەبەن، کەوایان لێهات لەمێژووی جیهاندا بەتایبەتی لەسەرەتای چەرخەکانی نوێوە، ئەو کۆمەلگایانە لەهەموو خەلکانی دیکە کەمتر رەفتاری شارستانی بگرنە بەر، بەپێچەوانەی کۆمەلگە سەرمایەدارەکانەوە بەتایبەتی کۆمەلگەی لیبرال دیموکراسی، کەکۆمەلگەیەکی وشیارو خود بزوێن و هەمەلایەنە، لەبەر ئەوە

شتێکی سروشتیە هەر کۆمەڵێك بڕێکی دیاریکراو لەهوشیاری بەکۆمەڵ هەبێت، باشترین سەرچاوەش بۆ ئەو هۆشیاریە هەڵبژاردنەکانە، هەڵبژاردنەکانی پەرلەمان، شارەوانی، سەندیکاکان، گرنگی ئەو هەڵبژاردنانە ئەوە نییە لایەنێك سەربکەوێت بەڵکو پرۆسەی هەڵبژاردنەکەو پێشوازی جەماوەرو بەشداریکردنیان خۆی لەخۆیدا جۆرە هوشیاریەکی دڵخۆشکەرە لەکوردستاندا کەبەرەو دیموکراسی و مەدەنیەت و گۆڕینی دەسەڵات بەشێوەی ئاشتیانەو یاسایانە هەنگاو دەنێین سەرەڕای کەکوکورتی و بەرژەوەندی حزبایەتی، کە زۆربەی تاکەکانی بەچاوپۆشین لەو بیروباوەڕەی سیاسی یان حزبایەتی بەشداریان لەو پرۆسەیەدا کرد، ئەمەش لانی کەمی رەفتاری شارستانی تاکی کوردە هەر چەندە سیستمی شارستانی لەکوردستاندا لەئارادانیە، بەڵام ئەم هوشیاریە بەکۆمەڵییە هەوێنی رەفتارێکی شارستانییە ئەوانەی کە ئەو هۆشیاریە دەیانگرێتەوە، بۆنمونە: دەبێت لانی کەم دەرامەتیان تارادەیەك بەرز بێت، ئەمیش بەستراوە بەداهاتی کەرتە جیاوازەکانی ئابوری لەکوردستاندا کە زۆر لاوازە، بەتایبەتی کەرتە بەرهەمهێنەکان، بەڵام وەکو هەنگاوێکی رێخۆشکەر کارگە بەرهەمهێنەکان لەکوردستان و کاری سەرمایەگوزاری وەکو قوتوبەندی و پرۆژەکانی دروستکردنی خانو کردنەوەی زانکۆی ئەهلی و سەنتەری رۆشنبیری و رێکخراوەکانی کۆمەڵگەی مەدەنی و دەرهێنان و پاڵاوتنی نەوت موژدەی ئایندەیەکی گەش دەبەخشن بەدانیشتوانی کوردستان، بەرزبوونەوەی بەرهەمی ئەو کەرتانە دەرامەتەکان زیاد دەکات، ئەویش سنورێکی بنەڕەتی لەکەرامەتی واتایی دەبەخشێت، لەئەنجامی ئەو لانی کەمەی کەرامەتە واتاییە، لەوانەیە دان بەجیاوازیەکی بەهای ئەو دەرامەتانە بنێین، بەڵام گرنگ ئەوەیە ئەو دانیشتوانەی کەئاماژەمان بۆ کرد ئەو وشیاریە بەکۆمەڵە بیانگرێتەوە، ئەو وشیاریە بەکۆمەڵە تایبەتمەندیەکی بنەڕەتیە لەتایبەتمەندیەکانی کۆمەڵگەی نوێ، دەسەڵاتداری سەردەمی کۆن، کەنەمافی مرۆڤ و نایەکسانی تێیدا رەچاو دەکرا بەهیچ شێوەیەك بیریان لەدانیشتوان نەدەکردەوە، تەنها لەوکاتانەدا نەبێت کەئارامی بنوێنن و بیانکەنە دانیشتوانێکی ملکەچ و بەرهەمهێن و سەرچاوەی هێزی سەربازی، ئەمەش هەمان دۆخە بەسەر دانیشتوانی عێراق بەگشتی و کوردستان بەتایبەتی هاتووە، سەرەڕای گرنگینەدان بەناوچەکە لەرووی پەرەپێدانی کشتوکاڵ و گەشتوگوزار و کانزا دەرهێنان و ..تد، بەڵام کۆمەڵگەی لیبرالی و دیموکراتیەکان ئەو باردودۆخەیان بەشێوەیەکی بەرچاو هەموار کرد، بیرۆکەی دادپەروەری لەبەردەم یاسا،

سنوردارکردنی دەسەڵاتی ناوەندی لەبەسەربازیکردنی تاکەکان و بڵاوکردنەوەی ئازادی رەخنەگرتن لەناوەند هەرچەندە لەکۆمەڵگەی رۆژهەڵاتیدا، بەتایبەتی وڵاتانی تازە سەربەخۆو ئەوانەی هێشتا نەگەیشتونەتە سەربەخۆیی، تامەزرۆی دەسەڵاتێکی سەربەخۆو سەروەرن، ئەمەش بووەتە هۆی ئەوەی هەرچەندە ئازادییش هەبێت لەدڵیان (نەك عەقڵ) نایەن رەخنە ئاراستەی سەرانیان بکەن تا وای لێدێت سەرکردایەتی بەشێوەیەکی میکانیکی رەفتاری دیکتاتۆریەت دەنوێنێت و پەردەی خۆشەویستی کوێرانە ئەو رەفتارە نابینێت.

رەفتاری شارستانی لەژیانی تایبەتی جیاوازییەکی بنەڕەتی لەگەڵ رەفتاری شارستانی لەپەیوەندییە راستەوخۆکانی بەشداربووانی ژیانی گشتیدا نییە، بۆیە لێرەدا پێویستە تاکەکان هۆشیاربکرێنەوە لەدامودەزگاکانی دەوڵەت لەقوتابخانەکان و فێرگەکان و رێنمایی هاتوچۆ و زانکۆکان و ...تد ئەم ئەرکەش دەکەوێتە سەرحکومەت کەلەرێگەی دامودەزگا پەروەردەیەکانەوە زیاتر گرنگی پێبدات، بەتایبەتیش لەدەزگاکانی میدیای وەزارەتی رۆشنبیری و دەزگاکانی میدیای پارت و حزبەکان و میدیای ئەهلی، سروشتی تاك و خاسیەتەکانی کەسایەتی تاکەکان کاریگەری گەورەیان هەیە لە بەرجەستەکردنی رەفتاری شارستانیدا، ئەو سروشتەی کەسی ئاشتیخواز هەیەتی زۆرگرنگە لەبواری لێبوردنی سیاسی و پێکەوە ژیانی ئاشتیانە، تاکی کورد بۆ دەربڕینی چاکەخوازی و دڵپاکی بەتایبەتی بەرامبەر بێگانە هەمیشە دەستبەرداری مافی خۆی بووەو وادەرکەوتووە کەسێکی شەرمنەو ئەو شەرمنیە هەڵیخەڵەتاندووەو وای لێکردووە چاوەڕێی دەستی داگیرکەر بێ تا ئەو کاتەی داگیرکەر بەهێزتر بووەو گورزی خۆی وەشاندووە ئەمەش دەیان جار لەمێژووی سیاسی تاکی کورد دا روویداوەو بەداخەوە کورد پەندی لێ وەرناگرێ، بەڵام بەداخەوە ئەمە خاسیەتێکە دانی پێدانانرێت و سەرەڕای ئەوەش چەندین پاساوی بۆ دێننەوە، رەوشت و رەفتاری باش لەوانەیە زۆر ئاڵۆز بێت، ئەگەر باویش نەبێت، گوزارشت لەرێزو نەوازش دەکات و دوریش دەکەوێتەوە لەزیانگەیاندن بەکەسانی دیکە، بەسەدان خێزان هەبووە لەکوردستان و لەماوەی پاش راپەرین کەباری گوزەرانیان زۆر سەخت و دژوار بووەو هاوکات بارودۆخیان بۆ رەخساوە بەشێوەیەکی نایاسایی گوزەرانی خۆیان باش بکەن، بەڵام ئەوەیان نەکردووەو لەبرسا مردنیان بەپەسەندتر زانیوە، واتە ویژدان و رەوشتی خۆیان کردۆتە سانسۆر، بۆیە رەفتاری باش یان سروشتی باش لەمرۆڤدا دەبێتە هۆی سنوردانان بۆ خراپەکاری، گرفتی کۆمەڵگەی ئێمە لێرەدایە، زۆرجار

ئەگەر تاکێك هەڵپەی وەدەستهێنانی پێویستیەکانی نەبێت بەگەمژەو کەمتەرخەمی لەقەڵەم دەدەن، یان ئەگەر ئەو مرۆڤە چاوپۆشی لەهەڵەکانی دەوربەری بکات و تۆڵە سەندنەوەی نەبێت، ئازاو بەجەرگ لەقەلەم نادرێت و هەندێك جاریش بەترسنۆك و خوێڕی دادەنرێت، یان بە بەستەزمان ناوزەدی دەکەن، واتە بەبێ دەسەلات دەیژمێرن، مرۆڤی بێ دەسەلاتیش لەروانگەی کۆمەڵەوە کەسایەتی بێ هێز دەگەیەنێ، جا لەبەر ئەوە پێچەوانەی ئەو سیفەتانە پەسەندترە، کەتاوانکاری و ئاغایەتی نواندن کۆکردنەوەی کەسانی تر لەدەوروبەری خۆیان دەسەلاتیان بەهێز تر دەکات.

سروشت و رەوشتی باش بۆ تاك وەکو جلوبەرك وایە، شتەناشیرینەکان دادەپۆشێت و گوزارشتکردن لەسروشتی خراپ سەرکوت دەکات، بەڵام هەموو کاتێك نا، چونکە ئەو تاکەی خاوەن ئەو رەوشتەیەو پێشوزای لەکۆمەڵگەی شارستانی دەکات وەکو تاك خۆیشی سەرکوت دەکرێت، لەبەر ئەوەی دەسەلاتی نییە لەدامەزراوە سیاسی و گشتیەکاندا، رەوشتی باش، کە لێرەدا مەبەستمان رەفتاری شارستانیە، رێگە دەدات بەهاوکاری نێوان ئەو کەسانەی بیروڕایان جیاوازەو زۆر جاریش دژ بەیەکن، (ولیەم هارکۆت) ی سیاستوان گوتوێتی هەروەکو (ت.س.ئەلیوت) دەیگێڕێتەوە: مانەوەی سیستمی پەرلەمانی پێویستی بەوە هەیە، کەهەمیشەنانی خوانی ئێوارە لەگەڵ ئۆپۆزیسۆندا ئامادە بکات، ئەگەر ئەمڕۆ بەناچاری ئەوە بکەین ئەوە لەئایندەدەدا ئەوە دەبێتە مۆرکی سیاسی لەهەرێمی کوردستان و پەیڕەو دەکرێت کەئەویش بەشێکە لەپێشکەوتن و ئایندەیەکی گەش کەهەمیشە هەوڵی ئیئتلافێکی گەورتر دەدەن لەگەڵ پارت و لایەنە ناکۆکەکانی ناو کوردستان، هەرچەندە ململانێی ناوخۆی هزری و ئایدیایی و بەرژەوەندی لەنێوان حزبەکان لەئارادایە، لەم بارەیەشەوە حزبە کوردستانیەکان بەجیاوازی ئایۆلۆژیایان هەوڵی ئاشتبوونەوەی سیاسی و پێکەوە ژیانی دیموکراسیەتیان داوە، ئەوانیش خۆشحال بوونەوە بەوە بۆ ئەوەی ئەو دیوارە دەرونیە لەنێوانیاندا درووست بووە بتوێتەوە، ئەمەش نیشانەی بوونی دۆستایەتیە، چەسپاندنیشی بەندە بە دەستتێوەردانی دوژمنانەوە، بۆیە لێرەدا قوربانیدان و دەستبەرداربوون (تنازل) لەکەڵەگایەتی بەردەوام پێویستە و نیشانەی سەوزە بەرەو دیموکراسیەت و مەدەنیەت و پەسەندکردنی یەکدی بەڵام کێ ئامادەیە واز لەکەڵەگایەتی خۆی بێنێ و ئەو زاتەی هەبێ بەلایەوە ئاسایی بێ خەڵك بەرامبەر ئەو وازهێنانە پێی بلێن ترسنۆکە؟ رۆشنبیران و لایەنگرانیشی وەکو تاك دەتوانن بەرەوشتە

باشەکانیان و دوورکەتنەوە لە مشتومڕی نەزۆکی حزبایەتی ڕۆڵی خۆیان ببینن، هەرچەندە ئەو ڕۆڵ بینینە دیارنییە، بەڵام کاریگەری خۆی هەیە لەپەیوەندییە ڕاستەوخۆکانی نێوان ئەو تاکانە لەژیانی ڕۆژانەدا، وەکو ڕەفتارێکی شارستانی، لەوانەشە ڕەوشتی خراپ لەلایەن کەسانی خاوەن بەرژەوەندییەوە لەرەفتاری ناشارستانیدا زیاد بکات، کەواتە لێرەدا تاك ڕۆڵی خۆی لەرەفتاری شارستانیدا دەبینێت، ئەمەش پەیوەستبوونی خەڵك بەدامەزراوەی شارستانی پتر دەکات لەپێناو دوورخستنەوەی تاکڕەوی و خوڵقاندنی گیانی هاریکاری، مەرجیش نیە ڕەوشتی باش و دەمەتەقێ و وتاری نەرم تەواو یەکبن لەگەڵ ڕەفتاری شارستانی، کەبەشێکە لەکۆمەڵگەی مەدەنی لەپەیوەندییە ڕاستەوخۆییەکان، کەواتە تاك کۆمەڵگەیەکی کۆمەڵگەی شارستانیە، لەپێناو بەدیهێنانی ئامانجەکانیدا کۆمەڵێك ڕێکخستنی ئازاد لە ئارادایە بەمەبەستی شارستانی بوونی تاك، لەئەنجامدا ئەو تاکانە دەبنە بەردی بناغەی چێکردنی کۆمەڵگەی شارستانی، هەر بۆیەشە پێویستە ئازادییە مەدەنیەکانی تاك بەنانیشەوە دابینبکرێت و ئەو بۆشاییە گەورەیەش پڕبکرێتەوە، کە دووچاری کۆمەڵگە بەگشتی وەك کوردستان بۆتەوە لەئەنجامی بێکاری پەرتەوازە بوون، کەلاوانی کوردستان لەئەنجامی خۆبەراوردکردنی لەگەڵ لاوانی دیکەی دنیاو دەوروبەر لەرێگەی ئەنتەرنێت و هێرشی بەربڵاوی کلتورەکانی دیکەی میەللەتان هەست بەو کەمییە دەکات و بۆشاییەکی گیانی تێدا درووست بووە، ڕەنگە لاوی ڕەفتار باش و ڕازیەمەند زۆریش بن لەوڵاتی ئێمەدا، بەڵام ڕەوشتی باش و ڕەوشتی خراپی تاکەکەس لەرامیاریدا حیسابی بۆ ناکرێ، هاوکات کاریگەری زۆرە بۆسەر ڕێڕەوی کۆمەڵ و ڕەوەرەوەی دیرۆك بە ئاراستەی شارستانیەتدا، هەر ئەم ڕەوەشتەیە ڕێگەی نەداوە سەد دەر سەد شارستانیەت تەنانەت لەوڵاتانی ئەورپاشدا بڕەخسێت (هەرچەندیشە ئەو ڕەوشتانە ناتوانن شارستانیەت بسڕنەوە، واتە ئەگەر گوڵێش نەبن ئەوا دڕکیش نابن ) بەتایبەتی لەوڵاتێکی وەکو کوردستان کەتاك بەهای کۆمەڵایەتی تا ڕادەیەکی باش پارستووە، ئەم پاراستنەش بەردی بناغەی ڕەفتاری شارستانی و مەدەنیەتە، ئەگەر هەرسکردنی گۆڕانکاریەکانی گەردوون لای بەرجەستە ببێت.

هەموو کۆمەڵگاکانی دنیا بەهەموو قەبارەو جۆرەکانیەوە پێویستیان بەرەفتاری شارستانی هەیە، ئەمیش پێویستە بەشێکی زۆری کۆمەڵگەی شارستانی بگرێتەوە ئەگینا توشی ئاژاوەو ململانێی گەورە دەبێت.رەفتاری شارستانی هەڵوێست و شێوازی کارە، هەوڵدەدات هاوسەنگی نێوان داوا ناکۆك بەیەکەکان و بەرژەوەندییە دژ بەیەکەکان ڕابگرێت، ئەمیش ئەوە دەگەیەنێت،

کەناکرێت پەیوەندییە گشتیەکان و دیبلۆماسیەکان تێك بچێت لەپێناو بەرژەوەندی هەنووکەیی، چ لەسەر ئاستی تاك بێت یان لەسەر ئاستی حزبایەتی، واتە نابێ گوێ بدرێتە ئایدۆلۆژیا جیاوازەکان، لەکاتێکدا حیساب بۆ بەرژەوەندی گشتی دەکرێت، لەم روانگەیەوە لەوانەیە دوژمنی دوێنێمان دۆستی ئەمڕۆمان بێت و پەسەندیشی دەکەین، چونکە لەوەدا بەرژەوەندی گشتیمان دەپارێزین تەنانەت لەرەفتاری شارستانی تاکیشدا، پێویستە رەفتاری دیبلۆماسیانە رەچاو بکرێت، بۆئەوەی تاکەکان سنورلای کۆمەڵ نەبەزێنن، بەڵام هاوکات تاکیش بەرژەوەندی خۆی هەیە، مەرج نییە سەد دەرسەد هەموو رەفتارەکانی بۆ بەرژەوەندی گشتی بێت، چونکە پاڵنەری دەروونی هەیەو دەیەوێ تێری بکات، بوونی هەندێ کەسیش لەرووی رامیاریەوە کەهەڵسوکەوتی شارستانیانە دەکەن، واتە لەبەرژەوەندی هەمووان مانای وانییە بەتەواوی واز لەکاری حزبایەتی بێت، لەراستشیدا ئەمە ئەوە دەگەیەنێت، کەئەو جۆرە کەسانە حزبایەتیان کەمترە لەهاوڕێ حزبییەکانی تریان و رکابەرە رامیاریەکانی تر، ئەو کەسانە قسەو کردەوەیان زیاتر بۆبەرژەوەندی گشتیە، لەهەر شوێنێکی کوردستاندا دەکرێت رەفتاری شارستانی هەبێت، ئەگەر شێوەی سەرەتایی هەبێت یان پێشکەوتوو، بەڵام زۆر جار ئەو کەسانە نادۆزرێنەوە، یان لەروانگەی کەسایەتیەوە ناناسرێن، کەهیچ پێگەیەکی ئابوری یان عەشایەریان نییە، لەبەرئەوە لەپەراوێزدا دەمێننەوە بەتایبەتیش ئەگەر لەچینەکانی ژێرەوە بن، هۆکاری ئەمەش دەگەڕێتەوە بۆ ئەو شیرازە عەشایەرییەی کەهەمیشە رۆڵی جڵەوکێشان بۆ دەوروبەر بینیوەو بواریان بەتاکەکان نەداوە خۆیان دەربخەن بەبیانوی بەستنەوەیان بە عەشیرەت و تایەفەگەرییەوە، ئەمەش دوژمنان پاڵپشتیان لێکردووە، بۆیە پێویستە لەسەر حکومەت ئەو پەیوەندییانە بشکێنێت و لەناوەندی لاوان پێشەنگ بدۆزێتەوە بێ ئەوەی لەناسنامەی عەشایەری بگەڕێت.

## هەستکردن بەکێماسی:

**کرانەوەی کورد بەسەر رووی دونیاو هاتنە کایەی گڵۆباڵیزم وتەکنۆلۆژیای بەهێز کەبەدونیای دەبەستێتەوە بووە هۆی ئەوەی تاکی کورد پتر هەست بەکێماسی بکات بەرامبەر نەبوونی دەوڵەتی خۆی.**

سەرباری کرانەوەو بوونی گەردوون بەگوندێك هێشتا لەکوردستان سایکۆلۆژیەت و رەفتارو عەقڵیەتی خێڵەکی بەردەوامە هەر لەرەفتاری تاکەوە بیگرە تا دەگاتە خێزان و کۆمەڵگاو دەسەڵات، تەنانەت زۆر لەرۆشنبیران و نووسەرانیش نازناوی خێڵ یان ناوچە یان خێزانیان بەخۆیانەوە لکاندووە بۆ ئەوەی زووتر دەربکەون، یەکێك لەفاکتەرەکانی ئەم رەفتارو بیرکردنەوەیە دەگەڕێتەوە بۆ بێ دەوڵەتی و ئەم بێ دەوڵەتیەش لەهەر کوێیەکی گەردووندا بێت ئەمە حاڵێتی، نەك تەنها لەروی سیاسیەوە بەڵکو لەرووی کۆمەڵایەتی و مێژووییشەوە، کەمێژووی کۆمەڵایەتی کۆمەڵگەی کوردەواری لەسەر بنەمای هۆزو عەشیرەت و پەیوەندی ئەو هۆزانەیە پێکەوە لەچارەسەرکردنی کێشەو گرفتە کۆمەڵایەتیەکان، کە هەمیشە سەرۆك هۆزو پیاو ماقوڵانی هۆز و ناوداران و تیرە رۆڵیان لەچارەسەرکردنی کێشە کۆمەڵایەتیەکان بینیەوە بەشێوەی خاترانە، واتە لەبەر خاتری ئەو سەرۆك هۆزو ئەو ئاغاو ئەو دەرەبەگ و پیاو ماقوڵ کۆتایی بەکێشەیەك هێنراوەو خاوەن کێشەش دەبێ رازی ببێ و یاساش هیچ رۆڵێکی نابێ،

کەدەکرا ئەم کێشەیە بچێتە دادگاوەو داگا ڕێگەی یاسایی بۆ بۆبدۆزێتەوە، ئەگەر بڕگەیەکیش لەیاسا سەبارەت بەو جۆرە کێشەیە نەبوایە دەکرا بیر لەداڕشتنی جۆرە یاسایەکی وا بکرێتەوەو دادگای پێ دەوڵەمەند بێ و عەقڵیەتی پابەندبوونیش بەیاسا شوێنی خۆی بکاتەوە، کەئەرکی دەوڵەتە ئەوەش دەبێتە بنەمایەك بۆ پێشکەوتنی یاسا، بەپێچەوانەشەوە پشتکردن لەیاساو ژێرپێخستنی یاسا شکاندنی شکۆی دەوڵەتەو بەرزکردنەوەو نەمرکردنی یاسای خێڵەکیە، تا بنەمای هۆزایەتیش بناغە بێ بۆ یەکلاییکردنەوەی کێشەکان ئەوا یاسا ناچێتە پێشەوەو وەك خۆی دەمێنێتەوە، ئەگەر بڕوانینە ولاتانی وەکو ئینگلتەراو ئەمریکاو ولاتانی ئەوروپاو ولاتانی دیکەی گەردوون یاسا هیچ دەرفەتێکی بۆخێڵ و هۆز نەهێشتۆتەوە کەببێتە کەڵەگاو بڕیاربدات و تەنانەت دەست بەسەر سامانی ولاتیشدا بگرێت و بۆ هەموو شتێکیش یاسایەك هەیەو بۆ مووچەو دابەشکردنی داهاتی ولاتیش یاسای خۆی هەیە، لەوەتەی کورد لەژێر دەستی دەوڵەتی داگیرکەرانە بەیاسای دەوڵەتی کورد نەچووە بەڕێوە، بەڵکو بەیاسای دەوڵەتی داگیرکەر بەڕێوە چووە ڕەنگە لەمەدا داداگا مافی کۆمەلایەتی و مەدەنی بۆ تاکێکی کورد وەك هەر تاکێکی دیکەی ئەو ولاتە گەڕاندبێتەوە چونکە یاسای دەوڵەتە، ئەگەر لەدەرەوەی یاساش پەنای بردبێ بۆ ئاغاو سەرۆك هۆزەکەی ئەوا بەعورفی عەشایەری کێشەکەیان بۆ کۆتایی پێهێناوە ئەگەر بەهەق بووبێ یان بەناهەق، چونکە سەرجەم تاکەکانی کۆمەڵگەکەی بەو چارەسەریە کەچارەسەرییەکی یاسایی و دەستوری نەبووەو بەوە ڕازی بووە، بوونی دەوڵەت خۆی لەخۆیدا بۆ ئەوە هاتۆتە ئاراوە وەك گرێبەستێکی کۆمەلایەتی هەروەکو جان جاك ڕۆسۆ دەڵێت و بناغەی دروستبونی دەوڵەتیش بۆ ئەو گرێبەستە دەگەڕێنێتەوە، ئەم گرێبەستە بریتیە لەدیاریکردنی ئەرك و مافی هاولاتێتی بەگوێرەی سەردەم لەژێر سایەی دەوڵەت، یان هەروەکو هەندێ بیردۆزی دیکە دەڵێن بنەمای دروستبوونی دەوڵەت مافێکی ئیلاهیەو ئەگەر خوا پێی بەخشیت ئەوا تۆ لەژێر سایەیدا دەژیت و ئەگەر نا ئەوا هەمیشە ژێردەستی یەکێکی دیکەی، یان یاسای خێڵ بەڕیوەت دەبا یان کۆمەڵی حزب بەڕێوەت دەبەن، بوونی دەوڵەت بنەمای دروستبوونی کۆمەلایەتی بوون و سەقامگیری مرۆڤە، ئەوجا دەوڵەتی دیکومراسی بێ یان تۆتالیتاری یان ئاینی یان هەر شێوەیەکی دیکەی سیستمی دەوڵەت، کورد لەدوای جەنگی جیهانی یەکەم و دابەشبوونی ئیمپراتۆریەتی عوسمانلی هەر بەشێکی لەژێر دەسەلاتی دەوڵەتێك بەڕێوە چووە، بەلام یاسای ئەو ولاتە بەڕێوەی بردوەو تاکی کوردیش بەپێی هەلوێستی خۆی پەنای

بۆ بردووه، تا رادەیەك هەستی بەوە کردووە کە داداگایەك هەیە بۆ ئەوەی داوای خۆی تۆماربکات و بڕیار لەسەر کێشەکەی بدات کە ئەم جۆرە یاساو دادگایە لای هۆزو خێڵ شێوەیەکی دیکەیەو ناچار ملکەچی یاساو دابونەریتی خێڵ بووە لەیەکلاکردنەوەی کێشەکانی و ملکەچبوون بۆ ئەو بەشێك بووە لەیاساکانی هۆز، بەڵام کرانەوەی کورد بەسەر رووی دونیاو هاتنە کایەی گلۆبالێزم وتەکنۆلۆژیای بەهێز کەبەدونیای دەبەستێتەوە چاوی کرایەوە کەوا پێویستی بەدەوڵەت هەیەو درکی بەوە کردووە ئەو کێشەو گرفتانەو ئەو خواست و ئارەزووەی هەیەتی لەسەربەخۆیی و ئینتیمای بۆ دەوڵەتێك وەك پێویستیەکی دەروونی و کۆمەڵایەتی لەناو هۆزو عورفی عەشایەری بەڕێوە نارۆن و وشیاری تاکەکان زۆر لەوە پترە دەرەبەگێك کێشەکەی چارەسەر بکات، کەئاغاو دەرەبەگ جێی دەوڵەتی گرتۆتەوە، لەم سۆنگەیەوە نەبوونی دەوڵەت هەستکردنە بەکەمی و گۆشەگیری و مانەوەی لەناو یاسای خێڵ، دەوڵەت بۆ تاکی کورد وەڵامگۆی هەڕەشە دەرونی و کۆمەڵایەتەکان و ئەو غەدرەیە کە بێ دەوڵەتی لەنەستیدا چێی کردووە، یاسای ژیان وایە کەهەموو هەڕەشەیەك وەڵامگۆیەکی دەبێت، نەبوونی دەوڵەت واتە نەبوونی سیستمێك بۆ پاراستنی مرۆڤەکان کەهەڕەشەیە بۆ سەر تاکەکان و ئەم هەڕەشەیەش وەڵامگۆی خۆی هەیە وەك هەستی کێماسی و خۆ بەکەم زانین و هەستکردن بەجەورو ستەم و شکست و نامۆبوون لەوڵاتی خۆیدا، تورکەکان دوای ئەوەی بەناوی دەوڵەتی عوسمانلیەوە سالآنێکی یەکجار زۆر حوکمی دونیایان کرد کەچی دوای رووخانی ئیمپراتۆرەکەیان دەوڵەتێکی نەتەوەییان دامەزراند، سەرەڕای بوونی دەوڵەوتی نەتەوەییشیان هەر هەست بەکێماسی دەکەن بەرامبەر گەلانی رۆژهەڵات و هەوڵی پەل هاویشتن دەدەن بەشێوەیەکی نوێ و مۆدێرن و بەناوی ئیسلامەوە، ئەمیش بەرجەستە بوونی بیردۆزەکەی ئەرنۆلد توینبیە سەبارەت بەدەوڵەت، پێویستی تاکی کورد بۆ دەوڵەت و ئینتیمابوونی بۆ خاك غەریزەیەکی کۆمەڵایەتی رەگ داکوتاوە لەپێکهاتەی دەروونی مرۆڤەکان، لەوەتەی مرۆڤ درووست بووەو هەوڵی سەقامگیری داوە لەشوێنێك بۆ نیشتەجێبوون هەستی بەوە کردووە پێویستی بەشوێنێك هەیەو خۆی لەغەدرو زوڵم بپارێزێ و سیستمێك هەبێ سەرپەرشتی بکات کە بەهۆی بێ دەوڵەتیەوە لەعورفی هۆزو خێڵ بەولاوە هیچی دیکەی نەبووە، قۆناغ دوای قۆناغ هەستی ئینتیمای بۆ بوونی دەوڵەت لەلادرووست بووەو بووتە پێویستیەکی بەردەوام و لەپێناویدا خەباتی کردووەو بۆی تێکۆشاوەو قوربانی داوەو هەر هەستی ئینتیمایە مرۆڤ بۆ خاکەکەی خۆی بەکوشت دەدات، پێویستیەکانی مرۆڤ بە دەوڵەت

تازە نییە بەڵکو هەزاران ساڵە مرۆڤ پێویستی پێیەتی لەپێناو ڕێکخستنی ژیان و پەیوەندی نێوان هێزو بێ هێز، بوونی دەوڵەت بوونی یاسایەکە بۆ دادپەروەری کەهەمیشە دادپەروەری و نادادپەروەری لەم سەردەمەدا مێشکی مرۆڤی جەنجاڵ کردووەو بەدوایدا وێڵە بۆ ئەوەی رزگاری ببێ لەجەورو ستەمی دەسەڵات بەهەموو شێوەکانیەوە، دەوڵەت بوونی هێزێکە بۆ پاراستنی لەمەترسی، دەوڵەت دروستکەری کۆمەڵگایەکە بۆ تێرکردنی پێویستیەکانی تاکو تێرکردنی سایکۆلۆژی و هەستکردن بەئاسودەیی دەروونی و بەرجەستەبوونی دامەزراوەگەلێکە بۆ دابینکردنی ژیان و بۆ زامنکردنی بوون وەك نەتەوەیەك و پاراستنی مافی نەوەکانی داهاتوو لەخێروبێری سەر خاکەکەی و ژێر خاکەکەی، بەپێچەوانەشەوە نەبوونی دەوڵەت بۆ تاکی کورد هەستنەکردنە بەئارامی و بوونی هەڕەشە چ هەڕەشەی ناوخۆیی و چ هەڕەشەی دەرەکی و هەستنەکردن بەئینتیما وەك پێویستیەکی دەروونی و بوونی کییان و هەستنەکردن بە ڕێزلەخۆنان و کەسێتی خود و چێژوەرنەگرتن لەخودو جوانیەکانی ژیان و هەستنەکردن بەتواناو لێهاتوویی و خود بەدی نەهێنان وەك نەتەوەیەك و بەهەدەرچوونی وزەی لاوانی و نامۆبوونیان لەنیشتمانی بێ دەوڵەتی خۆیاندا، ئیبن خەلدون سەبارەت بەدەوڵەت دەڵێت دەوڵەت بریتیە لە بوونەوەرێکی زیندوو سروشتی تایبەتی خۆی هەیەو یاسای هۆکارو ئەنجام بەڕێوەی دەبات، بریتیشە لەدامەزراوەیەکی مرۆیی سروشتی و پێویست، هەروەها یەکەیەکی سیاسی و کۆمەڵایەتیە و بەبێ ئەم شارستانیەت درووست نابێت، لای ئیبن خەلدون ڕووداوە کۆمەڵایەتیەکان کارێکی حەتمیەو هەر دەبێ بێ نەك سودفە درووستی بکات، لە ڕوانگەی ئەم مێژووناسەوە مرۆڤ زوڵمی لێ دەکرێ، نەك لەلایەن ئاژەڵی دڕندەوە بەڵکو لەلایەن برای مرۆڤیەوە بۆیە پێویستی بەدەسەڵات هەیە، کەئەمیش بێگومان دەوڵەت و دەسەڵاتە بۆ ڕێگرتن لەکوشتن و بڕین و نایەکسانی، بەڵام تائێستا تاکی کورد ئەو دەسەڵاتەی نەبووە وەك دەسەڵاتی دەوڵەت ئەوەی هەبووە تەنها ڕەفتارێکی تیرەگەریانەیە لەناخی دەسەڵاتدا درووست بووەو هەرچەندە باس لەیاسا بکرێ و بنووسرێتەوە دەسەڵاتی جێبەجێکار نەیتوانیوە بیچەسپێنێ و نەیتوانیوە لەوەزیرێك بپرسێتەوە کەئەمەت لەکوێ بوو؟

بنەمای دەوڵەت لای ئیبن خەلدون لەسەر دوو ڕەگەزە: سەربازو پارە، ئەگەر پارەش زۆر بوو ئەوا ڕابواردن زۆر دەبێ کەدەبێتەهۆی هەرەسی دەوڵەت بەتایبەتی کاتێك دەسەڵات هەر جۆرە دەسەڵاتێك بێ سەرقاڵی ڕکابەری گیرفان پڕکردن و ڕابواردن بێ و پارە بۆ ئەوە کۆبکاتەوە کە

رۆژێك لەرۆژان دەسەلآت بەجێ بێڵێ و نەمێنێ، هەمان بیرورا سەبارەت بەگەندەڵبوونی دەوڵەت بەپارەو پول هوشی منە دووپاتی کردۆتەوە، بەهەمان شێوە (فیکۆ) ش دەڵێ دیموکراسی پێویستیەکانی خەڵك زۆر دەکات بۆیە ئاژەوەچییەکان دەستیان دەگاتە بینا قاقای دەسەلآت و دەیخنکێنن بۆ گەیشتن بەتێرکردنی پێویستەکانیان، بەلآم دیسان دەبێ بپرسین مەبەستی فیکۆ لەدەسەلآت چ دەسەلآتێکە؟ئەگەر مەبەستی دەسەلآتی دەوڵەت بێ ئەوا دەوڵەت سنوری بۆ دیموکراسیەت دەبێ و دەسەلآت بڕوخێ دەوڵەت هەر دەمێنێ، ئەوەی قورەکە خەستر دەکات ئەوەیە تۆ نەزانی لەژێر سایەی چ دەسەلآتێکدای؟ دەسەلآتی حزب یان دەوڵەت؟ هەستکردنی تاك بەکەمی و جەورو ستەم بێگومان لەدەسەلآتی دەوڵەتدا نابێ بەڵکو لەدەسەلآتی حزبدایە، کاتێ سەرجەم دەسەلآتەکان لەنێو خۆیاندا دابەش دەکەن و هەڵبژاردنیش هەر لەنێو خۆیاندا دەبێ نەك لەنێوان دەسەلآتی حزب و دەسەلآتی دەوڵەت، ئەمە کارەساتی خۆبەکەم زانین و هەستکردنی تاك بەکێماسی دێنێتە کایەوەو وەلآمگۆی خۆی دەبێ چ بەشێوەی توندوتیژی چ بەشێوەی سەرهەڵدانی ئۆپۆزسیۆن چ سەرڵدانی هزرێکی دیکە، لەلایەکی دیکەوە کارل مارکس بوونی دەوڵەت دەبەستێتەوە بە ململانێی چینایەتیەوە تا ململانێ هەبێت دەوڵەتیش پێویستەو لەگەڵ کۆتایی هاتنی ململانێ پێویستی مرۆڤیش بەدەوڵەت نامێنێ، بەلآم ململانێ تاکە هۆکار نییە بۆ بوونی دەوڵەت بەڵکو غەریزەکانی مرۆڤ لەدەسەلآت و کۆکردنەوەو هێزو خۆپەرستی و شەڕانگێزی و دەرەبەگایەتی و خۆدەرخستن هەموو هۆکارن بۆ پێویستبوونی مرۆڤ بەدەوڵەت لەپێناو گەڕانەوەی ماف بۆ خاوەنەکەی و گەڕانەوەی سیستم و نیزام کەئەمانەش مرۆڤ بەرەو شارستانیەت دەبەن و بەبێ ئەمانە مرۆڤ هەست بەکەمی دەکات و خۆی بەبوونەوەرێکی لاواز دەزانێت بەرامبەر خاوەن دەسەلآت و دەرەبەگ و بازرگان و مشەخۆرەکانی دەسەلآتی بێ دەوڵەت، هەر ئەم هۆکارانەشە وا لەتاکی کورد دەکات وەك هەر تاکێکی مرۆڤایەتی هەست بەکەمی بکات چ لەئاست ناوخۆو چ لەئاست دەرەوەداو هەستکردن بەکەمی هەروەکو ئەدلەری ئەمریکایی دەڵێ بوونیاتنەری شارستانیەتە چونکە تاك و کۆمەڵگە لەئاستیدا ناوەستن بەڵکو هەوڵی خۆ رزگارکردن دەدەن لەو هەستەو هیچ دەسەلآتێکیش ئەبەدی نییە بەڵکو بەگوێرەی پەرەسەندنی کۆمەلآیەتی و دەروونی دەگۆڕێت و گۆڕان حەتمیەتی مێژوو دەبێ و مێژووش رەحم بەکەسدا ناکات، لەلایەکی ترەوە ئەرستۆ دەڵێ دروستبوونی دەوڵەت کاری سروشتەو مرۆڤیش بەسروشت بوونەوەرێکی

کۆمەڵایەتیەو ئەوەیشی بەدڕندەیی دەمێنێتەوە دەرەنجامی نیزام و سیستمە نەك دەرەنجامی سودفە، کەواتە بوونی دەوڵەت پێویستیەکی سروشتی و خۆڕسکیی تاکی کوردەو لەئەنجامی گەندەڵی تاکەکان هەست بەو کەمییە دەکەن، کاتێك مرۆڤ دەوڵەتی نەبێت هەست بەلەدەستدانی هاوسەنگیەکی دەروونی دەکات بەرامبەر سروشت و ژیان، کە دەیەوێت لەناو نیزامێکدا بژی و دوور بێ لەگەندەڵی و زەوتکردنی مافەکانی چونکە هەرچی لەدەرەوەی نیزام و دەوڵەت بێ بوونەوەرێکی دڕندە دەبێ و بەهێزو دەسەڵات بێ هێزو بێ دەسەڵات لووش دەدات وەکو ژیانی ناو دەریاو جەنگەڵستان و دوورە لەشەریعەتی مرۆڤایەتی کەدەوڵەتی بۆ دەکاتە چاودێر و رێکخەری ژیانی، کەواتە گەندەڵی و نادادپەروەری و نەبوونی دادوەرێك یان سیستمێکی خاوەن دەسەڵات یان دیموکراسیەتیەکی دادپەروەرانە ژیانێکی دڕندایەتی درووست دەکات بەواتای پەنابردن بۆ شەریعەتی جەنگەڵستان، کەلەدژی هەژارو بێ دەسەڵات و بێ پشت و پەنا یەکلادەبێتەوە، کەسەرەنجام رکوکینەو شەڕخوازی درووست دەبێت و پاشاگەردانی میوانی نیشتمان و نەتەوە دەبێت، بەو پێیە کۆمەڵگەی ئێستا هەزاران ساڵ لەشارستانیەت و یەکسانی و مافی مرۆڤ و دادپەورەری دوور دەکەوێتەوە، دەرەنجامی نەبوونی دەوڵەت بۆ تاکی کورد سەرۆك خێڵ و یاسای خێڵ پەناگەی کورد بووەو بەناچاری پەنای بۆ بردووە، لەلای خۆیەوە ئەفلاتۆن پێیوایە باشترین ژیان بۆ مرۆڤ نایەتەدی ئەگەر لەسایەی دەوڵەتدا نەبێت بۆیە بێ دەوڵەتیش فاکتەری گرنگی هەستکردنی تاکەکانە بەکێماسی، ژیانیش لە رووی ئابووری و مافی کۆمەڵایەتی و سیاسی و مەعریفی و هەموو شێوەکانی بۆ تاك لەژیانی پەلەوەرو بوونەوەرەکانی ناو دەریاو مشەخۆرەکانی سەرزەوی بەولاوە هیچی دیکە نییە، نیشتمانی بێ دەوڵەت تیایدا مرۆڤ هەست بەترس و نیگەرانی و دڵەراوکێ دەکات چ لەدەرەنجامی ململانێ نابەرابەرەکان چ لەئاست هەستکردن بەجەورو ستەم و خۆ بەکەم زانین، باوەڕ ناکەم تاکی کورد لەسایەی سیستمێکی سەرمایەداریانەی دەرەبەگایەتی و سەرمایەداریانەی لیبرالیزمانەو مشەخۆر هەست بە تروسکایەك بکات بۆ ئایندەی نەوەکانی، بێگومان ئەم جۆرە هەستکردنە هەستکردن بەکەمی بۆ نەوەکانی داهاتوو دەخولقێنێت و زەنگی مەترسی بۆ لەناوچوونی دەسەڵاتی ناوخۆیی و گەڕانەوە بۆ پتر چوسپاندنی دەسەڵاتی خێڵ لێ دەدات، بۆ رەوینەوەی عەقڵیەتی خێڵەکیانەی کوردو بێ دەوڵەتیی تاکی کورد پێویستی بەدەوڵەتێکی نەتەوەیی دیموکراسی هەیە تا قۆناغ بەقۆناغ غەدری مێژووی لەبیر بچێتەوە، بەهەمان شێوەش ئیبن

خەلدون دووپات لەوە دەکاتەوە کەمرۆڤ بونەوەرێکی مەدەنیە بەسروشتی خۆی، بێگومان لەنەبوونی دەوڵەت هەست بەکێماسی دەکات، کەسێتی خودی کورد و سیستمی عەشایری و خۆبەکەم زانین بەرامبەر بێگانەو نەبوونی هزرمەندانی کوردو زاڵبوونی عەقڵیەتی عەسکەرتاری و خۆویستی و ململانێ و بردنەوەی گرەوو خۆبەستنەوە بە رابردوو و بیرنەکردنەوە لەئایندەو کاریگەری داگیرکەران و کۆنترۆڵکردنی عەقڵیەتی کوردو دوورخستنەوەیان لەبیری نەتەوەیی و درووستکردنی ئەحزابی غەیری نەتەوەیی گرێی خۆ بەکەم زانین لای تاکی کورد درووست دەکات، ئەمیش پێویستی بەدەیان ساڵ هەیە تا سەقامگیری و ئاسودەیی دەروونی لای ئەو تاکە درووست ببێت و لەدڵەراوکێی بێ دەوڵەتی رزگاری ببێ و هەستکردنی بەکەمی ببێتە هەوێنی شارستانیەت.

## نامۆبوونی کەسێتی:

### دۆزینەوەی خودی کوردی لەباوەڕی نەتەوەییدایەو نامۆبوونیشی لەداگیرکردنی خەیاڵی دایە

تاکی کورد ئەگەر بەجەستەو لەپێناو بەرژەوەندی هەنووکەیی لەدەرەوەی کێشەکانیدا ژیابێ ئەوا بەگیان و ئارەزووی نەستییەوە هاوبەشی لەکێشەکەیدا کردووەو لەسەر کەسێتی و باری سایکۆلۆژی رەنگی داوەتەوەو لەئاکامی داگیرکاری و چەوسانەوەی بەردەوامی نەتەوەیی و نەبوونی ئاسایشی کۆمەڵایەتیش نامۆبوونی بەخۆیەوە بینیوەو ناسنامەشی لەنەوەکانی بەشێوەیەك بزرکراوە کەتەنها لەرابردوودا بژی و زمان و مێژووشی خۆی کەدووبنەمای بنەڕەتی نەتەوەیین لێ نامۆ بکرێ و رابردووی داگیرکاری بۆ ئەو بووبێتە توێشەبەرەی ژیان و شەوچەرەی زستانە، بەرجەستەنەبوونی ئەو شوناسە یان ئەو ناسنامەیە کەناسنامەی (من) ی کوردە نیشانەی نامۆبوونی کەسایەتی کوردە کەلەبازنەی کێشەیەکی نەتەوەییەوە لەپێگەیەکی جوگرافی نامۆو ژێر رکێفی داگیرکەران سەچاوەی هەڵگرتووەو نەوە دوای نەوە کێشە نەتەوەییەکەی بەزمان و مێژووەکەشیەوە ململانێی بەرەنگاربوونەوەی لەکەسایەتی تاکی کورددا خولڤاندوە، تا (من) ەکانی کورد لەبەرنگاربوونەوەی هێرشەکانی سەر کێشەکەی بن ئەوا کەسایەتیشی رەنگدانەوەی ئەو کێشەیەیە، بەڵام گیانی بەرەنگاربوونەوە لەو (من) انەدا نەیهێشتووە کەسایەتی ببێتە قەیرانێکی سەخت وا خۆی بدۆڕێنێ ئەگەر چی ئایدۆلۆژیای هاوردەی نانەتەوەیی و نامۆ بەکەسێتی نەتەوە لەژێر ناوی جیاجیا هێرشیان بۆ هێناوە بۆ سڕینەوەی زمانی دایك و هەستی مێژووی نەتەوەیی، ئەگەر گۆڕان بەسەر ئەو بارەدا و داگیرکەری زمان و رۆشنبیریمان لەکۆڵمان نەبێتەوەو کۆمەڵگا لەخڵتەو خەوشی تاریك رزگاری

نەبێت، کە نەیارانی کورد بەچاوی رابردوویەکی زۆر دوورەوە دەڕواننە ئەو زاتە کوردیە بۆ ئەوەی رۆڵی هەبێت لەخزمەت بەخۆیان و هەر ئایدۆلۆژیایەکی سواوو نامۆو خێڵەکی و دوور لەئایدیاو هەستی نەتەوەیی کەهەرگیز ناتوانیّ خۆی دووبارە بکاتەوە، ئەوا هەستکردنی تاکەکان بەنامۆبوون زیاتر دەبێت.

ئەگەر چاکسازی ئاینی و ئابوری و پیشەسازی لەئەوروپا نەهاتبایەتە ئاراوە رەگەزی میّ ئێستاش هەر لەو قاوغەدا مابۆوە، کەسنگی کون دەکراو بەسەر جادەدا رایان دەکێشا، کەپێش شۆڕشی فەرەنساو پێش سەردەمی رێنیسانس تیایدا دەژیان، چونکە دووبارە بوونەوەی مێژوو دووبارە بوونەوەی چەوساندنەوەی سایکۆلۆژی تاکەکان دەبوو، بەهەمان شێوە تاکی کوردیش دووچاری هەمان سایکۆلۆژیا دەبێتەوە بەهۆی هەستنەکردنی بەئاسایشی دەوونی کەلەئازادی تاکدایە، چونکە لەو بارە ئازادییە کەتاك خۆی دەدۆزێتەوە زاتی کورد ئەگەرچی لەنامۆبوونیشدا بژی چیتر بیّ وشیاری نەتەوەیی ناژی کەمێژووی پیّ دووبارە بکرێتەوەو خزمەتی داگیرکارانی نیشتمانەکەی بکات، بەردەوامبوونی زاتی کوردی لەهوشیاربوونەوەی بەرامبەر چەوساندنەوەی سایکۆلۆژی خۆی لەخۆیدا رەتکردنەوەی رۆڵبینینی نانەتەوەییەتی کە رابردوو پێی گێڕاوە، کەلەئاکامی هۆکارە مێژووییە جوگرافیەکانی ناوچەکەو پێگەی نیشتمانەکەی و دووری لەدەریاکان رەورەوەی مێژوویان پیّ گۆڕیوە، کەوایکردووە نەتوانێت ئەلتەرناتیڤی چەوساندنەوەی مێژوویەکەی بدۆزێتەوەو ناچار بووە واقیعێکی کۆمەڵایەتی وای بەسەردا بسەپیّ کە (من) ەکانی تێدا بۆ ماوەیەکی درێژ بزربن، ئەو هۆکارە مێژوویی و جوگرافیایی و سیاسی و کۆمەڵایەتیانەش لەسەر باری دەرونی و (من) ی کورددا رەنگی داوەتەوە، بۆیە دەبیّ (خاڵێکی وەرچەرخان) بدۆزێتەوە بۆ رزگاربوون لەو قەیرانەو رزگارکردنی (من) ەکانی کورد و ئاسودەبوونی، چونکە چاوەڕوان بوون بۆ تامی ئاسودەیی لەو واقیعە کەهەزاران ساڵە ئەو پێکهاتە دەرونیە چەقبەستووەی بۆ دروست کردووین کارێکی نەزۆکەو نەزۆکیش بووەو نەزۆکیش دەبێت، نەسڕینەوەی ئەو یادەوەریانەش کەلەنەستی تاکی کورددا چەکەرەی کردووە هەمدیس پابەندبوونی تاکی کورد دەگەیەنێت بەو نامۆییە کەهەرگیز رۆڵی ئەوەمان ناداتیّ نەتەوەی نەك سەر دەست بەڵکو ژێر دەستیش بین، کەواتە خاڵی وەرچەرخانی ئەو رەوڕەوە مێژووییە بەستراوە بەئازادی و شوناسی تاکەکان، کەبەرەو زاتی نەتەوەییمان دەبات، کەواتە لە رەورەوەی مێژووش کەبەرەو گەردوونبوونمان دەبات دواناکەوین، چونکە

گەردوونبوونی (مـن) ەكانی تاكی كورد لەمانەوەی منەكانی ناو خێڵ و عەقڵیەتی خێڵەكی ئاسودەترەو ئەگەری رزگاربوون لەسایكۆلۆژی دواكەوتووی ئەو مێژووە خێر لەخۆنەدیوەی زاتی كورد پەسەندترە لەمانەوەی چاوەڕوان بوونی كاسەی دراوسێ، كەوامان لێدەكات بەبێ شیوو سەر بنێینەوە، ئەو خاڵی وەرچەرخانەش دەشێ بەجیهانی بوون بێ، بەدامەزراوەكردنی وڵات بێ، بەفێركردنی تاكەكان بێ، بەدروستكردنی كەسێتی تاكەكان بێ لەرێگەی پەروەردەو رزگاربوونی تاك لەململانێی حزبایەتی و بەحزبیكردنی پەروەردە، هەروەسا رزگاربوونی تاكەكان لەهەستی دابەشكردنی خەڵك بەسەر حزبەكان و دوور خستنەوەیان لەگیانی نەتەوایەتی و دابینكردنی ئاسایشی كۆمەڵایەتی، بۆئەوەی سایكۆلۆژیای وا لەكەسایەتی كورد دروست بكات بتوانێ (وتار) رێك پێشكەش بەدەوروبەر بكات كەتەواو جیاواز بێ لەو وتارەی بۆی و بەناویەوە پێشكەش دەكرا، كەهەزاران ساڵە كورد نەیویستووە پشت لەدەوروبەر بكات كەچی دەوروبەریش هەمیشە خیانەتیان لێكردووەو كەسایەتی ئەویان بەرەو فەنابوون پەلكێش كردووە یان بەرەو توانەوە لەبۆتەی خۆیاندا بردووە، بۆیە رزگاربوونی (من) لەقەیرانی كەسایەتی تاكی كورد دا چاوەڕێ نەبوونی دەستی كەرەمی ئەوانە، كەسایەتی تاكی كورد تەنهاو تەنها لەبازنەی قەوارەی نەتەوەییدا دوور لەعەقڵیەت و سایكۆلۆژیای خێڵ و هۆزو عەشیرەت و تایەفەگەری دەردەچێت و دەتوانێت ناسنامەی زاتی نەتەوەیی خۆی بدۆزێتەوە، چونكە هەروەكو چۆن سەربەخۆبوونی تاك لەخێزان دۆزینەوەی ناسنامەیە، بەو پێیەش سەربەخۆبوونی تاكی كوردو رزگاربوونی لەهەر بازنەیەكی سایكۆلۆژی مێژوویی لەنەستەوە هاتووی خێڵەكێتی و دۆزینەوەی ناسنامەی زاتی كوردە، بەپێچەوانەشەوە بزربوونی ناسنامەكەی و توانەوەیەتی لەبۆتەی دوێنێدا، كەكەسانی تر جڵەویان گرتۆتە دەست، ئاسودەیی تاكی كورد لەهەر رەوتێكی دەرەوەی نەتەوەییدا ئاسودەیی كاتی ئەو منداڵەیە كەمۆركی نەتەوەیی لێ بزركراوە، بەڵام لەگەڵ هەراشبوونی، ئەو ئاسودەییەش لەدەست دەدات، چونكە قۆناغی سەربەخۆیی وەكو كردەیەكی مێژوویی دێتە ئاراوە، بەو پێیەش كورد (وتار) ی خۆی نابێ تا دواكەوتوویی ئەو هێڵە مێژووییە دەرەوەی (من) ی كورد بێت، ئەمەش چاوگی كێشەی كەسێتی و رەفتاری تاكی كوردە، ئەگەر چی دركیشی پێ نەكردبێ، بەڵام مێژووی نەتەوەیی پێ زەرەرمەند بووە، بۆ دەرباز بوون لەو قەیرانەش پێویست بەسەرلەنوێ بنیاتنانەوەی زاتی كوردە ئەویش بەبەخۆدا چوونەوەی ئەو زاتەو تەقاندنی ئەو بەربەستە

سایکۆلۆژیەی، کەزاتەکان بەرابردووەوەو پابەند دەکات و لەقۆناغی بەجیهانیبوون دوا دەکەوێ و نیشتمانیش لەتاکەکان نامۆ دەبێت و ناچار بەجێ دەهێڵرێت و بەمەش کەسێتی زیاتر دەکەوێتە قەیرانەوەو (من) ی کوردیش تا لەو هەستی بەئاسودەیەی رابردو و تا ئاسودەیی ئایندە رزگاری نەبێت و فۆرماتی سایکۆلۆژی بۆ نەوەکانی لەخوێندنگاکانەوە نەکات هەمیشە لەنامۆبووندا دەژی و ناتوانێ سەکۆی (وتار) بۆ خۆی دروست بکات، لەلایەکی تریشەوە هەر لەسەرەتای مێژووەوە تا ئێستاش وەهمی دەروونی نێوان نێرومێ لەگەڕان بەدوای ناسنامەدا کۆسپ بووە بۆ نەدۆزینەوەی ناسنامەی من کە (من) ی مێ لەبازنەی نەتەوەییدا لەگەڵ (من) ی نێر لەهەمان بازنەدا جیاکراوەتەوە ئەمەش سروشتی سایکۆلۆژی نەتەوەیی پەسەندی ناکات و پێویست بەبەخۆداچوونەوەی ئەو (من) انە دەکات، چونکە بنەچەی منەکان لێك جودا نین بەڵکو وەهمین و دەستکردی سایکۆلۆژیایەکی دەرەوەی سروشتی کەسێتی تاکی کوردن و بەسەریدا سەپێنراوە کەپاشکۆی کەسانی تر بن و خزمەت بەعەرەب یان تورك یان فارس و بیانی بکەن بەناوی هەر شتێکەوە بێ، لێرەدا سنورەکانی نێوانمان تەنها لەسەر کات و شوێن بەندەو بەگۆڕینی کات شوێنیش لەو بازنە وەهەمیەدا دەگۆڕێ و ئەو گۆڕانەش کاریگەریان لەسەر (من) ەکان دەبێت و ڕەورەوەی مێژووش ناوەستێنرێ، بەڵام تاکی کورد بەشێوەیەك هەوڵدراوە لەخشتەی ببەن بەناوی هەر ئایدۆلۆژیایەکەوە بووبێ کەرێگە لەمنەکانی بزربکرێ و خۆی نەناسێتەوە، ئەو خۆنەناسینەوە ئامانجی سایکۆلۆژی و شتنەوەی مێشکی تاکی کورد بووە بەنێرومێ و لەلایەن دەوروبەروە، چونکە خۆ نەناسینەوەی (مێ) ی تاکی کورد پابەند بوونی ڕۆڵەکانی دەگەیەنێت بۆ تێنەڕوانین لەئایندە، ئەو ئایندەیەی کەهەرگیز پێشوازی لەجیاکردنەوەی (من) ە نێرومێکان ناکات، بۆیە پێویستە لەرەوتی بەقەیران نەبوونی کەسایەتی کورد (من) ەکان خۆیان بناسنەوە ئەمیش بەداڕشتنی فەلسەفەی نوێی دەوڵەتە بۆ پەروەردەو چێکردنی زات و سایکۆلۆژیای نەتەوەیی لەتاکەکاندا.

## راپەڕین و ئازادی:

**توندوتیژیەکانی مێژوو بۆسەر تاکی کورد زەبریان گەیاندۆتە کەسایەتی ئەو تاکانە بۆیە ئارەزو ی دەروازەیەك دەکات ئەو زەبرانەی لێوە دەرپەڕێنێ ئەویش دەروازەی دیموکراسیەت و ئازادییە**

ئەگەر لەروانگەی سایکۆلۆژیاوە بڕوانینە رەفتاری دیموکراتی تاك دەتوانین بڵێین: (رەفتاری دیموکراتی ئەو رەفتارەیە کەلەناخەوە بیروڕای خەڵکانی دی رەتناکاتەوەو خۆیشی لەبەرامبەر هەر بیروڕایەکی تردا هەست بەکێماسی ناکات و توانای خۆگونجاندنی تەندروستیانەی لەگەڵ هەر گۆڕانکاریەکی بەرەو پێشڤەچوونی کۆمەڵگەهەیە) .

پاش راپەڕین وێڕای کەموکورتیەکانیش کەزیاتر لەمیکانیزمی رەفتاری دیموکراتی تاکی کورددا دەردەکەوێت نەك لەئارەزووی پیادەکردنی ئەو رەفتارەدا ئەوا ئەو ئارەزووە تۆوی خۆی لە کوردستاندا چاندووو زەمینەش لە (نەست-لاشعور) ی تاکی کورد بۆ ئەوە لەبارە کەخولیاو ئارەزووی خۆشگوزەرانی و ئازادی و دڵنیایی لەناخیدا بێ ناز ماوەتەوەو چاوەڕوانی رۆژێکی وەك راپەڕین بوون موژدە بێ هەڵهات لەرووی بێبەشبوونی تاکی کورد لەئازادی کەتەنها لەناخیدا حەشاری داوەو زەبرێکی دەروونی لەگیانیدا درووست کردووە، ئەگەر مرۆڤیش لەژیانیدا دووچاری هێدمەی دەروونی بووبێ ئەوا ئەو هێدمەیە بەئاسانی لەگیانیدا دەرناچێت، بەڵکو لەدەروازەیەك دەگەڕێت کەدەری پەڕێنێت، توندوتیژیەکانی مێژوو بۆسەر تاکی کورد زەبریان گەیاندۆتە

کەسایەتی ئەو تاکانە بۆیە بەکردەوە لەپاش راپەڕینەوە بەدوای دەروازەیەکەوەیە کەئەو زەبرانەی لێوە دەرپەڕێنێ ئەویش دەروازەی دیموکراسیەتە کەلەنەستەوە ئارەزووی دەکات، ئەگەرچی لەرووی روالەتیشەوە دامەزراوەکانی دیموکراتی لەئاکامی هۆکاری دەرەوەی کایەی کوردستانی نەگەیشتۆتە ئاستی پیادەکردنی دیموکراسی، رەنگە لەروانگەی کورد خۆیەوە تێڕوانین و بیرکردنەوە سەبارەت بەدیموکراسیەت لەکوردستان جۆراوجۆر بێت و ئارەزووی بارودۆخێکی بەرزتر دەکات، چونکە لەو شێوازە هەست بە خۆزگارکردنێك دەکات لەتەپ و تۆزی مێژوودا، لەلایەکی تریشەوە دەیەوێت ئەو رزگارکردنە بەرجەستە بکات و ترسی زەبرەکان لەخۆی دوور دەخاتەوەو زۆر بەرەواشی دەزانێ بەراشکاوی و لەناخەوە بێئەوەی سلبکاتەوە دان بەبیرورای نەتەوەکانی تری کوردستاندا بنێت، کورد وەکو نەتەوە لەشوێنێکی جوگرافی و سیاسی وادا دەژی دەوروبەری دەیان سالە دەولەتن خۆ ئەگەر خۆی بەراورد بکات لەگەلّ تاکەکانی ئەو دەولەتانەو ئەو حکومەتانە ئەوا بێگومان بەو پێگەیە، کەهەیەتی شایەدی بۆ ئەدرێ کەلەچاو ئەواندا باشترە، هەر لەکوردستاندا دەیان خوێندنگای تورکومانی کراوەتەوە بەزانکۆشەوە کەچی لەتورکیا کورد بۆی نییە بەزمانی خۆی قسەش بکات، ئەمە پەیوەندی بەسایکۆلۆژیەتی ئەوان و ئێمەوە هەیە، کەرەفتارێکی دەگمەنە لەرەفتاری دیموکراسی لەمێژووی نەتەوەکانی دەوروبەرمان، لەو جۆرە رەفتارە گشتیکردنێك هەست پێدەکرێت کەهەر شتێك مرۆڤ ئارەزووی بکات وەکو دیموکراسیەت و سیستمی پەرلەمانی ئەوا ئارەزووی شتە لەو چووەکانیش دەکات، هەر شتێکیش هەڕەشە لەمرۆڤ بکات ئەوا شتەلەو چوەکانیش دەکەونە بەر پەلاماری رکوکینەی ئەو مرۆڤە، زەبرو زەنگ و دیکتاتۆریەت وتاکڕەوی زەبری دەرونیان بەکورد گەیاندووە، لەبەرئەوە هەرشتێك لەوبچێت کورد دژی رەفتار دەکات، بەپێچەوانەشەوە لەگەلّیدا خۆی رادەهێنێت، فەراهەمکردنی خوێندن و کاری سیاسی غەیری کورد لەهەرێمی کوردستان گەواهی ئەو راستیەن، لێرەدا دیموکراسیەت رەوینەوەی زەبرە دەرونیەکانی تاکی کوردە، بۆیە ئەگەر بوار بدرێت ئەوا کوردستان دەبێتە پێگەی رەفتاری دیموکراتی رۆژهەلات و پاراستنی مافەکانی مرۆڤ، ئەو رەفتارە دەروازەی رزگاربوونی تاکی کوردە لەبەر ئەوە هەرشتێك بۆنی دیموکراسی لێبێت هەست ونەستی بۆ دەجولێت ئەگەر چی عەقلیەتی خێلّ تا رادەیەك زالە بەسەر سیاسەت و ژیانی کورددا، بەپێی یاسای گشتیکردن کەبنەمایەکە لەبنەماکانی بیردۆزی فێربوون، ئەوا تاکی کورد بەبێ رەفتاری دیموکراسی کەبۆنی گەشبینی و پشودانی لێدەکات هەلناکات، کەموکورتیش لەو رەفتارە پاش

راپەڕینی ١٩٩١دەگەڕێتەوە بۆ میکانیزمی جێبەجێکردنی دیموکراسیەت و راهێنان و فێربوونی دابونەریتی دیموکراتی و ویستی کۆمەڵگەی نێو دەوڵەتی نەك گیانی دیموکراسیەت کەتاکی کورد بەپێی یاسای گشتیکردن بەهەوێنی ژیانی خۆی دەزانێت بەمەبەستی رەوینەوەی زەبرە دەرونیەکانی زەمانەکە کەلەنەستی کورددا نیشتووە، بەو پێیەش رەفتاری دیموکراتی تاکی کورد لەنێوان ئارەزووی نەستیانەی دیموکراسیە لەلایەك و میکانزمی جێبەجێکردن و رەفتارگەری تاکی کوردە بۆ رووداوی دیموکراسیەتی لەناکاوهاتووی پاش راپەڕین و لەئەنجامی خێرایی رووداوەکانی ناوچەکە.

بۆفێربوونی هەر رەفتارێکیش لەسۆنگەی سایکۆلۆژیاوە پێویستە ئارەزوویەك لەئارادا بێت، لەبەر ئەوە پێشوازیکردنی روناکبیرو تاکی کورد لەدیموکراسیەت و پتەوکردنی پەیوەندیەکانی لەگەڵ دەرەوە بێ ئەو ئارەزووە نەبووە کەلەناخی گەلەوە سەرچاوەی هەڵگرتووە، کە بۆتە توێشەبەرەی رێگای دیموکراسیەت، کەواتە دیموکراسیەت دەرهاویشتەی ئێشو ئازارەکانی تاکی کوردو بەرێککەوت نەهاتۆتە ئاراوە، ئەگەر بەرواڵەتیش فێری سەرتاکانی دیموکراسیەت نەبووین ئەوا لەناخەوە ئارەزووی دەکەین.

## ڕەفتاری مێگەل:

**لەنێو حەشامەتی جەماوەریدا تاك جڵەوی ڕەفتارەکانی خۆی ناکات و سایکۆلۆژیەتی مێگەل بەڕێوەی دەبات**

تاك بەجەستەو عەقڵ خاوەن خودی خۆیەتی و خۆی خۆی بەڕێوەدەبات و دەپرسێت و بۆ بەرژەوەندیە دوورو نزیکەکانی ڕێچکەی عەقلانیزم دەگرێت و بۆ بەدیهێنانی خواستەکانی لۆژیکییانە هەنگاو دەنێت و جڵەوەی بزاڤە ویژدانی و ئەخلاقیەکانی خۆی دەکات و هاوسەنگانە خۆی دەسازێنی بەو شێوەیەی کەئەکتیڤ و کارا بێ و ڕەفتارەکانی دژی شەپۆلی عەقڵ و هۆش نەبێ، تاك ڕێگە خۆش ناکات غەریزەو ڕەمەکە هەوەسبازەکانی بەڕێوەی ببەن و بەهۆی ئەو غەریزەو خۆش هەوەسییانە کەسێتی و هۆش و خودی مرۆییانەی خۆی لەبیرناکات و بەزوڕنای زۆرینەش هەڵناپەڕێ، بەڵام هەر ئەو تاکە لەنێو حەشاماتی عەوامی خەڵکدا عەقڵی خۆی لەدەست دەدات و بەزوڕنای ئەوان هەڵدەپەڕێ و بەبای ئەوان شەن دەکات و مێگەلانە ڕەفتار دەکات و کوێرانە لاسایی دەکاتەوە بەو شێوەیەش لەئاست بیرکردنەوەدا کەسێکی بێ دەسەڵات دەبێت هەر وەکو مەیمونەکانی ستیفنسون کەپێشتر باسمانکرد، تاك لەناو حەشاماتی وەکو ڕاپەڕین یان جەماوەری وەرزشی یان ئاهەنگ و بۆنەکان یان هەر جۆرە حەشاماتێکی تردا وەکو ئەوان دەکات و کوێرانە لاساییان دەکاتەوەو ناعەقلانەو ناهۆشیارانە ڕەفتارەکانی ئەوان دەکات، بەڵام ئەمە ئەوە نییە کە دەڵێن لەگەڵ عامێ بچۆ شامێ و کەچوویتە شاری کوێران دەست بەچاوتەوە بگرە، چونکە ئەم دەست بەچاوگرتنە بۆ خۆگونجاندن

و خۆڵەگەڵ خستنەو تاك بەهۆشیارییەوە دەست بەچاوی خۆیەوە دەگرێ و لەهەمانکاتدا دەبینێ، رەفتاری بێ جڵەوی تاك لەنێو حەشاماتدا دیارە پەیوەندە بەمۆرکێکی کۆمەڵایەتی و لاساییکەرەوەییانەی تاکەوە کە لەنێو منداڵاندا بەرجەستە دەبێ و زۆر بەروونی لەنێو کۆمەڵی منداڵاندا دەردەکەوێ، بۆ نموونە کاتێك چەند منداڵێك بەدوای کەسێك بکەون و بڵێن ئەمە شێتە هەموو منداڵانی گەڕەك خۆیان لەگەڵ ئەو چەند منداڵە دەدەن و هەمان رەفتاری ئەوان دەکەن و بەهەموو کییان و هۆشی خۆیانەوە ئەو کەسە بەشێت لەقەڵەم دەدەن بێ ئەوەی هیچیشی لەبارەوە بزانن تەنها لاساییکردنەوەیەکی کوێرانە ئەنجام دەدەن، دوای تەواوبوونی سیناریۆکەش هەموان بەپێکەنینەوە پەرت وبڵاو دەبنەوە وەك بڵێی نەبایان دیوە نەباران و دواتر وەك بەسەرهات و رووداوی راستەقینە دەیگێڕنەوە، هەروەها لەیاریە وەرزشیەکانیشدا کەتوندوتیژی بەهۆی چەند کەسێکەوە سەدان کەس لەگەڵ خۆیدا پەلکێش دەکات، کەدەکرا ئەم سەدان کەسە بەشداری ئەو توندوتیژیە نەکەن و هەر ئەوانەشن کەکەسی رۆشنبیرو خاوەن بروانامەو پیشەی جۆراوجۆرنیان تێدایە بەڵام هەمویان دەچنە ئەو هەوەسەوە کەهەوەسی توندوتیژی مێگەلیانەیە، هەر ئەم لاساییکردنەوەو مۆرکە کۆمەڵایەتیەیە تاك لەهەڵوێستی سلبیدا پەیڕەوی دەکات و بەرەو ناو رەفتاری عەوامی خەڵك و حەشامات پەلکێش دەبێت، پەلکێشبوون بەرەو حەشاماتی خەڵك مۆرکێکی کۆمەڵایەتی ماڵی نەکراوەو لاساییکردنەوەیەکی کوێرانەی منداڵ ئاسایە وەك مێگەلەمەڕو رەوی باڵندە، کەغەریزەکانیان بەرەو رەفتاری بەکۆمەڵ پەلکێشیان دەکات لە کۆچکردن و مۆڵدان لەشوێنێکدا، ئەم مۆرکە سایکۆلۆژیایەکی وای بۆ درووست دەکات کە مەیلی رەفتارو هەڵسوکەوتی ئەو حەشاماتە بکات ئەگەر ئەو حەشاماتە لەخۆشیدا بێ یا لەناخۆشی، لەگۆڕەپانی وەرزشدا وەك باسمان کرد لەکۆتایی یارییدا کە دۆڕاندی لایەکی تێدا دەبێ ئەگەر هەندێك لە ئامادەبووان پەنا بۆ توندوتیژی ببەن ئەوا زۆربەی زۆری ئەگەر بەشێوەی واتاییش بێ پەنا بۆ توندوتیژی دەبەن و تیمی بەرامبەر و جەماوەرەکەیان بەرد باران دەکەن یان رکوکینەیەك بەرامبەر تیمی بەرامبەر تیایاندا درووست دەبێت و لەرەفتاری دەمارگیریاندا رەنگ دەداتەوەو مەودای ئەو دەمارگیرییە فراوانتر دەبێت و دەگاتە رك لێبوونەوە لە شارو وڵاتی تیپە وەرزشییەکەش، بەهەمان شێوە ئەو دەمارگیرییەی نێوان خەڵکی دووشار یان دوو نەتەوە یان دوو گەڕەك یان دوو ئاین پەیدابووە هەمان کاریگەری عەوامە لەسەر تاك، یان لەراپەڕینی کوردستاندا خەڵك وێرای ئەوەی

هێرشیان بردە سەر دەزگا داپڵۆسێنەرەکانی بەعس هەندێکیشیان دام و دەزگا مەدەنیەکانیشیان بەتاڵان برد ئەو بەتاڵان بردنە لەبەرنامەی کەسدا نەبووە کەئەنجامی بدات بەڵام کەجەماوەر هێرشیان برد تەڕو وشکیان پێکەوە سوتاندو هەندێ خەڵك کتێبخانەکانی ناو ئەنجوومەنی بەناو تەشریعی کوردستانیان تاڵان کردو دەیان کتێبی بەنرخ و بەهاداریان خستە بازاڕی فرۆشتنەوەو بۆ بەڵگەش خۆم یەکێك لەو کتێبە بەتاڵان براوەم لەتەنیشت قەڵای هەولێر ککەدوای ماوەی راپەڕین دەفرۆشرا کڕی بەناونیشانی (الوپائق السریە لحرب فیتنام) هەندێکیشیان سوتاندو پەیڕەوی هیچ نیزامێکی مەدەنی و بەرژەوەندی گەل و نیشتمانیان نەکردو لەهەمان کاتدا هەندێ کەسیش هەوڵی پاراستنی ئەو کەلوپەلانەی دەدا کەتوانیان کۆنترۆڵی خۆیان بکەن و هەست بکەن ئەوە موڵکی گەلە، لەماوەیی راپەڕین و حەشاماتی خەڵکدا حاڵەتی هەڵچوونی سیاسی تێکەڵ بەهەوەس و رەفتاری لاسایی‌کەرەوانەوە دەبێ و بەهاو داب و نەریت و پێوەرە عەقڵانییەکان پشتگوێ دەخرێن، ئەم جۆرە ئەم حاڵەتانە کۆمەلژانی فەرەنسایی تارد١٨٤٣-١٩٠٤ دووپاتی دەکاتەوە کەدەڵێ رەفتاری تاك لە ناو حەشاماتدا عەقڵانیزم لە دەست دەدات و پشت بە گێڕانەوەو لاسایی‌کردنەوە دەبەستێت واتە شتێك دەماو دەم دەگێڕدرێتەوە خەڵکی ئاسایی بڕوای پێ دەکەن بێ ئەوەی لێکی بدەنەوە ئەگەر پەیڕەویشی نەکەن ئەوا کار لەباری دەروونیان و بۆچوونەکانیان دەکات بەتایبەتیش لەکاتێکدا خەڵك خۆش باوەڕ بێت، دوای ئەمیش زانایەکی سۆسیۆلۆژی گوستاف لوبون ١٨٤١-١٩٣١هەمان رای هەبوو کە ئاماژەی بە ناکۆکی نێوان عەوامی خەڵك و نوخبە دەدات، کەدەڵێ: نیشانەی بنەڕەتی حەشامات بریتیە لە غیابی تاکێتی و بەرپەرچدانەوەو سەرهەڵدانی غەریزە سەرەتاییەکانی، هەروەها ئاماژە بە لەدەستدانی لۆژیك دەدات کە ئەمیش لەدەستدانی هەستکردن بە بەرپرسیارێتی شەخسییە بەرامبەر بەرژەوەندی گشتی و پێوەرەکانی کۆمەڵ، ئەم سیفاتانەش وا لەحەشاماتی خەڵك دەکات ببێتە کیانێکی ئاژاوەگێڕیی بێ نیزام و پاشان پێویست بوونی بە نوخبە بۆ رێکخستنەوەیان.

تاك کاتێ مافی تەنهایی بەخۆی دەدات و لەخۆی رادەمێنێ و بەرەفتارەکانیدا دەچێتەوە لایەنی عەقڵی زاڵە بەسەریداو هەوەس و حەزو ئارەزووەکانی دەخاتە چوار چێوەی بیرکردنەوەی عەقڵانیەوە، مرۆڤ لەم کاتەدا ئەو پەڕی پابەندە بەیاساوەو نایەوێ ئاژاوە بنێتەوە بەڵام کاتێ دەکەوێتە نێو حەشاماتی خەڵکەوە ئەو بیکردنەوەیەی نامێنێ و بەشێوازێکی مێگەلیانە

ڕەفتار دەکات بۆ نمونە کاتێ جەماوەری هاندەری تیپێکی وەزرشی هێرش دەکەنە سەر جەماوەری رکابەریان لەچوارچێوەی یاسا دەردەچن و ئاژاوە دەنێنەوەو هەموو ڕەفتارێکی سلبی دەگرنەبەر لەتیروتوانج و هەندێجاریش شەڕو هەراو کوشتن و بڕین، راپەڕینە جەماوەریەکان کە لەوڵاتان ڕوودەدات و لای خۆمانیش وەك باسمان کرد لەکاتی راپەڕانیشدا خەڵك کە هێرشی دەکردە سەر دام و دەزگاکانی دەوڵەت هەموو شتێکی تێکدەداو تەنانەت کەلوپەل و تفاقی قوتابخانەو نەخۆشخانەکانیان بەتاڵان برد و قەرەوێڵەی نەخۆشیان لەکۆڵانەکان رادەکێشا و فایل و دۆسیە تایبەتی و گشتیەکانی دام دو دەزگاکانی دەوڵەت و ئەوانەی پەیوەندن بەبەرژەوەندی خەڵکەوە بوو سوتاو ژێر پێ خران و هەرچەندیشە لەرادیۆکانەوە هاوار دەکرا بۆ پاراستنی نیزام و ئارامی سوودی نەبوو، لەوسەردەمەدا ئەگەر ئاماژەیان بەکەسێك بکردایە کە پیاوی رژێمە هەر هەموو بەوانەشەوە کە ئەو کابرایەیان نەدەناسی هێرشیان دەکردە سەر، چونکە لەو حەشاماتەیە مرۆڤ لێکدانەوەو لێکۆڵینەوە دەداتە دەست هەڵچوونەوەو لاساییکردنەوەی کوێرانە جلەوی دەکات، تاك هەمیشە مەیلی کۆمەڵ دەکات لەکاتە خۆش و ناخۆشەکاندا ئەو کاتانەی کە گوێبیستی ئاوازی سەمایەك دەبێ و دەبینێ خەڵك بەو ئاوازە سەما دەکەن ئەویش دوو دڵی ناکات و بەشداری دەکات، ئەگەر کۆمەڵێك چەپڵە لێ بدەن ئەمیش بێ ئەوەی بزانێ مەسەلە چییە چەپڵە لێ دەدات، تاك مەیلی ڕەفتارێکی باو دەکات کە بەدڵیشی نیە یان بەراستیشی نازانێ بەڵام لەبەر قسەی خەڵك هەر دەیکات نموونەش بۆ ئەمە کاتێ کەسێك نەخۆشیەکی دەروونی دەبێت لەشوێنێکی نارەسمی و ڕێپێنەدراو چاك بۆتەوە ئەوانی تریش ڕوو لەو شوێنە دەکەن ئەگەر حاڵەتەکەش هەمان حاڵەت نەبێ، لەم ڕوانگەیەوە لێکۆڵەرەوان ئەزمونێکیان لەبارەی کاریگەری تاکەوە لەسەر ١٠ کەس ئەنجام دا کە ١٠ کورسیان هێنا نۆ لەو کەسانە لەسەر نۆ کورسی دانیشتن بێ ئەوەی دەیەم بزانێ، بەهەر نۆکەسەکە ڕاگەیەنرابوو کە لەدەرەوەی ژوورەکەوە گڵۆپێکی سوور هەڵدەکرێت و ئەگەر پرسیاریان لێکرا هەمووشیان بڵێن گڵۆپی سەوز بووە، بۆیە کەسی دەیەم کەلەسەر کورسی دانیشتبوو ئاگای لەمەسەلەکە نییە ئەویش کاتێ پرسیاری لێکرا گڵۆپەکە سەوز بوو یان سور ئەویش وەکو نۆ کەسەکە وتی گڵۆپەکە سەوزە، ئەم وەڵامە هەڵەیە کاریگەری نۆ کەسەکەی ترە بەسەر ئەم کەسەوە کە لەبەرئەوە تەنها بووە کەوتۆتە ژێرکاریگەری ئەوانەوە.

ئەم نموونەیەو دەیان نمونەی تر لەکۆمەڵگەی کوردەواری، بە پێی روانگەی زانا تارد لاساییکردنەوەی کوێرانەی تاك بۆ کۆمەڵ لەدەستدانی ئەو عەقڵەیە یان خۆش باوەڕی خەڵك بەرامبەر هەر رووداوو کە یەکێك یان چەند کەسانێك بیانگێڕایەتەوە کەسانێکی تر باوەڕیان پێی دەکرد بێ وئەوەی بەعەقڵ لێکی بدەنەوە کە ئەو رووداوە یان ئەو هەقایەتە ناچێتە عەقڵەوەو دوورە لەراستی، عەلائەدین سەجادی لەرشتەی مرواریدا بەئاشکرا ئاماژەی بەم چاولێکەریی و خۆش باوەڕییەی خەڵك داوە کەوا رۆژێك پڕوپاگەندە بڵاوببوەوە گوایە بزنێك گۆرانی دەڵێ، خەڵك هەموو کەوتنە رێ بۆ بینینی بزن، ئیدی پرسیاریان نەدەکرد کەچۆن بزن دەتوانێ گۆرانی بڵێ لەکاتێکدا ئەوە ئاژەڵەو توانای نوتقی نییە، ئەی کەواتە چۆن دەتوانێ گۆرانی بڵێ، لەناو حەشاماتی خەڵکدا تاك بەهۆی لاساییکردنەوەوە تاك ئەو رەفتارانە ئەنجام دەدات کەکەسانی تر ئەنجامی دەدەن رەنگە بۆ ئەوان تا رادەیەك ئاسایی بێ بەڵام بۆ ئەم ئاسایی نەبێ، هەندێ لەم رەفتارانە دەگەڕێتەوە قۆناغی منداڵی کە منداڵ کوێرانە لاسایی منداڵانی تر دەکاتەوە، لەنێو ژنان و ئافرەتانیش رەفتاری لاساییکردنەوە بێ لێکدانەوە زۆرە کە هەڵدەستن بەگۆڕینی تفاقی ناوماڵ ئەگەر بەقەرزیش بێ، شایی و زەماوەندی کوردەواریش رەوشێکی ترە کە تاك تیایدا دەکەوێتە بارێکی دەرونی ئەوتۆوە بەهەموو کیانیی قەوارەی خۆی لاسایی دەکاتەوەو بەگەرمی هەڵدەپەڕێ و لەو هەڵپەڕینە خۆی لەبیر دەکات بەتایبەتیش سەرچۆپی گر، کەهەندێجار سەرچۆپیگرتن بووەتە مایەی شەڕو هەراو کەسی لەسەر کوژراوەو کەسانێك هەن ئەگەر کەسێکی تر سەرچۆپێکەیان لێبسێنێتەوە پێیان ناخۆشەو نایدەن یان شەڕێکی گەورە دەنێنەوەو خەڵك دەکوژرێت و شایی دەبێ بەشایلۆغان، ئەگەر لەبەردەمی خەڵك و لەناو حەشاماتدا نەبێ ئەو حاڵەتە رووناداتت یان سووك تر دەبێ، ساتی کوشتنیش مانای وایە ئەو کەسە غەریزە بەڕێوەی دەبات، ئەم جۆرە کەسانە نوخبە نین و کەسانی نوخبەش ئەوە ناکەن، بەپێی بیروڕای زانا تارد کەسانی خۆش باوەڕو ئەوانەی بەگێڕانەوەی شتگەلێکی بێ بنەما سەرسام دەبن و لەوانەن کەزوو فریو دەخۆن و نامەنتیقی بەسەریاندا زاڵە، سەرەڕای ئەوەی باسی تاك دەکەین بەڵام تاکی نوخبە ناگرێتەوە واتە کەسانێك کە ناچنە ژێر ئەو بارەوەو لەناو حەشاماتدا فریو ناخۆن ئەوانە نوخبەن یان دەستبژێرن، لێرەدا نوخبە مەرج نییە خوێندەوار بێ بۆیە زۆر پێویستە پرۆسەی پەروەردەیی جەخت لەسەر لێکدانەوەی عەقڵی و بیرکردنەوە بکات و منداڵ ورابهێنرێ کەبپرسێ کێ؟، بۆ؟، چۆن؟، کەی؟، لەکوێ؟.

## دەنگدان:

**ڕەگەزپەرستی و نەرگزیەت و نەخۆشیە دەرونیەکان هیچ دروستیەك بۆ پرۆسەی دەنگدان ناهێڵن.**

بۆ کورتکردنەوەی ڕێگای دووردرێژی شەڕو چەکداری و بۆ دوورکەوتنەوە لەتوندوتیژی و فێربوونی پێکەوەژیانی ئاشتیانەو گەشەپێدانی گیانی لێبوردەیی و کەمکردنەوەی دڵەراوکێ، هەڵبژاردن نزیکترین دەرمانخانەیەو دادوەرێکی بێدەنگە، وەلی کێشەی دەنگدەر لەباری دروونیدایەو پێویستە روون بکرێتەوە چوون پرۆسەی هەڵبژاردن بریتیە لەپەروەردەکردنی سایکۆلۆژییانەی تاك و هەر ئەو سایکۆلۆژییایە دەبێتە پاڵنەری ئارەزووی بەشداریکردن یان بەشدارینەکردنی ئەم پرۆسە دیموکراسیە، نەخۆشی و گرفتە دەرونیەکانی دەنگدەر لەبۆچوون و نەرگزیەت و خۆپەرستی و رەگەز پەرستی ودەمارگیری بەهەموو شێوەکانیەوەو سادێتی و ماسۆشێتی و کەللەرەقی و بەرژوەندی شەخسی کار لەهەڵبژاردنی کاندیدەکەی دەکات، بەپێی بیروڕای زانایانی سایکۆلۆژی چووونە ناو پرسی هەڵبژاردنەوە لەلایەن تاکەوە لەدوو لایەنی دەروونیەوە سەرچاوە دەگرێت ئەویش (بۆچوون _ attitude) و ( (بڕیاردان _making decision) ) ە کەکاریگەریان لەسەر چۆنێتی هەڵبژاردنی ئەو کاندیدەی هەڵدەبژێردرێ هەیە هەروەکو چۆن کاریگەرییان لەسەر ژیانی کۆمەڵایەتی و دەروونی و رەفتاری تاك هەیە، وەك هەر کارلێککردنێکی تری لەگەڵ کۆمەڵگا بۆچوونەکانی کاری لێدەکات لەپەیوەندییەکانی لەگەڵ دەوروبەرو تێڕوانینی بۆ خودو هەستەکانی بەرامبەر کەسانی دی و شێوازی بیرکردنەوەو چۆنێتی هەڵچوونی، کەواتە بەشێك لەمەیلی دەنگدەر وەك تاکێك بۆ هەڵبژاردنی کاندیدێك پەیوەندە بەباری سایکۆلۆژی دەنگدەرەوە کەئەمیش لەناوەڕۆکدا پەیوەندی بەپەروەردەی قۆناغی منداڵی و رۆشنبیریەوە هەیە، لەسەرەتاوە منداڵ بۆ بەدیهێنانی

پێویستیەکانی تا ئەو کاتەی بوونەوەرێکی بایۆلۆژیی ناکۆمەڵایەتیە پشت بەدایکوباوك و دەوروبەرەوە دەبەستێ، پرۆسەی دیموکراسی پێویستیە نەتەوەیی و کۆمەڵایەتی و ژیاریەکانی بۆ بەدی دەهێنێ، بەهۆیەوە پەنا بۆ توندوتیژی نابات وەك ئەوەی لەمنداڵیدا پەنای بۆ دەبرد لەگریان و نازکردن و غیرەو حەسودی و نەرگزیەت و کەللەقی و شەڕانگێزی و ئاژاوەگێڕی و خۆپەرستی، بۆیە بەشداریکردن سەرەڕای ئەوەی زەرورەتێکی سیاسی سەردەمە لەهەمان کاتدا زەرورەتێکی پەروەردەیی و سایکۆلۆژییە بۆ گۆشکردنی نەوەکانی داهاتوو وەك بەهایەکی تری ئاینی و خێزانی و کۆمەڵایەتی زەرورەتی پێویستە، چونکە بەبەشداریکردن لە پرۆسەکە تاك لەحاڵەتی هەڵچوون رزگاری دەبێت کەبەهۆی کێشە هەڵپسێردراوەکانی بیروباوەڕو ژیانی سیاسیەوە تووشی دەبێت کە بەشێوەیەك ژیانی رەنگرێژ کردووە بارگرژیشی خستۆتە ژیانی کۆمەڵایەتیشەوە لەسەر شێوەی تێکچوونی پەیوەندی کۆمەڵایەتی لەگەڵ کەسانی تردا بەهۆی تێکچوونی پەیوەندی سیاسی و کاری حزبایەتی و دەمارگیری، کەواتە هەڵبژاردن رۆڵی خێزان دەبینێت لەگۆشکردنی جگەرگۆشە، ئەوەی خێزان لەماوەی دەیانساڵدا دەیگێڕێ بۆ پەروەردەکردنی تاکێك و دەیان ساڵە بینوێتی بۆ پەروەردەکردنی نەوەکانی، هەڵبژاردن لەماوەیەکی کەمدا دەیبینێ، چونکە پێوەرێك دادەنێت و یاسایەك دادەڕێژێ بۆ ئەوەی پەیڕەوەی بکرێ لەژیانی رۆژانەی گەلاندا، وەلی ئەم منداڵە کەئێستا ناوی کۆمەڵگەیە بۆ تێرکردنی ئەو پێویستیانەی پەنا بۆ سندوقی دەنگدان دەبات، کەواتە بەشداریکردن لەهەڵبژاردن بە پسولەی سپیشەوە پەروەردەکردنی تاکەو دۆزینەوەی رێگایەکی بێ توندوتیژیە، چینیەکان وتویانە بۆ بڕینی هەزار میل لەیەك هەنگاوەوە دەست پێدەکەیت، ئەمەش ئەو هەنگاوەیە تاکی کورد وەك گەلێکی چەوساوەی دەستی سیستمی توتالیتاری دەیەوێت و پێویستە پەیڕەوی بکات و رێز لەئیرادەی دەنگدەر بگرێت، ئەو رۆژەیە دەیان ساڵە تاکی کورد بۆی دەجەنگێ، بڕینی سەدان ساڵی خەبات و قوربانیدانە تەنها بەبەشداریکردن و چوونە سەر سندوقەکانی دەنگدان، بۆیە پێویستە تاك خودی خۆی پەروەردە بکات و بەچاوی روون و دەم وگوێی ساغلەمەوە بەشداری هەڵبژاردن بکات و بۆچوونە دەروونیەکانی و دەمارگیری و کورتبینی و نەرگزیەت و گرفتە دەروونیەکان لەسادیزم و ماسۆشیزم و لاساییکردنەوەی کوێرانە کاری لێنەکات و لۆژیکانە بتوانێت بڕیاربدات و لەبڕیارداندا دوو دڵ نەبێت، کەواتە رەفتاری دەروون دروستی تاکی دەنگدەر لە دەنگدانی مەنتیقیانەو زانستیانە دەردەکەوێت و تاك لەخۆی بپرسێت ئایا بۆچوون و

بڕیاردانی درووسته؟ ئایا سۆزو گوشار کاری لێنەکردووە؟ئایا دەمارگیری حزبایەتی و تاك پەرستی و لاساییکردنەوەی کوێرانە فریویان نەداوە؟

بۆچوونەکانی مرۆڤ هەر لەمنداڵییەوە درووست دەبێت و کاریگەی خۆی لەسەر ڕەفتاری ئەو تاکە دەبێت بەتایبەتی لەکۆمەڵگەیەك کە پرۆسەی هەڵبژاردن ئەزموونێکی نوێیە وهێشتا پرەنسیبەکانی هەرس نەکراون، بۆچوونەکانی تاك لەدەمارگیری نەتەوەیی و ئاینی و حزبایەتی و عەشیرەتگەری و تایەفەگەری خۆی دەدۆزێتەوە، ئەمەیان لەگەڵ ڕەفتارو گیانی دیموکراسیەت ناگونجێ ڕێك وەك ئەوە وایە تۆ لە ڕکی کەسێکی تر دایکێکی خراپ یان یەکێکی تر بکەیتە دایکی منداڵەکەت، کوێرانە کەسێك هەڵدەبژێری بەپێی ئەو بۆچوونەی لەلات درووست بووە، یان خۆشەویستی تەواو بۆ لایەن و کەسێك یان ڕکوکینەت بۆ کەس ولایەنێکی تر، ئەمیش دەچێتە چوارچێوەی دەمارگیریەوە کەرەفتارێکی ڕەتکراوەو قێزەوەنەو دژی خواستەکانی دیموکراسیەت و مرۆ دۆستییە، هەندێجاریش تاکی دەنگدەر ناتوانێ بڕیاربدات کە دەنگ بەکێ دەدات و دوودڵیی پێوەدیارە یان دوو دڵی دەنوێنێت و پێوەرێکی ئەوتۆی لەلانییە کەبەهۆیەوە کەسێك یان لایەنێك هەڵبژێرێ، ڕەنگە ئەمیش پەیوەندی بە نەزعەی تەکامولیەوە هەبێت کە تاك هەیەتی و ڕەنگدانەوەی لەسەر ژیانی ڕۆژانەی هەیەو کار لە پرۆسەی هەڵبژاردنیش هەیە، کە دەنگدەر دەیەوێت سەد دەر سەد ئەو کەسەی بەدڵ بێت یان سەرجەم خواستەکانی بەدی بێنێت وگرفتێکی دەروونی بۆ دەنگدەر درووست دەکات، دەنگدەر دەبێ بزانێ لەم قۆناغەدا بەشداریکردن باشترە لەو هەستە کەلەلای درووست بووە، واتە قوربانی بەو هەستە بدات لەپێناو بیرکردنەوەیەکی زانستیانە، لەم حاڵەتەدا دەکرێ بەسپێتی پسولەکەی بخاتە ناو سندوقەکەوە، چونکە لێرەدا هەرچەندە کاندیدێك زەرەر دەکات، بەڵام گەلێك قازانج دەکات و فێردەبێت، هاوکات خودی هەڵبژاردنیش سەرکەوتوو دەبێت کەئەو کەسە پێشوازی لێکردووە، چاولێکەرییش یان کاریگەری زۆرینە لەسەر تاك ڕۆڵی خۆی هەیە لەسەر لایەنی دەروونی تاك و هەڵبژاردنیش بەرەو دووڕیانێکی مەترسیدار پەلکێش دەکات و ڕۆحی پاکی دەردێنێت، چونکە ئەگەر دەنگدەر پشت بەپڕوپاگەندەو زۆرینە ببەستێ لەدەستنیشانکردنی کاندیەکەی خودی خۆی ون دەکات و نازانێ بۆ بەشداری هەڵبژاردن دەکات، ئەمەش بۆ ئەو قۆناغی کرچوکاڵیی هەڵبژاردنەو قەتیسبوونە لەناو زەلکاوی بەستەڵکبوونی کەسێتی و زیانگەیاندن بەئاسایشی دەروونی، سندوقی دەنگدان بۆ تاکی کوردو عێراقی گوزەرنامەی چوونە ژوورەوەی

جیهانی ناسینەوەی ئەرك وماف و زامنکردنی ئاسایشی دەروونی تاکەکانێتی کەوێڵ و سەرگەردانی دەستی سیستمی نادیموکراسیە، سندوقی دەنگدان جیهانی لێبوردن و دۆزینەوەی رێگاچارەکانە ئەو رێگەچارەیەی کەتاکێکی پەککەوتەو کوشتەی ترس و تۆقین بەشێوەیەکی تر ناتوانێ ئەنجامی بدات، ئەو رێگەیەیە کە جۆن دیوی و رۆسۆو ڤۆلتێر دەیان ساڵ هەوڵیاندا مرۆڤ پێی بگات لەپەروەردەو مەدەنیەت و یەکسانی و دادپەروەری و درووستکردنی کەسی خاوەن بیرکردنەوەی زانستی و خاوەن ئایدیایەکی رۆشنگەر، بۆیە پێویست ناکات تاکی کورد یان عێراقی خۆ بخاتە دڵەراوکێ و دەمارگیری و دورەپەرێزیەوە لەکاتێکدا کە سەندوقەکانی دەنگدان هەلێکی مێژوویی و شارستانی رەخساندووە بۆ یەکلاییکردنەوەی کێشەی نەتەوەیی و حزبایەتی وبەدەستهێنانی مافەکان لەپێناو زامنکردنی ژیانی ئاشتیانە بۆ منداڵ وئافرەت و چەوساوانی وڵات لەپێناو سەرخستنی ژیانی لێبوردەیی و تێگەیشتن لەپێناو دوور کەوتنەوەلەهەڵچوونی حزبایەتی و پێشێلکاری مافی نەتەوەی ترو یەکسان نەبوونی نێرومێ، لەپێناو بەهەدەرنەچوونی سەروەت و سامانی نیشتمان بەشەڕی تایەفەگەری و کاری تیرۆریستی، بۆیە بەشداریکردن لەهەڵبژاردن پەروەردەکردنی مرۆڤە بۆ دروستبوونی ویژدان و ئەخلاقی لێبوردن و دوورکەوتنەوە لەتۆڵەسەندنەوەو درووستکردنی کەسایەتی دەروون درووست و کامڵبوونی عەقڵ و بەکۆمەڵایەتیکردنی مرۆڤ، ئەوەی فرۆید ئاماژەی پێداوە لەدرووستبوونی کەسێتی منداڵ لەپەیوەندی منداڵ بەدایك و باوکەوە ئەوەتا دیموکراسیەت باشترین کەشوهەوای لێبوردن و نەهێشتنی دڵەڕاوکێ بۆ دایك و باوك درووست دەکات بۆئەوەی منداڵ لێیانەوە فێرببێ و ئەوانیش بتوانن مافی منداڵەکەیان دابین بکەن و ئەو تاموچێژەی فرۆید ئاماژەی پێداوە لەناوهەوێنی دیموکراسیەوە دوای ئێشو ئازاری چەوسانەوەی نەتەوەیی و چینایەتی تامی لێبکات .

زانایان لەپەنجاکانی سەدەی رابردووە تەرکیزیان کردۆتە سەر دژە دیموکراسیەت کە ئەویش خۆسەپاندنە، ئەم خۆسەپاندنەش مانای لاوازی هێزو توانای من (انا) ەلای تاك و هەستکردنە بەشەڕانگێزی و لاوازی دان بەخۆداگرتن و کۆنترۆڵنەکردنی بێویژدانی و زیادەڕۆیی لەخودپەسەندیی کەتەنها بەرێگەی دیموکراسیەت دەڕەوێنەوە، لەم روانگەیەوە زانایان مانای چەمکی سیاسی دیموکراسییان گواستەوە بۆ چەمکی دەروونی و کۆمەڵایەتی، بۆیە پێویستە تەرکیز لەسەر بۆچوون و بڕیاردان لای تاك بەهەند وەربگیرێ و شێوازی پەروەردە گۆڕانی

بەسەردا بێت، کەئەمیش ئەرکی خێزان و قوتابخانەو فەلسەفەی دەوڵەتە، ئەم لایەنەی هەڵبژاردنیش بۆ تاکی کورد لەناو عیراقێکی فرەنەتەوەو فرەمەزهەبدا ئەرکێکی پەروەردەیی و کۆمەڵایەتی و شارستانی میدیاکاران و رۆشنبیرانە کەهەوڵبدەن لەگیانی تاکەکانی کۆمەڵدا بەرجەستەی بکەن لەپێناو بەرژەوەندی دوورونزیکی نەتەوەیی و نیشتیمانیدا، وشیاری فاکتەرێکی گرنگە بۆ هەموارکردنی رەفتاری تاکی پێش پرۆسەی دیموکراسی، ئەرکی وشیارکردنەوەش دەکەوێتە ئەستۆی دوو جەمسەر یەکێکیان خودی تاکە بەهەوڵە خودیەکانی خۆی لەرێگەی پرۆسەی فێربوون و خۆرۆشنبیرکردن و هەستکردنی بەئاسایشی دەروونی و ئاسایشی خۆراك و تەنانەت پۆشاك وئاکنجیبوونیش بگاتە دۆخی کۆمەڵایەتیبوون و دۆزینەوەی کەسێتی نەتەوەیی، بەو پێیەش تاك لەپرۆسەی دەنگداندا ئاسایشی نەتەوەیی رەچاو دەکات، کەقوربانی دەدات بەبەشێك لەبەرژەوەندییە شەخسیەکانی خۆی.

جەمسەری دووەم دەسەڵاتە کەبتوانێ بارودۆخی بابەتیانە بۆ بەدیهێنانی مافە هیومانیستیەکانی ئەو تاکە دەستەبەر بکات و بەوەش هەستی نامۆبوون کەهەستێکە لەئەنجامی مەودای فراوانی نێوان تاك و دەسەڵات دەرەوێتەوە و بەپێچەوەانەشەوە هیچ کاتێك مرۆڤ لەو نامۆبوونەی لەگەڵ دەسەڵات و نیشتمان ئاشت نابێتەوە، ئەم ئاشتنەبوونەوە هەستێکەو جڵەوی بیرکردنەوەو هۆش و بیری تاك دەکات، تاك بەدڵنیاییەوە پێیوایە ئەو نامۆبوونەوەی لەدەسەڵاتەوە سەرچاوەکەی گرتووەو دەبێ دەسەڵاتیش ئاشتی بکاتەوە، ئەگەر دەسەڵات سەرچاوەکەی گەل بێت بێگومان توانای نەشونماکردنی تاکەکانی دەبێت، ئەویش رێخۆشکردنە بۆ بونیاتنانی خودێکی سەغلەم و خاوەن بەرپرسیارێتی نەتەوەیی و نیشتمانی.

## کلتوری توندوتیژی:

**توندوتیژی سپی و رەسەن بۆ بەرگریکردنە لەخودو**
**توندوتیژی رەش و ناڕەسەن بۆ پەلاماردانە.**

**(فرۆم)**

سەرەتا دەبێ بزانین کلتور چی دەگەیەنێ، کلتور واتە شێوازی ژیان و چۆنێتی بیرکردنەوەو چۆنێتی گوزارشتکردن لەهەڵچوون و هەست و سۆز، هەر کۆمەڵگاو تەنانەت هەر خێزانێکیش کلتوری تایبەتی خۆی هەیە بۆ مامەڵەکردن لەگەڵ کایەکانی ژیان، کلتوری ژیانی کوردەواری بێگومان جودایە لەگەڵ کلتوری ژیان و گوزەرانی خەڵکی پاکستان یان بلوژستان و هی ئەوانیش جودایە لەگەڵ کلتوری ئەوروپای ئێستاو ئەروپای سەردەمی ئیمبراتۆریەتی رۆمانی، ئەگەر سەیری کلتوری ژیانی کۆمەڵایەتی فەرەنسایەکانی پێش شۆڕشی فەرەنسا بکەین جودایەو هی ئەوانیش جودایە لەگەڵ کاوبۆکانی ئەمریکا، سەبارەت بەکلتوری ژیانی کوردەواری دەکرێ لەشێوازی بیرکردنەوەی تاکی کوردەوە بیزانین، ئەگەر لەتاکێکی کورد بپرسی چۆن مامەڵە لەگەڵ ژن دەکەی و منداڵ چی دەگەیەنێ لای تۆ؟ بێگومان وەڵامەکەی جۆرێکە بەستراوە بەشێوازی بیرکردنەوەی ئەو کەسەوە، خۆ ئەگەر هەمان پرسیار لەکەسێکی ئەوروپاییش بکەی ئەویش وەڵامەکەی بەستراوە بە چۆنێتی بیرکردنەوەی و شێوازی ژیانی خۆیەوە، عەرەب ئەگەر بڵێ منداڵەکانم دەڵێ جهالی واتە نەزانەکانم و بەژنەکەشی دەڵێ زەعیفە، کەواتە مامەڵەشیان و جۆری پەروەدەشیان لەو راونگەیەوە سەرچاوە هەڵدەگرێ و کەسێتی تاکەکانیان بەو شێوەیە رەنگرێژ دەبێ، کورد دەڵی منداڵ ئەگەر چاوی سوری لەسەر نەبێ پیاو دەخوا، یان دەڵێن منداڵ قونی بدەرێ رووی مەدەرێ، هەروەسا وتویانە شەرعی مار

بەدار، ئەم دوو پەندە هەردووکیان لەمنداڵدانی کۆمەڵگەی کوردەواری سەری هەڵداوەو رەنگدانەوەی باری دەرونی خەڵکەکەیەتی، ئەم شێوازی بیرکردنەوەی تاکی کوردی رەنگە ئێستا بەجۆرێکی دیکە بێ لەسایەی گلوبالیزم کەجەخت لەسەر مافی منداڵ و ژن و کۆمەڵگەی مەدەنی دەکرێ، پەیوەندییە کۆمەڵایەتیەکانی تاکی کورد ئاوێنەن بۆ کلتورەکەی سەبارەت بەهەر دیاردەو رواڵەتێکی ژیان، کلتوری توندوتیژی بەندە بەرەفتاری تاکەکانەوە، توندوتیژی هەر رەفتارێکە مرۆڤ بەزەبرو هێز ئەنجامی بدات بۆ ئازاردانی کەسانی دیکە یان خۆ ئازاردان چ دەرونی بێ یان جەستەیی و ئایا ئەو توندوتیژیە تا چ رادەیەك لەنێو کۆمەڵگەدا دیارە، هەندێجاریش توندوتیژی مرۆڤ دژی خۆشێتی کە ئەوپەڕەکەی خۆکوشتنە.

توندوتیژی جەستەیی یان دەروونی، کەسێك دژی کەسێك یان کەسێك دژی کۆمەڵێك یان کۆمەڵێك دژی کۆمەڵێکی دیکە بەکاری هێناوە، ئەو کەسەی توندوتیژی بەکاردەهێنێ و توندوتیژی کردۆتە رەفتاری رۆژانەی پێی دەوترێ کەسی شەڕخواز (العدوانی) ئەمیش بەزۆر شێوە شەڕخوازی خۆی بەکاردێنێ کە لەنیەتەوە دەست پێدەکات تا ئەوپەڕی توندوتیژی کەکوشتنە، شەڕخوازی لەوانەیە بەنیەت بێ وەکو حەسودی یان رکوکینە یان جنێودان یان ئازاردانی جەستەیی، سیگموند فرۆید پێیوایە توندوتیژی لەرووخانی مرۆڤەوە دەست پێدەکات و پێیوایە هەر تاکێك کەلەژیانیدا تووشی شکست بێ لەتێرکردنی پێویستیەکانی و بچەوسێتەوە ئەو کەسە رەفتاری شەڕخوازانە دەبێ، هەندێ لەزانایانی دیکە پێیانوایە شەڕخوازی لەخودی مرۆڤدایەو ژینگەی کۆمەڵایەتی پەیوەندی پێوە نییە.

### لێکدانەوەی توندوتیژی

هەر لەگەڵ بوونی مرۆڤایەتی توندوتیژی بەشێوەی جۆراو جۆر هەبووەو مرۆڤ پەنای بۆ بردووە، زۆر لەزانایانیش سیگمۆند فرۆید دەڵێ ئارەزووی مردن و لەناوبردن بەشێوەی خۆڕسکانە لەمرۆڤدا هەیەو ئەم غەریزەیە لای فرۆید یەکسانە لەگەڵ غەریزەی ژیان و خۆشەویستی، هەروەها کونراد لورنتس پێیوایە شەڕانگێزی مرۆڤ خۆڕسکانەیەو ئەستەمە کۆنترۆڵ بکرێ، هەندێ لەزانایان پێیانوایە لەپشت هەر رەفتارێکی مرۆییەوە غەریزەیەك هەیە، ئەریك فرۆمیش پێیوایە دوو جۆر شەڕانگێزی هەیە شەڕانگێزی سپی کەبەرگریکردنە لەخودو

ئامادەباشیە بۆ هەڵاتن و هەروەها شەڕانگێزی ڕەش کەپەلاماردانی خەڵکی دیکەیە، (سکینەر) پێیوایە توندوتیژی خۆڕسك نیەو مرۆڤ لەژینگەی ئابوری و کۆمەڵایەتی و بەرژەوەندی کەسی فێری بووەو بەسەر مرۆڤدا سەپێنراوە، کوشتنی هابیل بەدەستی قابیلی برای توندوتیژی دەسەلمێنێ کە بۆ بەرژەوەندی کەسی بووە، هەندێ لەلێکۆڵەرەوانی مێژوویی دەڵێن لەخودی مرۆڤدا توندوتیژی نەبووە تەنانەت مرۆڤ ئەشکەوتەکانیشی لەترسی مرۆڤێکی دیکە نەپاراستووە، چونکە توندوتیژی دژ بەیەکدی نەبووە لەکاتێکدا کە مرۆڤی عاقڵ لە ٩٠٪ ژیانی لەراوشکاردا بەسەر بردووە، توندوتیژی زیاتر لەقۆناغی کشتوکاڵی پێشکەوتودا سەری هەڵداوە ئەمەش نیشانەی ئەوەیە لەگەڵ سەرهەڵدانی موڵکدارێتی توندوتیژی سەری هەڵداوەو لەگەڵ گیانی سەرمایەداری و هەڵپەکردن بۆ قازانجی زیاتر پەرەی سەندووە، هەندێکیش لەوانەش (لورانتس) لەو باوەڕدایە توندوتیژی کارێکی خۆڕسکانەیەو پەیوەندی بە غەریزەی مرۆڤەوە هەیەو رەفتارێکی رەمەکیانەی مرۆڤە.

فرۆیدو یۆنگ و فرۆم هامران کەتوندوتیژی دوو جۆرە جۆرێکیان مرۆڤ و ئاژەڵ تێدا بەشدارن و پێی دەوترێ توندوتیژی بەرگری بۆ مانەوەی بوونەوەر خۆیەتی و جۆری دووەمیش بریتیە لەتوندوتیژی نارەسەن کەخۆی لەسادیزم و ئارەزووی مردن و وێرانکردن و تایبەت بەرەگەزی مرۆڤایەتی دەدۆزێتەوە، لەلایەکی دیکەوە (ماکدۆکل) ی ئەمریکایی خاوەن قوتابخانەی غەریزەیی پێیوایە توندوتیژی رەنگدانەوەی غەریزەکانی مرۆڤەو پەیوەندی بەژینگەوە نییە.

کلتوری توندوتیژی وەك هەر کلتورێکی دیکە کە هەوێنی پێکهاتەی باری دەروونی مرۆڤەو جموجوڵەکانی رۆژانەی مرۆڤ لەگەڵ دەوروبەری لەسەر ئەو بنەمایە درووست دەبێت و هەر کۆمەڵگاو گەلێکیش بەپێی کلتوری شارستانی و کۆمەڵایەتی تاکەکانی گۆش دەکات و پێش لەدایکبوونی وەك رێککەوتنێکی کۆمەڵایەتی سیستمێکی کۆمەڵایەتی دادەنێ و نابێ تاك لێی دەرباز ببێ، لەنێو گەلانی دونیادا بەزۆر شێوە توندوتیژی بەکارهاتووە، یان لەژیانی رۆژانەیان رەنگی داوەتەوەو لەپەیوەندیە کۆمەڵایەتیەکان بەرجەستە بووەو بۆتە مۆرکی هەڵسوکەوتی ژیانی کرداریان، یان زۆرکەسی توندوتیژ بەئازاو جەربەزە ناوبراوەو سیمبولی پیاوەتی بووە، دانیشتوانی مۆندۆگۆمر لەباشوری ئەفریکیا کەلەژیانی کۆمەلایەتیاندا توندوتیژن لەپەروردەکردنی منداڵیشدا هەر توندوتیژن، چونکە توندوتوتیژی بووەتە کلتوری

ژیانیان و پەیڕەوی دەکەن، تەنانەت ناوی کەسێکیان بەمنداڵەکەیانەوە ناوە کەزۆر توندو زاڵم بووبێ، یان نیشانەی شەڕی پێوە بێ وەکو ناوی هرقل یان هتلەر یان جەنگیزخان یان رێگر یان سەرباز یان هەر ناوێك کەسیمبولی ئازایەتی بووبێ، بەپێچەوانەی ئەوەشەوە گەلانێك هەن خەڵکانی ئاشتی خوازو دوور لەشەڕانگێزی و توندوتیژی تێدایەو لەنێو تاکەکانیاندا ئەو جۆرە پەیوەندیە باوەو لەسەر ژیانیان رەنگی داوەتەوە لەوانەش هۆزی ئارابش لەباشوری ئەفریکیا کەزۆر نەرم و ئاشتی خوازن و لەگەڵ یەکدیدا لێبوردەو بەبەزەیین و منداڵیان زۆر لەلاخۆشەویستەو پێیانوایە منداڵ دەبێ بەنازو خۆشەویست بێ و زوو بەپیریەوە بچی و پێداویستیەکانی دابین بکەی، ئاشتیخوازی و نەرمی نواندن لەژیانی رۆژانەیان بووتە کلتورێك پێوەی دەناسرێنەوە، رەنگە ئەو کلتورە کۆمەڵایەتیەیان بەهۆی شێوازی ژیانی ئابوریانەوە بێ کەموڵکداری تێیدا نییەو هەرچی هەیە لەئامرازەکانی بەرهەمهێنان موڵکی هەمووانە، لەنێو کوردەواریشدا هەر لەژیانی راوشکاریەوە تا ژیانی کشتوکاڵی شێوازی توندتوتیژی هەبووە ئەگەر بۆ بەرەنگاربوونەوەی سەختی ژیان بووبێ وەکو بەرەنگاربوونەوەی ئاژەڵی دڕندەو پێویستبوونی تاك بەتفەنگ و خەنجەرو شتی هاوشێوە، کەئەمیش بووتە کلتور بۆ نەوەکانی داهاتوو گوازراوتەوەو زۆور جار تاك نازناوی خەنجەری هەڵگرتووە و پێیان وتوە فلان خەنجەر، یان فلان دەمانچە، یان وتویانە پیاو کوشتن و وئاو خواردنەوە لەلای وەك یەك وایە، کەمنداڵیش گوێی لەمەبێ بێگومان بیری لێدەکاتەوەو هیوای ئەوە دەخوازێ، یان فلانەکەس بەشێر ناوبانگی دەرکردووە لەبەرئەوەی وەکو شێر دڕو پەلاماردەر بووە، ئەم دڕبوونەش لەپەروەردەدا رەنگی داوەتەوەو کەسێك زۆر خۆشحاڵە کەپێیان وتووە تۆ شێری لەهەمان کاتدا شێریش ئاژەڵەو دڕندەیە، کەچی تاکی ئێستا نازناوی شێری پێخۆش نییە چونکە بەیاساو رێسا مافی خۆی وەردەگرێتەوەو چیتر پێویستی بەهێز نییە وەکو شێر خەڵك لێی بترسێ، هۆکارەکانی توندوتیژی زۆر جار دەگەڕێتەوە بۆ خودی تاك و بۆچوونەکانی بەرامبەر ژیان، کە لۆژیکی هێز رۆڵی هەبووە لەیەکلاکردنەوەی بۆچوونەکان کە بەهێز لاواز دەخوات و بەو پێیە رەفتار دەکات، ئەو جۆرە کەسانە ئەگەر بزانن کەسی بەرامبەریان لاواز و بێ دەسەڵاتە ئەوا زوڵمی لێدەکەن و ئەوەی بیانەوێ بەسەریدا دەسەپێنن، خێزانیش کەلانکی تاکە زۆر جار سەرچاوەی توندوتیژییە بەهۆی لاسایکردنەوەی منداڵ و گەشەکردنی کەسێتی لەناو خێزانداو هەروەها بارودۆخی ئابوری و سیاسی کەسی شەڕخواز درووست دەکات، توندوتیژی سیاسی کەسی شەڕخواز

دروست دەكات و میدیاكانی زمانحاڵی ئەو سیاسەتە هاندەری كلتوری توندوتیژی دەبێت و لەسەر كەسێتی تاكەكانی بەتایبەتی منداڵ ڕەنگ دەداتەوە، لەكوردەواری ئەگەر یەكێك بێ دەسەڵات و هێز بێ دەڵێن وەكو ژن وایە، كەئەمیش توندوتیژیەكی شاراوەیە دژ بەژن و بەشێوەیەكی ئۆتۆماتیكی كاریگەری لەسەر پەروەردەكردنی منداڵ هەیە چ منداڵی كوڕ كەدەیەوێ بەرەفتاری توندوتیژی و شەڕانگێزیانە پیاوبوونی خۆی پیشان بدات و لەبەرامبەر ئەوەشدا منداڵ كچ كەگوێی لێیە نازناوی ژن بەكەم تەماشادەكرێ و وەكو جوێن بەرامبەر باوكی بەكاریان هێناوە لەدوولاوە هەست بەكەمی دەكات، لایەكیان خۆی رەگەزی مێیەو هیوای ئەوە دەخوازێ نێر بوایەو لایەكی دیكە باوكی وەك پیاو تەماشا ناكرێ هەست بەكەموكورتی خێزانیی دەكات، ناكۆكی نێوان ژن و مێردو دۆخی هەڵچوونی بەردەوامی نێوانیان كاری مەنتیقی هێزی هێناوتە ئاراوە بۆ چارەسەركردنی كێشەكانیان و بووەتە كلتورێك پەیڕەوكراوەو نمونەش بۆ ئەمە كاتێك پیاوێك ئەگەر ژنەكەی سەركوت نەكات ئەوا بەپیاو لەقەڵەم نادرێ و پێی دەڵێن هۆمەر، چونكە وەڵام ناداتەوە، ئەمیش كاری لەسەر پەروەردەی منداڵ و دروستبوونی كەسێتی بەو بۆچوونە كردووە، چونكە منداڵ لاسایی دەكاتەوەو هەمان كردەوە بەكاردەهێنێ و وەكو قەرەبوكردنەوەی ئەو ژیانە بێ ئەمانەی كەتیایدا ژیاوە لەسێبەری توندوتیژی ئەمیش ئەوە بەكاردەهێنێ، ئەگەر بەكاریشی نەهێنێ ئەوا لەسەر باری دەرونی خۆی ڕەنگ دەداتەوەو كار لەكارو بەرهەمی دەكات.

وێستگەكانی دروستبوونی كلتوری توندوتیژی لەهزری كورداو ڕەنگدانەوەی لەسەر پەروەدەی منداڵ لەم پەیوەندیە كۆمەڵایەتیانە خۆی دەبینێتەوە:

**یەكەم: ژن (دایك) و پەیوەندی لەگەڵ پیاو (كوڕ) ەكەی:**

پەیوەندی پیاو لەگەڵ ژنەكەی بێگومان لەسەر بنەمای باوكسالاریە لەنێو كۆمەڵگەی كوردەواری و پەیوەندی هەر چۆنێك بووبێ لەنێو خۆیاندا ئەوا لەبەر چاوی خەڵك هەر بەو لۆژیكە بووە كە پیاو پیاوەو ڕەمزی هێزو پەنای ئافرەتەو ئافرەتیش شەرەف و ناموسی پیاوەو بۆی نییە هیچ شتێك بڵێ تا پیاوەكەی لەئارادا بێ ئەگەر مافی خۆیشی بێ، ئەم دەنگ نەكردنەی ژن پەنگ دەخواتەوەو لەرێرەوێگ دەگەڕێ دەربازی بێ ئەویش بێگومان خۆسوتانە

یان خۆکوشتن کەراستەوخۆو ناراستەوخۆ کاریگەری دەکاتە سەر پەروەردەی منداڵ، هۆکارەکانی خۆکوشتنی ژن پەیوەندە بەکلتوری کۆمەلآیەتی ژن کە کەس گوێی لێنەگرێ هەوڵی سەرنجڕاکێشان بەتوندوتیژی دژ بەخۆی دەدات کە تەنها هۆکارە راستەوخۆکە نییە، بەڵکو هۆکارگەلێکی کەڵەکە بووی چەندین ساڵەی رابردووشە کە تیایدا کۆبوونەتەوەو پەنگیان خواردۆتەوەو دەگەڕێتەوە بۆ کلتوری هزری تونوتیژی کۆمەڵگا، کە ئەگەر سەرنج بدەینە ئەم هۆکارانەش ئەوا لەدوو توێیدا هزری توندوتیژی خۆی حەشارداوە بەم شێوەیە :

١- کلتوری هەستنەکردن بە ئاسایش و ئارامی بێ پیاو و تێڕوانینی رەشبینانەی ئافرەت بەرامبەر ژیان وەك هەر تاکێکی دیکە چ نێر بێ چ مێ، بەلآم ئەم لەبەر پێگە کۆمەلآیەتیەکەی کلتوری کۆمەڵگەی نێرسالاری نەیتوانیوە وەکو نێر گوزارشت لەو رەشبینیەی خۆی بکات بە خۆکوشتن نەبێت کەئەوپەڕی توندوتیژییە، کە زیاتر خۆسوتانە کە لە رووی میکانیکیەوە کارێکی ئاسانترە لەبەر ئەوەی ئامرازەکانی ئەنجامدانی لەبەر دەستدایە، پیاو ژنی دووەم دێنێ تۆڵەی خۆی لە ژنەکەی خۆی دەکاتەوە و گوزارشت لە بێزاربوونی خۆی دەکات و دەگوازرێتەوە بۆ منداڵەکەو ئەویش هەر بەم شێوەیە گوزارشت لەو بۆچوونەی خۆی دەکات کەبێگومان توندوتیژی هەوێنێتی و پرسی دووژنییش لەچوار چێوەی کلتوری کۆمەڵەگەی کشتوکاڵی کورددا هەبووەو ئێستاش بەردەوامە هەرچەندە کەمیش بۆتەوەو سەرچاوەکەشی هەر کوێیەك بێ، بەلآم ژن ئەمە ناکات، کە بەم کارە هەلێك لە گەڕانەوە لە خۆکوشتن لە دەست دەدات، هەروەها ژن ناتوانێ وەك پیاو گوزارشت لە ئێشو ئازارەکانی رۆژانەی بکات، کە بۆی هەیە دەمانچە هەڵبگرێت، موبایل بەخۆیەوە ببەستێ، جگەرە بکێشێ و بخواتەوە و گەشت بکات، بەبێ منداڵ بسوڕێتەوەو بگەڕێ، ئەمانەش بە بڕوای خۆی کەمێك لە خەمەکانی دەرەوەێنێتەوە، ئەم هەستەی ژن کار لەپەروەردەی منداڵیش دەکات و منداڵ بەسانایی هەستی پێ دەکات و زانایانی سایکۆلۆژیش ئاماژەیان بەوەداوە کەمنداڵ هەر لەساواییەوە هەست بەنیگەرانی و دڵەراوکێی دایکی دەکات، بەو پێیەش ئەو جۆرە پەروەردە توندوتیژیە دژ بە ئافرەت بێگومان توندوتیژی لێدەکەوێتەوەو دەبێتە کلتورێکی پەیڕەوکراو .

٢- ژن لە چوار چێوەی ماڵەکەی خۆیدا نەبێت پێویستی بەوەی کە گرنگی پێ بدرێ وەك هەر تاکێکی کۆمەڵگە تێر ناکات، هەندێك جار لە ماڵەکەی خۆیشیدا ئەو پێویستیە دەروونیەی تێر ناکرێت کە بەلایەنی کەمەوە پێی بڵێت دەست خۆش چێشتەکەت خۆش بوو،

یان ئەمڕۆ بە دەوام و کاری ناومالّەوە زۆر ماندوو بووی، تێرنەبوونی ئەم پێداویستیە کەسەرچاوەکەی کلتوری توندوتیژی کۆمەڵە بەرامبەر ئافرەت دەبێتە هەستکردن بە کەمووکورتی و ڕەفتاری شەڕانگێزی کە هەردووکیان واتە هەستکردن بە کەمووکورتی و شەڕانگێزیش پالّی پێوە دەنێت سەرنجی دەورووبەر رابکێشیّ بە هەر هۆیەك بیّ، یان ئەوەتا رۆژانە شەڕو هەرا لە مالّەوە دەنێتەوە و گوێی لێدەگرن، یان شەڕو هەرا دەنێتەوە گوێی لێناگرن بۆیە بێزار دەبیّ و ژیان لە لای بیّ مانا دەبێت و هەولّی رزگار بوون دەدات و منداڵیش بەوە کاریگەر دەبێت ئەگەر دایکی ئایندە بیّ یان باوکی ئایندە ئەویش ئەو کلتورە بۆ منداڵەکانی دیکە دەگوازێتەوە، واتە نەوە دوای نەوە ئەو کلتوورە دەگوازرێتەوەو کار لەپەروەردە دەکات.

٣-جەختکردن لەسەر خوودبەدیهێنان پێویستیەکی دەروونی ئافرەتە ئەوپەڕی هەولّی بۆ دەدات لەو چوار چێوەیە کە تێیدا دەژی، بەلاّم ئەم چوارچێوەیە ئەو زەمینەیەی بۆ نارەخسێنیّ، کە بگاتە ئەو ئامانجە ئەوە نەبێت کە پەنا بۆ ئارایشت و خۆجوانکردن ببات بۆ رازیکردنی دەورووبەر، هەندێك جاریش ئەمەیان بە گوێرەی پێویست بۆی ناچێتە سەر بە هۆی رکابەری هەستی جوانی لە لایەن ئافرەتانی دیکەو دلّپیسی پیاوەکەی کەتوندوتیژی لێدەکەوێتەوەو کار لەپەروەردەکردنی منداڵ دەکات و بۆی دەگوازرێتەوەو ئەویش بەهەمان شێوە دەیگوزاێتەوە.

٤- تێرنەبوونی هەستی ئینتیمابوونی بۆ خێزان و دەورووبەر، کەرەنگە لەبەر ئەوە بووبیّ منداڵی کوڕی نەبیّ، یان پەیوەندی لەگەلّکەسوکاری پیاوەکەی لاوازبیّ، یان ڕێز لە خۆی نەنیّ بەهۆی هەستکردنی کە ئەو گۆشەگیرەو دەورووبەر لێی رازی نین، ئەمەش جیاوازی لەنێوان کورو کچ دروست دەکات و وەکو توندوتیژی بەرامبەر ئافرەت بەکاردەهێنریّ و وەك کلتورێك کار لەپەروەردەکردنی نەوەکانی داهاتویان دەکات .

٥-کەڵەکەبوونی کێشە دەروونی و کۆمەلاّیەتیەکان، کەپێشتر بەبیّ چارەسەر بەجێی هێشتوون و لە نەستیدا باوك سالارێتی گەمارۆی داوەو پەنگی خواردۆتەوە، کێشە دەروونیەکان دەگەڕێنەوە قۆناغی پێشووتر کە هەر کچ بووە لە هەمان کۆمەڵگەی نێر سالاری، کە لەگەڵگەورەبوونی زیاتر گەورە دەبێت، چونکە تا گەورەتر بیّ دەبیّ زیاتر پابەندی داب و

نەریتی کۆمەڵگەی بێت و گوێڕایەڵی کوێرانەی ئەو کلتورە بێ ئەگینا بەتونوتیژی وەڵام دەدرێتەوەو لەکاری پەروەردەکردنی منداڵەکانیشی رەنگ
دەداتەوە .

٦-هەڵاتن لە ژیان و بەرگەنەگرتنی بەهۆی ماندووبوون و ئیرهاق و سوتانی دەروونی ونەبوونی کاتێك بۆ بەخۆداچوونەوەی خوودو چێژوەرنەگرتن لەژیان و هەستکردن بەبێ واتایی ژیان و هاوکارینەکردنی لەلایەن ئەندامی دیکەی خێزانەوە، کەئەمەش خۆی لەخۆیدا توندونیژیەکی شاراوەی دیکەیە دژ بەئافرەت و منداڵی کچ کەهەر لەسەرەتاوە ئەو یارییانەی بۆی هەڵدەبژێرن هەر دەبێ کاری ناو ماڵ بێت و هەر لەو ساتەوە برا گچگەکەی فەرمانی بەسەردا دەکات و پێی دەڵێ، کە خواردنی بۆ ئامادە بکات ئەگەرچی خوشکەکەی لەدەوامی قوتابخانەش بێتەوەو ئەویش لەماڵەوە بێت، ئەمەش دەبێتە مۆرکی کەسێتی و بەشێك لەمیژووی کۆمەڵایەتی ئەم گەلە، کەپێویستی بەپێداچوونەوە هەیەو خێزان و پەروەردەو پرۆگرامی خوێندن رۆڵیان تێدا هەبێت.

٧- پەنابردن بۆ کلتوری تۆڵەسەندنەوە نەك لێبوردن لەگوشارەکانی دەورووبەر وەك پەرچە کردارێك بۆ ئەو چەوسانەوە کە رۆژانە دەیبینێ و کەسێك نەبووە گوێی لێ بگرێ و خەمەکانی بەبادا بکات .

٨- هەستکردن کە ئەو وەکو پێویست نییە بۆ کۆمەڵگە بەتایبەتی لە کاتی خۆ بەراوردکردندا، چونکە کلتوری کۆمەڵایەتی وایگوتووە .

### دووەم : پەیوەندی نێوان دەرەبەگ و جووتیار:

ژیانی کۆمەڵایەتی کوردەواری بریتی بووە لەپەیوەندی نێوان جوتیارو دەرەبگ و هیچ مامەڵەو جموجولێك لەکوردەواریدا بەبێ ئاگاداری ئاغاودەرەبەك نەکراوەو تەنانەت کارو تەقەلای جوتیارانەی جوتیار بەشێکی زۆری بۆ دەرەبەگ بووەو جوتیار تەنها رەنجکێش بووە، ئەم دەرەنجامی ئەم پەیوەندیە گواستراوتەوە بۆ پەروەردەو منداڵیش لەگەڵ گەورەبوونیدا زانیوێتی باوکی و دایکی لەژێر رکێفی دەرەبەگدان و ئەویش لەئاست ئەوەدا هەستی بەکەمی کردووەو لەسەر کەسێتی رەنگی داوەتەوەو بۆ منداڵەکانی گواستویەتیەوە، زۆرجاریش

دەرەبەگ دەستی هەبووە لەكچ بەشودانی جوتیاران و ژنهێنانیان و ئەگەر كارێك بەدڵی ئەو نەبوبێ سەری نەگرتووەو هەڕەشەی هەڵوەشاندنەوەی داوە، تەنانەت ئەگەر دەرەبەگ هاوكاری جوتیاریشی كردبێ لەو روانگەیەوە بووە كەجووتیار پاشكۆی ئەوە، منداڵانی ئەم جوتیارەش لەئاست ئەودا هەستیان بەكەمی كردووەو گیانی تۆڵەسەندنەوەی شاراوەیان لەلا دروست بووە، هەرچەندیشە ئەم هەستە نێگەتیڤەی خۆیان نەدركاندووە، بەڵام لەكاروكردەوەیان رەنگی داوەتەوەو هەستیان بەكەمی كردووە، بۆنمونە كوڕی جوتیار بەرامبەر كوڕی دەرەبەك و كچیش بەهەمان شێوە.

### سێیەم: دەمارگیری:

هەستی دەمارگیری نەتەوەیی و تایەفەگەری و ناوچەگەری لەناو كۆمەڵگای كوردی وەك هەر كۆمەڵگایەكی دیكە بەرجەستەو روون و ئاشكرایەو نوكتە گێڕانەوەو ناوچەگەرێتی نمونەی ئەوەن، هەرچەندە ئەم دەمارگیریە بەهۆی گوشاری سیاسی حكومەتە یەك لەدوای یەكەكانی عێراق دروست بووە، بەڵام تاكی كوردیش وەك رەنگدانەوەیەك لەرەفتاریدا پەنای بۆبردووەو باوەڕی بەشۆڕشی چەكداری هەبووە وەك رێگەچارەیەكی بۆگەیشتن بەئاوات و ئامانجەكانی و مافە زەوتكراوەكانی، ئەو جۆرە بۆچوونە لەسەر باری دەورنی منداڵ رەنگی داوەتەوەو پەیڕەوی كردووە كەهەندێجار لەسەر شێوەی نوكتەگێڕانەوە بەسەر گەلانی دیكە بەكاری هێناوەو گواستراوەتەوە بۆ دەمارگیری تایەفەگەری و ناوچەگەریش كەتاكەكانی ناوچەیەك بەسەر ناوچەیەكی دیكەی هەمان نیشتمان و كۆمەڵگە دەیگێڕنەوەو دەماو دەم لەنەوەیكەوە بۆنەوەیەك دەگوازرێتەوەو تەنانەت دەمارگیری خێزانێك بەرامبەر خێزانێك و تاك بەرامبەر تاك كاردانەوەی خۆی گواستۆتەوەو بوونی هەیە.

## چوارەم: پەیوەندی و بیروبۆچوونی عەشایەری:

هەندێ بیروبۆچونی عەشایەری لەبەهاو داب ونەریتەکان کاریگەری خۆیان لەسەر پەروەردەکردنی منداڵ بەجێ هێشتووە، لەوانەش گیانی تۆڵەسەندنەوەو کاریگەری لەسەر منداڵ، لەبەر بڵاونەبوونەوەی ڕۆشنبیری ناتوندوتیژی و ژیانی ڕەمەکیانەی خەڵك گیانی تۆڵەسەندنەوە لەنێوان تاکەکانی کۆمەڵ هەیە، کوڕ کوێرانە دەبێ بەگوێی بابی بکات قسە لەقسەی نەدات ئەگەر ئەو قسەیەش بەدڵیشی نەبێت بێ و هەروەها کچیش بەهەمان شێوە کەوا باو بووە دەبێ خزمایەتی و شوکردن و ژن هێنان دەبێ لەچوارچێوەی عەشیرەت یان خزماندا بێ و ئەگەر کارەکەش نابەدڵیش بووبێ ئەوا بۆکچ نەبووە قسە بکات و بەرگری لەمافی خۆی بکات، ئەم کلتورە لەپەروەردەکردنی منداڵ و جۆری کەسێتیان ڕەنگی داوەتەوە، بەهەمان شێوە پەیوەندی نێوان بوك و خەسوو بەهەمان شێوە گوازراوەتەوەو ئەو بووکەی کەبووك بووەو بووتە خەسو خەسوەکەی چی لێکردووە ئەویش بەبوکەکەی خۆی کردووە وەکو گیانی تۆڵەسەندنەوە، ئەم جۆرە پەیوەندییە دوانییانە کاردانەوەی لەسەر باری دەروونی منداڵ هەبووەو لەنەستیاندا ماوەتەوەو کاری پێدەکەن، ڕەنگە خوێنەر بڵێ کوا باوی ئەوە ماوە، بەڵام ڕاستیەکەی ئەگەر بەلێکدانەوەی عەقڵی لێکی بدەیتەوە کەخاسیەتێکی ئەم سەردەمەیە بەڵام لەرووی چەپاندنی دەرونیەوە ئەوە بارە سایکۆلۆژییە هەر لەتاکەکاندا ماوە نموونەش بۆ سەلماندنی ئەم ڕاستیە تاقیکردنەوەکەی (کاواکامی)ە کەلەخوارەوە ئاماژەمان پێداوە ... تد)

## پێنجەم: گێڕانەوەی بەسەر هات و چیرۆکەکانی گوێ ئاگردانی کوردەواری:

_گومانی تێدانیە پێکهێنانی باری دەروونی پشت دەبەستێ بەو چیرۆك و ڕەفتارانە کەژیانی باوباپیران هەیانبووە لەوانەش چیرۆکەکانی گوێی ئاگردان کە گەورەکان بۆ منداڵەکانیان گێڕاوتەوەو باسی پاڵەوانێتی باو باپیرانیان کردووەو یان گەورەکان لەنێوان خۆیاندا بەسەر هاتە واقیعیەکانیان گێڕاوەتەوەو منداڵیش گوێی لێبووەو ئارەزوی ئەو پاڵەوانێتیەی هەر لەمنداڵیەوە تێدا چەکەرەی کردووەو بۆ ئاینده بەکاری هێناوە چ وەکو گێڕانەوە بۆ نەوەکانی

یان وەکو پەیڕەوکردنی لەژیانی ڕۆژانەیاندا، چونکە ئەو گێڕانەوانە بەشێك بووە لەپێکهێنانی باری دەرونی و کەسێتی منداڵ لەبەر ئەوەی منداڵ لاپەڕەیەکی سپیە، هەستی ناسکە و هیچی دیکەی پێ نیە، کەواتە ئامادەباشە بۆ وەرگرتن و گواستنەوەی ئەوەی فێردەکرێ و ئەو هەموو جۆرە پەیوەندیانە لەو ڕێگەیەوە کار لەپەروەردەکرنی دەکات و نەوە دوای نەوە دەگوازرێتەوەو کەسێتی تاکەکانی لێ پێکدێت.

**شەشەم: نەست وکاریگەری لەسەر پەروەردە:**

بێگومان منداڵ وەك مرۆڤ گەلێ حەزو ئارەزووی هەیەو بۆی نایەتەدی، بەتایبەتی لەکۆمەڵگەیەك کەکلتوری توندوتیژی تێدا پەیڕەو کرابێ و دواکەوتوو بێ و ڕۆشنبیری پەروەردەکردنی تێدا کەم بێ نەستی ئەو منداڵە کەگەورە بووە کاریگەری لەسەر جموجوڵ و چالاکیەکانی هەبووەو بەڕێوەی بردووەو لەگەڵ خەونەکانیدا تێکەڵاو بووە، هەموو کەسێك بەشێکی زۆر لەبۆچوونە دەرونیەکانی دەگەڕێتەوە بۆ قۆناغی منداڵ و ئەوەی گوێی لێ بووەو بۆی ماوەتەوەو بەرادەیەك ئەو بۆچوونانە کاریگەرە زۆر کەس ناوی باپیریان بەمنداڵەکانیانەوە دەنێن و تەنانەت بیروبۆچوونەکان وەسیەت و بەڵێنەکانیشیان جێبەجێ دەکەن .

حەوتەم: سەختی ژیان و بەجێهێشتنی توندوتیژی، چۆنێتی ژیان و بەدەستهێنانی بژێوی ژیان و سەختی کاری ڕۆژانە توندوتیژی لەتاکەکانیدا کۆمەڵ دروست کردووە بۆ نموونە ناوچەی شاخاوی یان بیابان مرۆڤی ناچار کردووە هەمیشە خۆی قایم بکات بۆ بەرەنگاربوونەوەی ئاژەڵی کێوی و دڕندەو هەروەها بەدەستهێنانی بژێوی ڕۆژانە لەراوشکارو کاری کشتوکاڵی کە مۆرکی توندوتیژی دەبەخشێتە تاکەکانی کۆمەڵگە، کە ئەمیش لەسەر باری دەروونی منداڵ و کەسێتی ڕەنگ دەداتەوەو لەژیانی ڕۆژانە پەیڕەو دەکرێ، تاکی کوردیش بەهۆی سەختی ژینگەو بەرەنگاربوونەوەی کەشوهەوای نالەبارو سەختی جوگرافیەکەی ناچاری کردووە بە توندی بەرەنگاری بێتەوە .

**هەشتەم: شێوازی بیرکردنەوەی گەورەو هەڵچوون و ترساندنی منداڵ و چاو سورکردنەوە:**

کلتوری پەروەردەی کوردەواری هێشتا هەر لەسەر هزری باوباپیرانە سەبارەت بەمنداڵ و گوێرایەڵبوونی و وتویانە منداڵ دەبێ عاقڵ بێ، مەبەست لەوەش ئەوەیە منداڵ ملکەچی تەواوی یاساکانی دەوروبەری بێ و ئەگەر فەرمانیان پێکرد کە دانیشێ ئەوا دەست بەجێ دەبێ دابنیشێ ئەگەر نا ئەو منداڵە عاقڵ نییە، لەهەمان کاتدا منداڵێتی منداڵیش تاموچێژی ئەو تەمەنەیە لە هەڵبەزو دابەزو راکردن و ئاژاوە نانەوە، بەڵام کۆمەڵگەی کوردی وتوێتی شەرعی مار بەدار، بۆیە چاوسورکردنەوەی لەمنداڵ وەك ئەرکی خۆیان تەماشایان کردووەو توندوتیژیان لەگەڵدا بەکارهێناوە، فەرمانکردنی زۆرداریش کاردانەوەی نێگەتیڤی بەسەر کەسێتی ئەو کەسەدا دەبێ کەفەرمانی پێدەکرێ، بەپێی لێکۆڵینەوەیەکی ئەمریکایی لەمبارەیەوە فەرمانکردن بەسەر کەسانی دیکە گیانی شەڕخوازی لای تاك دروست دەکات، لەنێو گەلانی دونیا بەکوردیشەوە بەلایانەوە لاوازیەو کەموکورتیە ئەگەر منداڵ کوێرانە بەقسەی کەسانی گەورتر نەکات، پەیوندی نێوان باوك و کوڕ ئەو جۆرە فەرمانەی تێدابووەو مێژووی تەوتەمیەتیش ئەوەی سەلماندووە کەباوك کوڕەکانی لەماڵ دەردەکرد بۆ ئەوەی خۆی هەموو ژنەکان قۆرغ بکات و بەرهەمی ژنەکانیش بۆ ئەو بێ، هەڵوێستی کوڕ لێرەدا هەستکردنە بەکەموکورتی، ئەم هەستکردنە رەنگدانەوەی بەسەر باری دەرونی دەبێت، کەئەو کەسە بۆ پڕکردنەوەی هەندێجار پەنا بۆ رەفتاری سەرنجڕاکێش دەبات ئەگەر نێگەتیڤیش بێ وەکو ئەو پیاوەی کەلەسەر کانی ژنان خۆی بەتاڵ دەکات بۆ ئەوەی پێی بڵێن ئەو سەگبابە کێ بوو ئەمەی کرد، بەم جۆرە رەفتارە ئەو کەسە دووپات لەخودی خۆی دەکاتەوە، هەر بەوشێوەیەش دەیان رەفتاری دیکەی رۆژانە ئەنجام دەدرێ بۆ سەرنجڕاکێشان لەوانەش درۆکردن و قومارو ترازانی کۆمەڵایەتی و ..تد ئەمانەش کاردانەوەی لەسەر رەفتاری منداڵ دەبێت، هەر بەپێی تۆژینەوەیەکی دیکەی ئەمریکایی ملکەچکردن بۆ فەرمانی کەسانی سەروتر مرۆڤ دەکاتە گیانەوەرێگی دڕندە، لەمبارەیەوە تاقیکردنەوەیەکیان ئەنجام دا... خەڵك چی دەکات ئەگەر داوایان لێکرا ملکەچی

فەرمانێك بن؟، داوا لەکۆمەڵ کەسێك کرا پەنجەبنێن بەدوگمەیەکی کارەبایی بەهێزی ٤٥٠ ڤۆڵتی، کەئێش و ئازارێکی زۆر بۆئەو کەسە دروست دەکات کە لێی دەدرێ.

وەلآم: زۆبەی ئەو کەسانە پەنجەنانیان بەدوگمەکە هەڵبژارد هەرچەندیشە کاریگەری ئازار بەسەر کەسی ژێر تاقیکردنەکەوە دیاربوو، یان هاواری دەکردو داوای فریاکەوتنی دەکرد، ئەمە ئەنجامی ئەو لێکۆڵینەوەیەیە، کەسەبارەت بە سایکۆلۆژیای شەڕخوازی و مەیلی زۆربەی مرۆڤایەتی بۆ گوێڕایەڵبوون (اطاعة الاوامر) ی فەرمانی بێ گفتوگۆکردن ئەنجام دراوە، تەنانەت ئەگەر شوێنەواری خراپیش بەسەر کەسانی دیکەدا هەبێ، هەڵسوڕێنەرانی تۆژینەوەکە رایانگەیاند، کە توانیویانە ئەو ساتانە دیاری بکەن کە وا لەهەندێ کەس دەکات دڕندە بێ و هەندێ دیکەش پاڵەوان بێ، ئەم تۆژینەوەیە راستی ئەزمونێکی هاوشێوە دووپات دەکاتەوە کەزانای دەروونی بەناوبانگ (ستانلی ملیگرام) پێش چەندین دەیە ئەنجامی داوە سەبارەت بەچۆنێتی هەڵسوکەوتی مرۆڤ لەژێر گوشاری فەرمانی راستەوخۆ، ئەزمونەکەی ملیگرام کە پرسیاری لە ئەگەری ئەژمارکردنی نازیەکان کەبەشداریان لەکوشتنی جووەکان کردووە لەجەنگی دووەمی جیهان، کە تەنها هاوبەشن لەشەڕخوازی، لەبەر ئەوەی بەشداریان لەو کوشتنە بەکۆمەڵیە کرد تەنها بۆ جێبەجێکردنی ئەو فەرمانەی پێیاندراوە، ئەزمونەکە لەسەر بیرۆکەی مامۆستاو قوتابی بونیات نراوە، کە پێویستە لەسەر یەکەم (مامۆستاکە) هەندێ وشە ئاراستەی دووەم (قوتابییەکە) بکات، لەگەڵ سزادانی بەهێدمەی کارەبایی لەئامێرێکەوە ئەگەر نەیتوانی ئەو وشانە لەبەر بکات، ئامێرە کارەبایەکەش لەراستیدا نەبەستراوە بەقوتابییەکە (قوربانیەکە) وە، بەڵکو ریکۆردەرێك ئەو رۆڵە دەبینێ، کەهاوارکردنی تێدا تۆمار کراوە گوایە ئازار و هاوارکردنی قوتابییەکەیە، بەلآم ئەوانەی کەرۆڵی مامۆستا دەبینن لەئەزموونەکە ئاگایان لەوە نەبووە، لەگەڵ ئەوەی کە ئامێرەکە سورە لەسەر ئاراستەکردنی فەرمان بۆیان بە بەدواداچوونی ئەزموونەکە سەرەڕای دەرکەوتنی نیشانەی ئازار لەقوتابییەکەوە.

ئەوەی لەئەزموونەکە مایەی سەرنجڕاکێشان بوو ئەوەبوو، کە رێژەی سەدا ٦٥ کەبەشداریان لەئەزمونەکە کردوە رازی بوون لە ئاراستەکردنی هێدمە کارەبایەکە بۆ قوتابییەکە بێ گوێدانە هاوارکردن و ئێشو ئازاری، ئەمە هەروەکو (دکتۆر توماس بلاس) شرۆڤەی کردووە مەیلی مرۆڤ دەسەلمێنێ بۆ ملکەچکردنی فەرمانی ئەو کەسانەی کەرێزیان لێدەگرن.

لێکۆڵینەوەیەکی دیکە رەگەز پەرستی مرۆڤی سەلماندوە بێ ئەوەی هەستی پێبکات و لەهەمان کاتدا خۆیانیش بەلێبوردەو رێزگر لەبەهای یەکسانی دادەنێن، لەمبارەیەوە (خاتوو

کیری کاواکامی) سەرپەرشتیاری تۆژینەوەکە وتویێتی ئەم تۆژینەوەیە و زۆرلەشێوەکانی ئەوە دووپات دەکەنەوە، کەهێشتا بیروباوەڕگەلێکی نێگەتیڤ سەبارەت بە رەش پێست لەئارادایە.

لەلێکۆڵینەوەیەکی دیکە دەرکەوتوە کەوا دایکوباوك کاریگەری زۆریان بەسەر بیروبۆچوونی دەرونی منداڵەوە هەیە، ئەو دایکوباوکانەی کەهەڵوێستی ئیجابیان بەرامبەر رەش پێستەکان هەیەو پەیوەندی ئەم دایکوباوکانەش لەگەڵ منداڵەکانیان باش بووە بۆیە ئەو منداڵانە هەڵوێستی ئیجابی تریان بەرامبەر ئەو رەش پێستانە دەبێت و گەشەی پێ دەدەن.

کاوا کامی دەڵێ هەندێ کەس باوەڕیان وایە زۆر لێبوردەن و بێلایەنن، بەڵام لەراستیدا لایەنگیریی شارەویان هەیە و خەڵکیش لەپێشبینیکردنی رەفتاریان لە هەڵوێستە کۆمەڵایەتیە هەستیارەکان زۆر خراپن، دایکوباوك لەکۆمەڵگەی ئێمە بەئاشکرا هێرش دەبەنە سەر کەسانێك و بەتوندی رەخنەیان لێدەگرن لەبەرامبەر منداڵەکانیان و هەر خۆیشیان بەگەرمی پێشوازی لەو کەسانە دەکەن و منداڵیش ئاگای لەهەردوو هەڵوێستەکەی دایەو بابەیە، ئەم دوو هەڵوێستە دژ بەیەکە ململانێی دەروونی و دڵەراوکێ لای منداڵ درووست دەکات و لەسەر کەسێتی و تێفکرینی رەنگ دەداتەوەو کار لەرەفتاری رۆژانەی دەکات.

**هەشتەم: بەهای عەشایری و کاریگەری لەسەر منداڵ: بیرکردنەوەی عەشایەری بەرامبەر منداڵ.**

دەسەڵاتی عەشایەری کاریگەری زۆری لەسەر بیروبۆچوونی تاکەکانی هەبووەو نەیانتوانیوە بەئاسانی لێی دەرباز بن، ئەم دەسەڵاتە کە رەگ و ریشەی لەناو دەرونی تاکدا داکوتیوە بەهاگەلێکی بۆ خۆی دروست کردووە کەوەك پێوەری کۆمەڵایەتی مامەڵەی لەگەڵ دەکرێت و حەسابی بۆ دەکرێت، ئەو جۆرە بەهایانە لەرێگەی خێزان و گەورەکانەوە کاری لەپەروەردەی منداڵیش کردووەو کەسێتی لەژێر گوشاری ئەو بەهایانەدا درووست بووە، شەڕوشۆڕی عەشایەری لەگەڵ عەشیرەتەکانی دەوروبەر لەسەر مەسەلەی زەوی و زارو مەڕومالآت کاردانەوەی لەسەر تاکەکانی هەبووە، هیچ تاکێك نەیتوانیوە خۆی لەو ناکۆکیە عەشایەریانە دوور بگرێت، کەدەبێ جەربەزەیی خۆی نیشان بدات چ بەتفەنگ و خەنجەر بێ چ بەوەفاداری بۆ ئاغاو پیاوماقوڵانی عەشیرەت، جاری واش هەبووە کێشەی عەشایەری بە ژن و ژنخوازی

کۆتایی هاتوەو ئەم ژن و ژن خوازیەش لەسەر حەسابی رەگەزی مێ بووە ئەگەر رازی بووبێ یان نا ئەمیش جۆرێکە لەتوندوتیژی بێدەنگ کەدژی ئەو رەگەزە یان خێزانەکەی کراوە، یان کچ لە جیاتی خوێن دراوە، بێگومان ئەو جۆرە پرۆسەیەی ژن و ژنخوازی کاردانەوی نێگەتیڤی لەسەر هاوسەرەکان و منداڵەکانیشی دەبێ کەئەمەش خۆی لەخۆیدا بەرجەستەبوونی کلتوری تونوتیژییە لای تاکی کوردو لەنەستیدا پەنگی خواردۆتەوەو ئەو هزری توندوتیژییە لەو کەسەوە گواستراوەتەوە بۆ منداڵەکانی ئەوانیش لەرێگەی خۆیانەوە بۆ نەوەکانی دواتریان.بەڵام نابێ لەبیرمان بچێ کەگۆڕانی کۆمەڵایەتی کارێکی حەتمیە هەردەبێ روودات نەخاسمە لەکاتێکدا رەفتاری مرۆڤ خاسیەتێکی دینامیکی هەیە کەتوانای راستکردنەوەو بەرەو پێشچوونی هەیە، تاکی کوردیش وەك هەمو تاکێکی دیکەی گەلانی دونیا بەپێشکەوتنی بارودۆخی سیاسی و ئابوری و بەرزکردنەوەی ئاستی داهاتی تاك و کاریگەری تەکنۆلۆژیا ئەویش بەرەو پێشەوە دەچێت و کلتوری مەدەنیانەو مافی مرۆڤ شوێنی کلتوری توندوتیژی دەگرێتەوە، بۆیە پێویستە لەسەر دەزگا پەروەردەیی و کۆمەڵایەتیەکان کلتوری ناتوندوتیژی و گیانی لێبوردەیی لەتاکەکانی کۆمەڵ بچێنن و تۆژینەوەی زانستی سەبارەت بە بەرەنگاربوونەوەی کلتوری توندوتیژی ئەنجام بدەن و ریسوای بکەن و لەرێگەی میدیاکانەوە رۆشنبیری سایکۆلۆژی بۆ هەموو تاکێك بڵاو بکەنەوە، لەکەناڵە کوردیەکان هەر لەبڵاونامەی هەواڵەکانەوە بیگرە تا دەگاتە ریکلام و فیلمە ناوخۆیی و دۆبلاجکراوەکان کەرۆژانە گەورەکان بەدوایدا دەچن بەئاشکراو لەدووتوێییاندا توندوتیژی هەیەو کاردانەوەی راستەوخۆو ناراستەوخۆی لەسەر کەسێتی منداڵ و باری دەرونی گەورەش هەیەو ئایندەیەکی نێگەتیڤی لەسەر باری دەروونی دەبێ، ئەو فاکتەرانەی باسمان کردن چ مێژووی بێ یان جوگرافی یان کەشوهەوا یان شێوازی گوزەران و بژێوی ژیان بەشداریەکی زۆر دەکەن لەپێکهێنانی کلتورو ئەمیش رەنگدانەوەی لەسەر باری باری دەروونی تاك دەبێت. .

## تاوانی کۆمەڵایەتی:

**دانیشتوانی کۆڵان و گەڕەکە هەژار نشینەکان زیاتر بەشداری تاوان دەکەن**

**(لێکۆڵینەوەیەکی ئەمریکایی)**

سستمی کۆمەڵایەتی سورە لەسەر پاراستنی بەرژەوەندی تاکوکۆمەڵ بەگوێرەی ئەو یاسایانەی دایناوە، لادان لەو یاسایە یان سەرپێچیکردنی سزای تایبەتی خۆی دەبێ، بەوپێیە تاوان بەگوێرەی مانا یاساییەکەی ئەنجامدانی ئەو کردەوەیە کەیاسا قەدەغەی کردووەو سزایەکی بۆداناوە.

دیاردەی تاوان لەسەرەتای ژیانەوە بەشێوازی جیاجیا هەبووە وەکو کوشتن لەوانەش کوشتنی هابیل لەلایەن قابیلی برایەوە کەئەمیش شێوەیەکە لەشێوەکانی توندوتیژی کەدژی بەرژەوەندی تاکەکانی کۆمەڵەو تاوانیش لەشوێنێکەوە بۆ شوێنێکی دیکە جیاوازە، لەوانەش تاوان لەشارە گەورەکان کەبەشێوەیەکی گشتی لەوشارانە زۆرترن ئەگەر بەراورد بکرێ لەگەڵ شوێنەکانی دیکەی وەکو لادێنشین، یان ئەو شوێنانەی کەدانیشتوانیان کەمترە، هۆکاری ئەمەش بۆ ئەوە دەگەڕێتەوە، کەلەشوێنی قەرەباڵغ و چڕدا کێشەوگرفتەکان بەحوکمی زۆری پێداویستیەکان و هەمەچەشنی چین و توێژەکانی کۆمەڵ کەزۆر جار لەململانێی چینایەتی خۆی دەبینێتەوە بەڵام ئێمە نامانەوێ خۆمان لەقەرەی ململانێی چینایەتی بدەین چونکە لەئامانج دوور دەکەوینەوە، هەروەها لەشوێنی قەرەباڵغ بەتایبەتی لەو شوێنانەی، کەلادێنشینەکانی بۆ گوازراوەتەوە بەهاکۆمەڵایەتیە جیاوازەکانی شارو لادێ خۆیان بەیکتردا

دەدەن کەپێی دەوترێ (اصگدام القیم الاجتماعیە) کەیەکێکە لەهۆکارەکانی تاوانی توندوتیژی، هەروەها جیاوازی پیشەو جیاوازی باگڕاوندی تاکەکان وئاستی خوێندن و رۆشنبیری رادەو بڕی داهاتی خێزان و شێوازی ژیان هۆکارن بۆ بڵاوبوونەوەی تاوان، بەگوێرەی لێکۆڵینەوەکان گەڕەکە قەرەباڵغەکان کەهاوتەریبی کۆمەڵایەتی بەگوێرەی پێویست نییە دەبێتە سەرچاوەیەك بۆ فێربوونی تاوان لەشارەکاندا.

لەگرنگترین ئەو لێکۆڵینەوانەش لەبواری تاوانی توندوتیژی ئەوەبوو کەلەئەمریکا لەکۆتایی شەستەکانی سەدەی رابردوو لیژنەیەك بەناوی لیژنەی نیشتمانی بۆ تاوانی توندوتیژی ئەنجامیاندا بەگوێرەی ئەو لێکۆڵینەوەیە:

١- تاوانی توندوتژی دیاردەیەکە بەستراوە بەشارەوە بەتایبەتی شارە قەرەباڵغەکان.

٢- زۆربەی تاوانی توندوتیژی (نێر-کوڕ) ئەنجامی دەدات.

٣- زۆربەی ئەوانەی تاوانی توندوتیژی ئەنجام دەدەن تەمەنیان (١٥-٢٤) ساڵە

٤- زۆربەی ئەوانەی تاوان دەکەن سەر بەو خێزانانەن کەداهاتیان نزمە

٥-دانیشتوانی گەڕەکە هەژار نشینەکان بەشداری زیاتری تاوان دەکەن

٦-زۆرببەی قوربانیانی توندوتیژی سەر بەهەمان ئەو توێژە کۆمەڵایەتیانەن کەتاوانکارن لێوەی هاتوون

٧-زۆربەی تاوانەکانی توندوتیژی ئەو کەسانە دەیکەن کەپێشتر تاوانیان ئەنجام داوە

ئەو ئەنجامانە هەرچەندە تایبەتە بەکۆمەڵگەی ئەمریکی بەڵام بەگوێرەی قسەی زانیان بەسەر زۆربەی کۆمەڵگە مرۆییەکاندا دەچەسپێ.

بەگوێرەی لێکۆڵینەوەیەکی دیکە پێوەری کۆمەڵایەتی کاریگەری لەسەر رەفتاری تاوانکاری هەیە کەلەرێگەی ئەو پێوەرانەوە رێز لەیاسا دەگیرێ یان پێشێل دەکرێ و هەر ئەو پێوەرە سزا بەسەر پێشێلکاران دیاری دەکات، بۆ نموونە باندە تاوانبارە گەورەکان کەسزای وای بەسەر ئەندامانی داناوە بەئاسانی ناتوانێ پێشێلی یاساکانی بکەن، تاوانی توندوتیژی لەهەموو دونیادا زیادی کردووە زیاتریش بەهۆی کەمی سزا یان لاوازی باری ئاسایش و بوونی شەڕوشۆڕو دزی و راوەرووت، کەلەرێگەی لاساییکردنەوە کەسانی نوێ دروست دەکەن.

ئەو هۆکارنەی کەدەبنە هۆی تاوان ململانێی پێوەرە کۆمەڵایەتیەکان و گۆڕانی خێرای کۆمەڵایەتی و کۆچکردنە لەلادێوە بۆشار، کەململانێی رۆشنبیری نێوان توێژەکان دروست دەکات، خێزانیش

کاریگەری خۆی هەیە بۆ گواستنەوەی تاوان لەرێگەی لاساییکردنەوە یان ئالودەبوون یان هەڵوەشاندنەوەی خێزان و ناهوشیاری و نەداری و نەخۆشی، شارستانیەتیش کاریگەری خۆی هەیە لەگواستنەوەی رەفتاری توندوتیژی، ئەو کۆمەڵگایانەی کەرەفتاری ناشارستانیان هەیە توندوتیژترن و تاوانی توندوتیژی زیاتر تیایاندا روو دەدات، بیرمەندی عەرەبی ئیسلامی ئیبن خەلدون وتویەتی (وەحشیگەری فاکتەری سەرەکیە لەململانێی کۆمەڵایەتی و مرۆڤ چەند دوور بێت لەشارو شارستانیەت رادەی توندوتیژی زیاتر دەبێت ) راستە ئیبنخەلدون باس لەململانێ کۆمەڵایەتی کردووە، بەڵام ئەو ململانێیە لەرەفتاری تاك کەتاکەکانیش کۆمەڵ دەگرنەوە سەرچاوە دەگرێ کەئێمە پێشتریش ئاماژەمان بەوەدا کەگواستنەوەی لادێنشین بۆ ناوشارەکان بەهۆی پێکدادانی بەها کۆمەڵایەتیەکان دیاردەی توندوتیژی دروستکرد، ئەمیش بەڵگەی ئەوەیە کەلەخودی ململانێی کۆمەڵایەتی رەفتاری توندوتیژی دەردەکەوێ، کەلە گیانی تاکەکاندا خۆی دەنوێنێ، لەروانگەی زانایانەوە توندوتیژی (جوێن) یش دەگرێتەوە کەواتە جوێنیش تاوانەو سزای خۆی هەیە، گومانی تێدانیە جوێن لەنێوان چینە جیاوازەکانی کۆمەڵدا هەیە وەکو توانجگرتن و پلارگرتن یان قسەی ناشیرین یان بەشێوەی پەند لەناو کۆمەڵگاکاندا هەیە بۆ نموونە لەناو عەرەبدا دەڵێن دوژمنەکەت بکوژە پێش ئەوەی بتکوژێ، لەکۆمەڵگەی کوردیش ئەو جۆرە رەفتارە زۆر دەبینین و لەژیانی رۆژانەیاندا خەڵك پەنای بۆدەبەن، کەباوەڕیان بەوەیە دوژمنی دوژمن دۆستە، کەرەنگە ئەو دۆستەش لەوپەڕی جیاوازی هزری و بیرکردنەوەدا بێ لەگەڵ ئەمدا.

هەروەها رکوکینەو شەڕخوازی رەگوریشەیەکی کۆمەڵایەتی هەیە دەکرێ ناوی بنێیین تاوان، کەلەکاتی تۆڵەسەندنەوەدا کۆمەڵگەکان پەیرەوی دەکەن بۆ نموونە کۆمەڵگەی کوردەواری ئەگەر کەسێك بکوژرێ کەسانی ئەم کوژراوە دەچن بکوژەکە یان کەسێکی بکوژەکە دەکوژن، کەبیرکردنەوەی زانستی و وشیاری کۆمەڵایەتی ئەم رەفتارە رەتدەکاتەوە، گوشارو رکوکینە لەناو کۆمەڵگەوە بەسەر تاکدا دەسەپێنرێ لەسەر رەفتاری ئەو تاکە رەنگ دەداتەوە، لەمبارەیەوە زوهێر حەتەب و عباس مکی کەدوو لێکۆڵەرەوەی بواری کۆمەڵایەتین پێیانوایە دەوروبەر ئەگەر منداڵیان خستە ژێر رکێفی بەهاکانی خۆیان و نەسەقی کۆمەڵایەتیان لەرێگەی فشارو زۆرداری ئەوا تاکەکانی ئەو کۆمەڵە نوێنەرایەتی توندوتیژی دامەزراوە کۆمەڵایەتیەکانی وەکو خێزان دەکەن لەپەیرەوکردنی توندوتیژیدا.

فاکتەری کۆمەڵایەتی و ئابوریش لەو توندوتیژیەش زیاتر دەکات، کەدەبنە فشاری دەروونی سەر تاك، دیمەنە ترسناك و فیلمە هاندەرەکانی توندوتیژی تەلەفزیۆنیش هۆکارێکی دیکەی تاوانی

کۆمەڵایەتیە لەپەیڕەوکردنی توندوتیژی یان لاساییکردنەوەی توندوتیژی، تەنانەت گۆرانیە کلیپکراوەکان کەکوشتن و بڕینی تێدایە کاریگەری خۆی لەسەر باری دەروونی و هاندانی شەڕانگێزی هەیە، جگەلەوەش هەواڵ و ڕیۆرتاژەکان و کورتە فیلم و زنجیرە فیلمە کوردی و بیانیەکانیش .

کەمی پشودان و حەوانەوەو هێوربونەوە بەهۆی زۆری کارکردن و ماندوبوون و فشارەکانی ژیان هۆکاری توندوتیژین کەسەرچاوەی دەگەڕێتەوە بۆ هەژاری و خراپی شوێنی نیشتەجێ، کاتی ڤاڵایی کۆمەڵایەتی بەتایبەتی لەو کۆمەڵگایانەی، کەهەلی کارکردنیان کەمە ئەمەش لەسەرکلتوری کۆمەڵگە ڕەنگی داوەتەوە ئەوەتا لەکۆمەڵگای کوردەواریدا دەڵێن: شەڕ لەبەتاڵی باشترە، مەبەست لەمەش ئەوەیە کاتێ مرۆڤ ماوەی ڤاڵایی زۆربوو حاڵەتی پێکدادانی کۆمەڵایەتی لەگەڵ ژینگەی دەوروبەر زۆرتر دەبێت و شەڕوهەرای لێ دەکەوێتەوە، کەئەمیش جۆرێکە لەتوندوتیژی.

مستەفا حجازی لەمیانەی لێکۆڵینەوەیەکی مەیدانیدا لەلوبنان لەسەر لاوانی تازەپێگەیشتووی لوبنان گەیشتە ئەو ئەنجامەی کەوا ترازانی کۆمەڵایەتی بەستراوە بەتێکچوونی شیرازەی کۆمەڵایەتی و ئابوری ودابەزینی ئاستی ڕۆشنبیری و پەروەردەیی دانیشتوان کەهەندێ لەهۆکارەکەی دەگەڕێتەوە بۆ جیاوازی لەتێڕوانینی ئەو کەسانە بۆ ژیان، جیاوازی بەها کۆمەڵایەتیەکان و جیاوازی وشیاری و ئەقڵیەت و کلتوری دانیشتوان، لەلایەکی دیکەوە د.غسان ڕەباح فاکتەری ژینگەشی دەستنیشان کردووە، کەخێزان تیایدا دەژی و دەبێتە هۆی زیادبوونی تاوان و بەرەڵابوونی تاك، شوێن نیشتەجێی هەژار تەنها شڵەژان و پەشێوی کۆمەڵایەتی دروست ناکات بەڵکو کار لەهەڵوێستەکانیش دەکات وەکو تیژکردنی مەیلی توندوتیژی و تاوان ئەنجامدان .

توندوتیژی خێزانیش بەتایبەتی دژی منداڵ وئافرەت و نەخاسمە نێوان پیاو ئافرەت هۆکاری دیکەی ئەنجامدانی تاوانی کۆمەڵایەتین کەمنداڵ ناچار دەکرێ ڕووبکاتە دەرەوەی ماڵ و لەئەنجامیدا دووچاری کێشە و گرفت دەبێتەوە بەتایبەتی لەژینگەیەکدا کەوشیاری کۆمەڵایەتی و ڕۆشنبیری کۆمەڵایەتی لەئاستێکی زۆر نزمدان و شەڕو بێ باوککردنی منداڵ و سەقەتبوونی یەکێکیان بەشێوەیەکی ناڕاستەوخۆ دیاردەی توندوتیژی زیاتر دەکات، چونکە ئەو کەسانە کەبنکەو سەنتەری شیاندنی کۆمەڵایەتیان نەبوو ئەوا دەبنە نێچیری چەوری کەسانی نەفس نزمی کۆڵان و جادەو بانەکان.

بەهەر حاڵ سیمای هاوبەشی کەسانی توندوتیژ بریتیە لەنەبوونی گیانی کۆمەڵایەتی کەرێگەی پێدەدات ئامانجەکانی خۆی بێ پەرچدانەوە جێبەجێبکات.

شەڕانگێزی لای لۆرنس هەروەکو فرۆید غەریزەیەکە لەئەنجامی ئەو وزە بەردەوامەی مرۆڤ خۆی و مەرجیش نییە ئەو شەڕانگێزییە وەلامگۆی وروژێنەرە دەرەکیەکانی مرۆڤ بێ، لۆرنتس پێیوایە وزەی تایبەت بە کرداری غەریزەیی بەردەوام کەڵەکە ئەبی لەسەنتەرە سروشتیەکانی ئەو جۆرە مرۆڤە کەشەڕانگێزن، ئەگەر وزەی پێویست کەڵەکە بوو ئەوا لەوانەیە بتەقێتەوە بێ ئەوەی وروژێنەر بوونی هەبێ، بەهەر شێوەیەك بێ مرۆڤ و ئاژەڵ و بوونەوەران زۆرجار لەو وروژێنەرە دەگەڕێن کەوزەی پەنگ خواردوویان بتەقێنێتەوە، چاوەڕێش ناکەن کەوروژینەری گونجاو دەربکەوێ، ئەم جۆرە رەفتارە لۆرنتس پێی دەڵی رەفتاری برسی (السلوك المشتهی)، دووپاتیشی دەکاتەوە کە مرۆڤ حزبی سیاسی دروست دەکات بۆئەوەی ئەو وزە پەنگ خواردووەی خۆی بوروژێنێ، لەجیاتی ئەوەی ئەحزابی سیاسی هۆکاری شەڕانگێزی بن.

کەواتە تاوانی کۆمەڵایەتی بەو پێیەی پێشێلکردنی یاسای کۆمەڵایەتی و کەتنکارییە هەر لەنیەتەوە هەستی رکوکینە دەگرێتەوە تا دەگاتە جوێندان و ئازاری جەستەیی و کوشتن و دزی و مامەڵەی خراپ و دەستدرێژی سێکسی و تێکدانی بەرژەوەندی کۆمەڵ لەگەلێك هۆکاردا خۆی دەبینێتەوە لەوانەش هۆکاری دەروونی تاك، هۆکاری ئابوری و گوزەرانی خێزان، هۆکاری رۆشنبیری خێزان و کۆمەڵ و وشیاری کۆمەلایەتی، هۆکاری کۆمەلایەتی خێزان لەتێکچوونی شیرازەی پەیوەندیەکانی خێزان و هەلوەشاندنەوەی بەهۆی تەلاق و جیابوونەوەی دایکوباوك، بلاوبوونەوەی نەخۆشی، کۆچکردن لەلادێوە بۆشارو قەرەباڵغی شوێنەکان و تەسکی کۆلانەکان، شەڕو شۆڕو کارەساتی سروشتی، خراپی رەوشی پەروەردەو فێرکردن و زۆری کاتی ڤالایی و سود لێوەرنەگرتنی ...تد

ئەگەر ئیزدیحام مەرجییێکی گرنگ بێ بۆ شەڕانگێزی ئاژەڵ ئەوا پرسیارێك خۆی قیت دەکاتەوە ئایا ئیزدیحام بەهەمان شێوە سەرچاوەی گرنگە بۆ شەڕانگێزی مرۆیی، ئەم بیرۆکەیە بەشێوەیەکی فراوان باوەڕی پێ کراوە، لەمبارەیەشەوە لیهاوزن کەبەڵگە دەهێنێتەوە کەوا چارەسەری یاخی و توندوتیژی نییە بێ دروستکردنی هاوسەنگی ژمارەی دانیشتوانی کۆمەڵگاکانی مرۆیی و پەلەکردن لەدۆزینەوەی ئامرازی سەرکەوتوو بۆ کۆنترۆڵکردنی، بەشێوەیەکی باو ئیزدیحام و چڕی دانیشتوان تێکەلبوونێکی دروست کردووە، بەلام لیهاوزن کەجۆرە نزیککردنەوەیەکی لەهەردوو زاراوەکە کردووە ئەوەی فەرامۆشکردووە کە گرفتی ئیزدیحام دوو رووی هەبێ، ئەوانیش لەناوبردنی بونیادی کۆمەلایەتی و نەگونجاندنی نێوان قەوارەی دانیشتوان و بنەمای ئابوری و کۆمەلایەتی بوونی ئەو دانیشتوانە.

مرۆڤ پێویستی بەنیزامێك هەیە کەپێگەی تیادا هەبێ و پەیوەندیشی بەکەسانی ترەوە تارادەیەك جێگیر بێ و بەهاو ئایدیای پەسەند پاڵپشتی بکات، بەڵام لەکۆمەڵگای پیشەسازی تازە داب ونەریتەکان و بەها هاوبەشەکان و پەیوەندیە کەسی و کۆمەڵایەتیەکان تارادەیەکی زۆر لەناوچوون، ئەو مرۆڤەی کەهاتۆتە ناو کۆمەڵگەی قەرەباڵغی تازەوە تەنهاو گۆشەگیرە، هەرچەندە خۆیشی بەشێکیش بێ لەو قەرەباڵغییە، بەڵام ئەو بیروباوەڕی پێ نییە کەپێی بژی لەگەڵ کەسانی تردا تەنها ئەو دروشم و ئایدۆلۆژیایانە نەبێت کەلەرێگەی میدیاوە دەستی دەکەوێت، تاکیش ئەگەر بۆ بەرژەوەندی نەبێ یەکناگرێتەوە هەرچەندیشە زۆرجار بەرهەڵستکارە، ئەمیل دورکهایم ئەم دیاردەیەی ناو نا نەبوونی نیزام یان بێ نیزامی (anomie) پێشیوابوو ئەوە گرنگترین هۆکاری خۆکوشتنە کەلەگەڵ پیشەسازی زیاد دەبێ.مەبەستی دورکهایم لەنەبوونی نیزام لەناوچوونی هەموو پەیوەندیە کۆمەڵایەتیە تەقلیدیەکانە کەبەهۆی ئەوەی کەهەموو سیستمێکی کۆمەڵایەتی راستەقینە بووەتە شتێکی لاوەکی بەنسیبەت دەوڵەتەوەو ژیانی کۆمەڵایەتی راستەقینەش لەناوبردرا، دورکهایم باوەڕیشی وابوو کەوا خەڵك کەلەبارێکی سیاسی تازە دەژین وەکو تەپوتۆزێکە کەلەتاك دروست بووبێ، بەهەمان شێوەش ف. تونیس هەمان رای هەیە، کەواتە چڕی دانیشتوان بەتەنها هۆکاری شەڕانگیزی مرۆیی نییە، بەڵکو نەبوونی بونیاتی کۆمەڵایەتی و پەیوەندیە هاوبەشەکانیش بەشدارن، وڵاتانی وەکو بەلجیکاو هۆڵەندا کەدانیشتوانیان زۆر چڕە، بەڵام دانیشتوانەکەشیان شەڕانگێز نین، هەروەها هەردوو میهرەجانی لاوان لە وودستوك و دورگەی وایت لەئەنگلتەرا کەزۆریش بوون بەشێوەیەکی زۆر سەرنجڕاکیش بی شەڕانگیزی بون لەکاتی خۆیدا.

ئیزدیحام خۆی لەخۆیدا تەنها هۆکاری شەڕانگێزی نییە، بەڵکو رەوشی کۆمەڵایەتی و سایکۆلۆژی و ئیکۆنۆمی کەدەبنە هۆی شەڕانگیزی بەرپرسیارن لەشەڕانگێزی، ئاشکراشە کەوا زۆری دانیشتوان و چڕیەکەی لەبارودۆخی هەژاریدا دەبێتەهۆی توندوتیژی و شەڕانگێزی بەتایبەتی لەو شوێنانەی کەپارێزراو نین لەرەفتاری راستەوخۆی کەسانی مشەخۆر، کەواتە پێوەری گونجاو بۆژیانی ئاسایی گەڕانەوەی نیزامە بۆ ئەوەی لەبێ نیزامی رزگارمان بێت هەروەکو دورکایم ئاماژەی پێداوە، ئەمیش گۆڕانی رادیکالی کۆمەڵایەتی دەوێ، ئاژەڵ ناتوانی گۆڕانکاری لەبونیادی کۆمەڵایەتی بکات بەڵام مرۆڤ ئەو توانایەی هەیەو توانای بەستنی پەیوەندی کۆمەڵایەتی و بەهای هاوبەشی هەیە بۆیە چارەسەری مرۆڤ بۆ گرفتی ئیزدیحام چارەسەرێکی سیاسی و کۆمەڵایەتیە، بەڵام هی ئاژەڵ چارەسەری غەریزەییە.

بۆچارەسەرکردنی تاوان و بەرەنگاربوونەوەی پێویستە لەسەر دامەزراوەکان بەتایبەتی دامەزراوی مەدەنی کەزەرورەتی ئەم چەرخەیە پێویست هەنگاو بنرێ بۆ نەهێشتنی کاتی ڤالاَیی و دۆزینەوەی هەلی کارکردن و وشیارکردنەوەی خەلّك و ئاگادارکردنەوەیان لەمەترسی تاوان و یارمەتیدانی هەژارن و بێوەژنان و بێ سەرپەرشتان و پیرو پەککەوتەو منداڵانی بێدەرەتان بۆ ئەوەی فشاری ژیان لەسەریان کەم ببێتەوەو دامەزراوەکان لەو دیاردەیە کەتەواوکەری ئەو رۆڵانەیە کەخانەکانی نەوجەوانان پێی هەڵدەستن لە دۆزینەوەی هەلی کارکردن بۆئەو تۆمەتبارەی گیراوەو ئازادکراوەی یان بۆ ئەو کەسەی کەگیراوە چاکسازی لەسەر کراوە، خەڵکیش وشیاربکرێتەوە کە بەچاوی کەم تەماشای ئەو گیراوانە نەکەن بۆ ئەوەی متمانەیان پێ بدرێتەوە کەئەوان کەسانی پێویستی ناو کۆمەڵن، زیادکردنی بواری خزمەتگوزاری زیندانەکان و یارمەتیدانیان و هاوکاری ئەو خێزانانەی کەمنداڵیان زۆرە یان رەوشی ئابوریان خراپە لەرێگەی چاودێری خێزانەوەو ئەنجامدانی یان دروستکردنی شوێنی نیشتەجێی زۆر بۆ کەمکردنەوەی پێکدادانی کۆمەڵایەتی و بەها کۆمەڵایەتیەکان و کەمکردنەوەی فشار لەسەر ئەو خێزانانە، کەشوێنی نیشتەجێیان زۆر خراپە، پێویستیشە یارمەتی لێکۆڵەرەوانی کۆمەڵایەتی و دەروونی بدرێ بۆ ئەنجامدانی لێکۆڵینەوەی زانستی کۆمەڵایەتی و دەروونی و نیشاندانی هۆکارەکانی تاوان و تاوانکاری و چارەسەرکردنی، سەرەڕای ئەوەش زۆر گرنگە کە میدیا رۆڵی کاریگەری خۆی ببینێ لەزۆرکردنی بەرنامەی کۆمەڵایەتی و وشیارکردنەوەی خێزان و نیشاندانی ئەو مەرگەسات و کوێرەوەریەی، کەلەئەنجامی تاوان دێتە کایەوەو پەرەپێدانی کەسانی خاوەن پسپۆرێتی و فەرامۆش نەکردنیان، هەروەسا دروستکردنی پەیوەندی توندوتۆڵ لەنێوان پسپۆران و قوتابخانەکان و دامەزراوەکانی مەدەنی و میدیا لەدەروەدانی تاوان و وشیارکردنەوەی خێزان و بڵاوکردنەوەی خوێندەواری.

لەوبیردۆزانەی کەئاماژەیان بەتاوان داوە بیردۆزی جوگرافیا کەهۆکاری تاوان دەکەرێنێتەوە بۆ هۆکاری جوگرافیاو وەرزەکانی ساڵ و کەشوهەواوژینگە، هەروەها بیردۆزی ئابوری کەپێیوایە تاوان و تاوانکاری هۆکاری هەژاری و دەستکورتی بێکاری لەپشتەوەیە، بیرۆدزی بایلۆژی کەلەهەموان باوترەو لۆمبرۆزوی ئیتالیەوە دانراوە دەڵێ شێوەی جەستە تاوان کاریگەری لەسەر تاوان هەیەو هۆکاری بۆماوەش کاریگەری لەسەر ئەو جەستەیە هەیە، لەو شێوانەش کەتاوانکردنی پێوە دیارە هاوشێوە نەبوونی هەردوو نیوە گۆی کاسەی سەر، گەورەیی چەناگەو فسبوونی لووت و کەمی موو لەژێر چەناگەو کەمی هەستکردن بەئازار.

## کێ چەقۆکێشە؟

**چەقۆکێش (ویژدان مردوو) ئەو کەسانەن کەلەیاسا ناترسن و گوێ نادەنە بەرژەوەندی گشتی**

چەقۆکێشی دیاردەیەکی دەرونی تاوانکارییە، بەپێی لێکۆڵینەوە دەروونیەکان هەموو ئەو کاروکردەوانە دەگرێتەوە، کەکەسێك ئەنجامی دەدات بێ ئەوەی رەچاوی یاساو شەرع و دەستوور بکات و بێئەوەی رێز لەنیزام بگرێت و گوێڕایەڵی کۆمەڵ بێت، بێئەوەی رێز لەمافی کەسانی دی بگرێت و بەسیستەم و عورف و دابونەریت و بەها کۆمەڵایەتیەکان و ئاین پابەند بێت، لەبەرئەوە گەندەڵچی و ئەو کەسەی کەیاسا پێشێل دەکات و مافی خاوەن ماف دەخاتە ژێر پێوەو بەرتیلخۆری دەکات و هەق و ناهەق لێك جیاناکاتەوەو گوێ ناداتە نیزام و یاسا و سزای تاوان و پابەند نابێت بەماف و دادوەری و ویژدانەوە دەچێتە ریزی چەقۆکێشیەوەو بەوکارانەی ئەنجامی دەدات دژی بەرژەوەندی باڵای کۆمەڵ و دەبێتە مایەی زەرەر و زیان گەیاندن بەبەرژەوەندی گشتی.

چەقۆکێشی رەچاونەکردنی ویژدانی ئەخلاقی و بەهاو پێوەری کۆمەڵایەتی و یاساکانە، کەواتە بەگوێرەی ئەو لێکۆڵینەوانە، کەکراون هەندێ لەو کەسانە دەخەینە روو کەرەفتاری چەقۆکێشییان بەسەردا دەچەسپێت.

* ئەگەر سیاسەت پرۆژەیەك بێ بۆ خۆدەوڵەمەندکردن ئەو پەڕی چەقۆکێشیە، هەروەها ململانێی حزبایەتی لەسەر حیسابی نەتەوەیی و نیشتمانی .

* ئەوەی خەریکی بەرتیل و بەرتیلخۆریە چەقۆکێشە.

* ئەوەی موڵك و ماڵی کەسانی تر داگیردەکات چەقۆکێشە، چ حکومەت بێ یان حزب یان هەر دەست وتاقم و کەسێك.

* ئەو بەڵێندەرەی جادەو کۆڵانەکان هەڵدەکۆڵێت و رەچاوی ماوەی پرۆژەکە ناکات و بەجێی دێڵێت تا باران لێی دەدات چەقۆکێشە، ئەوەیشی بەرگری لەو بەڵێندەرو قۆنتەرانچییانە دەکات چەقۆ کێشەو ویژدانی مردووە

* ئەو فەرمانگەیەی مۆڵەتی بیناسازی گرێبەستی خەیاڵی (وەهمی) دەکات چەقۆکێشە.

* خۆدەوڵەمەندکردن لەرێگەی پایەو پلە و پۆستی حزبی و حکومی بەشێوەی نا شەرعی چەقۆکێشییە.

* ئەوانەی لەکاری بیناسازی غەش دەکەن و سەرپێچی دیکۆرات و نەخشەو وێنەئەندازیاریەکان دەکەن چەقۆکێشن.

* ئەو فەرمانبەرەی بەئەنقەست لەکارەکەی دوا دەکەوێت چەقۆکێشەو سەرۆکی فەرمانگەکەش کەلێی ناپرسێتەوە چەقۆکێشە.

* ئەو بەرێوەبەرەی بەئەنقەست کاری خەڵك دوابخات چەقۆکێشە.

* ئەو وەزیرەی هاولاتیان لەدەرەوەی نوسینگەکەی چاوەڕی دەکەن لەبەرئەوەی کچێکی جوان یان بازرگانێك میوانێتی چەقۆکێشە.

* ئەو بەرپرسە حکومیەی کەبەهەفتە کارەکەی بەجێ دێڵێت و کەس لەشوێنی خۆی دانانێت بۆ راپەڕاندنی ئیشو کاری هاولاتیان ئەوە چەقۆکێشە.

* ئەو فەرمانبەری کۆسپ دەخاتە بەردەم بەرژەوەندی هەتیوو و بێوەژن و پیرو پەککەوتوان و خانەنشینان و کەسوکاری شەهیدانەوە ئەوە چەقۆکێشە.

ئەو بەرێوەبەرەی زەمینە بۆکاری واسیتەو دەستماچکردن خۆش دەکات چەقۆکێشە.

* ئەو کەسانەی زەوی شارەوانی و مەتروکە دەفرۆشن بۆگیرفانی خۆیان و زەوی بەزەوی دیکە دەگۆڕنەوە چەقۆکێشن.

* هەر بەرپرسێك هاولاتیەك دەکاتە هاوبەشی خۆی بۆوەرگرتنی زەوی و فرۆشتنەوەی بەهاوبەشی ئەوە چەقۆکێشە.

* ئەوەی کارئاسانی دەکات بۆ کەسانی تر کەموڵك وماڵی حکومەت بخۆن چەقۆکێشە.

* ئەوەی لەسزاو یاسای دەوڵەت نەترسێ چەقۆکێشە.

* ئەو پزیشکەی لەنەخۆشخانەکانەوە بەئەنقەست نەخۆش ڕەوانەی نۆرینگەی خۆی دەکات چەقۆکێشەو فرۆشتنی دەرمانی ئێکسپایەر بەهاولاتیان و بازرگانیکردن پێوەی کاری چەقۆکێشیە .

* ئەو کەسەی زۆپاو موبەریدەو کەلوپەلی فەرمانگەی بەئەمانەتیش بێت بباتەوە بۆماڵی خۆی چەقۆکێشە.

* ئەوانەی ئۆتۆمبێلی فەرمانگە حکومیەکان دوای دەوامی ڕەسمی بەکاردێنن بۆ بەرژەوەندی خۆیان چەقۆکێشن.

* ئەوەی دژی گەشەپێدانی نیشتمانەکەی بێت چەقۆکێشە.

* ئەوەی دژی سزادانی تاوانبارێك بێت و بەرگری لێبکات چەقۆکێشە.

* ئەوەی دژی شارستانیەت وئازادی خەڵك بێت چەقۆکێشە.

* ئەوانەی هەوڵی ساختەکاری دەدەن لەهەڵبژاردن چەقۆکێشن.

* ئەو بەڕێوەبەرەی کەلوپەلی تاقیگەکانی قوتابخانەکان لەقوتابیان بشارێتەوەو پارەی فرۆشگای قوتابخانە بخوات و بەرێککەوتن لەگەڵ بەرپرسانی گەورتر فرۆشگای قوتابخانە وەربگرێت چەقۆکێشە.

* ئەو بەڕێوەبەرەی پێش تەوابوونی دەوامی خۆی کاری هاولاتیان بۆسبەینێ دوابخات چەقۆکێشە.

* ئەو پەرتوك و کتێبانەی کەبەشی قوتابیانەو لەبازارەکان دەفرۆشرێن کاری چەقۆکێشیە.

* ئەوەی دەخواتەوەو منداڵەکانی لەماڵ دەردەکات چەقۆکێشە.

* ئەوەی نرخی شمەکەکانی فەرمانگەکەی لەسەر (وصولات) زیاد دەکات بەناوی لیژنەی کڕینەوە چەقۆکێشە.

* ئەو مامۆستایەی لەناو پۆلدا خۆی بەشتی لابەلایەوە خەریك دەکات و تواناکانی تەنها بۆ وانەی تایبەتی (خصوصی) بەکاردێنێت ئەوە چەقۆکێشە.

* ئەوەی بۆڕی ئاوی سەرەکی دەشکێنێ و بۆماڵەکەی خۆی رایدەکێشێ بەبێ مۆڵەت چەقۆکێشە.

* ئەوەی کارەبا فول دەکات بەبێ مۆڵەت چەقۆکێشە، ئەوەیشی بەبێ بوونی یاسایەك مۆلەت دەدات هەر چەقۆکێشە.

* ئەوانەی پاراستنی ژینگەیان بەلاوە گرنگ نییە چەقۆکێشن وەکو ئەوانەی پاشماوەی خواردنەوەکانیان و هەر پاشماوەیەك لەناو ئۆتۆمبیلەکانیانەوە فڕێ دەدەنە دەرەوەو ئەوانەی بەئاوی پاکی خواردنەوە بەهەر شێوەیەك بەفیڕۆ بدەن لەشوشتنی ئۆتۆمبیل و شوشتنی جادەو کۆڵانەکان.

* ئەوانەی هەڕەشە لەدەرکردنی یان گواستنەوەی مامۆستایەك دەکەن بۆ بەرژەوەندی خۆیان چەقۆکێشنن ئەوەی مامۆستایەکی ناپێویست دەگوزازێتەوە بۆ قوتابخانەیەکی تر خۆی و مامۆستاکەش چەقۆکێشن.

* میدیایەك رەچاوی ئاسایشی کۆمەڵایەتی و رەوشی دەروونی تاکەکان نەکات چەقۆکێشە.

* فەرمانبەرانی بن دیوار، کەموچەی بێ دەوام وەردەگرن کاری چەقۆکێشیەو لێ نەپرسینەوە لێیان هەر کاری چەقۆکێشیە.

* ئەوانەی چەندین وەزیفەو پۆستیان پێ دراوە لەکاتێکدا کەدەکرێ ئەو وەزیفەو پۆستانە بەکەسانی تر بدرێ کاری چەقۆکێشیە.

* ئەوانەی بڕوانامەی ساختە درووست دەکەن چەقۆکێشن و ئەوانەی پرسیارەکانی تاقیکردنەوە ئاشکرا دەکەن بەمەبەستی جیاواز چەقۆکێشن.

* هەموو ئەوانەی کاری ساختەو فرت و فێڵ و دزی و درۆ دەکەن و دالّدەی پیاو خراپان دەدەن و لەرێگەی توندو تیژییەوە مەرامەکانیان جێبەجێ دەکەن و دژی بەرژەوەندی وڵات و گەلەکەیانن چەقۆکێشن، چونکە ئەو جۆرە کەسانە رەچاوی ویژدانی ئەخلاقیی ناکەن، لەهەموو چەقۆکێشتر ئەوانەن کەزەوی کشتوکاڵی بەهەدەر دەبەن و لەجوتیارانی دەکڕن و تەلبەندی دەکەن و سودی لێ نابینرێ و دژی جوانی سروشت و نەهێشتنی بەرهەمی کشتوکاڵییە، بەهەدەربردنی سەروەت و سامانی نەوەکانی ئایندە بەئەنقەست و بەبەرژەوەندی شەخسی چەقۆکێشیە، هەروەها چەقۆکێشی لەبوارەکانی ئینتەرنێت و ئەلیکترۆنیات و نووسین و بڵاوکردنەوەی و ئاماژەنەدان بەسەرچاوەی نووسین پەرەی سەندووە.

## كراونەوەو داخران:

**کەسی کراوە وزەی دەروونی دەبەخشێتە دەرەوە، بەڵام کەسی داخراو وزەی دەروونی لەجیهانی دەرەوە وەردەگرێ (یۆنگ)**

کێ هەیە لە سەر ئەم زەمینە پێی خۆش نەبێ کە باس لە کەسێتی بکرێ و بواری بدرێتێ پرسیار لە کەسێتی خۆی بکاو لە خاسیەتەکانی کەسێتی خۆی ئاگاداری بکەنەوە؟ هەریەکە لە ئێمە ئەگەر بزانین کلیلی ناسینەوەی کەسێتیمان لە بازاڕەو دەفرۆشرێ ئەوا بەبێ دوودڵی دەمانکڕی، وەلێ کەسێتی وەکو کاڵای بازرگانی نییە تا لە بازاڕدا بیکڕین، بەڵام دەکرێ بێ پارە لە دەستی بدەی، کەسێتی ناکڕدرێ بەڵام وەك دیواری خانوو درووست دەکرێ، ئەگەر هەر خشتەو شوێنی خۆی بگرێ ئەوا بێ سڵەمینەوە ئەو خشتەی لە دوای ئەو دێ شوێنی خۆی دەگرێ و خوار نابێتەوە، ئەو کەسێتیە ئێمە دەمانەوێ درووست ببێ پەیوەندە بە (خود) ەوە، ئایا چۆن دەڕوانینە خودی خۆمان و چۆن لەگەڵجیهانی دەرەوەدا کارلێکدەکەین؟ خەڵك چۆن دەڕوانێتە ئێمە؟ ئایا کامیان بکەینە پێوەر؟ هەڵسەنگاندنی خۆمان بۆ کەسێتیمان یان هەڵسەنگاندنی خەڵك؟بەپێی بیردۆزە زانستیەکان مرۆڤ تەنها ٣٠٪کەسێتی خۆی دەناسێتەوەو هەمان ڕێژەش لەکەسێتی نەخۆی و نەکەسانی تریش نایزانن و هەمان ڕێژەش کەسانی تر دەیزانن، واتە کاتێك تۆ دڵنیای کەکەسێتیت بەشێوەیەکی دیاریکراوە ڕەنگە ئەوە هەستی خۆت بێ، کێ دەڵێ وایە!یان کاتێك تۆ بڕیار لەکەسێتی کەسێك دەدەی کێ دەڵێ وایە!ئەگەر هەڵسەنگاندنی خۆمان کردە پێوەر ئایا ئەو

هەڵسەنگاندنە تەواوە؟یان هەڵسەنگاندنی خەڵك تەواوە؟یان پشت ببەستین بە بیردۆزو تێروانینی زانایان؟ئەگەر لە روانگەی زانایانەوە بێ ئەوا دەیان جۆر کەسێتیان دەست نیشان کردووە کە هەریەکەیان و خاسیەت و نیشانەی خۆی هەیە و هەندێك لەو نیشانانە دووبارەیەو هەندێکیشیان روون و ئاشکرا نین، لەوانەش کە دکتۆر عەلی کەمال ئاماژەی پێداوە وەکو کەسی شیزیزم، خەمۆك، دوو روو، خودان دڵەراوکێ، خۆسەپێن، گومانکار، سایکۆپاتی، هستیری، نا ئارام، سارد، کەم، هەڵچوو .....تد، لە فەرهەنگی سایکۆلۆژیشدا زۆر ئاماژە بە دوو جۆر کەسێتی دراوە کە رۆژانە لە خۆماندا یان لە خەڵکیدا بەدی دەکەین ئەوانیش خاکەڕایی (extraveration) و داخراو (introveration) ە، خاکەڕایی (کراوە) ئاراستەیەکە مرۆڤ بەرەوە جیهانی بابەتگەرایی و واقیعی دەبات، خاکەڕا کەسێکی کۆمەڵایەتیە، کاری خۆش دەوێت، رووداوەکانی دەرەوەی خۆی کاری لێدەکات بۆ نموونە رووداوێك ببینێ دەست بەجێ هەڵوێستی خۆی هەیەو بەشداری لە چارەسەرکردنیدا دەکات، داخران (introveration) یش بە پێچەوانەی کرانەوەیە، بیردۆزی زانا یۆنگ و زانا ئایزنگ کە دووجۆر کەسێتی مرۆڤیان دیاری کردووە جۆری کراوە (خاکەڕا) وجۆری داخراو (ئالۆز ) لەم باسەماندا تیشکیان دەخەینە سەر، پزیشکی نەخۆشیە ئەقڵیەکان زانا یۆنگ لە بارەی کەسێتی داخراوەوە ئاماژەی بەوە داوە ئەم جۆرە کەسانە کاتێ لە پڕ دووچاری ململانێی هەڵچوونەکان و گوشاری دەوروبەر دەبنەوە مەیلی گرمۆڵەکردن و خۆکشانەوەیان هەیە بۆ ناو خودی خۆیان، ئەم جۆرە کەسانە بە رای یۆنگ شەرمنن و لە خەڵك دوور دەکەونەوە، کاتێ بە تەنهان هەست بە ئاسوودەیی دەکەن، یۆنگ لەو باوەڕەدایە کە دەشێ زانایان و فەیلەسوفان کەسانی داخراو بن، بەڵام کەسی خاکەڕا (کراوە) لای ئەم زانایە بە پێچەوانەی کەسی داخراوە، کەسی خاکەڕا روودەکاتە جیهانی دەرەوە نەك ناوەوەی خۆی، زیرەکانە لەگەڵخەڵکدا لە هەڵوێستە کۆمەڵایەتیەکان مامەڵە دەکات، ئەم کەسانە پابەندن بە پێوەرە باوەکانی رەفتارو رۆح سووك و دڵخۆش و گەشبینن و نەترسن و کار لە کەسانی دیکەو بواری کۆمەڵایەتی دەکەن، ئەم جۆرە وەکو کەسانی سیاسی و بەڕێوەبەرو خاوەن دامەزراوەکانن، بە گوێرەی بیروڕای زانا یۆنگ کەسێك لەوانەیە لە شتێکدا کراوە بێ وەکو ویژدان، بەڵام لەوانەیە هەمان کەس لە پێشبینیکردندا داخراوبێ، لێکۆڵەرەوان لە نێوان کرانەوەو داخراندا ئاماژەیان بە کەسایەتی هاوسەنگ داوە کە ئەمانیش ئەو کەسانەن کە هەمان خاسیەتیەکانی کراوەو داخراو تیایاندا کۆدەبێتەوە، لەنێوان کراوەی زیادەڕۆ و داخرانی زیادەڕۆدا ئەو کەسانەن کە نە لەگەڵکراوەکانن نە لەگەڵداخراوەکانن کە پێیان دەوترێ کەسایەتی هاوسەنگ،

بە شێوەیەکی گشتی کەسانی جۆری کراوەو جۆری داخراو نیشانەو خاسیەتی خۆیان هەیە پێی جیادەکرێنەوە کە لێرەدا ئاماژەیان پێ دەدەین:

## کەسی داخراو (introvert):

زانا یۆنگ دەڵێ کەسی داخراو وزەی دەروونی خۆی لەجیهانی دەرەوە وەردەگرێ بەڵام کەسی کراوە وزەی دەروونی ڕەوانەی دەرەوە دەکات، کەسی داخراو ئەو جۆرە کەسەیە کە داخراوەو توانای کرانەوەی بە سەر جیهانی دەرەوەدا نییەو وزەو توانا دەروونیەکانی لە ناوەوەی خۆیدا سەرچاوە هەڵدەگرێ، واتە ئەگەر خۆی دەست پێشخەری و جوڵە نەکات و نەبزوێ کەسانی دیکە ناتوانن بیبزوێنن بۆ نموونە ئەگەر نەتوانێ هاوڕێیەتی لەگەڵخەڵکیدا بکات ئەوا کەسانی دیکە ناتوانن ئەوەی بۆ ئەنجام بدەن، سوود لەجیهانی دەرەوەی خۆی نابینێ بۆ هاندان و پاڵنەرەکانی ژیانی ڕۆژانەی بەهۆی کارلێکنەکردنی لەگەڵ دەورووبەریدا، درەنگ لێی تێدەگەین چونکە بە سانایی گوزارشت لە خۆشی و ئێشو ئازارو گرفتەکانی خۆی ناکات و زۆر جار پرۆسەی چەپاندن هۆکارە بۆ ئەو تێنەگەیشتنە،، شەرمنە، کەسێتی دوو فاقیەو بیروڕای زوو زوو دەگۆڕێ، بە قسە شتێك دەڵێ و بە کردەوە شتێکی دیکە، یان زۆر تایبەتە یان زۆر گشتیە، لە رووی سۆزەوە بەجۆش و خرۆشە، دوودڵە لە نێوان کردنی شتێك بیرکردنەوە لەو شتەو لە دواجاردا دەگەڕێتەوە بۆ بیرکردنەوە نەك ئەنجامدانی شتەکە، تا شتێك نەبینێ فێری نابێت، پێویستی بە کات هەیە بۆ بیرکردنەوەپێش ئەوەی بڕیار بدات واتە کاتێك داوای شتێکی سادەو ساکاری لێ بکەی بە ئاسانی بڕیار نادات، توانای هەیە بۆ تەرکیزکردن، لە حزوری خەڵکیدا زۆر بێدەنگی دەنوێنێ و تەنانەت ئەگەر ڕایەکیشی هەبێ بەرامبەر بابەتێك کە باس دەکرێ ئەو ڕای خۆی دەرنابڕێ، هاوڕێی کەمە، هەست بە ڕابەرایەتی کەسانی تر دەکات، ئارەزووی تایبەتمەندی دەکات بۆ نموونە ئەگەر کەسێك قسە بۆ هەمووان بکات ئەو ئارەزووی ئەوە دەکات ئەو کەسە تەنها بۆ ئەو قسە بکات، لە حزوری کەسانی دی دەترسێ، حەز دەکات لەگەڵخەڵکیدا بێ بەڵام بۆ ماوەیەکی کەم واتە پێی خۆشە هەڵوێستەکان زوو کۆتایی پێ بێ بۆ نموونە ئەگەر لە ئاهەنگێکدا بێ ئارەزووی ئەوە دەکات زوو کۆتایی بێ و خەڵك پەرش و بڵاوە بکەن، ئارەزووی ئەوەش دەکات بۆ هەندێ کات بە تەنها بمێنێتەوە بۆ ئەوەی هەندێ چالاکی خۆی ئەنجام بدات وەکو خوێندنەوە، یان بێ دەنگبوون، چاوەڕێ دەکات هەواڵی خەڵکی پێبگات بەڵام

خۆی هەوڵی بۆ نادات واتە ئەگەر کەسێك ڕووداوێکی بەسەر هاتبێ چاوەڕێ دەکات هەواڵەکەی پێ بگەیەنن نەك خۆی بە دوایدا بگەڕێ، کەسێکی خۆ پارێزە بە ئاسانی قسە ناکات ئەمیش ئەو هۆکارەیە کە درەنگ گۆڕان بە سەر رەفتاریدا دێ بۆ نموونە بە ئاسانی مۆدێلی جلوبەرگەکانی ناگۆڕێ، مۆدێلی پرچ تاشینی ناگۆڕێ، بە زەحمەت هاوڕێ پەیدا دەکات و بە ئاسانیش لە دەستی نادات و وزەو توانای خۆی دەپارێزێت و بە هەدەری نادات، لە تەلەفۆن بە ئاسانی قسە ناکات، زەحمەتە بە ئاسانی بناسرێ، چونکە خۆی لە قەرەی هەڵوێستە جیاوازەکانی ژیان وەکو میوانداری و شین و شایی و نەخۆشی و ئاهەنگ نادات، بەڵام کەسی کراوە کەسێکی کۆمەڵایەتیەو لەگەڵ خەڵکدا تێکەڵەو هاوبەشی خەموپەژارەو ناخۆشی و خۆشیەکانیان دەکات، لەنیشانە گرنگەکانی کەسی کراوە: لە کارکردن لەگەڵکەسانی دیکەدا تام و چێژ وەردەگرێ و بەبێ ئەوان هەست بەتەنیایی دەکات، ئارەزوو دەکات کاتی ڤالآیی لەگەڵ ئەواندا بەسەر ببات، تام وچێژ لە بێدەنگی وەرناگرێ و بەئەزموونەوە قسە دەکات و بەئاسانی هاوڕێ پەیدا دەکات و گوزارشت لەهەست ونەستی خۆی بۆ دەوروبەر دەکات، هەست بە بێزاری و بێ تاقەتی ناکات کاتێ بە تەلەفۆن پەیوەندی لەگەڵ خەڵکدا دەکات، دوای ڕوودانی شتەکان بیریان لێ دەکاتەوە واتە زۆر بیر لەشتێك ناکاتەوە بەڵام زوو ئەنجامی دەدات، کەسی کراوە ئەگەر کەسی داخراو لە دەوراو پشتی بێ هەست بە بێزار بوون دەکات و ئاسودە نابێ، ئارەزووی ئەوە دەکات گوێ لەهەواڵ ودەنگو باسی خەڵکی دیکە بگرێ، کەسی کراوە بە پێچەوانەوە گڕوتینی پاڵنەرێتی لە جیهانی دەرەوە بەدەست دێنێ، جیهانی بنەڕەتی لە دەرەوەیە، بە ئاسانی لێی تێدەگەی، زوو تێکەڵ دەبێت، زیاتر مەنتیقیەو کەمتر دەکەوێتە ژێر کاریگەری سۆزەوە، دوو دڵە لەنێوان بیرکردنەوەو کردەوەدا، بەڵام هەرچۆنێك بێت کارەکە ئەنجام دەدات بێ ئەوەی پێویستی بەکاتێکی زۆر بێت بۆ بیرکردنەوە لێی لەدواجاردا دەگەڕێتەوە بۆ کردەوەکە، بەهەوڵدان و هەڵەکردن فێر دەبێت، ئەم نیشانانە لەگەڵ لەدایکبوونی مرۆڤ لەدایك نابێ بەڵکو بەرەنجامی پەروەردەی خێزان و کۆمەڵگەیە کە شێوازی پەروەردەیان لە سەر کەسێتی تاك ڕەنگ دەداتەوەو ڕۆژانە پەیڕەوەی دەکەن، بۆیە مرۆڤ دەتوانێ تا ئاستێك گۆڕان لەخۆیدا درووست بکات و بە سەر جیهانی دەرەوەدا بکرێتەوە، تێکەڵبوون و بەشداریکردنی هەڵوێستە کۆمەڵایەتیەکانی دەورووبەر دەروازەن بۆ کرانەوە، بەڵام ئەگەر مرۆڤ هەمیشە بیر لەوە بکاتەوە کەس لەو بەرزتر نییە ئەوا ڤالآیی نێوان خۆی و خەڵك لە فراوان بووندا دەبێت و گۆشەگیری بە خۆیەوە دەبینێ

# کەش و هەواو رەفتار

## خاکی بەپیت سیستمی دیکتاتۆری و پاشایەتی دێنێتەکایەوە (مونتسکیو)

مرۆڤ سەرەڕای ئەوەی بوونەوەرێکی ئەکتیڤوپڕچوست و چالاکییە لە گۆڕینی کەشو هەوا بەو ئاراستەیەی کە بۆخۆی پێتڤیبە هاوکات بوونەوەرێکی کارلێککراوە و باری دەروونی و تەندروستی دەکەوێتە بەر زەبری ئەو کەشو هەوایە کە بریتین لە سەرماو گەرما و پیسبوونی هەوا و قەرەباڵغی و قەتیسبوونی گەرمی و شێ و باران و رەشەباو تاریکی و رووناکی و مانگ و هەتاوو هەسارەکانی دیکەش، کە بە گوێرەی لێکۆڵینەوە زانستیەکان هەر یەك لەو توخمانە کاریگەری خۆی لە سەر باری دەروونی تاك هەیە، ئەگەر مرۆڤ لە ئاستیدا بوونەوەرێکی بێ دەسەڵات بوایە ئەوا توانای خۆگونجاندنی لە گەڵیدا نەدەبوو و هاوسەنگی دەروونی و تەندروستی تێکدەچوو، بۆیە باری سایکۆلۆژی و باری عەقڵی مرۆڤ لە بەرامبەر گوشاری هەوا لەم هاوکێشەیەدا بەرجەستە دەکرێت:

عەقڵ (ئەکتیڤ بوون ) ⟵ ئاوو هەوا (گۆڕان ) ی دەروونی ⟵ (هاوسەنگی)

ئەم هاوکێشەیە لەگەڵ هەموو تاك و هەموو زەمکانێکدا هەمان ئەنجامی نابێ، چونکە خۆگونجاندنو هاوسەنگ بوونی تاك بە پێی تواناو هێزی بەرگری تاك دەگۆڕێ، هەروەها بە

پێی توخمەکانی ئاووهەوا (گەرماو سەرماو شێ و باران و .....تد) دەگۆڕێ، کە دەکرێ نموونەی گەرماو پیسبوونی هەوا لێکبدەینەوە کە چۆن کار لە بارەی دەروونیو کەسێتی مرۆڤ دەکەن:

## گەرما:

کار لە باری جەستەیی و دەروونی و ئەقڵی و سۆزێتی تاك دەکات، گەرما جۆرە نا ئاسوودەییەك بۆ مرۆڤ و توندی میزاج درووست دەکات، مرۆڤ دەوروژێنێ و ورەی دەتەپێنێو هەست بە سەخڵەتی و گوشاری دەروونی دەکات، پلەی گەرمی کار لەکارکردنی مرۆڤ دەکات و هەر کارێکیش لەگەڵ پلە گەرمایەکی دیاریکراودا دەگونجێ بۆ نموونە وەکو رستن و چنین، خوێندنەوە، نووسین، کاری سەربازی، راوکردن ....تد، پلەی گەرمای هاوین دەبێتەهۆی تورەبوونی مرۆڤ و تێکچوونی پەیوەندیەکانی لەگەڵ خودی خۆی و دەوروبەریدا، بڕوانە بازاڕو شوێنە قەرەباڵغەکان کە چۆن مرۆڤەکان خێرا دەڕۆنو تورەو سەخڵەتن وەك بڵێی چەندین کاری گرنگ و پێویست چاوەڕێیان دەکات و لە راستیشدا هیچ لە ئارادا نییە، هەر پلەی گەرماش مرۆڤ دەخاتە بارگرژی دەروونی و نواندنی رەفتاری شەڕانگێزی، زۆربەی شۆڕشەکانی جیهان لەمانگە گەرمەکاندا روویانداوە، شۆڕش و راپەڕینەکان زیاتر لەو کاتانەدا سەر هەڵدەدەن کە مرۆڤ بەهۆی گەرماوە لە جۆش و خرۆشدایە بە تایبەتیش وەرزی بەهار کە مرۆڤ قاوغی سەرمای شکاندووەو رەفتارەکانی پڕجۆش و خرۆشەو گیانی دەخورێ و ئالۆش دەگرێ گوڕوتین دەکەوێتە رەفتارەکانییەوەو میزاجی توند دەبێت، ئەو لێکۆڵینەوانەی کە ئەنجامدراون ئەوە نیشان دەدەن کەوا تاوان و توندوتیژی پەیوەندە بەبەرزبونەوەی پلەی گەرماوە، زانایان ئەم پەیوەندییە (پەیوەندی نێوان پلەی گەرماو تاوان) یان ساڵی ١٨٣٣ز دۆزیەوە، کە راپۆرتی بڵاوکراوەی پۆلیسیان سەبارەت بە تاوان لەناوچەیەکدا بەراوورد کردووە لەگەڵ راپۆرتی کەشناسی هەمان ناوچە سەبارەت بەپلەی گەرمی کەبۆیان دەرکەوتووە کەوا پەیوەندی نێوان گەرمی و تاوانی دەستدرێژی هەبووە، کە تا پلەی گەرما و شێ زیادی کردبێ رادەی تاوانیش زیادی کردووە، هەندێ لە زانایانی دەروونناسی کۆمەڵایەتی لەو باوەڕەدان کەوا زیادبوونی پلەی گەرما دەبێتە هۆی رکوکینەو رەفتاری سلبیو شەڕانگێزی، لە لێکۆڵینەوەیەکدا لەگەڵ کەسێکی بیانیدا کراوە، کە لە ژورێکی گەرمدا دایانناوە بینیویانە هەستی رکوکینەی زیاتر بووە بەرامبەر خەڵك بە

بەراورد لەگەڵدانانی لە ژورێکی دیکەدا کە هەواکەی فێنك و مامناوەندیی بووە، گەرمی هاوین بارگرژی دەمارەکان زیاتر دەکات، کەش و هەوا زیاد لە هەر فاکتەرێکی دیکە کاریگەری لە سەر ژیانی مرۆڤ و بوونەوەرەکانی دیکەش هەیە، پەیوەندی نێوان کەش و هەوا لە چەندین دیاردەی دەروونی و گۆڕانی فسیۆلۆژی و دەماری و دەروونی مرۆڤ دەردەکەوێ، بە گوێرەی لێکۆڵینەوەی زانستیش گەرمی هەتاوی هاوین نۆرەی شقیقە ( لاژانە سەر) زیاد دەکات، هەر بەگوێرەی لێکۆڵینەوەی زانستی پلەی گەرمی بارگرژی دەمارەکان زیاد دەکات کە کار لە ناوەندی هەڵچوون دەکات لە ناو مێشکدا، زیادبوونی وزەی زیهنیی کاردانەوەی عەقڵیی دەبێت کە لە بارگرژییەکاندا بەر جەستە دەبێت، ئەمیش پێی دەوترێ وریابونەوەی نەخۆشیانەی زەین کە دەبێتە هۆی کاردانەوەی خێرای مێشك بەرامبەر سادەترین رووداو کە رەنگە مرۆڤ هێندە بایەخی پێنەدات بۆ نموونە لە کاتی گەرمادا پێویستیت بە کەسێك هەبێت کارێکت بۆ ئەنجام بدات رەنگە درەنگتر بە دەنگتەوە بێت بە بەراورد لە کاتێکی فێنکدا، لێرەدا پرسیارێك خۆی قیت دەکاتەوە، کە بۆچی دەمارەکان لە وەرزی هاویندا زیاد لە هەر وەرزێکی دیکە دەوروژێن؟ ئایا مەسەلەکە گەرمایە؟ئەی مرۆڤ چۆن خۆی دەپارێزێت؟شتێکی سروشتیە کەوا گەرماو عەرەق و ئیرهاق کار لە دەمارەکان و کۆئەندامی دەماری بکات، گەرمی کار لە ناوەندی هەڵچوون دەکات لە ناو مێشکدا و پاشان ئەوەش کار لە دەمارەکان دەکات و ناوەندی هەڵچوونیش هۆرمۆنی سیرۆتۆنین دەردەدات کە کار لە رادەی هەڵچوون دەکات، هەروەها بارگرژی و هەڵچوون مادەی کۆلیسترۆلیش زیاد دەکەن، کە زیان بەمرۆڤ دەگەیەنێ، بەگوێرەی لێکۆڵینەوەیەکی نەرویژی هەتاوی بەهێزی هاوین لەوانەیە ببێتەهۆی زیاتر وروژاندنی لاژانە سەر (شقیقە) لای ئەوانەی کە تووشی نەخۆشییەکە بوونەتەوە، هاوسەنگ بوونی مرۆڤ بەرامبەر پلەی گەرماو شێ راهاتنە لەگەڵیدا بەو شێوەیە کار لە کەسێتی نەکات و نەبێتە کۆسپ لەبەردەم کارکردنو شڵەژانی رەفتارو تێکچوونی باری دەروونی، ئەگەر مرۆڤ عاقڵانە رەفتاری لەگەڵگەرماو سەرمادا نەکردایە ئەوا نەیدەتوانی زاڵ بێ بەسەر ئەو گوشارانە کە گەرماو سەرما بۆی دەخولقێنن و هاوسەنگی تێك دەچوو.

پیسبوونی هەوا: پیسبوونی هەوا کاریگەری لە سەر پەیوەندییە کۆمەڵایەتیەکان بە شێوەیەکی ناڕاستەوخۆ درووست دەکات، چونکە تەپ و تۆزو دوکەڵی ئۆتۆمبیل و مەولیدەکان وپاشماوەوزبڵوخاشاك کار لە جەستەو فسیۆلۆژیای تاك دەکات، گومانی تێدا نییە باری

سایكۆلۆژیای مرۆڤ ڕەنگدانەوەی لایەنی جەستەیی و بەپێچەوانەشەوە ڕاستە، پیسبوونی هەوا گوشار لە سەر لەش و فسیۆلۆژیای مرۆڤ دەكات لەوانەش كۆئەندامی سییەكان و چاوو گوێ و هەستی بەركەوتن و تێكدانی میزاج و ئەمیش كار لە ئیدراك و باری دەروونی و چالاكی كۆمەڵایەتیو پەیوەندییەكانی وەكو هاوكاری و لێبوردن و ركابەری دەكات، چونكە كاتێ مرۆڤ تەندرووستی تێكبچێ تونای كارلێككردنی كۆمەڵایەتی لاوازتر دەبێ و ڕەنگە لەبەرخۆیشی كەسانی دیكەی وەبیر نەمێنێ، لەمبارەیەوە لێكۆڵینەوەیەك ئەنجامدراوە كەتیایدا كاریگەری جگەرە كێشان نیشاندەدات لەپیسبوونی هەوا كە دەبێتەهۆی دابەزینی توانای تاك بۆ تاقیكردنەوەی زیرەكی و مەعریفی كەئەمیش واتای دابەزینی ئاستی زیرەكی و وریابوونەوەی ئەو مرۆڤە دەگەیەنێ، چونكە ئەو شوێنەی كەدووكەڵی جگەرەی تیادا بڵاوبۆتەوە ڕادەی ئۆكسجینی كەمترە یان دووەم ئۆكسیدی كاربۆنی زۆرترە كە كار لەباری دەروونی مرۆڤ دەكەن، هەروەها لەرووی كۆمەڵایەتیەوە تاك كەمتر وریایە بەرامبەر پرۆسە كۆمەڵایەتیەكانی دەوروبەری، پیسبوونی هەوا بەهەر هۆیەكەوە بێ كار لەپەیوەندی تاك دەكات لەگەڵ دەوروبەری كەتوانای چالاكیە كۆمەڵایەتیەكانی لەگەڵ دەوروبەر لاوازەو ئارەزووی گەشت وگوزارو سەردان و گەڕانیشی لاواز دەكات، لە ڕۆژی خۆڵبارینداا كەخۆڵ و تەپوتۆز لە ناوچەكانی دیكەوە بەرەو لای ئێمە هەڵدەكات خەڵك كەمتر هەست بە ئاسودەیی دەكەن و تەنانەت هەوڵ دەدەن جموجوڵ نەكەن و نەگەڕێن و هەندێ جاریش كاروچالاكیەكانی خۆیان پەك دەخەن، چونكە ئەمانە هەمووی كار لەتەندروستی لەش دەكەن ورەی مرۆڤ و گەشبینی دادەبەزێنێ و ئەمەش نیشانەی لاوازبوونی باری دەروونی دەگەیەنێ و خەمۆكی و ڕەشبینی لێ دەكەوێتەوە، هەروەها بۆن و بەرامەی ناخۆش و ژەهراوی كار لە پەیوەندی و خۆشەویستی و لەگەڵ دەوروبەر دەكات، بە پێی لێكۆڵینەوەیەكی زانستی ئەو قوتابیانەی كە لەریزی پێشەوەی پۆل دادەنیشتن بەهۆی تەپو تۆزی تەباشیرەوە زووتر بێزار دەبوون و خەمۆكی دایان دەگرت، كاتێ مرۆڤ لە شوێنێكدایە بۆنی گازێكی ژەهراوی دەكات ركی لەو شوێنە دەبێتەوەو تەنانەت هەوڵ دەدات لێی دوور بكەویتەوە بەمرۆڤەكانیشەوە، ئەو كەسەی جگەرە دەكێشێ بەهۆی زۆركردنی دووەم ئۆكسیدی كاربۆن لەو شوێنە كەسانی دەوروبەر بێزار دەكات و هەست بەركوكینە دەكەن بەرامبەری، ئەو شوێنەو ئەو كاتەی كە مرۆڤ تیایدا هەست بە بێزاری دەكات یان تیایدا تاڵی چەشتووە ئەو شوێن و كاتە دەبێتە یادەوەرییەكی ناخۆش كەدوای

چەندین ساڵیش لە هەمان کات و شوێندا ئەو یادەوەرییە ناخۆشەی وەبیر دێتەوە، ئەگەر رووداوە ناخۆشەکانی ئەو شوێنەشی وەبیر نەیەتەوە ئەوا کاریگەری ناخۆشیەکە لە نەستیدا هەر دەمێنێ، مرۆڤ چەند خۆی دوور بگرێ لەو جۆرە کەش و هەوا نالەبارە رەوشی دەروونی باشترو ئاسودەتر دەبێ بە بەراورد لەگەڵ ئەو مرۆڤانەی کە لە شوێنی پیس و تەپو تۆزدا ژیان بەسەر دەبەن.

بەپێ راپۆرتێکی زانایانی بەریتانیا گۆڕانکاری کەشوهەوا دەبێتەهۆی گۆڕانکاری رەفتاری زۆر لەباڵندەکان کە پێش کاتی خۆی هێلکە بکەن، راپۆرتی کۆمەڵەی شانشین بۆ پاراستنی باڵندەکان ودامەزراوەی بریتانیا  بۆ تۆژینەوە لەسەر باڵندەکان دەریانخستوە کەوا ئەو گۆڕانە بووەتە هۆی گۆڕانگاری لەباڵندەکانی وەکو (شەرشور و ئەبولحەنا) [1])، بەپێی لێکۆلێنەوەکان باڵندەی شەرشور بە تێکڕا  ٩ رۆژ پێش وادەی خۆی هێلکە دادەنێ لەچاو شەستەکانی سەدەی رابردوو، هەروەسا باڵندەی ئەبولحەناش ٦رۆژ پێش کاتی خۆی دایدەنێ، ئەمە نیشانەی ئەوەیە کەشوهەوا کار لەرەفتارو هەڵسوکەوتی گیانلەبەران دەکات، لەلایەکی دیکەوە  د.ستیوارت بوتشارت رێکخەری دامەزراوەی بیردلایف ئنترناشیونال دەڵی زەحمەتە بتوانین بەوردی هەندێ گۆڕانکاری لەباڵندەکان بۆ گۆڕانکاری کەشوهەوا بگەڕێنینەوە، بەڵام دڵنیاین کەوا کۆمەڵێ تەواو باڵندە هەیە لەژێر هەڕەشەی لەناوچوندان بەهۆی گۆڕانکاری کەشوهەواوە، لەوانەش بەبەغا  لەدورگەی هاوای و فلوریانا لەدورگەی گالاباگوس.

بەپێی راپۆرتێکی دیکە سەبارەت بەقەتیسبونی پلەی گەرمی لێکۆڵەرە ئوسترالیەکان دووپاتیان کردۆتەوە کەوا گۆڕانکاری کەشوهەوا هەستی بیستنی لای ماسی لاواز کردووە، کەبەو جۆرەش ناتوانێ شوێنی حەوانەوەی خۆی بدۆزێتەوە، زۆربوونی رێژەی کاربۆن لەهەوا واتای کەمبونەوەی رێژەی کالیسیۆم دەگەیەنێ لەناو ئاودا، پاشان کار لەهەستی بیستنی ماسیەکان دەکات، کەزیاتر پشت بەبیسستن دەبەستن لەکارو چالاکیەکانیاندا، بە پێی راپۆرتێکی وەزیرانی ژینگەی هەشت وڵاتەکە قەتیسبونی گەرمی رۆژانە (١٥٠) جۆر ئاژەڵ و

---

[1] جۆرە باڵندەیەکە لەناوەڕاستی سیبریاو رۆژهەڵاتیداو لەباکورو رۆژاوای ئەمریکاو ناوچە شاخاویەکان دەژی شیوەی و قەبارەی لەچۆلەکە دەچێ دەژی و ئەبولحەناش جۆرەباڵندەیەکە لەئەوروباو ئاسیاو ئەفریکا دەژی و درێژیکەی نزیکەی١٤سم و سنکی سورە تا رادەیەك لەچۆلەکە دەچێ.

رووەك لەناو دەبات، زۆر لەبیردۆزە دەروونیەکان لەوانەش بیردۆزی بوار (المجال) ی کیرت لیڤین (١٨٩٠-١٩٤٧) و هەروەسا بیردۆزی گەشتالت (کهلر و کوفکا)، دەروننانسی ئەزموگەری، کاریگەری ژینگەیان لەسەر مرۆڤ کۆڵیوەتەوە وەکو کاریگەری روناکی و فشار لەسەر مرۆڤ، کیرت لیڤین یەکەم کەس بووە ژینگەی بەکارهێناوە لەتۆژینەوە دەرونیەکانیدا هەرچەندیشە ژینگەی کۆمەڵایەتی بەکارهێناوە، کە باوەڕی وابوو رەفتار (ر) کەسێتی (ك) و ژینگە (ژ) دیاریی دەکات، کەهاوکێشەکە بەم شێوەیە دەبێت:

ر= ئەرك

ئەرك= (ك x ژ)

واتە رەفتار=ئەرك (کەسێتی x ژینگە)

لەماوەی نێوان (١٩٥٠-١٩٧٠) بەکارهێنانی بێژەی ژینگە زۆر لەوە زیاتر بووە کەزانا لیڤین وێنای دەکرد، پاشان لێکۆڵینەگەلێکی زۆر سەری هەڵدا سەبارەت بەچۆنێتی پێکهاتنی هاوڕێیەتی و روودانی گەشەی کۆمەڵایەتی و چۆنێتی کاریگەری دیزاینی تەلارسازی لەسەر وەڵامگۆی مرۆیی.

کەشوهەوا کاریگەری لەسەر رەفتاری ئایینی تاکەکان دەکات لەکاتی باران نەبارین و وشکەساڵی و بومەلەرزەو تۆفان و هەورە تریشقەدا مرۆڤ پتر رووەدەکەنە مزگەوت و کڵێساکان بۆ ئەوەی لەخوا بپاڕێنەوە بەهانایانەوە بیٚ، کەشوهەوا کاریگەری لەسەر جۆری جوڵەو یاریکردنی تاك هەیە، ناوچە ساردەکان زیاتر پەنا بۆ ئەو یاریانە دەبەن کەجوڵەو بزاڤی تێدایە وەکو تۆپی پیٚ و تێنس و گۆڵف و رەجبی rugby (جۆرە یاریەکی بەکۆمەڵە، لەفەرەنساو بریتانیاو ئوسترالیاو نیوزلندە زۆر باوەو شیوەی تۆپەکەی هێلکەییەو زمارەی تیم ١٣یان ١٥کەس دەبن) هەورەها ناوچە گەرمەکان پەنا بۆ ئەو یاریانە دەبەن کە بە دانیشتنەوە مرۆڤ دەتوانیٚ بیکات وەکو شەترەنج و ئەو یاریانەی کەپێویستی

بەدانیشتنە، لەکوردەواری لای خۆمانیش زیاتر کلاوێن و سێ رسکان و قەمچان* و زۆر یاری دیکە کەگەورەو بچووك دەیکەن.

دانیشتوانی ئەوروپا بەهۆی زوقم و سەرماوە سپی پێستن پرچیان زەرد و لوتیان درێژە، کەیارمەتیدەرە بۆ گەرمکردنی هەوا پێش ئەوەی هەڵیمژن، بەڵام دانیشتوانی ناوەڕاستی ئەفریکیا کەلەکەش و هەوای گەرما دەژین پێستیان رەشە بۆ پاراستنیان لەگەرمی هەتاو و پاراستنی دەمارەکانیان، پرچیان رەش و لوت فس و فشن بەهۆی شێداری و گەرمی هەواوە، دانیشتوانی ناوچە ساردەکان توشی جۆرە نەخۆشیەك دەبن جیاوازە لەناوچەگەرمەکان، دانیشتوانی ناوچە ساردەکان بەهۆی زوقم و کاریگەری لەسەر سییەکانیان توشی رۆماتیزم دەبن، یان هەندێکیان وەکو حاڵەتی دەروونی توشی خەمۆکی زستانە دەبن، هەروەها شێداری زۆر لەناوچەگەرمەکان دانیشتوانی توشی نەخۆشی پەڵەی پێست و رۆماتیزم و هەوکردنی جومگەکان دەکات، بەڵام شێی کەم پێست دووچاری قڵیشان دەکات و لێوەکانیش بەهەمان شێوەو لوت پزانیش تیایاندا روو دەدات.

هەروەها کەش وهەوا کاریگەری لەسەر داهاتی خۆراك دەبێت، کەکار لەبەرهەمی کشتوکاڵی دەکات، گەرما کار لەهەڵسوکەوتی کۆمەڵایەتیش دەکات وەکو تاوان و توندویژی و کوشتن و بڕین، بەهۆی بەرزی رادەی ئەدرینالین لەناو خوێندا، کەلەوانەیە ببێتەهۆی بەرزبوونەوەی رادەی بارگرژی، سەرەڕای ئەوەش رێژەی تەڵاقدان و تێکچونی میزاجی تاکەکان و بارگرژی رەفتار، بەڵام سەرما کار لەئارامی دەمارەکان دەکات.

مونتسکیو لەکتێبەکەی (روح القوانین) باسی لەکاریگەر ی کەشوهەوا لەسەر مرۆڤ کردووەو هەوڵی داوە پەیوەندی نێوان داب و نەریت و رەوشت و یاساکان لەگەڵ کەشوهەواو بەرزو نزمی و ئاین بدۆزێتەوە، سەبارەت بەکاریگەری کەشوهەوا لەسەر میزاجی خەڵك وتوێتی: کەشوهەوا کاریگەری مادی راستەوخۆ لەسەر دەمارەکان و ماسولکەکان و پاشان

---

*قەمچان:جۆرە یاریەکی میللیە منداڵ و گەورەش دەیکات کە ٥ بەردی بچووك هێندەی هێلکە چـۆلەکەیەك ئامادەدەکەن کە هەر ٥بەردەکە لەناو مشت قایم دەکرێت و پاشان یەکیان بـەرەو سـەرەوە بەبـەرزایی مترێـك هەڵدەدەی و هەر بەو دەستەش دەیگریتەوەو بەو شێوەیە تا هەر ٥بەردەکە هەڵدەدەیت و نابێ هیچیان بکەوێ دوای قۆناغێکی دیکەی یاریەکە دێ تا کۆتایی ، ئەم جۆرە یاریە لەناوچەکانی خانەقین باوە.

لەسەر هەڵسوکەوتی خەڵك و رەوشتیان هەیە، چوست وچالاکی خەڵکی ناوچە ساردەکان زیاترە کەدەبێتەهۆی زیاتر دەسکەوت و داهێنان و باوەڕ بەخۆ بوون و تواناو هەستی زیاتر بەسەکەوتن و ئیحساسی کەمتر لەغیرەو گومان و ریاکاری، بەڵام لەناوچە گەرمەکان گەرما کار لەجەستە دەکات و لەویشەوە دەگوازرێتەوە بۆ مێشك، کەدەبێتەهۆی رەفتاری نەرێنی، کەئارەزووی کار ناکەن و حەزیان لەگەڕان نیە و توانایان نیە بۆ تەواوکردنی کارەکانیان و سزاش کاریان لێناکات و مەیلی ملکەچکردن و کۆیلایەتیان بۆ سیاسەت هەیە، تەمبەڵی زاڵە بەسەر گەلانی ناوچە گەرمەکان کەرەفتاری نەرێنی لێدەکەوێتەوە، کەگیانی خۆپارێزی و ترس لەنوێبوونەوەی لێ دەکەوێتەوە، بەڵام ناوچە ساردەکان حەزی نوێبوونەوەو گۆڕان تیایاندا هەیە.

زۆر لەبیردۆزە دەرونی و کۆمەڵایەتیەکان ئاماژەیان بەکاریگەری ژینگەو ناژینگە لەسەر رەفتاری تاك داوە لەوانەش بیردۆزی هەربوون (الحتمیە) وبیردۆزی بژارخوازی (الاختیاریە) وبیردۆزی شیمانەیی (الاحتمالیە)، سەبارەت بەبیردۆزی هەربوون، ئەم بیردۆزە پێیوایە مرۆڤ لەژێر رکێفی ژینگەدایەو نەك ژینگەلەژێر دەسەڵاتی مرۆڤ، ژینگە بەکەش وهەواو و ژیانی ئاژەڵەوە لەهەمولایەکەوە کار لە مرۆڤ دەکات، ژینگە کار لەئێسکی مرۆڤ دەکات، ئەگەر مرۆڤ لەژینگەیەکی شاخاویدا بژی ئەوا ماسلوکەکانی قاچی بەهێز و توندوتۆڵ دەبێت، ئەگەر ژینگەی دەریایی بێ ئەوا ماسلوکەکانی هەردوو دەستی بەهێز دەبێت، لەو زاناو فەیلەسوفانەی کەپاڵپشتی ئەم رایە دەکەن:

هیبۆکرات لەکتێبەکەیدا بەناوی (الجو والماو و الاقالیم) پێیوایە دانیشتوانی ناوچە شاخاویەکان کەباران و بای هەیە بەئازایەتی و بەژن و باڵا بەرزی و خەسڵەتی باش دەناسرێن، بەڵام دانیشتوانی هەرێمە رووت و وشکەکان بەباریکی و حەز لەزاڵبوون ناسراون.

مونتسکیو کەشوهەوای کردووە بەسێ بەشەوە کەهەر چەشنێك لەکەشوهەوا جۆرێك رەفتارو خەسڵەتی مرۆیی درووست دەکات بەم شێوەیە:

کەشوهەوای سارد: ئازایەتی، دەروون پاکی، هێزو توانا بۆ لەش لەمرۆڤەکاندا چێ دەکات.

کەش و هەوای گەرم: ترسنۆکی، مەکربازی، لاوازی لەمرۆڤەکانیدا چێ دەکات.

لەبارەی خاکیشەوە مونتسکیۆ خاکی بەم شێوەیە باسکردوە: خاك کاریگەری لەسەر سیاسەت هەیە بەم شێوەیە:

خاکی بەپیت: سیستمی پاشایەتی و دیکتاتۆری دێنێتە ئاراوە.

خاکی هەژار: سیستمی کۆماری و دیموکراسی دێنێتە ئاراوە.

دورگەکان: سەربەخۆیی و سەقامگیری تیایدا درووست دەبێت.

داروین: بناغەی مرۆڤی گەڕاندۆتەوە بۆ ژینگەی سرووشتی و کاریگەری سروشت لەسەر دروستکردنی خەسڵەتە جەستەییەکانی مرۆڤ، کەهەر سروشتەو جۆرێك خەسڵەت لەمرۆڤدا دروست دەکات.

بوکلbuckle: بۆ سەلماندنی بیردۆزەکەی سەبارەت بەچەشنی مرۆڤەکان و رەفتارو کارو کردەوەیان پشتی بەسێ فاکتەر بەستووە : کەشوهەوا، خۆراك، خاك، کەهەرسێکیان ئەو فاکتەرانەن کەکار لەشارستانیەت دەکەن بەم شێوەیە:

شارستانیەت لەئەفریقیا و ئاسیا خاك کاری لێکردووە، کەبەو شێوەیە بێ کەهەیە لەرووی تۆبۆگرافی ناوچەکەو ژیانی گشتی مرۆیی.

شارستانیەتی ئەوروپا کەوتۆتە ژێر کاریگەری کەشوهەواوە، گەرمی زۆر رێگرە لەکارکردن، بەڵام کەشوهەوای فێنك چوست و چالاکی بۆ مرۆڤ دێنێت و لەگەڵ بوونی خۆراکیش کارو پیشە زۆر دەبێت.

شارستانیەتی میسری و هندی و چینی لەهەمو شارستانیەتەکانی تر پێشکەوتووترە بەهۆی بوونی گەرمی گونجاو و خاکی بەپیت.

فیکتور کزن: victor cousin بیروڕاکانی لەوەدا دەردەکەوێ کەدەڵێ: نەخشەی وڵاتێکم بدەنێ کەزانیاری تێدا بێت سەبارەت بە پێگەو کەشوهەواو رواڵە سروشتیەکانی و داهاتەکانی ئەوا دەتوانم دەستنیشانی بکەم کە چ جۆرە مرۆڤێك لەسەر ئەو خاکە دەژی و چ جۆرە دەوڵەتێك و چ رۆڵێکی لەمێژوودا دەبینێ .

قەرەباڵغی و جەنجاڵی جادەو بانەکان بەئۆتۆمبیل دەبێتەهۆی بەرچاو تەسکی مرۆڤ و بەشداری دەکات لەبەرزبونەوەی فشاری خوێن و سەرهەڵدانی نەخۆشی شەکرە و وا لەمرۆڤ دەکات زوو بتەقێتەوەو رێخۆشکەر بێت بۆ کاری ساویلکانە و بایەخدان بەشتی پروپوچ.

لەپەرتوکی (گریقە عمل عوامل الجغرافیا فی التاریخ ) کەساڵی ١٩١١ دەرچووە لەلایەن ئەلین تشیرشیل سمیبلەوە هەندێ لەبیروڕاکانی مونتسکیو دووپات دەکاتەوە کەدەڵێ زەوی کاریگەرانە کار لەرەفتاری مرۆڤ دەکات ـ لەناوچە شاخاویەکان مرۆڤ ماسولکەکانی بەهێزە بۆ ئەوەی بتوانێ سەرکەوێ بەشوێنەبەرزەکاندا لەناوچە کەناراوەکانیشدا ماسولکەکانی سینگی و هەردووباڵی مرۆڤ بەهێزترن بۆ ئەوەی بتوانێ مەلە بکات و ماسی راو بکات، بەڵام لەسەر قەراغی روبارەکان توانای ماسولکەکانی

یەکسانن بۆ ئەوەی بتوانێ سود لەبەپیتی زەویەکانی وەربگرێ بۆ کشتوکاڵ، بەو پێیە سیفاتەکانی مرۆڤ بەپێی هەڵکەوتە جوگرافیەکەی دەگۆڕێ بۆیە پێویستە ئەو فاکتەرانە بزانین کەشێوازی ژیان و جۆری ژیان دیاری دەکات بۆ هەرکەسێك ئەم فاکتەرانە مەیلی مرۆڤن بەچاوپۆشین لە شوێنی لەدایکبوون و سروشتی جوگرافی ناوچەکەو پلەی گەرمی، هەندێ لەم فاکتەرانە لەگەڵ لەدایکبوونی مرۆڤدا هەن و هەندێکیشیان مرۆڤ فێریان دەبێ لەوانەش: پێنج هەستەوەرەکە، هەستونەستەکان، بیروباوەڕ، پێویستیەکان، خێزان، خودخۆشویستن، فێربوون، حەزو خواستەکان، بەهاکان، سەرچاوەی زانیاری...تد ئایا سیفاتەکان دەکەونە ژێر کاریگەری ئەو فاکتەرانەوە؟ بەپێی زۆربەی لێکۆڵینەوەکان فاکتەرە جوگرافی و مێژوویەکان کار لەپێکهێنانی کەسێتی مرۆڤ دەکەن، ئەو مرۆڤەی لەشوێنێك لەدایك بێت پڕ بێت لەئاوو رووەك و ئاژەڵ ئەوا لە بیرکردنەو زیاتر خاوترە بۆ گەڕان بۆ چارەسەری زیرەکانە بۆبەدەستهێنانی پێویستیەکانی ژیان بەپێچەوانەی ئەوەی لەناوچە هەژارو وشك و رەقەکاندا دەژی کەمرۆڤ ناچار دەکات بەدوای چارەسەردا بگەڕێ لەدۆزینەوەی ئاوو خۆراك و چۆنێتی گواستنەوە، بۆسەلماندنی ئەم راستیەش سەرچاوە زانستیەکان ئاماژەیان بەچەند نمونەیەك داوە لەوانەش: ژاپۆنیەکان کەسروشتی وڵاتەکەیان سەوزاییەو رادەی شێی بەرزە لەزۆربەی کاتەکانی ساڵداو زۆری ئاو لەروبارو دەریاکان و زۆری باران وای لەکەسی ژاپۆنی کردووە خاسیەتگەلێکی تێدا بێ لەکەسێکی تردا نەبێ، هەر لەرووی جلوبەرگیی تایبەتیانەوە وەکو کیمونو (ئاوریشم) یان جۆرێکی تر وەکو بوکانا (لۆکە) کەکەمی تێدەچێ و هەروەها لۆکە بۆ وەرزی هاوین، سروشتی سەوزایی ئەو وڵاتە وای لەمرۆڤی ژاپۆنی کردوە گرنگی زیاتر بەسەوزایی و باخچەی ماڵەوەی بدات، ئەمیش لەهونەری باخچەکانیاندا دەردەکەوێ کەتایبەت بەمان لەوانەش باخچەی تسوکیاما کە تایبەتە بە بەباخچەی تەلان و بەرزایەکان باخچەکانی کاریسانسوی، تایبەتە بەباخچەی ناوچە وشك و لماویەکان باخچەکانی تشانیوا تایبەتە بەرێورەسمی چاخواردنەوە.

سەبارەت بەکاریگەری کەشوهەوا لەسەر خانوی ژاپۆنی و زۆری بارن بارین لەماوەی ساڵێکدا خانوەکانیان کەوانەیی کردووە بۆ ئەوەی لەوەستانی ئاو لەسەر بارنەکانیان رزگاریان ببێ، هەروەها بۆ ئەوەی لەزەوی لەرزەش رزگاریان بێ کەرەسەی سوك و هەرزانیان بۆ خانووەکانیان بەکارهێناوە، سەبارەت بەبەرهەمی ئەدەبییش زۆربەی دانراوە کۆنەکانیان باس لەشەڕ ئەکەن، ماوەی تەرکیزکردن لەسەر ئەدەبیاتی سامورای کەگەیشتە ئاستی بەپیرۆز زانین لەئەدەبی نوسەرو ئەدیبانیان لەماوەی ١٦٠٠ تا ١٨٦٧ز دەردەکەوێت بەهۆی ئەو بیروڕایەیە کەهەر لەمنداڵییەوە تیایاندا دەچەسپێترێت

هەست دەکەین ژاپۆنیەکان دڵسۆزن لەکارو پیشەیان و نیشتمانیان خۆش دەوێت هەر لەبەرئەوەشە بەرهەمە تەکنۆلۆژیەکانیان دونیای داگیرکردووە.

تەوارق (گەلانی مەغریبی عەرەبی) ئەمانە لەبیابانی مکەفەرەدا دەژین هەر لەسەرپۆشیانەوە تا جلوبەرگیان کەهەموو جەستەیان داپۆشیوە کاریگەری سروشتی خاك و کەشوهەوا دەردەخات، سەرپۆشی سەریان لە گەردەلولی لماوی دەیانپارێزێ، پێویستیەکانی ژیانیان سوکن بۆ ئەوەی بتوانن کۆچ و کۆچبەری بکەن کە رەفتاری نیمچە هەمیشەییانە، ئەمانە رەفتاریان توندە بەهۆی بارودۆخی رەق و تەقی بیابان و پلەی بەرزی گەرمی ناوچەکە، بەهۆی ئەو نالەباریەوە توانای سەبرو تەحەمولیان هەیە بۆیە لەروی هزریشەوە زۆر بەستەڵەککراون بەبەراورد لەگەڵ گەلانی تر، بەهەمان شێوە لەرووی سۆزو خۆشەویستیشەوە، لەهەمان کاتیشدا توانای بیرکردنەوەو داهێنانی زمانەوانیان هەیە ئەمیش لەو پەندو هۆنراوانە دەردەکەیت کە لەئەدەبیاتیاندا هەیە.

ئەسکیمو: ئەمانە لەنێوان چەند وڵاتێکدا ژیان دەگوزەرێنن لەوانەش روسیاو ئەمریکاو کەنەدا، لەوپەڕی باکوری گۆی زەوی کەساردترین شوێنی زەویە، وشەی ئەسکیمو بەواتای بخۆری گۆشتی خاو دەگەیەنێ، کەبەراستیش گۆشتی خاو دەخۆن و نایکولێنن بۆ ئەوەی مادەی خۆراکی تەواویان دەست بکەوێت بەمەبەستی بەرگەکرتن لەو سەرماو سۆڵەیە کەتووشیان دەبێت، ئەسکیمۆیەکان پشت بەراوشکار دەبەستن لەراوەماسی و فەقمەو حوت، لەناو خێوەتی دروستکراو لەپێستی فەقمە دەژین کەگەرمە بۆ زستان، سەختی ژیان و ئاوهەوایان وای لێکردوون کەجیاواز بن لەگەلانی دیکەی دونیا.

## گەنج:

**ئاسایشی کۆمەڵایەتی بەردی بناغەی هەستی ئینتیمایە لای گەنجان، بەپێچەوانەوە نامۆبوون هەمیشە میوانی گەنجانە**

قەیرانی لاوان، گرفتی لاوان، پێداویستی لاوان ئەو زاروانەن کەلێرەو لەوێ لەناو خێزان لەکۆمەڵگاو لای سیاسەتمەداران و نەخشەدانەرانی حکومەت و میدیاکان پرسیاری لەبارەیەوە دەکرێ ئەم پرسیارکردنەش شتێکی نوێ نییە، بەڵکو لەگەڵ بوونی دەوڵەتدا هەرکراوە بۆ ئەوەی لاو وەك توێژێکی زیندوو چالاك بۆ لای خۆیان رابکێشن، بەڵام لەمبارەیەوە خشتێك نەخراوتە سەر خشتێك بۆ بنیاتنانی کۆمەڵگە، کەلاوان تیایدا هەست بەبوون و شوناسی خۆیان بکەن بەتایبەتیش لەکۆمەڵگای ئێمەدا کەبەبارودۆخێکی ناهەموارو ناهاوسەنگدا تێپەڕیووە لەرووی سیاسی و ئابوری و کۆمەڵایەتی، کە هەڵپەی بەدوادا دەکرێ و خۆشی لەهەڵپەدایە بەدوای سادەترین پێداویستیەکانیدا کەتێرنەکردن (قەیران) ێکی گەورەی لەدەرونیدا دروست کردووە نەحکومەت و نەکۆمەڵگا تەنها باسکردن نەبێت لەبەرنامەو بۆنەکاندا نەیتوانیوە چارەسەری بکەن، دیارە هۆکاری ئەو چارەسەرنەکردنەش زۆرە گرنگترینیان نەبوونی پلانە کەنەك هەر لەرووی قەیرانی لاوان پلان نەبووە بەڵکو بۆ سادەترین پێویستیەکانی شارستانیەت لەرێگاو بان و سیستمی هاتووچۆو بیگرە تادەگاتە خوێندن و ژنهێان و شوکردن پلان نەبووە بەتایبەتی لەدەوڵەتی عێراقدا تەنها بۆ شەڕ لاوانیان بیرکەوتۆتەوە، نازانم حکومەتە یەك لەدوای یەکەکانی بۆ لەکاتی تەنگانە بۆسەربازی و پێشمەرگایەتی هاوار دەبەنە لاوان

هەر ئەو کاتانەش بنەکەیەکی لاوان لێرەو لەوێ دەکەنەوە لەگەڵ پڕکردنەوەی بەچەند کورسی و مێزێك، ئایا حکومەت بەو رادەیە نەزانە؟!یان خودی لاوانی ولاَتی ئێمە نەزانن کەتواناو لێهاتوویی و وزەی خۆیان نازانن؟!کەواتە هەم حکومەت و هەم لاوان پێویستیان بەشۆڕش هەیە شۆڕشێك کەحکومەت درك بەوە بکات لاوان بەکردنەوەی بنکەیەکی چارەسەرناکرێ، لاوانیش بزانن چییان دەوێت لاوان ئەگەر ئەرزەوحالێك بدەنە حکومەت و داواکانی خۆیان دیاری بکەن دەسبەجێ دەڵێن بنکەیەك بۆ لاوان، خولی موزیك و خولی فێربوونی شۆفێری بکرێتەوە کەئەمانە هیچیان چارەسەر نین ئەمە دەورێکی کوشندەیە چونکە ئەمەیان بۆکاری سیاسی و حزبایەتیە کەچەند لاوێك کۆدەکەنەوەو هەوڵدەدەن پایەیەکی حزبی وەربگرن، بۆ ئەوەی لەرێگای پایە حزبیەکەوە خۆیان دەوڵەمەند بکەن، ئەمیش واقیعێکە لەولاَتی ئێمە ئەگەر بۆ بەرپرسی کۆمیتەیەك یان بەرپرسی ناوچەیەك بێت یان کوڕی بەناو پیاو ماقوڵێك بێت ئەوا دەبێتە ئەندام پەرلەمان و دەوڵەمەند دەبێت، بەلاَم ئەوەی پێداویستی دەرونی تێربکات کێشەی سەرەکی چارەسەر بکات و لەدەرچوون لەقەیران نزیك بێتەوە لایەنی پێویستیە شوناسی و دەرونی و بنەڕەتیەکانی لاوانە وەك مرۆڤ بۆ کەمکردنەوەی ئەو قەیرانە، چونکە چیتر بیر لە پێویستیە بنەڕەتی و دەرونیەکان ناکەنەوە کەسادەرتین مافی مرۆڤە کەسەگ و پشیلە بەئاسانی پێی دەگەن، ئەو پێویستیانە وەك واقیعێك هەستم پێکردووە، بەلاَم لەرووی تیۆریشەوە لاوان بەچەند قۆناغێکی تەمەندا گوزەر دەکەن هەر قۆناغێك پێویستی دەرونی و کۆمەلاَیەتی و ئابوری خۆی هەیە کەئەمیش بەستراوە بەپەرەسەندنی مێژووی رەوشی تاکەوە کەبارودۆخی سیاسی و ئابوری و شەڕوشۆڕی ناوخۆ کاری لێدەکات، قۆناغەکان لەرووی بایۆلۆژیەوە زاناکان بەچەند شێوەیەك دەست نیشانیان کردووە، بەشێوەی گشت و شێوەی تایبەتیش، شێوە گشتیەکەی ئەوەیە مرۆڤەکان بەگشتی کۆمەڵێ پێداویستیان هەیە کە دەبێ یەك لەدوای یەك تێربکرێن وەکو خواردن و خواردنەوەو حەوانەوە نوستن و سێکس کەئەمەی دواییان لاوانی سەرقاڵ کردووە، لاو ئەم پێداویستیانەی بەتایبەتی سێکس لەو پەڕی قەیراندایە چونکە شەڕو شۆڕ و عەسکەرتاریەت و ئابوری ولاَت وای لەلاوان کردووە کەئاستەنگی گەورەو قەرزاری لەلای لاوان دروست کردووە بەزۆری دوای ٢٥ساڵی یان ژن دەهێنێت یان شوودەکات کەلەرووی زانستیەوە مرۆڤ لەسەرەتای هەرزەکاریەوە بیر لەپرۆسەی سێکس دەکاتەوە بۆیە زۆرجار دووچاری گرفتی شەوی زاوایەتی دەبێتەوە کەلەدواییدا دەڵێن بەستراوە یان نوشتەی لێکراوە، ئەمەندەش تامەزرۆی ئەو شەوەیە دووچاری ململانێی دەرونی دەبێتەوە کەبەجارێك دەیەوێت هەقی ٢٠ساڵی رابردووی خۆی لەو

شەوە بکاتەوە، بەهەمان شێوە بوکی بەدبەختیش لەپڕ زاوای  تینوو پەلاماری دەدات و دووچاری هێدمە دەبێت، و هەر لەو شەوەشدا زۆر دەترسێت ئەم مەسەلەی ژن هێنان و شوکردنە وەك پێویستی بایۆلۆژی و دەرونی و کۆمەڵایەتی سەرچاوەی قەیرانی لاوە، کەحکومەت دەتوانێت بەکاربێنێت و کەسێتی خۆی بنوێنێت بۆ کارێکی وەك دامەزراندن  پەنا بۆ واسیتەو فرت وفێڵ دەبات، ئەوە بەشێوەیەکی گشتی بەڵام بەشێوەی تایبەتی هەر قۆناغەو پێویستی خۆی هەیە کەلەتێرنەکردنی لاو دەخاتە بازنەیەکی مەترسی و بێ ئومێدیەوە، ئەم پێداویستیانەش بەیەکەوە بەستراون وەبەگوێرەی قۆناغ زانایان ئاماژەیان پێداوە واتە قۆناغی هەرزەکاریە کەسەرەتای لاوێتیە (١٢-٢٠) ساڵ کۆمەڵێ پێداویستی خۆی هەیە لەوانەش پێویستی رۆڵ بینین و گوزارشت کردن لەو هەستەو نابێ کۆمەڵ و دەوروبەر ئەو رۆڵەی لێبسێنێـەوە، کەزۆرجار کلتوری کۆمەڵ رێگەی نەداوە بەتایبەتی مێ گوزارشت لەخودی خۆی بکات و هەندێ جاریش چارەنووسی کەسێکی تر بۆی دیاری دەکات و کاردانەوەی نێگەتیڤی لەئاییندەدا  بۆ دەبێت و پێویستی بەهاوڕێیەتی هەیە، بەڵام لێرەشدا کەسوکارە هاوڕێی بۆ دەست نیشان دەکەن و پەیوەندیە کۆمەڵایەتەکانی لێ تێکدەدەن و لەگەڵ رەگەزی دیکە دووچاری شەرم دەبێت بەهۆی نەبوونی پەیوەندی لەگەڵدا، کەدایکوباوك لەم تەمەنی هەرزەکارەدا رێگەی نادەن سەربەخۆیی کەسێتی بەدەست بێنێت، کەهەمیشە دەیانەوێ پابەندی ئەوان بێ، لەبارەی سەربەخۆیی ئابوریش کە لاو بەهۆیەوە خۆی بەسەرفرازی دەبینێ چارەسەری بکات بەسولفەیەکی زۆرچاك لەو چارەسەرکردنە ئەوەیە ئافرەت و پیاو دوای هاوسەرگیری دەچنە قۆناغی سەقامگیری دەرونیەوە، بەخێزانەوە پابەند دەبێ منداڵیان خۆش دەوێـت و ئومێدی ناواقیعی گەورە لەمرۆڤ دەخاتە ململانێوە، ئەوجا ئەگەر بچینە سەر پێویستی قۆناغی دووەم کەئەویش پێویستی ئاسایشی دەرونیە کەوا پێویست دەکات لاو هەست بەو ئاسایشە بکات لەرێگەی نەبونی هەڕەشەو مەترسی بۆ سەر ژیان و ئاییندەی و بوونی شوێنی نیشتەجێ و ئارامی و دوورخستنەوەی لەمەترسیەکانی دیکەی دەوروبەری هەورەها بەهەمان شێوە هەستکردنی لاو بەئینتیما کەبزانێ کەبزانێ کۆمەڵگەو حکومەتن بەرگری لێدەکەن و لەخزمەتی ئەون و ئەویش هەست بەوە بکات کەسێکە لەوان بەڵام کام ئینتیما ؟!

گەنج هەست نەکات حکومەت حکومەتی ئەوە سیستم و کۆمەڵگا هی ئەون کەهەموو ساتێ هەڕەشەی لێدەکرێ و ئومێدەکانی خامۆش دەبێت و لەپەراوێزدا دەژی و هەرگیزیش ناتوانێت هەست بەرێزو خۆشەویستی کۆمەڵ و دەوروبەری بکات و ناشتوانێت  وەك کەسێك خاوەن بوون و کییان و تواناکانی خۆی بێت دوچاری شکست دەبێت کەلایەنی کەمی

پێویستیەکانی خۆی دابین ناکات و ئامادەباشی بۆ پێکەوەنانی خێزان و پیاوەتی تیا دروستن نابێت و ئەمەیش تەڵەزگەیەکی گەورەیە لاو تێی دەکەوێ، چونکە بۆ دروستکردنی هەستی بەرپرسیارێتی کۆمەڵایەتی دەبێ ئامادەباشی تێدا دروست بکرێ، بەڵام لەولاتێکدا کەشەو و رۆژ رەخنە و شکست بێ بۆ لاو چۆن دەتوانرێ ئەو هەستانەی گەشە بکات، ئەی چۆن دەتوانێت بیر لەوە بکاتەوە ژن بێنێ یان شوبکات و خێزان پێکەوە بنێ و ماڵ بەڕێوەببات، کەئەمیش پێویستێتی لاوە.

٢١-٢٥ساڵی و خۆئامادەکردن بۆ پەروەردەی منداڵ و پێکەوە ژیان لەگەڵ هاوسەرو هەڵکردن لەگەڵ پیشەو کاردا کەشەو و رۆژ قەیرانی ئابوری لای بوونەتە کۆسپ لەبەردەم ئەو قۆناغەدا لاوی خستۆتە سەر دووریانێکی سەخت و دژوارەوە پاشان لەتەمەنی دواتردا ٢٥-٤٠ساڵی لاو زۆر بەتوندی پێویستی بەوە هەیە رۆڵی مەدەنیانەو بەرپرسیارێتی گەورەی کۆمەڵایەتی ببینێ و ئاستێکی جێگیری گوزەران هەبێت و ترسی لەسەر نەبێت و پاشان بتوانێت وەکو باوك یان دایك هاوکاری منداڵەکانیان بن کەبەختەوەرو دڵخۆش بن و هەست بەبەرپرسیارێتی بکەن، بەڵام ئایا سەد دەرسەد بۆ ئەوە گونجاوە دایکوباوك بتوانن گیانی کۆمەڵایەتیبوون و بەرپرسیارێتی لەمنداڵدا دروست بکەن، کەزۆربەی پێویستی منداڵ شکستی خواردووەو زۆر لەمنداڵەکان لەکوچەو کۆڵانەکان بەرەڵان و دایکوباوکیش هەستی پێدەکەن، بەڵام بێچارە ماونەتەوەو هەوڵی پڕکردنەوەی کاتی ڤاڵایی دەدەن، ئایا پەیوەندی نێوان خۆیان وەك ژن و پیاو ئەوە دەستەبەر دەکات کەدووچاری قەیرانی دەروونی نەبن بەهۆی سەختی ژیان و نەبوونی ئاسایشی دەرونی؟ ئەم پرسیارانەو دەیان پرسیاری دیکە لەلاوان و دەسەڵات بکرێت کە تاچ رادەیەك لاو هەست بەتێرکردنی لایەنی کەمی پێداویستیەکانی کردووەو حکومەتیش تا چ ئاستێك هەوڵی دابینکردنی ئەو پێداویستیانەی داوە؟بونیاتنانەوەی کەسێتی تاك و رەوینەوەی هەستی شکستخواردن ئەرکێکی گەورەی میدیای کوردیە کەتاهەنوکەش میدیای حزب و گروپ زاڵەو ئەم میدیایە خۆی لەقەیراندا دەژی کەرەنگدانەوەی بارە شکستخواردووەکانی کۆمەڵگایە لەشەڕی ناوخۆوو دابەشکردنی کلتوری کۆمەڵگا کەبێگومان لاوانیش لەدەرەوەی ئەو رەوەشە نین، کەزۆر پێویستە ئاسایشی کۆمەڵایەتی بۆ کۆمەڵگای کوردی بگەڕێتەوەو جەنگی سارد کۆتایی پێ بێ

## بەستنەوەی رابردوو بەئایندەوە:

**مرۆڤ دەرەنجامی بیرەوریە تاڵ و شیرینەکانی رابردوێتی (گیدو موتری)**

کێ هەیە ساتێك لەساتەکانی ژیانی ئاخ هەڵنەکێشێ بۆ ساتە خۆش و ناخۆشەکانی تەمەنی بابردووی لەسۆزو خۆشەویستی و رکوکینەو جموجوڵی کۆمەڵایەتی و شەو نشینی جارانی ماڵان و رەوشی ئابوری گیرفان و ساتەکانی هاورێیەتی و بیرکردنەوەو خەیاڵی گەنجێتی یاخود منداڵی و پەیوەندیەکانی لەگەڵ ژیان و رەفتارە جۆراوجۆرەکانی لەگەڵ دەوروبەر؟ئەو ئاخ هەڵکێشانەی بیرەوەریەکانی تەمەن هەندێکیان نزیکن و هەندێکیشیان دەگەرێنەوە قۆناغەکانی پێشتری تەمەنی مرۆڤ کەرەنگە تەمەنیان دەیان ساڵ بێت بەیادەوری باوباپیرانیشەوە کەئەوانیش گێراویانەتەوەو بۆتە بەشێك لەیادەوەری نەوەی دوای خۆیان، ئەو بیروەریانە گا تاڵ گا شیرین بێ دەبنە ئاوێنەیەك و مرۆڤ خودی خۆی تێدا دەبینێتەوە لەروخساری ئەو کەسانە دەیخوێنێتەوە کەدێنە خەیاڵی یان دیدەنیان دەکا، کەهەندێکجار خەیاڵی خۆشی لەشەقەی باڵ دەدات بەرەو ئەو مەنزڵگەیە کەکانی یادەوەریەکانێتی دەفرێ و لەجێ ژوانێك دەنیشێتەوەو هێلانەی خەیاڵ چێ دەکات و تاو تاوەش بەزەیی بەخۆیدا دێتەوەو خۆی بەساویلکە دەزانێت، و هەندێکجاریش ئیسقاتیانە لۆمەی بیروەریەکی تاڵ دەخاتە ئەستۆی کەسێکی دیکەو بەرادەیەك ئاخی حەسرەت هەڵدەکێشێ کەئەو ساتە دەبێتە ئەزموونێك لەژیانیداو دەبێتە وانەیەك و میراتێك بۆنەوەکانی داهاتووی و دەبێتە پەندێك کەسانی دیکە لێوەی فێر دەبن، سەرجەم ئەو پەندانەی کوردەواریش هەر لەو ساتە

یادەوریانەوە سەرچاوەیان هەڵگرتووە، کەلەئەدەب و چیرۆك و شیعر و هونەری گۆرانی بەرجەستە دەبێ کەبەدەم ئاوازەکەی عەلی مەردانەوە دەیلێینەوەو ئاخ و حەسرەت بۆ رابردووی خۆمان و یادە تاڵ و شیرینەکانمان هەڵدەکێشین چ بەدەنگی بەرز یان لەناو سنگی خۆماندا کەدەلێین:

کەی دێتەوە کەی دێتەوە
کاتی لاوم کەی دێتەوە
لەدەستم چوو بەخوا هەرگیز نایەتەوە نایاتەوە
ئەو گوڵەی کە لەناو رەزا ئەشنایەوە ئەشنایەوە
ئێستا وشك بوو بولبول ناچێ بەلایەوە بەلایەوە... تد

یان کەدەلێین:

شەرتە وەك مەجنون عەساو قولێنگێ هەڵگرم
تابەداخی لەیلەوە دەمنێنە قەبری تەنگ و تار... تد

بیرەوەریەکانی مرۆڤ بەزۆر شێوە لەلایەن هزرمەندانەوە لێکدراوتەوە لەوانەش فەیلەسوفی هندی گیدۆموتری کەلەوباوەڕەدایە مرۆڤ دەرەنجامی بیرەوەریە تاڵ و شیرنەکان و رابردوێتی و دووپاتی دەکاتەوە کە رەفتارو هەڵسوکەوتەکانی ئێستامان رەنگدانەوەی سات و روداوو ئەزمونەکانی رابردوودمانە، کەرۆژ دوای رۆژ کەڵەکەبوون و لەکانێکدا کۆبوونەتەوە، نەك هەرئەوە بەڵکو زۆر جار پەیوەندییە تازەکانیشمان بەندە بەرابردووەوەو لەسەر بنەمای رابردوو مامەڵە دەکەین و زۆرێکیش لەو یادەوەریانەمان کردۆتە پەند وەکو: بەسەر پردی نامەرد دا مەپەڕەوە...گیا لەسەر بنجی خۆی ئەڕوێتەوە...ئەگەر هێزت نەبوو بەدۆستی دایکت بڵێ کاکە..تد ئەو پەندانە هەمووی دەرەنجامی یادەوەری و بەسەرهاتەکانی ژیانی رابردووە و ئێستا پەیڕەوی دەکەین، یادەوەریەکانی دۆست و هاوڕێیانی باو باپیرانیشمان کەبەدۆستی خۆمانیان دەزانین و کردۆتە پێوەرو بنەما تەنانەت جۆری خوارنەکانیشمان کەهەمیشە ئاخ بەدۆو ماست و کەرێی جاران و دۆستایەتی جاران دەخوازین و هی ئێستا بەلامانەوە گرنگیی نییە، ئەگەر

لەهۆکاری ئەمە بکۆڵینەوە ئەوا دەبێ بگەڕێینەوە بۆ شیکردنەوە دەروونیەکانی سیگمۆند فرۆید و شیکەرەوەانی سایکۆلۆژی و باس لەوە بکەین کە قۆناغی منداڵی کاریگەری لەسەر کەسێتی تاکدا هەیەو نەستی کۆمەلآیەتش کە کاریگەری باو باپیرانمانە هەر لەسەرمانە، ئەزمونی تاك خۆی بەتەنها نەستی لەو تاکەدا درووست کردووەو کاریگەری دابگێڕانی نەوەکانی پێشوو نەستی کۆمەلآیەتی بۆ ئیمە دروست کردووەو بەخۆشی و ناخۆشەیکانیەوە کاری لێکردووین، بیروەریەکانی مرۆڤ تەنها کەسەکان ناگرێتەوە بەڵکو رەنگ و بۆن و وەرزەکانی ساڵ و کەشوهەواش دەگرێتەوە کەلەمێشکی مرۆڤدا دەچەسپێن و دەبنە ئامرازی وەبیرهاتنەوەی بیرەوەری، کەئەمیش پەیوەندی بە تۆمارگەی مێشکەوە هەیە کەئەو کەشوهەوایەی یان ئەو رەنگەی یان ئەو بۆنی گوڵوگوڵزارەی بەهاری یان بۆنی دەغڵ و دانی جاران و شەوچەرەی گوێی ئاگردانی بەستووە بەبیروەریەکی تاڵ یان شیرینەوە، ئەگەر لەبەهاری هەر ساڵێکدا لەناو گوڵە نێرگزدا لەگەڵ کەسێکدا ژیانمان گوزەراندبێ ئەگەر بۆ ماوەی تەنها کاتژمێرێکش بووبێ ئەوا بەبۆنکردنی نەرگز لەهەر کاتێکدا ئەو ساتەمان وەبیر دێتەوە، لەماوەی خەلەو خەرماندا لەهەر هەڵوێستێکدا بووبین ئەوا ئەو هەڵوێستەمان وەبیر دێتەوە ئەگەر پاش چەندین ساڵێش بووبێ، ئەمەش پەیوەندی بەفێربوونی مەرجییەوە هەیە کەبەهۆی زەنگەکەوە خواردنەکە وەبیر سەگەکەی بافلوف دێتەوە، زۆرجاریش رابردوو کەدەبێتە بیروەری تاڵ بۆ ئێمە ئەوا وەکو ئەزموون سودی لێ وەردەگرین و هەڵەکانی رابردومان وەك بیروەریەکی تاڵ دووبارە ناکەینەوە، هەندێجار کەسانی دەروبەر یادەوەری دەگێڕنەوە نەوەی دوای خۆیان کەتەنها بیستویانە سودی لێ وەردەگرن و ئەو هەڵەیەی ئەوان دووبارە ناکەنەوە، بیروەری هەندێ جار دەبێتە خەیاڵی داهێنەر بۆ نوسەران و شاعیران و دەبێتە سەرچاوەو ئیلهامی شیعری و کاری هونەری، یادەوەریەکانی مرۆڤ هەندێجار وەکو خەون وان و هەندێکجاریش دەبنە خەون بۆ مرۆڤ، مرۆڤ بەئەندازەیەك سوود لەبیروەریەکانی رابردووی خۆی وەردەگرێ دەیکاتە پەندو عیبرەت بۆ خۆی و خۆی دەمەزەرد دەکاتەوەو بەچەشنێکی نوێ خۆی جۆش ئەدات و زاخاوی مێشکیش هەر تازەگەریانە ئەداتەوە.

مرۆڤیش بۆ ئەوەی خۆی لەرابردووی تاڵ رزگاربکات و کاری نەرێنی نەکاتە سەری ئەوا پێویستە لەگەڵ خودی خۆیدا بدوێ کەئەو بیروەریە تاڵەی کردووە بەهەوێنی ئەزمونێکی نوێ و بەرهەمێکی باشتری هەڵسوکەوت و رەفتاری، هەرگیز ناشکرێ بیروەرەیەکانی رابردوو

بسرڕێتەوەو وەکو ئەدیبان دەڵێن هەنگاوێك بۆ دواوەو دوو هەنگاو بۆ پێشەوە بەئامانجی پێشکەوتن، بیرەوەریەکانی مرۆڤ بەشێکی زۆری بەستراوە بەقۆناغی منداڵییەوە کەوەکو کۆمپیوتەرێك هەمووی تێدا کۆگا کراوە، بەڵام مرۆڤ دینامیکیانە سۆز دەیوروژێنیٚ و کۆمپیوتەریش میکانیکیانە مرۆڤ کلیکی لەسەر دەکات و بەئارەزووی خۆی کاری پیٚ دەکات.

کاریگەری یادەوریەکان:

یادەوریە تاڵەکان بەرادەیەك کاریگەری لەسەر هەندیٚ کەس دەبیٚ ژیانی وێران دەکاو لەرەفتارو هەڵسوکەوتی رۆژانەی رەنگ دەداتەوە وەکو یادەوری ژنێك کەکوڕەکەی لەبەردەمی کوژرابیٚ، یادەوری ئەنفال کەهێدمەی دەروونی بۆکەسوکاری قوربانیانی ئەنفال درووست کردووە، یادەوەری کیمیابارانی هەڵەبجە کە شوێنەواری نەرێنی لەسەر تاکەکانی نەك تەنها هەڵەبجە بەڵکو لەسەر زۆربەی تاکی کورد هەیەو دوژمنانی کورد ئەگەر هەست بەگوناه بکەن ئەوە خەسڵەتێکی مرۆییەو ئەگەر نا ئەوا ئەو جۆرە کەسانە کەسانی سایکۆپاتین کەبەرامبەر کورد ویژدانیان ئازاریان نادا، جوتیارانی کورد کەلەناوچە دابڕاوەکان دەرکران لەهەفتاکانی سەدەی رابردوو ئێستا هەست برینی یادەورەیەکانیان دەکەن نەخاسمە لەکاتێکدا ئێستاش زەوی و زاریان داگیرکراوە، سەرجەم یادەوەریەکانی کورد لەمانگی ئازارو نەورۆزدایە لەهەڵگیرسانی شۆڕش و لەنسکۆی شۆڕش و لەکیمیاباران و چەندین وێستگەی دیکەی سیاسی کەشوێنەواریان لەسەرباری تاکی ئەم نەتەوەیە هێشتۆتەوە جا خۆش بیٚ یان ناخۆش بۆیە لەم مانگەدا هەستی نەتەوەیی و نیشتمانی و شۆڕشگێڕی دێتە جۆش و خرۆش و کەلەمێشکی تاکی کورددا چەسپاوە، قەتل و عامی ئەرمەنەکان وەك یادەوەریەك لەناخی ئەرمەن و دوژمنانیان ماوەتەوەو نوکوڵی لیٚ دەکەن، بەهەمان شێوەی کوردو ئەرمەن ئەمازیغیەکانیش وەك نەتەوەیەك یادەوری تاڵ و شیرینیان هەیە. یادەوریەکان کاریگەری زۆر لەسەر هەڵچونەکانی مرۆڤ دەکەن کەهەمیشە مرۆڤ دەخەنە دڵەراوکیٚ و فشاری دەرونیەوەو شپرزەی دەکەن، یادەوەریەکان کار لەپەیوەندی کۆمەڵایەتیش دەکات کەوەکو ئەزمونێکی تاڵ پەیوەندی بەجۆرە کەسانێکی تایبەتەوە هەبیٚ بۆنموونە کوشتن و شەهیدکردنی تاکێك بەدەستی رژێمی بەعس وایکردووە کورد هەستی نەرێنی بەرامبەر عەرەب درو ست بکات.

یادەورەیەکان کاریگەری لەسەر باری جەستەیی و کۆئەندامی دەماری مرۆڤیشەوە هەیە کەکار لە وەبیرهاتنەوەو نەخۆشی سایکۆسۆماتی دەکات، هاوکات یادەوریە خۆشەکانیش

کاریگەری ئەرێنی بەسەر مرڤەوە هەیەو وایلێدەکات هەمیشە دڵخۆش بێت و کاری ئیجابی بکات و ئەرێیانە بیر لەژیان بکاتەوەو پەیوەندی لەگەڵ دەروبەری باش بێت، بەشێکی زۆری خەو و خەیاڵی مرۆڤ بەندە بەیادەورەیکانەوە، زۆر لەبەرهەمە شیعریەکانی کۆن و نویَ لەرۆمان و شاکارەکانی ئەدەب پەیوەندی بەیادەوەریەوە هەیەو ئەگەر بڵێین ئەدەب و خەیاڵی ئەدەبی بیَ یادەوەری کارێکی سانایە ئەوا گومان لەو ئەدەبە دەکرێت، بەو شێوەیەش یادەوەری ژیانی سایکۆلۆژی تاکەکانی پێکهێناوە، کەدەکریَ بیکەینە هەوێنی بەرەو پێشبردنی ژیانمان نەك خۆمان رادەستی یادەوەریەکی تاڵ بکەین.

## وردەکاری رەفتاری رۆژانە پاڵنەرێکە بۆ زیندوو راگرتنی ویژدان

ژنان لەرووی سۆزو پەیوەندییە کۆمەڵایەتیەکان لەزۆر لەپیاوان بەهرەمەندترو وردەکارترو هەستیارترن، لەرووی ویژدانیشەوە زووتر بەخەبەر دێن و وریان، ئەمەش پەیوەندی بەزیرەکیەوە هەیە، زیرەکی توانایەکی ئەقڵی مرۆڤە لە هەموو بوارێکدا، زیرەکی ویژدانیش کۆمەڵە ئەدگارێکی لایەنی کەسێتی و کۆمەڵایەتی و دەروونی و هەڵچوونی مرۆڤە، بەهۆی ئەو کۆمەڵە ئەدگارەوە مامەڵە لەگەڵ خۆی و دەوروبەردا دەکات، مرۆڤ هەست بەکێماسی و گوناه و هەندێکجاریش هەست بە تاوان و خۆهەڵکێشان و خۆ بەزلزانین و خۆپەرستی و ترزلییش دەکات، ئەم هەستانەی خود تەنهاو تەنها لەرێگەی ئەو زیرەکییەوە کۆنترۆڵ دەکرێت، کە ویژدانی متبوو بەرێوەدەبات، کەسەرەنجام دەبێتە راستکردنەوەی رەفتارەکانی رۆژانەی، ئاستی ئەو کۆنترۆڵکردنەشی بەستراوە بەئاستی بەگەڕخستن وبزواندنی ئەو زیرەکی و ویژدانەوە، کەئەمیش بەستراوەو پەیوەندە بەسەوداو مامەڵەکردن لەگەڵ ژیان و ژینگەی مرۆیی و سروشتی و ئاو وهەواوو دەوروبەرو مەعریفەو دینامیکیزمی دەروونی خودیشەوە، لە هەڵوێستە جیاوازەکانی ژیاندا رۆژانە مرۆڤ زیرەکی ویژدان بەکاردەهێنێ بۆ ئەوەی بتوانێ لەگەڵ خۆی ودەوروبەریشدا هەڵبکات و لەگەڵ سەرماو گەرمادا هەڵبکات .

لەگەڵ دراوسێ و بێکارەبایی و نەداری و نەخۆشی بەو شێوەیە کەچارەسەری گونجاویان بۆ بدۆزێتەوەو دووچاری هەلآتنی کۆمەڵایەتی و دەروونی نەیەت و نامۆبوون و حەسرەت نەکاتە ناسنامەی خۆی و بشتوانێت لەگەڵ پێویستیە سێکسی و خۆشەویستی و ململانێکانی لەگەڵ خودو دەوروبەردا بسازێ و بەو شێوەیە لە نەخۆشی و مەینەتی و دەردەسەرییەکانی رۆژانە خۆی نەشارێتەوە، زۆر گرنگە مرۆڤ لەگەڵ خۆیدا بگونجێت، چونکە جاری وا هەیە مرۆڤ هەر لەخۆیەوە بێزارەو نازانێ چی بکات و چۆن خۆی بەرێوەببات، کە نازانێ چی بکات و کەلێنێك بدۆزیتەوە بۆ

دەربازبوون لەو بێزارییە کە پاساوێکی ئەوتۆی نییە کەواتە ئەو مرۆڤە نەیتوانیووە زیرەکی ویژدانیانەی خۆی بەکاربهێنێ و ئەو تواناو زیرەکییەی هەیەتی وەکو ئەو پارەوپولە وایە کە مرۆڤ هیچ سودێکی لیَ نابینێت بۆ ژیان وگوزەرانی خۆی، وەکو ئەو دایکەوایە کە شیر لەمەمکیدا هەیەو بەدوای خواردنی منداڵەکەیدا وێڵە، وەکو ئەو جوتیارە وایە کەداسی بەدەستەوەیەو دەغڵەکەی لەرەگەوە هەڵدەکێشێ و زیان بەخاکەکەی دەگەیەنێ، مرۆڤ ئەگەر نەتوانێ هاوسەنگی بۆ خۆی دروست بکات و هەمیشە لەگریان و پەژارەدا بژی کەواتە بیرکردنەوەی نییە وئاستی زیرەکی وەك خۆی بەکار نەهاتووە، ئەگەر مرۆڤ تورەبووو نەیتوانی خۆی کۆنترۆڵ بکات و ئاقڵانە نەتوانێ بەرەنگاری کێشەکانی خۆی ببێتەوە ئەوا نەیتوانیوە لەتاریکدا رووناکی بەکاربێنی و ویژدانی هەرەسی هێناوە ... رەفتارکردن لەگەڵ خود و لەگەڵ دەوروبەریشدا زیرەکی ویژدانی دەوێت و پەیرەونەکردنی ئەو ویژدانە مایەی دڵەراوکێ و هەستکردنە بەگوناه، رەنگە ئەو هەستکردن بەگوناهە مرۆڤ نەزانی بۆچی دەیگەرێنێتەوە، وەلیَ دوای رەفتارکردنەکانی کێچ دەکەوێتە کەوڵی و کینگڵ دەدات وسەری لیَ دەشوێنێت و زۆرجار رەفتاری ئیسقاتیانە[1] دەنوێنێ بەرامبەر خەڵك و لۆمەی خۆی و خەڵکیش دەکات، کە ئەمیش وەك فێڵێکی دەروونی بەکاردەهێنێت بۆ سرپۆشکردنی ئەو هەستە، ئەمیش پەیوەندی بەخودەوە هەیە بۆیە پێویستە مرۆڤ رۆژانە بەخۆیدا بچێتەوەو وبریار لەسەر رووداو کارکردنەکانی ئایندەی نەدات و گورۆتین نەکاتە هەوێنی کارەکانی، چونکە گورۆتین بەتەنهاو بێ گەرانەوە بۆ خود نەخشەی سەر ئاوەو سودی لێنابینریت و تەنانەت ئەو مرۆڤە خۆیشی نازانێت چ نەخشەیەکی کێشاوە بۆ خۆی و هەنگاوەکانی دوا رۆژی، مرۆڤێك کە لە حاڵەتی هەڵچووندا گۆزە پڕ هەنگوینە ساڵەها ساڵیەکەی بشکێنێ ئەوا کارەساتی بەسەر ویژدانی خۆیدا هێناوەو پەشیمانی فریای ناکەوێت، پەروەردە کاریگەری زۆری هەیە لەسەر بەگەرخستنی زیرەکی ویژدانی منداڵ و پەرەپێدانی تا ئەو ئاستەی کلیلی سەرکەوتنەکانی ژیان بەدەستەوە بگرێت، کەئەمیش بایەخدان بەخودو تێیدا گەشەپێدانی ویژدان بەرجەستە دەبێت، بەگوێرەی لێکۆڵینەوەکان زیرەکی ویژدان دەکرێت مەشقی لەسەر بکرێت و گەشەی پێبدرێت وراست بکرێتەوەو بەو شێوەیەی کە دەمانەوێ، رەنگە هەندێك

---

[1] کەسێتی ئیسقاتی "الشخصیة الاسقاطیة " ئەو جۆرە کەسانەن کەلەکاتی شکستدا هۆکاری ئەو شکستیەی خۆیان دەدەنە پاڵ خەڵکی دیکەو لۆمەی کەسانی تر دەکەن .

کەسیش لەم ڕووەوە لەگەڵماندا کۆك نەبن لەبەر ئەوەی ویژدان لەسەرەتای منداڵیەوە دروست دەبێت و دەخرێتە سەرپێ و بەکارهێنانی ئەو ویژدانەش پێویستی بەزیرەکی و تواناو راهێنان و پەروەردەی خێزان و دەوروبەر هەیە، بەڵام ئەزموونەکانی ئەمرۆی ژیانی رۆژانەوسوود وەرگرتن لە ئەزموونی کەسانی دیکە دەستێکی باڵای هەیە لەبەرەو پێشبردنی زیرەکی ویژدان، لەم رووەوە ئافرەتیش بەگوێرەی هەندێك لێکۆڵینەوە زیاتر زیرەکن وتوانای بەڕێوەبردنی هەڵچوونەکانیان زیاترەو لەرووی سۆزو و پەیوەندی کۆمەڵایەتیەوە بەهرەمەندترن و زێتر و زووتر پەی بەو هەستە دەبەن، بەگوێرەی لێکۆڵینەوەیەکی ئەمریکایی نوێ توانای زەینی ئافرەت لەگەڵ بەساڵاچوون زیاتر دەبێت، ئەمیش پێچەوانەی ئەو بۆچوونە باوەیە کە دەیگووت ئافرەت دوای تەمەنی بێزاربوون بیرچوونەوەی زیاتر دەبێت و توانای زەینی کەم دەبێتەوە، ئەو توانا زەینیەی ژنیش بێگومان کاریگەری هەیە لەسەر مامەڵەکردن و بەکارهێنانی زیرەکی ویژدان.

## خەمی ژن:

**با ژنەکەت گوزارشت لەدەردو خەمی لای تۆ بکات، ئەوە پرتەو بۆڵە نییە بەڵکو دەروزایەکە بۆ بەباکردنی خەمەکانی.**

دیاردەی خۆکوشتن ترسناکترین نیشانەکانی خەمۆکیە کەدەرەنجامی ئەوپەڕی بێزاری و نائومێدی و وێڵبوونی مرۆڤ بۆ ئاسۆی ژیان و بێ واتایی ژیانە، دیاردەی خۆکوشتن نەك تەنها لەنێو مرۆڤەکاندا بەڵکو لەنێوان باڵندەکانیشدا روو دەدات، لەم چەرخەدا لەنێو مرۆڤدا پتر رەگەزی مێ پەنا بۆ خۆکوشتن دەبات بەهۆی ئەوەی کەکەمتر گوزارشت لەخەمەکانی دەکات، تەنها هۆکارێکیش نییە بۆ ئەو دیاردەیە تەنها کاتێکی دیاریکراویش نییە بەڵکو هۆیەکانی خۆکوشتن دەگەڕێتەوە بۆ هۆکارە کەڵەکەبووەکانی سەراپای ژیانی ئەو مرۆڤە، کەناتوانێ بەرەنگاریان ببێتەوە، پاشان لەبێدەسەلاتی و بەدەنگەوە نەهاتن و گوێ بۆنەگرتنی خۆی دەکوژێ، ئەو هۆیانە بێزاری و نائومێدی و ناهاوسەنگی کەسایەتی مرۆڤەکە لەگەڵ سەرهەڵدانی هۆیەکی نوێ و راستەوخۆ کارەسات روودەدات، راست نییە کەدەڵێن فلانەکەس لەبەر فلانە هۆ خۆی کوشتووە، بەڵکو ئەو هۆکارەی کەدەڵێن بووەهۆی خۆکوشتنی ئەو کەسە، لەراستیدا دوایین هۆکارە کەبەشداری هۆیە کەڵەکەبووەکانی پێشتر دەکات، خۆکوشتنی ئافرەتان دەگەڕێتەوە بۆ دوو کۆمەڵە هۆکار، کۆمەڵی هۆکارە بابەتیەکان کەتایبەتن بەپێگەی ژن لەبەرهەمهێنان و دەرهاویشتەکانی ئەو پێگەیەو کاریگەریەکانی لەسەر چۆنێتی وەڵامدانەوەو پێشوازیکردنی گوشارەکانی دەوروبەر لەمێردو بنەماڵەی مێردو چۆنێتی کۆنترۆڵکردنی ئەو ژنە بۆ هەڵچوون و بارە دەروونیەکانی و رێلێگرتنی، ئەوەی گرنگ بێ مەسەلەی کەرامەت و رێزگرتنە لەنێوان ژن و

پیاودا، ئەگەر واقیعیانە بێت ئەوا دەتوانین بڵێین لەژیانی هاوسەرێتیدا ڕێزو کەرامەت زیاتر پیاو قۆرخی کردووە بۆ نموونە : پیاوان جوێن بەژنەکانیان دەدەن زۆریش لەو ژنانە وەڵامی جوێن نادەنەوە، بەڵام لەناخیاندا پەنگ دەخواتەوە، کاتێکیش پیاو یان ڕەگەزی نێر جوێن بەکەسێکی دیکە دەدات لەبەردەم ژنەکەی هەر ناوی خوشك و دایکی ئەو کەسە بەکاردێنێ کەجنێوەکەی بۆ دەنێرێ، نەك تەنها جنێوەکان لەگەڵ مرۆڤە بەڵکو زۆر جار شتێکی لێ یاخی دەبێ جنێو بەوشتەش دەدا بەپەنا بردن بۆ ئەندامی سێکسی بۆ نموونە کاتێك پلاکێکی کارەبای پێ چاك ناکرێتەوە ئەڵێ ئەمە چین دروستی کردووە هەی لەوەی چین بەم .

ژن بەراستوهەڵە ملکەچی پیاوەکەیەتی ئەو جۆرە پەیوەندییە، ڕۆژ بەرۆژ لەدڵی ئافرەتەکەدا دەمێنێتەوەو پەنگ دەخواتەوە، سەرەڕای بارودۆخی گوزەرانی خراپ و زۆری ژمارەی منداڵ وپشونەدان و عەرەقکردنی بەهۆی بەردەوامی کارکردنی لەموبەق و نەبوونی کاتێك بۆ دڵدانەوەی دەروونی خۆی و بەخۆداچوونەوەی و نەبوونی هاوڕێیەتی لەگەڵ دەستەخوشکەکانی سەردەمی منداڵی و گوزارشتکردن لەتەمەنی بەهاری تەمەن...تد

کاتێك هەڵوێستێکی نوێ دووچاری ئەو ئافرەتە دەبێتەوە لەگەڵ هۆیەکانی دیکە هەڵدەئاوسێن و ناخە پڕبووەکە دەتەقێتەوە لەسەر شێوەی خۆکوشتن.

فشارەکانی پیاوو دیدو بۆچوونە نەرێنەکانی باوی کۆمەڵ زۆرو جۆراوجۆرن لەسەر ئافرەت، بەڵام لەبەرئەوەی وردن و ڕۆژانەن ئافرەتەکە نایدرکێنێ و دەڵێ (قەیناکا چار چییە، واز بێنم لەپیاوەکەم ...دەبێ بچمە لای براژن و دانیشم...ئەویش هەر چار نییە...تد ) ئەگەر وەڵامیش بداتەوە لەوانەیە حاڵ بگاتە جیابوونەوەو تەڵاقدان، ئەم تەڵاقدانەش لەکۆمەڵگەی ئێمەدا دەبێتەهۆی سوك سەیرکردنی ئافرەتی تەڵاقدراو، بەڵام بۆ پیاوەکە تارادەیەك ئەهوەن ترە، ئەو نەدرکانە لەناخی ژنەکە کاردانەوەی خۆی هەیەو کۆدەبێتەوەو کورد واتەنی مێشێك دەبێتە گامێشێك، کەسێکیش نییە داخی خۆی بەسەردا بڕێژێ، وەکو مێردەکەی کەبەسەر ئەمدا دەیڕێژێ، تەنها گریان و فرمێسکە پەنای بۆ دەبات لەوانەشە لەم کاتەدا پیاوەکەی پێی بڵێت عەمرت نەمێنێ ژن... هەر بگری، دیسان ئەوەش سوکایەتیە بەو ئافرەتە، زۆرجار ئافرەتەکە ڕایەك دەردەبڕێت لەوانەیە ڕاستیش بێت بەڵام بۆ ئەوەی قسەی ژنەکە زاڵ نەبێت پیاوەکە ڕەتی دەکاتەوە، ئەمەش ڕەنگدانەوەی خۆی هەیە لەسەر دەروونی ژنەکە، هەرچەندە دەری نابڕێ، ئەو دەرنەبڕینەش دیسان کاریگەری خۆی هەیە لەسەر ئایندەی سایکۆلۆژی ئافرەت، زۆرجار لەنێوان

ژن و خێڵی مێرد حیساب بۆژن ناکرێت تەنانەت ماڵدارییش کەزیاتر لەسەر ژنەکەیەو پێشینانیش وتویانە ژنومالْ واتە کەوچکە چایەکیش کەپێویستی ناوماڵە لای ژنەکە وەکو ئەو تفەنگە وایە کە لای پیاو گرنگە، سەرەڕای ئەوەی ماڵداری وردەکاری زۆرتێدایەو راستەوخۆ ئافرەت هەڵسوکەوتی لەگەڵدا دەکات زۆرگرنگە، بەڵام پیاوەکە بەدیدوبۆچوونێکی ترەوە دەڕوانێتە ئەو وردەکارییەو هیچ بایەخێکی نییە لای ئەو، هەر ئەو وردەکاریانە کۆدەبنەوە، بۆیە خەمە وردەکانی مرۆڤ ئەگەر دەروازەیەك نەبێت رۆژانە دەری پەڕێنێت ئەوا لەسەر یەك کەڵەکە دەبن و دەبنە هۆی داخ و حەسرەت و لەدواجاردا لاڕێیەکی خواروخێچ دەدۆزێتەوە لەوانەش تاوانی خۆکوشتن یان دەرکەوتنی نەخۆشی و شڵەژانی دەروونی، پێکەنین کە خۆراکێکی سایکۆلۆژی رۆژانەیە کەچی بۆ ئافرەت یاسای لەسەر دانراوە وەکو: نابێ قاقا لێبدا، نابێ لەهەمو جێگایەك پێبکەنێ، هەرچەندیشە لەرووی سایکۆلۆژیەوە پێکەنین دەروازەیەکی گرنگە بۆ هەڵڕشتن وبەباکردنی خەمەکان.

هۆکارەکانی خۆکوشتنی ژن تەنها هۆکارە راستەوخۆکە نییە، بەڵکو هۆکارگەلێکی کەڵەکەبووی چەندین ساڵەی رابردووشە، کە تیایدا کۆبوونەتەوەو پەنگیان خواردۆتەوە بەهۆکارێکی راستەوخۆ دەتەقنەوەو هیچ هۆکارێکیش بە تەنها رۆڵی سەرەکی نابینێ، کە لەم چەند خاڵەدا کۆی دەکەینەوە:

١- هەستنەکردن بە ئاسایش و ئارامی دەورووبەرو تێڕوانینی رەشبینانەی ئافرەت بەرامبەر ژیان وەك هەر تاکێکی دیکە چ نێر بێ چ مێ، بەڵام ژن لەبەر پێگە کۆمەڵایەتیەکەی کۆمەڵگەی کوردەوەاری و نێرسالاری نەیتوانیوە وەکو نێر گوزارشت لەو رەشبینیەی خۆی بکات بەخۆکوشتن نەبێت، کەزیاتر خۆسوتانە، کە لەرووی میکانیکیەوە کارێکی ئاسانترە لەبەر ئەوەی ئامرازەکانی ئەنجامدانی لەبەر دەستدایە وەکو کەرەسەکانی موبەق و گەرماو لەتەباخ و پەرەمێزو سەرچاوەکانی سوتەمەنی و ئاگر و چەقۆو شتی دیکە، پیاو ژنی دووەم دێنێ تۆڵەی خۆی لە ژنی یەکەمی دەکاتەوەو گوزارشت لە بێزاربوونی خۆی دەکات، بەڵام ژن ئەمە ناکات، کە بەمەش هەلێك لە گەڕانەوە لەخۆکوشتن لەدەست دەدات، هەروەها ژن ناتوانێ وەك پیاو گوزارشت لە ئێش و ئازارەکانی رۆژانەی بکات، کە بۆی هەیە دەمانچە هەڵبگرێت، موبایل بەخۆیەوە ببەستێ، جگەرە بکێشێ و بخواتەوەو گەشت بکات،

بەبێ منداڵ بسوڕێتەوەو بگەڕێ، ئەمانەش بە بڕوای خۆی کەمێك لە خەمەکانی دەڕەوەێنێتەوە.

٢- ژن لە چوار چێوەی ماڵەکەی خۆیدا نەبێت پێویستی بەوەیە کە گرنگی پێبدرێ وەك هەر تاکێکی کۆمەڵگە تێر ناکات، هەندێك جار لە ماڵەکەی خۆیشیدا ئەو پێویستیە دەروونیەی تێر ناکرێت کە بەلایەنی کەمەوە پێی بڵێت دەست خۆش چێشتەکەت خۆش بوو، یان ئەمڕۆ بەردەوام و کاری ناوماڵەوە زۆر ماندوو بووی چونکە ئەم جۆرە سۆزپێدانە لای پیاوی کوردەواری دەگمەنەو ئەگەر سۆزیشی بۆی هەبێ ئەوا نایدرکێنێ کەژنەکەی دڵی پێ خۆش بێ ئەمەش هۆکاری سایکۆلۆژی خۆی هەیە لەوانەش نەوەك کەسوکاری پیاوەکە بەپیاوەکە بڵێن تۆ زاڵ نیت بەسەر ژنەکەتەدا، تێرنەبوونی ئەم پێداویستیە واتە دانانی پیاوەکە بەسۆزو خۆشەویستی بۆ ژنەکەی دەبێتە هەستکردنی ژنەکە بەکەمووکورتی و ڕەفتاری شەڕانگێزی، کە هەستکردن بەکەمووکورتی و شەڕانگێزیش پاڵی پێوە دەنێت سەرنجی دەوروبەر رابکێشێ بە هەر هۆیەك بێ، یان ئەوەتا ڕۆژانە شەڕو هەرا لەماڵەوە دەنێتەوەو پرتەو بۆڵە دەکات و گوێی لێدەگرن، یان شەڕو هەرا دەنێتەوە گوێی لێناگرن، بۆیە بێزار دەبێ و ژیان لە لای بێ مانا دەبێت و هەوڵی رزگار بوون دەدات.

٣-جەختکردن لەسەر خۆبەدیهێنان پێویستیەکی دەروونی ئافرەتە، ئەوپەڕی هەوڵی بۆ دەدات لەو چوار چێوەیە کە تیایدا دەژی، بەڵام ئەم چوارچێوەیە ئەو زەمینەیەی بۆ ناڕەخسێنێ، کە بگاتە ئەو ئامانجە ئەوە نەبێت کە پەنا بۆ ئارایشت و خۆجوانکردن ببات بۆ رازیکردنی دەوروبەر، هەندێکجاریش ئەمەیان بە گوێرەی پێویست بۆی ناچێتە سەر بە هۆی رکابەری هەستی جوانی لەلایەن ئافرەتانی دیکەو دڵپیسی لە پیاوەکەی .

٤- تێرنەبوونی هەستی ئینتیمابوونی بۆ خێزان و دەوروبەر، کە رەنگە لەبەر ئەوە بووبێ منداڵی کوڕی نەبێ چونکە بوونی رەگەزی نێرینە لەنەستی کۆمەڵگەی کوردەواری رەگی داکوتاوەو نەوە دوای نەوە گوازراوەتەوە هەرچەندیشە تاکەکان وانالێن ئەوە تەنها بۆ ئەوەیە کەلەگەڵ سەردەمدا دەگونجێن بەڵام لەسایکۆلۆژیەتی مرۆڤدا سەردەم لەگەڵ نەستی کۆمەڵایەتی ناکۆکن، یان پەیوەندی لەگەڵ کەسوکاری پیاوەکەی لاوازبێ، یان رێز لە خۆی نانێ بەهۆی هەستکردنی کە ئەو گۆشەگیرە ودەوروبەر لێی رازی نین.

٥-کەڵەکەبوونی کێشە دەروونی و کۆمەڵایەتیەکان، کەپێشتر بەبێ چارەسەر بەجێی هێشتوون و لە نەستیدا باوك سالارێتی گەمارۆی داوەو پەنگی خواردۆتەوە، کێشە دەروونیەکان دەگەڕێنەوە قۆناغی پێشووتر کە هەر کچ بووە لە هەمان کۆمەڵگەی نێر سالاری، کە لەگەڵگەورەبوونی زیاتر گەورە دەبێت، چونکە تا گەورەتر بێ دەبێ کوێرانەو زیاتر پابەندی دابونەریتی کۆمەڵگەی بێت.

٦-هەڵاتن لە ژیان و بەرگەنەگرتنی بەهۆی ماندووبوون و ئیرهاق و نەبوونی کاتێك بۆ بەخۆداچوونەوەی خوودو چێژوەرنەگرتن لەژیان و هەستکردن بەبێ واتایی ژیان و هاوکارینەکردنی لەلایەن ئەندامانی دیکەی خێزانەوە .

٧ تۆڵەسەندنەوە لەدەورووبەر وەك پەرچە کردارێك بۆ ئەو چەوسانەوە کە رۆژانە دەیبینێ و کەسێك نەبووە گوێی لێ بگرێ و خەمەکانی بەبادا بکات .

٨- هەستکردن کە ئەو وەکو پێویست نییە بۆ کۆمەڵگە بەتایبەتی لە کاتی خۆ بەراورد کردندا .

٩- بەنازپەروەردەکردنی لە قۆناغی منداڵی و لە دەستدانی ئەو نازە لەماڵی پیاوەکەیدا .

١٠- میدیاودەزگاکانی و بڵاوبوونەوەی هەواڵەکانی خۆسوتان هۆکارێکە بۆ بیرکردنەوەی ژن لەخۆکوشتن، بیرکردنەوەش لە خۆکوشتن ئەگەرەکانی ئەنجامدانی نزیك دەکاتەوە.

١١- لاوازی کەسێتی ئەو ژنەی خۆی دەکوژێت و ددان بەخۆدانەگرتنی و خۆکۆنترۆڵنەکردنی بەرامبەر کێشەکانی رۆژانە، نابێ ئەوەشمان لەبیر بچێت کە هەر ژنەو کۆمەڵە هۆکارێك پاڵی پێوە دەنێت، رەنگە جیاواز بێت لە کەسێکی دیکە، بەڵام سەرجەم هۆکارەکان لەدەورووبەری (خود) دا دەخولێتەوە، کە پێویستە خۆی بدۆزێتەوەو خۆی بەدی بهێنێ ....تد

## نزیکترین دادگای ژن و مێرد:

**کەسی سێیەم، نێوان ژن و مێرد ئاڵۆزتر دەکات**

هیچ خێزانێك بێ کێشەو گرفت نییە، لەوانەشە ئەو گرفتە ئابوری بێت یان کۆمەڵایەتی یان تەندروستی ...تد

ئەگەر ئەو گرفتانەش چارەسەر نەکران ئەوا ئەوە ناگەیەنێت ئیتر پیاوەکە، یان ژنەکە نێوانیان ناکۆك بێت، چونکە بەو ناکۆکیە هەرگیز کێشەکە چارسەر ناکرێت، واتە گرفت بەگرفت چارەسەر ناکرێت، بەڵام گرفتی باوی نێوان ژن و مێرد زیاتر پەیوەندی بەباری دەرونیەوە هەیە وەك:

نەگونجان، لێکحاڵی نەبوون، دیواری دەرونی، نەبوونی دیبلۆماسیەت (واتە شێوازی باوی سەردەم) ئەمەش زیاتر پەیوەندی بە کەسێتی ژن و مێردەوە هەیە.

ئەوەی لەم جۆرە کێشە سایکۆلۆژییانەدا قورەکە خەستر دەکات ئەوەیە ژن و مێرد بەبێ بەرنامە پەنا بۆکەسی سێیەم (ناوبژیوان) دەبەن بۆ چارەسەری کێشەکەیان، لەراستیدا ناوبژیوان بۆ ئەوە دەبێت خەرمانێك یان میراتێك لەنێوان دووکەس بەش بکات، نەك دابەشکردنی کێشەی سایکۆلۆژی نێوان ژن و مێرد کەدەبێتە هۆی دابەشکردنی هەستەکانیان، ئەو هەستەی کەهەر لەگەڵ پەیمان بەستنی هاوسەرێتیەوە کە دووپارچە هەست بوون، بوون بەیەك، لەسۆنگەی ئەوەوە کەشەڕی نێوانیان سایکۆلۆژییە کەواتە ڕێز نەگرتن، لێکحاڵی نەبوونە هاتۆتە ئاراوە، تەنها خۆشیان لەزمانی ئەو هەست و نەستە تێدەگەن، چونکە هەستەکان پێکهاتەی تەمەنی هاوسەرێتی و واتاییەوە زمانی هاوسەرێتی ڕەنگ دەداتەوە، کەواتە کێ دەڵێ ناوبژیوان لەو زمانە تێدەگا؟!زمانی ئەوان بێدەنگەلەبەرئەوە بۆئەوە نادوێ تا کەسی

دیکە لێی تێبگات ناوبژیوانیش کەزمانی ئەوان نەزانێ دەبێ ژن و مێرد دەستبەرداری هەست ونەستی خۆیان بن بۆ ئەوەی ناوبژیوان لێی تێبگا، کەلەو بازنەیەش دەرچوون مانای وایە پیرۆزی هاوسەرێتی پێشێلکراو کلیلی چارەسەری کێشەکانیان دایە دەستی کەسانی دیکەو ماوەیەکی دوور لەخۆیانی بزر دەکەن، بەڵام باپرسین ژنومێرد بۆ لەو بازنەیە دەردەچن؟هەموو مرۆڤێك هەق بۆلای خۆی رادەکێشێ، کەواتە کێ لەسەر هەق نییە؟

لەراستیدا هاوسەرێتی قوربانیدانە لەپێناو خێزان و کۆڵەگەی گرنگی کۆمەڵەو پیرۆزی پێ دەبەخشێت و پاشان بەهۆیەوە تاکەکان ئارام دەبنەوەو ئۆقرە دەگرن و کۆچ ناکەن بەرەو نامۆبوون، بۆیە پێویستە ژنومێرد تارادەیەك دەستبەرداری هەندێ لەداخوازی و شتەکانی خۆیان بن لەپێناو بنیاتنانی هەستی خێزانداری، کەواتە پێویست ناکات پەنا بۆ کەسی سێیەم ببەن، چونکە کێشەکانیان نە ئابووریەو نەبازرگانی و نە تەندروستی جەستەیی، لەبەرئەوە ناوبژیوان لەو زمانە تێناگات، چونکە لەئاکامی دەخالەتی ناوبژیوان ژن و مێرد ناچار دەبن زمانی هەست و نەست کەشێوازی پەیوەندیەکانیانە بشارنەوە، چونکە ناوبژیوان لێی تێناگات بۆیە یەکتر تاوانبار دەکەن بۆئەوەی هەریەکەیان زووتر رەزامەندی ناوبژیوان بۆ خۆی وەربگرێت، پاشان دانان بەهەڵەکردن کارێکی هێندە ئاسان نییە، نەخاسمە لەبەردەم کەسی سێیەم کەناوبژیوانە بۆیە یەکتر تاوانباردەکەن، کاتێك ژن یان مێرد نەتوانێ گوزارشت لەدەردو خەمەکانی بکات پەنا دەباتە بەر شتە کۆن و رابردووەکان کورد واتەنی کای کۆن بەبادا دەکات، لایەنی دووەمیش ناچار دەبێت وەڵامی کۆنەکە بداتەوە کەواتە لەبەردەم ناوبژیوان شتەکۆنەکانیش زیندوو بونەوە، بەو شێوەیە هەنگاوێك گەڕانەوە دواوە.

هەورەها هەریەکە لەژنومێرد لەکاتی سەرنەکەوتنیان لە بەردەم ناوبژیوان پەنا بۆ شتی ناڕاست و هەڵبەستراو دەبەن ئەمەش دەبێتە هۆی ئەوەی یەکدی پتر بریندار بکەن و زیاتر دوور بکەونەوە، کەواتە دان بەخۆیاندا بگرن و ماڵی خۆیان باشترین و نزیکترین دادگایە، باشتریش وایە هەردووکیان پرۆتۆکۆلێك لەنێوان خۆیاندا مۆربکەن بەناونیشانی (ئەگەر توڕەبووم هەموو شتێك ناڵیم) بۆئەوەی توانای پاشگەز بوونەوەت هەبێت و لایەنی دووەمیش بەشێوەیەك بریندار نەکەیت گەڕانەوەی ئەستەم بێت، چونکە توڕەبوون رەشەبایە پێش ئەوەی ماڵەکەت تەفروتونا بکات خۆت قایم بکەی باشترە، جارناجارێکیش شەڕی ژن ومێرد پێویستە بۆئەوەی دڵی پڕبوی ژیانیان خاڵی بێتەوەو کەفوکوولێش دامرکێننەوە.

## بازرگانی ژن:

**دەرکردنی نێرەکان لەلایەن باوکی تەوەتەمیەتەوەو هێشتنەوەی مێیەکان لەماڵەوە ژنی لەبازرگانی و کاری دەرەوە دوورخستەوە.**

دابەشکردنی کار لەنێوان ژن و پیاو لەگەڵ سەرهەڵدانی موڵکداریێتی تایبەتیەوە سەریهەڵداوە ئەگینا لەمێژوودا و لەقۆناغی سەرەتای کۆمۆنەی سەرەتایی کە موڵکداریێتی تایبەتی نەبووەو سەرجەم ئامرازەکانی کارکردن موڵکی هەمووان بووەو دەسکەوت و داهاتی رۆژانەش ماڵی هەمووان بووەو وەکو یەك دابەشکراوەو کەس بێبەش نەبووەو کەس نەیگووتووە ئەمە هی منەو ئەوەیان هی تۆیە، هەر ئەمەش بوو وایکرد مرۆڤ مرۆڤێکی تر کۆیلە نەکات بۆ کارەکەی یان سامانەکەی، بەڵام لەگەڵ کۆتایی قۆناغی کۆمۆنەی سەرەتایی و سەرهەڵدانی قۆناغی کۆیلایەتی و کۆیلەکردنی مرۆڤدا ئافرەتیش وەك هەر مرۆڤێکی تر کۆیلەیەك بوو لەو کۆیلانە کەکەسانی بەهێزو بەتوانا لەپێناو کارو سامانیدا بۆ خۆیان قۆرغیان دەکردو رەوتێکی سایکۆلۆژیی وایان بەبالآیدابڕی کەدەبێ پاشکۆی پیاو بێ لەپێناو داهاتەکەی، بەڵگەش بۆ ئەم پاوانکردنەش لەکۆمەڵگەی تەوتەمیزمدا دەردەکەوێ کاتێك باوك هەموو کوڕەکان (نێرەکان) ی وەدەر نا بۆ ئەوەی کەسیان توخنی ژنەکانی نەکەوێ و هەموو ژنەکانی بۆ خۆی قۆرغ کردو هەموو داهاتی ئەو ژنانەش هەر بۆ خۆی بوو ئەمەش رکوکینەیەکی سایکۆلۆژییانەی نێوان باوك کوڕ درووست کرد کە هەوێنەکەی زەوتکردنی سایکۆلۆژییانەی ژن بوو لەلایەن باوکی دەسەلآتدارەوە، دیارە داهاتەکەش زیاتر مەبەست بووە، بەمەش قۆناغی کۆیلایەتی زیاتر

بەرجەستە بوو لە کۆیلەکردنی مرۆڤ و بەتایبەتیش ئافرەت و بەستنەوەی بە پارێزگاریکردنی منداڵ لەماڵەوەو کردنی ژن بەلایەکی هاوکێشەی درووستکراوی (ژن و ماڵ و منداڵ) و دوورخستنەوەی نێرەکان بۆکارکردن لەدەرەوە لەلایەن باوکی تەوتەمیزمەوە، بەستنەوەی ژن بەو هاوکێشەیەوەو نەبەستنەوەی پیاو پێوەی کە نەوتراوە (پیاو و ماڵ و منداڵ) بەڵگەی بەستنەوەی سایکۆلۆژییانەی ئافرەتە بە شێوەیەکی چەوسێنەرانە بە ماڵەوەو دوورخستنەوەی لەبازرگانی و دەرەوە هەم لەدیدی خۆیەوەو لەدیدی نێریشەوەو بووەتە بەشێك لەلاشعوری پیاوی رۆژهەلاتی و تا ئەم قۆناغەش هێشتا هەر کاریگەرەو نازانرێ تاچەند سەدەی دیکەش بڕدەکات ئەمە رەنگە پرسیارێکی بێ وەلام بێ .

لەقۆناغی دەربەگابەتیشدا کاری مرۆڤ بەشێوەی گشتی قۆرغ کراوەو کاری ئافرەتیش یەکێك بووە لەو پرۆسەی قۆرغکردنە بۆ زەوتکردنی سەروەت و سامانەکەی و زەوتکردنی وەچەکانی لەلایەن دەسەلاتی پیاوەوەو ئەمەش دەروازەیەکی تر بوو بۆ چەسپاندنی هزری نێرسالاری، کەبەشداری کرد لەئاواکردنی خۆری ئازادی ئافرەت و و خستنییە ژێر رکێفی پیاوەوەو درووستکردنی هەستی خۆبەکەم زانین و هەستی مانەوە لەماڵەوە، بەلام لەگەڵ تێکشکانی دەرەبەگایەتی وروخانی ئیمبراتۆریەتەکانی دونیا بەتایبەتیش ئیمبراتۆریەتی رۆما و سەرهەڵدانی جۆرێك لەئازادی و رزگاربوونی کۆیلەو نەبەستنەوەی بە زەویەکەوەو سەرهەڵدانی پیشەسازی بچووك و کۆچکردنی تاکەکان بۆ کارکردن لەشارەکان، کە تیایاندا پیشەسازی بەشێوەیەك لەشێوەکان دەرکەوتبوو، بەهۆی ئەم پیشەسازیەشەوە جۆرە ئازادییەك بۆ ژن هاتە کایەوە لەکارکردن و رزگاربوونی لەکۆیلایەتی و سەربەخۆیی لەداهات و پاشان سەربەخۆیی لەهەڵچوون و سۆز، بەلام ئەمە زیاتر لەکۆمەڵگا رۆژاواییەکاندا بوو کە زووتر پیشەسازی تیایدا سەری هەڵداو بەسەردەمی رێنیسانس واتە راپەڕین ناسرا، کەئافرەت ئازادی کارکردن و سەربەخۆیی داهاتی بۆ هاتە ئاراوەوچیتر پاشکۆی پیاو نەما بۆ بژێوی ژیان و خۆی توانی خۆی بژێنێ و بەتایبەتیش دوای سەردەمی رێنیسانس و پچڕانی پەیوەندی وابەستەبوون بەپیاو، لەکۆمەڵگا رۆژهەلاتیەکانیشدا هێشتا شوێنەواری کۆیلایەتی و ترساندنی لەلایەن پیاوەوە بەناوی ئابڕووەوە و کەوتنە ژێر رکێفی پیاو هەر تیایدا ماوەو نەیتوانیوە ئازاد بێ و بۆ بازرگانی دوور بکەوێتەوە و لەشوێنێکی دوور کار بکات، بەلام رەنگە ئازادییەکی رێژەیی لەملاو ئەولاوە پەیدابووبێ لەکارکردن شان بەشانی پیاو لەبواری پەروەردەو پزیشکی و

تەندروستی و بۆشاییگەری و سەربازی و چەند بوارێکی تر، کەچی پرسی بازرگانی سنورەکەی زۆر دیاریکراوە بەتایبەتیش لەولاتانی رۆژهەلات، کە بازرگانی دەرەوە زیاتر سنوردارە لەبازرگانی ناوخۆ، چونکە لەناوخۆدا ئافرەت توانیویەتی تارادەیەك بەشداری جۆرەبازرگانییەکی ناوخۆ بکات بەپێی ئەو سەرمایەی دەستی کەوتووە ئەمەش بۆ رێژەیەکی کەمی ئافرەتان، چونکە ئافرەت لەکۆمەلگەی کوردستاندا ئێستاش بەدوای زەمانەتی مانەوەو رەوینەوەی ترس لەجیابوونەوە دەگەڕێ کە ئەویش بۆ ئەو هەلگرتن و کۆکردنەوەی زێڕو زیوە بۆ رۆژانی تەنگانە، ئەو هەلگرتنەش لەمالەوە زیان بەسامانی ولات دەدات لەجیاتی بازرگانیکردن و کاری سەرمایەگوزاری پێوەی کە ئافرەت لەوە دەترسێ ئەوەش لەدەست بدات و ترسیش دێوەزمەیەکە بەئاسانی لەکۆل ژن نابێتەوەو لەسەر کەسێتی رەنگی داوەتەوەو بووەتە بارێکی سایکۆلۆژیی و بەسەریدا زالەو ئەوەیشی لەمێشکیدا گەلالە کردووە کە سەوداسەری و بازرگانیەکەی مسۆگەر نابێت بەبێ رێنوێنی پیاوەکەی و وەکو پیاو، پیاوێکی بازرگان ئەگەر زەرەیش بکات (دەلێ بەگونەوە) دەتوانێ داوای قەرز بکات کە ئەمە حالێ حازر بەئافرەت ناکرێت ( دەبێ ئافرەتیش هەر وا بلێ ) لە کۆمەلگای ئێستادا، بۆ ئایندەش وەلامەکە لەسەر ئایندەخۆیەتی، چونکە ئەو پارەو زێڕەی لەرووی وەبەرهێنانەوە بێکەلکەو سوودی لێنابینرێ و من پێم وایە ئافرەت لەم روانگەیەوە هێشتا نەیتوانیوە ئەو زێڕەی بفرۆشێ و بیخاتە بازرگانییەو ئەگەر بشیخاتە بازرگانییەوە رەنگە وەك پشك بەشداری ئەو کاریی بازرگانییە بکات و نەتوانێ ئەدای وەك ئەدای پیاو بێ ئەمیش دەگەڕێتەوە بۆ کلتوری کۆمەلایەتی و ئەو قۆناغە کۆمەلایەتیەی کە تاکی کوردی تیایدایەو ئەگەر لەمبارەیەشەوە زێرو زیوی نووستووی ئافرەتان لەکوردستان بخەملێنین رێژەیەکی زۆرەو گونجاوە بۆ کاری وەبەرهێنان و سوودی بۆ داهاتی نیشتمانیش هەیە، بەلام ئەمە تەواو پێچەوانەیەو هۆکارەکەشی ئەو قۆناغە کۆمەلایەتیە ئابورییەیە، کە کۆمەلگای کوردستان تیایدایەو ئەم مەسەلە بازرگانییەش رێك وەك مەسەلە کۆمەلایەتی و دەروونیەکەی ئافرەتە کە پێگەو رۆلی لەکۆمەلگەی ئێمەدا هێشتا نەگەیشتۆتە ئاستی پێویست و هێشتا لەمبارەیەوە مشتومڕ نەبڕاوەتەوەو مێژووی کۆمەلایەتی قسەی خۆی دەبێ و خودی قۆناغەکە شێوازێك دەسەپێنێ کە پەیوەندی بەباردۆخی بابەتیانەوە دەبێ .

کەواتە قۆناغی کۆمەڵایەتیش شێوازی بیرکردنەوەو رەفتاری کۆمەڵایەتی و هزرو تێڕوانینی مرۆڤ و ئاسۆو بوون و شێوازی هەڵچوونەکان و سۆزو پەیوەندییە کۆمەڵایەتیەکان دیاری دەکات، بەو پێیەش ژن لەکۆمەڵگەی ئێمەدا لەقۆناغێکدایە کە رەنگە نیوەی زیاتری لەرەگەزی نێر لەهەندێ بواردا کاربکەن لەئەنجانی جۆرێك لەپێشکەوتن و گونجاندنی بەگوێرەی قۆناغەکە لەبواری پەروەردەو تەندروستی و شتی تر، بەڵام ئایا ئەم رێژەیەی ژنان بەرامبەر بەپیاوی بازرگان دەبێ چەند بێ؟ زیادەڕۆییم نەکردووە ئەگەر بڵێین ٪٥یش نابێ، بەڵام لەبواری پەروەردەو تەندروستی و دام و دەزگا خزمەتگوزارییەکانی دەوڵەت ئەم رێژەیە زۆر جیاوازە، چونکە لەبواری پەروەردەو تەندروستی ژن لەپیاوەوە نزیکەو دەگەڕێتەوە ماڵەوەو پیاو غیرەی لێناکات و ئاگاداری منداڵ و ماڵەکەی دەبێ و سۆزو خۆشەویستی خۆی بەوان دەدات و خۆیشی لەو سۆز بەخشینە تێردەبێت کە پێویستیەکی دەروونی مرۆڤەو ئافرەت لەماڵەوە تێری دەکات، پرسیارەکە لێرەوە سەرهەڵدەدات ئایا کاری بازرگانی رێگە لەم تێربوونە ناگرێت و وا لەژن ناکات بیروهۆشی لای ماڵ و منداڵی بێ و پڕ دڵەراوکێ بێ ؟ ئایا پیاو بەکردەوە نەك بەبۆچوونی تیۆری کە هەمومان وەك پیاو بەڵێ بۆ کاری ژن دەکەین بیروهۆشی لای ژنەکەی نابێ و بەئاسوودەیی دەخەوێ کە ژنەکەی بۆ کاڵایەکی بازرگانی چەند رۆژێك لێی دوور بێت؟ ژن دەبێ دەستبەرداری بەخێوکردنی منداڵ بێ ئەمەش هێشتا قبول نەکراوە بەتایبەتی لەدەوڵەتی ئێمەدا کە هێشتا دەوڵەت نەیتوانیەوە وەکو وڵاتانی سۆسیال دیموکرات بەخێوکردنی منداڵ لەئەستۆ بگرێ و ژن بیرەهۆشی لای منداڵی نەبێ و پیاوەکەی لەحەیاو حورمەتی نەترسێ و بەرگەی تیروتوانجی دەوروبەر بگرێ ؟

یان ئەم مەسەلەیەش بەستراوەبەرادەی گۆڕانکاری و ئاساییبونی پرسی بارزگانی وەکو پرسی پەروەردەو میدیا و سلکی پۆلیس و سیاسەت و پەرلەمان کە ژن کەم تا زۆر رۆڵی خۆی هەیە، ئایا کۆمەڵگە چۆن سەیری پرسی بارزگانی ژن دەکات؟ئایا تێڕوانینی پیاو بۆ کاری ژن هەمان تێڕوانینێتی لەبواری میدیا کە تائێستاش ژمارەیکی کەمی ژنان هەرچەندیشە ئارەزووی دەکەن خۆیان لەقەرەی کاری میدیا بەپێی پێویست نادەن؟ئایا چۆنێتی بیرکردنەوەی ژن کار لەئەدای بازرگانی دەکات؟کارکردنی ژن لەهەر بوارێکدا لەسەرەتاوە چۆن پیاو تێی روانییەوە و لەکۆتایشدا لێی راهاتووە لەوانەش بواری میدیا و پەروەردەو سەربازی و پزیشکی و هەواڵگری و کشتوکاڵ و پیشەسازی و ..تد ئاواش لەگەڵ پەرەسەندنی کۆمەڵایەتی و بڕینی

قۆناغە کۆمەڵایەتیە ئابوریەکان تێڕوانینی بەرامبەر بازرگانی ژنان دەگۆڕێ و لەهزرو دەروونی پیاوو کۆمەڵگەدا جێی دەبێتەوە، وەلی ئەم هەویرە ئاو زۆر دەکێشێ!چونکە ژن هێشتا سەرقاڵی بەخێوکردنی منداڵەو ئەو ئەرکەی لەسەر شانە کە لەزۆر کۆمەڵگەکانی دونیادا ئەرکی بەخێوکردنی منداڵ تارادەیکی زۆر لەسەر شانی ژن لاچووەو گرنگی بەدایەنگەو باخچەی ساوایان دراوەو بۆ ژن ئاساییە منداڵی نەبێ و کەس فشاری ناخاتە سەر و لەبەر ئەوەش کات و ماوەی زۆرە بۆ کارکردن و سەفەرکردن و ئازادیشی زیاترەو دڵەراوکێشی کەمترەو دەتوانێ هزرو توانای خۆی بەکاربێنێ، بەڵام ئەمە لای ئێمە نییە، هاوکات بەدیلی ئەمە هەیە لەنیمچە بازرگانی ناوخۆ وەکو کردنەوەی کارگەیەکی دوورمان یان کردنەوەی کێڵگەی بەخێوکردنی پەلەوەر یان کردنەوەی فابریقەیەکی درووستکردنی ئامرازی پیشەسازی و رستن و چنین یان کردنەوەی کارگەیەکی رستن، بەڵام بازرگانی بەو مەفهومەی کەباوە وەك پەیوەندی بەجیهانی دەرەوەو راپەراندنی کاری بازرگانی و رووکردنە وڵاتان بەستراوە بەپەرەسەندنی کۆمەڵگەو گەیشتن بەو قۆناغەی کە ئەو وڵاتانە پێیگەیشتوون لەرووی بازرگانی ژنانەوەو باوەڕناکرێ لەو رووەوە ئێمە بگەینە ئەوان، چونکە کلتوری کۆمەڵگەی ئێمە جیاوازەو پیاوی رۆژهەڵاتی قبول ناکات ژنەکەی یان خوشکەکەی بۆ بازرگانیکردنی دەرەوە بچێ بۆ وڵاتێکی ئەوروپاو لەوێ چەند رۆژێك بمێنێتەوە، چونکە پیاوی کۆمەڵگەی ئێمە ئەگەر ئارەزووی سێکسی کرد ناتوانێ بچێ رابوێرێ لەگەڵ یەکێکی تردا و ئەمەش خیانەتە، بۆیە بەلایەوە ئاسایی نییە ژنەکەی بۆکاری بارزگانی بچێتە دەرەوەی وڵات و ژنەکەشی وەك هەر موڵکێکی تر بەموڵکی خۆی دەزانێ و دڵنیا نییە کە کەس توخنی ناکەوێ، ئەم دڵنیانەبوون و گومانە لەمێشکی پیاوی رۆژهەڵاتی دەخولێتەوەو هیچیشیان دانی پێدا نانێن وهەر ئەمەشە وایکردووە ژن دوور بێ لەکاری بازرگانی و خۆئاخنین لەکاری بازرگانییش بەندە بەئایندەوە.

## ژن و پیاو:

**مرۆڤبوون، نەك مێبوون یان نێربوون جیاوازی لەنێوان ژن وپیاو درووست دەكات، ئەمیش پەیوەندە بەجیاتاكییەوەیە نەك رەگەز.**

نەك ژن و مێرد بەڵكو هەموو دوو مرۆڤێك لەژیاندا لەهەر كوێیەك و لەهەر سەردەمێكدا بگوزەرێنن بیروڕایان هەر چییك بێ جیاوازیان هەیەو مەرج نییە سەد دەرسەد پێكەوە هەڵبكەن، سەرچاوەی كێشەكان لەوەوە سەرهەڵدەدەن، كە ژنومێرد وابزانن دەبێ سەد دەرسەد پێكەوە هەڵبكەن، ئەمە هەستێكی هەڵەیە، چونكە هەڵكردنی پێكەوە سەد دەرسەد مەحاڵە، ئەگەر هەر ژن و مێردێكیش چاوەڕێی ئەو پێكەوە هەڵكردنە بن، راست نییە، بەڵام ژن بەهۆی هۆرمۆناتی مێینە زیاتر ناز دەكات و هەڵگرتنی ئەو نازە لەسەر پیاوە، زۆرجاریش دوو منداڵی جمكیش لەبەرئەوەی جیاوازیان كەمە كەمتر ئارەزووی یاریكردن لەگەڵ یەكتر دەكەن، تۆژینەوەكان ئەوەیان سەلماندووە منداڵی ناجمك لەمنداڵی جمك باشتر پێكەوە هەڵدەكەن چونكە تەواكەری یەكتر دەبن بەهۆی ئەو جیاوازیەی هەیانە، لەبنەڕەتیشدا هەردووك (نێرومێ) هەروا خوڵقاوون، هۆكاری ناكۆكی نێوان ژنومێرد تەنها ئەم جیاوازی و بۆچوونی بەرامبەر جیاوازییە نییە، بەڵگەگەلێك هۆكاری دیكەی سەردەمیانە هەیەو كاریگەی خۆیان دەكەن لەوانەش كێشەی كەموكورتی ئابوری، كەپێویستیەكانی شارستانیەت و سەردەمی تەكنۆلۆژیاو گەشتوگوزار تێرنەبن و كاسەكە بەتاڵ بێ پێكەنینیش نایەتە ئاراوە، نایەكسانی ئاستی كۆمەڵایەتی، گرفتی دەروونی كەخۆی لەم هەستانە بەرجەستە دەكات

-هەستی هەڵە، کاتێك ژن یان پیاو وەك تاك گفت و رەفتاری بەرامبەری بەهەڵە دەخوێنێتەوە لەئەنجامی جیاوازی بیرکردنەوەو کلتوری ژیانیان، کەرەنگە جۆرە کردەوەیەك یان رەفتارێك لەبنەڕەتدا هەڵە نەبێت یان ئەو مەبەستە نەبێت کەبەرامبەر بەهەڵە تێیگەیشتووە، خۆئەگەر هەڵەش هەبێ ئەوا بەرامبەر هەڵە لێخۆشبون هەیە، لێخۆشنەبوونیش ناکۆکی زیاتر دەکات

-لێخۆشنەبوون لەهەڵەی یەکدی، ئەمەش دەگەڕێتەوە بۆ کلتوری تاك و کلتوری کۆمەڵ کەزۆر لەتاکەکان باوەڕیان بەلێخۆشبوون نیەو ئارەزووی تۆڵەسەندنەوە دەکەن یان هیچ نەبێ لەگەڵ ئەو کەسەی هەڵەی کردووە بەرامبەریان ئاشت نەبێتەوەو گەردنی ئازاد نەکات، یان کلتوری ئەو کۆمەڵەیەی تێیدا دەژی واپێویست دەکات لێی لانەدات و گوێڕایەڵی ئەرێیانەی ئەوان بێت، ئەمیش پەیوەندە بەبیرکردنەوەی نەرێیانەی تاکەوە چونکە هەستی تاك زۆرجار وا دەخوازی یان وافێرکراوە نەرێیانە بیربکاتەوەو ئەمیش لەرەفتارەکانیدا رەنگ بداتەوەو هەموشتێك بەنەرێنی وەربگرێ، ئەو کەسانەشی یان راستر ئەو ژن ومێردانەی کەبیرکردنەوەی نەرێنی بەسەریاندا زاڵە ئەوا ناکۆکی نێوانیان زیاتر دەبێ، چونکە بیرکردنەوەی نەرێنی کەسێك رەنگە کار لەکەسێکی دیکە نەکات ئەگەر ژن و مێرد نەبن، بەڵام ژن ومێرد بەهۆی گوزەرانی بەردەوامی لەگەڵ یەکدی ئەوبیرکردنەوانە پتر دەردەکەن وکار لەژیانی عەمەلی دەکات و رێ خۆش دەکات بۆ دەستتێوەردانی کەسانی دیکەلەژیانیانداو تێکدانی پەیوەندی ژن و مێردانەی نێوانیان، چونکە دەستتێوەردانی کەسانی دیکە دەچێتە ناو ئەو هەستانەی ژن و مێردایەتی کەتەنها خۆیان دەیزانن ئەگەر کەسێکی دیکە هاتە ناومەسەلەکەوە بەئەهوای خۆی هەنگاوی بۆدەنێ و لەمانیشی تێکدەدات، رەنگە کەسی سێیەم مەبەستیشی ئەرێنی بێ، بەڵام هەستی ژن و مێردایەتی ئەو هەستی سێیەمە قبول ناکات، بۆیە هەر دەخالەتکردنی مەسەلەکە گەورەتر دەکات و نێوانیان فراوانتر دەکات، ئاشکرایە یەکێك لەئەرکەکانی هاوسەرگیری لایەنی سێکسی و تێرکردنێتی کەئەمیش پێویستیەکی بنەڕەتیە لەپێویستیەکانی مرۆڤ، بەڵام تێرنەکردن و فەرامۆشکردنی ئەم لایەنە رەنگە ناهاوسەنگی لێبکەوێتەوە نەخاسمە ئەگەر لایەنێکیش ساردی سێکسی هەبێ ئەوا ئەوی دیکە رەنگە وانەبێ، ئەم ناهاوسەنگی لەخودی خۆیانداو لەپێوەندی نێوان هەردوولا ناکۆکی ونەخۆشی سێکسی دروست دەکات، بەڵام رەنگە دان بەوەشدا نەنرێت کەئەمیش خۆی لەخۆیدا گرفتە، باوەڕیش ناکەم لەکۆمەڵگای ئێمە ئەگەر حاڵەتی لەو جۆرەش هەبێ تاك زاتی ئەوە بکات سەردانی پزیشکی تایبەت بکات، بەهەمان

شێوە پێویستیە مادیەکان هەر لەپێویستیە کەمالی و جەمالیەکانەوە تاتەواوی پێویستیە شارستانیەکان لەئۆتۆمبێل و خانوو و شتی دیکە هۆکاری ناراستەوخۆی ناکۆکی پەیوەندی نێوان ژن و مێردن، هەرچەندە لەوانەیە ژن ومێرد دان بەوەدا نەنێن کەپێویستیە مادیەکان گرفت بن لەرێیاندا، بەڵام گوشاری تێرنەکردنی ئەم پێویستیانە دەچێتەسەر پێویستیەکانی دیکە کاریگەری خۆی لەدڵ و دەرونی ژن ومێرد دەکات و بەرەفتاری رۆژانەیانەوە دیاردەبێت، پیاو یان ژن ئەگەر وشیاربن سەبارەت بە واتای ژیان بەگشتی و واتای ژیانی هاوسەرێتی بەمنداڵ و بێ منداڵیش و فەلسەفەی خۆیان هەبێت بۆژیان و نەکەونە ژێرکاریگەری سێیەم کە لەدەرەوەی ئەوان دێت ئەوا دەتوانن بەئاسانی زاڵبن بەسەر ناکۆکیەکانیانداو ئەو ناکۆکییانە دەبێتە شتێکی ئاسایی، پیاو یان ژن چەند کراوەبن و پەیوەندیە کۆمەڵایەتیەکانیان لەئاست وشیاریاندا بێ باوەڕ بەوەش دێنن کەناکۆکی یان جیاوازی بیروڕا شتێکی ئاسایی و جوزئیە لەژیانی ژن و مێردایەتی، ژن یان مێرد پێویستە زاڵبن بەسەر هەڵچوونەکانیاندا و لەگەڵ سێبەری خۆیاندا شەڕ نەکەن، چونکە هەڵچوون وا لەمرۆڤ دەکات دووربێت لەعەقلانیزم و بکەوێتە ژێر رکێفی لایەنی هەوەس و غەریزەو ئەمیش وایان لێدەکات هەوڵی ئەوە نەدەن ناکۆکیەکان لێکبدەنەوەو رێگەچارەیان بۆ بدۆزنەوە، قەناعەت نەکردن بەوەی هەیەو ئەوەی لەواقیعی ژیانی کۆمەڵایەتی ئەمرۆیاندا بەرچاو دەکەوێ، رەنگە کەسێکیان کۆمەڵە خزمێکی هەبێ لەکلتورو بیرکردنەوە لەخزمانی ئەوی دیکە جیاواز بێ بەڵام نابێ ئەمە وا لەوە بکات بەچاوی کەم تەماشای هاوسەرەکەی بکات، چونکە دەبێ قەناعەت بەوە بکات ئەوان بەشێکن لەم کۆمەڵگەیەو واقیعەکەی، هەروەها قەناعەتکردن بەوەی هەیە سەبارەت بەگوزەران و بژێوی ژیان چونکە ژیان بەتەکامولی نایەتە بەردەمی مرۆڤ بەڵکو بەشێوەیەکی پارچەکراوە دەبێ لێی دروست بکەی و هەموو شتێکیش لەژیاندا و لەیەك سەردەمەدا وەك خۆی نییەو نابێ مرۆڤ رەچەی تەکامولی بۆژیان هەبێ.

هۆکارێکی زۆرگرنگی دیکە کەرۆژانە لەژیانی ژن ومێردایەتیدا هەیە ئەویش شەڕانگێزییە کەهەندێجار ژنەکەو هەندێجار پیاوەکەو هەندێکجاریش هەردووکیان شەڕانگێزن، کەئەم جۆرە زۆر زەحمەتە تا سەر پێکەوە هەڵبکەن، جا ئەو شەڕانگێزیە مەرج نییە لێدان و شەڕی راستەقینە بێ بەڵکو زۆرجار لایەنی دەرونییە وەکو نیازخراپی یان هەست ناسکیی، یان هەر شێوەیەکی دیکە، نازکردنیش هۆکارێکی دیکەی ناکۆکی و تێکدانی پەیوەندیە کەهەندێجار

ژنەکە پێویستی پێیەتی وەکو پێویستیەکی دەرونی هەموو مرۆڤێك و هەندێکجاریش پیاوەکە بەڵام کەمتر، گوێنەگرتنیش بۆیەکترو پێویستی یەکترو رەچاونەکردنی بەرژەوەندی یەکدی.

-گوێنەگرتن بۆ گرفتی خێزانی دەبێتە هۆی ناکۆکی و پچڕانی پەیوەندی نێوانیان، پوختەی مەبەست باشترین ناوبژیوان و نزیکترین دادگای ژن و مێرد ماڵەکەی خۆیانە، چونکە تەنها خۆیان لەهەستی خۆیان تێدەگەن.

## هەڵبژاردنی هاوسەر:

سروشتی ژیان وەك خۆی و پێش شارستانیەت و بیرکردنەوەی زانستی و بەکۆمەڵایەتی بوونی مرۆڤ، تاك خۆی لەگەڵ ژینگەی سروشتی و کۆمەڵایەتی هەرەمەکی سازاندووەو تاموچێژی لێوەرگرتووە، ئەوەی بەجەستەو گیانی خۆشبووبێ سڵی نەکردۆتەوە، کەگیانی خۆی لەسەر دانابێ وەکو ململانێی نێوانیان بۆ بەدەستهێنانی ژەمەخۆراکێ، نەخاسمە لەو سەردەمە کەجگە لەیاسای هەڵبژاردنی سروشتی نێوان گیانداران، کەئازادانە بووەو باوەڕ بەیاسای خوداوەند بۆ گەردوون یاسایەکی ئەوتۆی کۆمەڵایەتی و ئاینی و شارستانی نێوان تاکەکاندا نەبووە، بەڵام لەگەڵ سەرهەڵدانی دەوڵەت و شارستانیەت و ئاین و یاسا کۆمەڵاتیەکان بژاردنی هاوسەریش کۆمەڵێك رێساو مەرج و کۆتوبەندی بۆ پەیدا بوو، کە ئەو مەرج وکۆت و بەندانە خووئاسا بوونە بازگەی نێوان مرۆڤەکان، تاکیش پێویستی بەوە هەبوو ناسنامەیەك هەڵبگرێ بۆ هەڵبژاردنی هاوسەر، هاوسەریش دەبێ نیشانی بدات یان بەرزی بکاتەوە، ئەو ناسنامەیەش جۆراوجۆرو رەنگاورەنگە، لەلایەکەوە سوکراتی فەیلەسوف دەڵی: ( (پێم بڵێ چی دەخوێنیتەوە ئەوا پێت دەڵێم تۆ چ ناسنامەیەکت هەڵگرتووە، یان پێت دەڵێم تۆ کێی؟) ) لەلایەکی دیکەوە بیکۆن و هۆبزو فەیلەسوفانی هاوسەردەمی خۆیان دەڵێن: ( (بیرکردنەوەی زانستی تۆ ناسنامەی وشیاری کۆمەڵایەتی بەتۆ دەبەخشێ.تۆ چۆن بیربکەیتەوە ئەوە پێوەری وشیاری و نا وشیاری تۆیە) ) .

تێڕوانین و بۆچوونی میللی گەلانیش ناسنامەکەیان لەخو و دابونەریتی چەسپاوو داکوتراوی ناو سیستمی سایکۆلۆژی کۆمەڵگەیە، کەتۆ مەسیحی بی بێ بیرکردنەوە ئاراستەت بۆ کوڕێکی مەسیحی، یان کچێکی مەسیحی رەوت بکات، ئەگەر موسڵمان بی، بێ بیرکردنەوە

مێشکت بۆ کچە موسڵمانێ یان کوڕە موسڵمانێ بچێ، یان یەزیدییەك یان جولەکەیەك...تد مەبەستیش ئەوەیە دەبێ هەستەکان یەکتر بناسن، چونکە تێکەڵبوونی دوو هەست لەیەك بۆتەدا ناتوێنەوە ئەگەر وەکو دوو جۆر خوێنی جیاواز بن کەکەڵەکە دەکەن و تاماون ئەو هەستانە یەکتر بریندار دەکەن و هەمیشە لەئازاردا دەژین.

بۆ دەستنیشانکردنی ئەو کەسەش لەچوار چێوەی ئایدۆلۆژییە ئاینی یان نەتەوەیی یان مەزەبییەکە، دەکرێ بیربکەیەتەوە کەبتوانی ئەو هەستە بدۆزیتەوە کەلێتەوە نزیکە، ئەمیش بەهۆی بوونی تۆ لەو ئایدۆلۆژیاو باوەڕە تێکەڵاوانەی سەرەوە کەباسمانکردن هەستەکان لەئاوی لێڵدا دەبن، هاوکات کلتوری هەر خێزانە شتێکی دیکە دەڵێ، کەواتە تۆ لەچوارچێوەیەکی هەستپێنەکراو ئازادیت، هەرچەندیشە هاوار بکەی و بڵێی من ئازادم، یان لەچوارچێوەیەکی باوەڕدا تۆ سەربەستی کەهەستی هاوسەرێ بدۆزێتەوەو بێ بازگە بەناخیدا گوزەر بکەی و گوزەر بکات، ترسی دەسەڵاتیش ئەو دەسەڵاتەی کەنەوە دوای نەوە لەنەستەوە گوازراوەتەوەو تیشکی سەوزو سورت بۆ هەڵدەکات، وەرگرتنەوەی ئازادی ڕەهایی بێ دەمارگیری لە تاك، بەرامبەر بەهایەکە کەبەهای نەتەوەیی یان مەزەبی یان ئاینی یان چینایەتی یاخود کلتور و فەرهەنگییە...تد، کەنەوە دوای نەوە هاتووەو ڕێچکەی خۆی وەرگرتوە بەراست و چەپ حوکمی خۆی دەکات و هەست بەهەڵەکانیش ناکرێ و هەڵگەڕانەوە لێی ئاسانە، بەڵام پێویستی بە گۆڕانی سایکۆلۆژی وکۆمەڵایەتی و فەرهەنگی و بیرکردنەوە هەیە، کەئەمیش بەستراوە بەقۆناغی مێژووییەوە.

بەڵام پێمانوایە کوڕ یان کچ کەلەچوار چێوەیەکدا دەژی ئەو چوار چێوەیە فراوانە ئەگەر بتوانێ بەشێوەیەك زانستی بیربکاتەوەو بێ کاریگەری نەستیانەی سێکس و بێ کاریگەری دەمارگیری خانەوادەیی و نەتەوەیی و چینایەتی و نەزۆکی بیرکردنەوە بیربکاتەو بۆ هەڵبژاردنی دەزگیران، بەڵام تێڕوانینی یەکەم ساتی سایکۆلۆژی بارگەکراو بەهەڵچوون و وزەی سێکسی نێوان کوڕو کچ بەتایبەتیش کوڕ بۆ کچ بابەتەکان بابەتەکان سەراوژێر دەکات و بەهەڵگەڕاوەیی دەبیبنرێ و روخسارو رواڵەتی دەرەوە دەبنە سەکۆی بڕیاردان و ناخ و ئاوەزو کەسێتی و هەڵوێستی دەروونی و هەڵچوون بۆ دوارۆژی هاوسەرگیری پاش منداڵبوون و لەسەر رەفە تۆز لەسەر نیشتوەکانی ژیان هەڵدەگیرێ، بەڵام رەشەباو گەردەلوولی دەروونی ئەو رەفەیە لەق دەکات و لەشوێنی خۆی دەیبزوێنێ و تەپوتۆزی دواخراوی ساتە سایکۆلۆژی و سروشتی

منداڵێتی و کاسەی پڕوبەتاڵ و راستڕەوی و چەپڕەوەی کلتوری کۆمەڵایەتی لەناخ چەسپیوی خودو دەوروبەرو کەسێتی بەهەموو رەهەندە سێکسی و هەڵچوونی و دەروونی و کۆمەڵایەتیەکانەوە چنراوە، پێویستی بەماوەیەکی زۆر هەیە لەراشکاویی نێوان نێرومێ و خێزانی هەردوولاو نەهێشتنی پەردەی خۆشەویستی دەمارگیری، کەئەو داوە دەزووانە کەتۆڕی دەروونی و کەسێتی دروستکردووە بناسنەوە، بەناسینی ئەو دەزووانە خود دەناسرێ و دەزانێ هەڵبژێرێ و، نەجوانی کچ و نە دەوڵەمەندی و پایەو پلەی سوارچاکی چاوەڕوانکراو، نە رۆمانسیەتیش نابنە پێوەر بۆ وردیی و کارامەیی و زانستی هەڵبژاردنی هاوبەشی ژیان، چونکە تاکی نائازاد بەجەستە یەکتر دەناسن نەك بە رۆح.

## گومان و دڵپیسی

**گومانی بونیاتنەر پێویستە، کەلایەنی مەعریفی و کەسێتی و پەرەپێدانێتی، بەڵام گومانی نەخۆشی پێویستی بەهەڵوەستەیە.**

گومان و دڵپیسی گرفتێکی دەروونی و کۆمەڵایەتیشە لەهەمانکاتدا، کەرۆژانە یەخەی مرۆڤ دەگرێت، هەموو تووشبونێکیش بەنەخۆشی دانانرێت، چونکە گومان لەژیاندا هەرهەبووەو شتێکی ئاساییە کەدەبێتەهۆی سوربون و گەڕانی مرۆڤ بەدوای راستی و دەرچوون لەگومان، کەواتە گومان بەشێوەیەکی گشتی دووجۆری هەیە، یەکێکیان ئاساییەو دەبێتە بونیاتنانی لایەنی مەعریفی و کەسایەتی و پەرەپێدانی تواناکان، کەسێك کەگومان لەزانیاریەکانی خۆی بکات سەبارەت بەبابەتێك ئەوا لەو بابەتە خۆی پێشدەخات و زانیاری لەبارەیەوە پەیدا دەکات، مرۆڤ کەگومانی لەوەبوو تەندروستی ناتەواوە ئەوا هەوڵدەدات، خۆی بگەیەنێتە لای پزیشك بۆچارسەرکردن، جوتیارێك کەگومانی لەبارانبارین بوو ئەوا هەوڵدەدات لەکەناڵێکی دیکەی کشتوکاڵیەوە بەرهەمەکەی پتر بکات، جۆری دووەمیان نەخۆشیە کەبەشێوەیەکی لەرادەبەدەر کاردانەوەی دەرونی و کۆمەڵایەتی دەبێت و کەسایەتی مرۆڤ لێکهەڵدەوشێنێت و پەیوەندی خێزانداری تێکدەدات و بەهیچ شێوەیەك سودی نییە لەزیان بەولاوە، لەبەرئەوە دەتوانین بڵێین گومان و دڵپیسی هەستێکی هەڵەیە لەلایەن کەسێکەوە بەرامبەر کەسێکی تر یان بابەتێکی تر دروست دەبێت.

دڵپیسی زیانی دوو لایەنی هەیە، لەلایەکەوە کار لەجەستەو سوڕی خوێن و لێدانی دڵ دەکات و مرۆڤ بەهۆیەوە دەکەوێتە حاڵەتی شپرزەیی و بارگرژییەوە، لەلایەکی دیکەوە مرۆڤ

دووچاری خەمۆکی دەکات و بەرامبەر ژیان رەشبین و بیٚ ورە دەبیٚت و خواردنی پیٚناخوریٚ و رۆژ دوای رۆژ لاوازتر دەبیٚت بەرامبەر رووداوەکانی ژیان .

گومان ئەگەر لەو سنورە دەربچیٚت کەدەگەڕیٚت بەدوای راستیدا ئەوا پیٚویستی بەچارەسەرو تیٚڕامانە، گومانی مرۆڤ پەیوەندی بەشویٚنیشەوە هەیە، ئەگەر شویٚنی کارکردن بیٚ یان شویٚنی نیشتەجیٚ، ئەو مرۆڤە شویٚنەکە بەجیٚ دیٚلیٚ و دەچیٚتە شویٚنیٚکی دیکە، رەنگە بەگواستنەوەی بۆ شویٚنی دووەم باری میزاج و دەرونی باشتر دەبیٚت و ئەو کەسە متمانە بەخۆی پەیدا دەکات، کوردواتەنی ئەگەر دەرگایەك خیٚری نەبوو دەرگایەکی تر لەخانوەکەت بکەرەوە، لەراستیدا ئەو دەرگاکردنەوەیە هەستی بڕوابەخۆبوون و گەشبینی بەمرۆڤ دەبەخشیٚ، مرۆڤیش واهەست دەکات ئەو دڵخۆشیە پەیوەندی بەدەرگاکەوە هەیە، مرۆڤ کاتیٚ گومان دەکات خۆی زۆر پاڵەوان دیٚـتە پیٚش چاو، گوایە ئەو کەسیٚکی زۆرباشەو زوڵمیان لیٚکردووەو خەڵکی باش و پیاوەتی نەماوە، کەسی گومانکار لەهاوڕیٚ و کەسانی دەروبەریشی گومان دەکات بەتایبەتی ئەگەر ئەو هاوڕیٚیانەی بیروڕاو بۆچوونیان لەگەڵ ئەم جیاوازبیٚت کەپیٚیوایە جیاوازی بیروڕای کەسیٚکی دیکە پەیوەندی بەدژایەتیکردنی ئەمەوە هەیە.هاوکات ئەو کەسەی تۆگومانی لیٚدەکەیت ئەویش لەوانەیە گومان لەتۆ بکات، گومان بەگومانیش لەوانەیە ببیٚتە مایەی ململانیٚیەکی سەخت، ئەم ململانیٚیە پاڵنەریٚکی سایکۆلۆژی هەیەو چاکبوونەوەی ئەستەمە چونکە دوورە لەقەناعەت پیٚکردنی یەکتر.

کەسی گومانکار تەنانەت گومان لەخۆیشی دەکات، بۆ نموونە ئەگەر دوو کەس لەدورەوە پیٚبکەنن ئەم واهەست دەکات ئەو پیٚکەنینە دژی ئەمە، جاری واهەیە سواری پاسیٚك دەبی یان لەتەنیشت کەسیٚکەوە دادەنیشی ئەو کەسە بەشیٚوەیەك خۆی لادەدات و درەنگ دەجولیٚ کەشویٚنی تۆ بکاتەوە دابنیشی، چونکە گومان لەکەسیٚتی خۆی دەکات و متمانەی بەخۆی نییە.

لەگوماندا مرۆڤ ململانیٚیەکی هەیە و ژیان بەتەندروستی جەستەیی و دەرونی و کۆمەڵایەتی خۆی دەگەیەنیٚ، رۆژانە حاڵەتی گومان لەناو خەڵکدا دەردەکەویٚ بەڵام لەهەمووی نالەبارتر گومان و دڵپیسی نیٚوان ژن و میٚردە کەئەگەری جیابوونەوەی لیٚدەکریٚت، چونکە گومان لەم پەیوەندیەدا یەکەم هۆکاری بەهیٚزو زیندووی تیٚکدانە کاتیٚك ژن یان میٚرد گومان

دەکات لەهاوسەرەکەی لایەنی دووەم بیر لەتۆڵەسەندنەوە دەکاتەوە وەکو دروستبونی پەیوەندی دیکە، ئەگەر ژن بێت یان پیاو.

خێزان هێلانەی دروستبوونی تۆوی دڵپیسیە لەمنداڵەکانی، کاتێ منداڵێك خۆی دەشکێتەوەو بابەخ بەتوانای نادات و بەکەم تەماشای دەکات و متمانەی بەخودی خۆی لەلادروست ناکات و ئەو کات گومان دەکەوێتـە گیانی ئەو منداڵەوە دژ بەخۆی و دەوروبەری و کۆمەڵگا، لەکاتی گوماندا پێویستە مرۆڤ بڕیاتر نەدات و لێکدانەوەی زانستی بۆ رووداوەکان هەبێت و نابێ تەنها پشت بەهەست ببەستێ، چونکە هەستەکانی خیانەت لەخاوەنەکەی دەکەن.

## خۆشەویستی:

**خۆشەویستی بانگەوازێك نییە بۆ خود بەڵكو بانگەوازێكە بۆ خودێكی باشتر، چونكە ئەو كەسە خودەكەی خۆی بەكەم ئەزانێ و حەسودیشی بەخودە باشترەكە دێ، كەدەیەوێ خۆشی بوێ بۆ ئەوەی داگیری بكات** (......) .

ئایا حەز دەكەیت خۆشەویست بی؟ئەگەر وایە كەواتە دەوروبەریشت وەكو تۆ حەز دەكەن خۆشەویست بن، ئایا وێنای ئەوە دەكەیت كەسێك هەبێت حەز بكات خۆشەویست نەبێت؟كەواتە خۆشەویستی پێویستیەكی دەروونی مرۆڤە ناتوانی دەستبەرداری بی، حەسودی لایەنێكی تێبینی نەكراوە لەكەسی خۆشویستراو كەدەیوروژێنێ، بۆیە دەتوانین بڵێین خۆشەویستی لەگیانی حەسودی و غیرەی نەستیەوە سەرچاوە هەڵدەگرێ، خۆشەویستی هێزێك بەرێوەی دەبات ئەویش عەقڵە، ئەگینا لەپرۆسەیەكی سێكسی بەولاوە هیچی دیكە نییە، یان پرۆسەیەكی رۆمانسیانە بەو لاوە هیچی دیكە نەدەبوو، لەهەردوو حاڵەتەكەدا تاموچێژی خۆی هەیە، هەریەكە لەپیاو یان ژن بەئامانجی نەمریی بەدوای خۆشەویستیدا وێڵە، بەڵام ئایا پیاوان زیز نابن كەبڵێین ئەوان سەرپێیانەیەو ژنیش ئەبەدیانە خۆشەویستیان دەوێ!رەنگە سەرچاوەی ئەم سەرپێیانەو ئەم ئەبەدیەتیانە بۆ تێروانینی كۆمەڵگا بگەرێتەوە بەتایبەتیش لەكۆمەڵگای باوكسالاری، كەپیاو لەشكستی خۆشەویستی ترسی نییەو پێوەی لەكەدار نابێ، بەڵام ژن

کەکەوتە داوی خۆشەویستیەوە کارێکی سەرکێشیانەیە، چونکە کەشکستی هێنا ئەوا باجی خۆشەویستیەکە ئەم دەیدات، چونکە تێڕوانینی کۆمەڵگا بۆ ئەم شێوازێکی نەرێیانەیەو لەکەدار بوونە، تاموچێژی خۆشەویستی لەگەڵ شکستی خۆشەویستی (بەهاوسەر نەبوون) کۆچ دەکا، کەچی سەیرە یەکێکی وەکو گۆتە تێڕوانینی بۆ خۆشەویستی لەشیعرێکدا دەردەبڕێ کەدەڵێ:

بەلای باخێکدا تێپەڕیم
هیچم نەدی غەیری گوڵێکی زەردی وردیلە نەبێ
پێم گوت ...ئەی گوڵە وردیلەکە ..بتکەمەوە
گوڵەکە گوتی: بۆ دەمکەیتەوە؟
گۆتە گوتی: خۆشم دەوێی
گوڵەکە گوتی: سەیرە .. چۆن خۆشت دەوێم کەدەمکەیتەوە؟
گۆتە گوتی: لەماڵەوە دەتنێژم بۆئەوەی لەگەڵتا یەکبگرمەوە.

خۆشەویستی لای گۆتە توانەوەیە لەناو یەکداو بوون بەیەك و هیچ هۆکارێکی جوانی و ناشیرینی و ئاستی چینایەتی کاری تێناکات و تاموچێژی تەواو نابێ، چونکە دوورە لەتاموچێژی هەوەسبازی سەرپێی کەهەندێ پیاوی رۆژهەڵاتی بەدوایدا وێڵە، لەهەمان کاتدا گۆتە حەسودی بەو گوڵە جوانە دێ و دەیەوێ لەماڵەوە داگیری بکات حەسودی لایەنێکی تێبیننەکراوە لەو ئیعجابەی کەخۆشەویست دەیوروژێنێ، بۆیە خۆشەویستی لەگیانی حەسودی و غیرەی نەستیەوە سەرچاوە هەڵدەگرن، ئەو کەسێکی خۆش دەوێت دەیەوێ دەست لەملی خۆشەویستەکەی بێ و سۆزیانانە مامەڵەی لەگەڵدا بکات، بەڵام مەیلە نەستیەکانی یەکەم جار تەماعتێکردنە لەگەڵ ئارەزووی دەستبەسەرداگرتن و بوون و تاپۆکۆدنی و لەدواجاردا ناچارکردنی کەبۆ ئەو بێ..ببورن زۆریشن ئەو ژنانەی کەخەنجەری زوڵم بەگیانی پیاودا دەئاخژنن، گۆتە رێك وەك ئەو مرۆڤە وایە کە بەعەقڵ خۆشەویستیەکەی بەڕێوەدەبات و نایداتە دەست سۆزێکی کاڵوکرچی بێ جڵەو، کەدەیەوێ یەکبگرێتەوەو گوڵەکەش سیس نەکاتەوە.کەواتە خۆشەویستی میکانزمێکی رێژەییە، لای گۆتە یەگگرتنەوەیەو لای

ژنەکوردێکیش هاوسەرگیری و دۆزینەوەی پاڵپشتیە لەپێناو قەیرە نەبوون و لای هەندێ پیاویش ئەگەر ئاشکرا بوو ئەزم ئەگینا دزم.لای جان پۆل سارتەری فەرەنسیش خۆشەویستیی خۆخەڵەتاندنە کەدەڵێ: خۆشەویستی جۆرێکە لەخۆخەڵەتاندنی سیستماتیکی ...بۆیە دەڵێ کاتێك کەسێکم خۆش دەوێ دەمەوێ ئەویش منی خۆش بوێت، واتە دەمەوێ کەسێکی تر بیەوێ من خۆشم بوێ، دیارە سارتەر خۆشەویستی بەئەرك دەزانێ و رەنگە ئەم تێڕوانینەی سارتەر بۆئەوە بگەڕێتەوە فەلسەفیانە بیر لەخۆشەویستی بکاتەوە نەك توشی بووبێ یان تامی کردبێ، ئەمە وەکو ئەوە وایە پیاوێك ماسی بفرۆشێ و پیاوێکیش ماسی راو بکات و خۆی بیبرژێنی و خۆیشی بیخوات، بێگومان ئەوەی دەیفرۆشێ تامەکەی لەدەستکەوتە مادیەکەیدایەو لەبیریشی دەکا کەرۆژێك لەرۆژان ماسی فرۆشتبێ، بەڵام ئەوەی راوی دەکات و دەیبرژێنێ و دەیخوا هەمیشە تاموچێژی دەماو دەم دەگێڕێتەوە.

هەروەها سارتەر دەڵێ: هەرچەندە خۆشەوستی کەسێکی تر بۆ من زیاتر بێ، بوونم زیاتر ون دەبێ و پاشان دوودڵیم بۆ ئەرکەکانم و توانا تایبەتەکانم زیاتر دەبێ، هەروەسا دەڵێ خۆشەویستی ململانێیەکی بەردەوامی نێوان دوو ئازادیە نەك بەشداریەکردنێکی ئەکتیڤی نێوان دوو ویست هەرچەندە ئازادی کەمتر بەویستێکی تەواو خۆی دەوێ بێ ئەوەی ئازادی کەسانی تری بوێ.

هەروەسا دەڵێ: مردن تاکە مەترسی نییە، کەهەڕەشە لەخۆشەویستی دەکات بەڵکو مەترسی گەورەتر هەستکردنە بەتەنهایی تەنانەت لەناو خۆشەویستیشدا، سارتەر دەڵێ: خۆشەویستی هەمیشە لەسەر لێواری مردن دەژی، بەڵام درامای ژیانی مرۆیی ناچارمان دەکات بۆ خۆشەویستی، بۆ ئەوەی بژین.

ئێمە دەزانین کە لەوانەیە بۆ پیاو ئاسان تر بێت لەپێناو ئەو ژنە بمرێت کەخۆشی دەوێت لەوەی بۆی بژێت. خۆشەویستی لای ژن واتای بەختەوەری و سەقامگیری دەگەیەنێ و لەبەرئەوەشی کە خۆشەویستی لای ژن زیاتر مانای هەیەو کۆمەڵێك پاڵنەری کۆمەڵایەتی لەپشتەوەیە بۆیە بێ ئومێدی لای ژن زیاترە لەپیاو سەبارەت بەخۆشەویستی، چونکە نوشستی لەخۆشەویستی بۆ ژن ونبوون و لەکەداربوونە لەکۆمەڵگای ئێمەدا، وەلی بۆ پیاو شتێکی دیکەیە، هەروەها سارتەر دەڵێ ژن کە هیچوپوچی ئەو پیاوەی کەخۆشی دەوێت بۆی دەردەکەوێت توشی هەستێکی ئازار بەخش دەبێت، خۆشەویستیش لای پیاو واتای لەزەت و

گەڕان و شەهوەت و تامکردنی سەرپێیی دەگەیەنێ..پیاو بەخێرایی عاشق دەبێ و بەخێرایش وازی لێ دێنێ بەڵام ژن خۆشەویستی ناکات بەزەحمەت نەبێ.

خۆشەویستی لەروانگەی کارل مارکسەوە ناوەڕۆکێکی کۆمەڵایەتی هەیەو ئەو پێیوایە خۆشەویستی بونیادێکی عەقڵی سەرخانیانەیە وەکو سیاسەت و ئەخلاق و زانست و هونەرو ڕەنگدانەوەی کارلێککردنی دینامیانەی ژێرخانە ئابوریەکەیە، واتە ڕەنگدانەوەی پرۆسەی ئابوریە، بەپێی بیرورای مارکس ناوەڕۆکی پەیوەندی نێوان ژن و پیاو پلەیەکە لەپلەکانی پەرەسەندنی کۆمەڵایەتی مرۆیی و هەورەها دەرەنجامی بزاڤی فسیۆلۆژی و سۆسیۆلۆژی مرۆڤە.

هاوسەرگیری ئەگەر یەکسانی و هاوهێزی و گۆڕینەوەی خۆشەویستی نەبێت ئەوا جۆرێکە لەچەوسانەوە، ئەو کەسە چەوساوە دەبێت کە بێ دەسەڵاتە بەرامبەر کلتوری کۆمەڵگە، ئەو کلتورەی کەدەتوانێ ئافرەت وا بترسێنێ کەهیچ نەدرکێنێ بۆ ئەوەی ئابڕوی نەچێت هەرچەندە ئەمەش لەسەر حەسابی باری دەرونی ئافرەتیش بێ.بەو پێیەش بێ  خۆشەویستی بەواتا مرۆییەکەی هێشتا رووی نەداوە.

ئەریك فرۆم پێیوایە خۆشەویستی هێزێکە بۆ روخانی ئەو دیوارەی کەمرۆڤ لەهاوڕێیانی جیادەکاتەوە، خۆشەویستی هێزێکی کاریگەرە لەمرۆڤدا، وا لەمرۆڤ دەکات زاڵ بێت بەسەر هەستی دابڕان، کەسی دەوڵەمەند لای فرۆم ئەوەیە شت ببەخشێ نەك ئەوەی هەیەتی، کەواتە هەژاریش دەوڵەمەندە ئەگەر ببەخشێ، ئەوەی خۆشەویستی دەبەخشێ دەوڵەمەندە بەخۆشەویستی، بەبەخشینی زانست لەخۆشی لە خەمی لەئاسودەیی لەپەرۆشیی، کەوا لەو کەسە بکات هەست بەدەوڵەمەندی بکات هەست بەژیان بکات، بەمەرجێکیش چاوەڕێی پاداشت نەکات، خۆشەویستی ئەوەیە خۆشەیستی بەرهەم بێنێ نەزۆکییش ئەوەیە کەنەتوانێ خۆشەویستی بەرهەم بێنێ، کەواتە خۆشەویستی گۆڕینەوەی خۆشەویستیە بەخۆشەویستی و متمانە بەمتمانە، کەواتە هەر جۆرە خۆشەویستیەك لەگەڵ مرۆڤێکی تر گوزارشتکردنە لەژیانی ئەو مرۆڤە خۆی واتە ئەگەر نەتوانی خۆشەویستی خۆشەویست بی کەواتە خۆشەویستیەکەت نەزۆکە، توانای خۆشەویستی ئەوەیە گیانی زاڵ بوون ببەزێنی بەو شێوەیەشە ڕەچەی شمولیەت و نەرگزیەت و ئارەزووی ئیستغلالی کەسانی تر و کۆکردنەوەی پارە دەبەزێنی ئاواش ئەو مرۆڤە دەبێتە خاون باوەڕکردن بەتوانا مرۆییەکانی و ئازایەتی لەپشت بەستن بە توانا و هێزەکانی بۆ گەیشتن بەئامانجەکانی، ئەم بەخشینانە چەند کەموکورت

بن مرۆڤ بەو رادەیە ترسنۆکە لەوەی دەیبەخشیٚ دواتر لەخۆشەویستیش دەترسیٚ.لەپاڵ توخمی بەخشین مۆرکی ئیجابیانەی خۆشەویستی رون دەبێتەوە کەتوخمە گرنگەکان هەموو جۆرە خۆشەویستیەك دەگرێتەوە وەکو ریعایەو بەرپرسیارێتی و رێزو مەعریفەت.

فەرەنساییەکان دەڵێن خۆشەویستی بێچووی ئازادیە، مەبەستیش لەمەعریفەت زانینی نهێنی مرۆڤەکەی ترە بۆئەوەی رێگای چوونە ژورەوەی بزانیٚ، یەکێك لەدەروازەکانی ئەو چوونە ژورەوەیە خۆشەویستیە.

، لەلایەکی دیکەوە باسکاڵ دەڵی رکوکینە لەخودو گومان لەخودو هەستکردن بەکەمی و ئارەزوو بۆ خودێکی باشتر باشترین هەنگاوی ریٚ خۆشکەری پێویستە بۆ پەرەسەندنی خۆشەویستی، کە هەوڵی مرۆڤە بۆ پتەوکردنی رێزگرتنی مرۆڤ لەخودی خۆی، بەڵام ئەگەر لەخۆمان رازی بین کەواتە بۆ هەوڵی خودێکی باشتر دەدەین و بەدوایەوە وێڵین، خۆشەویستیش دوای رکوکینە لەخود دێت، خۆشەویستی دوای ساردبوونەوەو هەندێجار دوای یاسبوونی مرۆڤ دێت لەژیانیدا، ئەفلاتۆن پێیوایە خۆشەویستی بنەمای داهێنان و گوڕو تین و جوانییەو دەڵیٚ وزەی دەروونی لەگەڵ غەریزەی خۆشەویستی تێکەڵ دەبێت، گۆتەش دەڵیٚ زۆر لەئاریشەکانی ژن و زیانەکانی بەخۆشەویستی چارەسەر دەبێت، زۆر لەبیردۆزەکان و تیۆرانینەکان گرنگییان بەلایەنی کۆمەڵایەتی داوە لەپرسی خۆشەویستی بەڵام ئەوەی زیاتر جەختی لەسەر لایەنی سێکسی کرۆدتەوە لەخۆشەویستی سیگمۆند فرۆیدە، کە ئەریك فرۆمیش لەمبارەیەوە رەخنەی لیٚ گرتووە کە پێیوایە فرۆید لایەنی دەرونی بایۆلۆجی لەجنسدا فەرامۆش کردووەو زۆر گرنکیشی بەجنس داوە، بەهەمان شێوەی فرۆیدیش شوبنهاوەرو نیتشە گرنگییان بە گرنگی بە ژیانی سێکسی داوە لەپەرەپێدانی کەسێتی مرۆیی، بەڵام بەهۆی کاریگەری ئاین و کۆمەڵایەتی مەسەلەی ژیانی سێکسی بەئاڵۆزی ماوەتەوەو زۆر لەلێکۆڵەرەوانی دەرووونی و کۆمەڵایەتیش ناتوانن لەلێکۆڵینەوەکانیاندا بگەنە باوەڕێك یان جورئەتی ئەوەیان نییە پرسی خۆشەویستی بکەنە لێکۆڵینەوەی زانستی رەنگە هۆکاری ئەوەش کلتوری زۆر لەکۆمەڵگاکان بێت کەتاك ناتوانیٚ بەئاشکرا رۆبچێتەناخی خۆیەوەو باسی خۆشەویستی بکات یان رازی نابێت خۆی بکاتە بابەتی لێکۆڵینەوە بەتایبەتیش رەگەزی میٚ، ئەوەشی وتراوە تەنها لەلێوارو پەراوێزی مەسەلەی ئەویندارییە.

## زویربوون:

### زویربوون زەنگی بەخۆدا چوونەوەی تاکە، بەڵام مەترسی لەوەدایە تاکۆتایی بێت

زویربوون یان زیزبوونی دوو مرۆڤ لەیەکتر دیاردەیەکی دەرونی و کۆمەڵایەتی باوە دەسەڵاتی خۆی لەنێوان ئەو دوو کەسەدا قیت دەکاتەوەو هەر یەکێکیان دروستکردنی ئەو دەسەڵاتە یان ئەو دیوارە دەخاتە ئەستۆی ئەوی دیکەو لەوانەشە پێچەوانە بێت، هەندێك لەو زویربوونە زوو چاك دەبێتەوە بەتایبەتی لای ئەو کەسانەی کەجۆری لێبوردەو کراوەو دڵپاکن و شت لەناخیاندا پەنگ ناخواتەوە، هەندێجاریش پەیوەندی بەسروشتی و کەسێتی یەکێکیانەوە کەتوڕەو کەللەڕەق و خۆپەرستە گوێناداتە مافی کەسانی دیکەو بەیەوە گرنگ نییە خەڵك لێی زویر بێت یان نا، بابەتی ئابوری و کۆمەڵایەتی و کلتوری جیاوازیش هۆکارن بۆ زویربوون، بەڵام ئەوەی مەترسیدار بێت ئەوەیە پەیوەندی بەلایەنی سایکۆلۆژی کەسێکەوە بێت کەلەهەست و نەستەکانیدا چرۆی کردووە کەلەدیدوبۆچوونی سایکۆلۆژی خۆیەوە دیاردەکان و کەسانی دەروبەر دەپێوێت یان لەکونجی دڵی خۆیەوە دەوروبەر دەبینێت، یان لەکونی دەرگای ماڵەکەی خۆیەوە دراوسێی دەبینێت بێ ئەوەی رەهەندە جۆراوجۆرەکانی دەروونی و کۆمەڵایەتی لەبەرچاو بگرێت و لێیان حاڵی بێت، لەروانگەی سایکۆلۆژییەوە بڕوا بەخۆنەبوون هۆکارێکی گرنگە کەکەسانی بێبڕوا و متمانە بەخود زووتر زویر دەبێت، هەندێجاریش هۆکارەکان واقیعین کەدوو کەس بەڵێنی یەکتر پێشێل دەکەن یان بێ بەڵێنی دەنوێنن بەرامبەر یەکدی، بەڵام بەهەند وەرگرتنی کەسێتی بەرامبەر رەنگە مرۆڤ گوێ نەداتە ئەو زیانەی پێی

گەیشتووە بەهۆی کەسێکی دیکەوە لەبەر ئەوە لێی خۆش دەبێت و پەیوەندیشیان باشتریش دەبێتەوە، چونکە لەیەکترقبوڵکردنی هەڵەکانی پێشتری یەکتریش لەناخدا پەنگ دەخواتەوە، پێویستی بەدەربڕین هەیە، بۆیە دوای دەربڕین و گوزارشتکردن لێی دڵ و دەروونی مرۆڤ ئاسودە دەبێت، کەواتە هەژمارکردنی دەوروبەر زویر بوون دوور دەخاتەوە لەبەر ئەوەی بەها رۆحیەکان لەکۆمەڵگەی ئێمە رەگیان داکوتاوە، هەندێ لەهۆکارەکانیش پەیوەستن بەبەهاکانی خێزانەوە وەکو ژن و ژنخواستن و کلتوری کۆمەڵ و گلەیی و گازەندە، کەبەشێکە لەکلتوری ئێمە و بەپیریەوە دەچین، بەڵام ئەگەر گلەیی و گازەندەش زۆر بێت ئەوا لاوازی کەسێتی ئەو کەسە دەنوێنێت و پێویستە مرۆڤ زۆر پەنای بۆ نەبات و مەرجیش نییە مرۆڤ هەموو کەسێك بناسێت، چونکە لەکەسێتی و سایکۆلۆژیەتی خەڵك جیاتاکی هەیەو هەموو مەنجەڵێك سەرقەباخی خۆی هەیە، مەترسیدارترین زویربوونی دەرونیش ئەوەیە لەنێوان ژن و مێرددا بێت، چونکە زویربوونی بەردەوام بۆشایی نێوانیان پتر دەکات و لەوەش خراپتر ئەوەیە کەسی سێیەم بکرێتە دادگا، چونکە باشترین و نزیکترین دادگای نێوان زویر بووان هەر خۆیانن.

## نەوێران:

**بۆیە ناوێری لەوە دەترسی بەدڵی ئەوان نەبی،**
**ئەمیش دەرەنجامی شەرمنیە.**

کەسێك نیە لەتەواوی ژیانیدا کەم تازۆر سڵنەکاتەوە، یان نەترسێت، یان شەرمێك نەکات لەهەڵوێستە کۆمەڵایەتیەکان، وەکو چوونەناو ئاهەنگێك یان شوێنێکی قەرەباڵغ کەپڕبێت لەرەگەزەکەی دیکە یان کەسانی دیکەی خاوەنی بیروڕای جیا یان هەڵوێستی وەکو بەشداریکردن لەرێورەسمی ماتەمینی، یان میواندارێکی فراوان، ئەمان تارادەیەك ئاساین بۆ مرۆڤی ئاسایی، بەڵام لەهەمان کاتدا کەسانێك هەن هەرگیز ناوێرن خۆیان لەقەرەی ئەو جۆرەهەڵویستە کۆمەڵایەتیانە بدەن کەدەروازەی کارلێککردنی کۆمەڵایەتی وخۆگونجاندنە لەگەڵ دەوروبەر، ئەم جۆرە رەفتارانە، یان ئەم هەستانە کەدەبنە بەربەست لەبەردەم مرۆڤدا پەیوەندی بەتێڕوانینی مرۆڤەوە هەیە بۆخودی خۆی یان پەیوەندی بەهەستی ئەم مرۆڤەوە هەیە بۆکەسانیتر ئەمیش لەوەدا بەرجەستە دەبێت کەهەست بکات هەمو خەڵکی ئەو شوێنە کەئەم بۆی دەچێت دیقەتی جلوبەرگ و جموجوڵ و رەفتاری ئەو دەدەن، ئەم بۆچوونەش سەبارەت بەخوود بۆ قۆناغی منداڵی دەگەڕێتەوە، کەسانی نەوێر (بێ جورئەت) لەهەڵپەی ئەوەدان رەزامەندی دەروبەر بەدەستبێنن و لەوەدەترسن بەدڵی دەوربەر نەبن، ئەم هەستی ناڕەزاییە بۆ خوود لەخوددا بەرجەستە بووە، کەهەندێ لەهۆکارەکانی دەگەڕێتەوە بۆ پەیوەندی بەخێزانەوە لەرەخنەگرتن و کۆسپ خستنە بەردەم بەدیهێنانی ئارەزووەکانی منداڵ هەر لەیاریکردنەوە تا

دەگاتە هەڵبژاردنی جلوبەرگەکانی و سیاسەتی تونوتیژی و لێدانی لەلایەن دایك وباوکەوە، مرۆڤیش کەئەو هەستەی لەلا دروست بووبێت خۆی بەکەم دەزانێت و هێشتا هەر بەهەستی منداڵییەوە دەڕوانێتە خۆی کەوا هەست دەکات خەڵکانی تریش وەکو دایکوباوك پێی رازی نین و بەکەم تێی دەڕوانن هەروەکو چۆن دایکوباوك لەسەردەمی منداڵی لێی رازی نەبونە ئاوهاش خەڵك پێی رازی نین، لەبەر ئەوە ناوێرێ هەنگاو بنێت تەنانەت تەوقەکردنیش لەگەڵ کەسانی دیکە بێمتمانەو بێ بڕوا بەخۆبوونەوە لەچالاکی کۆمەڵایەتی رۆژانە وەك دەستپێشخەری و دواندن و گفتولفت و هاوکاری دەوروبەرو بەشداریکردنی لەبۆنە خۆشوناخۆشەکان سڵ دەکاتەوە، کەپێی خۆشە بەشدار بێت لەو بۆنانە، بەڵام ناوێرێ هەنگاو بنێت نەوەك شکست بێنێ یان بەدڵی خەڵکی نەبێت، چونکە تاڵی وتفتی شکستهێنانی منداڵی چەشتووە کەبووەتە مایەی سوکایەتی پێکردنی لەلایەن ئەندامانی خێزانەکەیەوە کەلەبەرامبەر شکستەکانیدا سوکایەتیان پێکردووە، لەراپرسیەکدا کچێکی تەمەن٢٢ساڵ لەپەیمانگەی پەروەردەی وەرزش لەهەولێر بەم شێوەیە باس لەبەشداریکردنی بۆنە کۆمەڵایەتیەکانی خۆی دەکات:

(نەخێر بەشداریم نەکردووەو بەشداری ناکەم، چونکە زۆر کات لەکەسایەتیم کەم دەبێت وەکو کۆمەڵگەی ئێمە هێشتا نەگەیشتوین بەو ئاستە تاکو کچەکانیان بەشداری هەموو بۆنەکان بکەن).

یەکێکی دیکە تەمەن ٢٣ساڵ دەڵێ:

(بەڵێ هەندی ئاهەنگ بەئاسانی بەشداری دەکەم بەڵام هەندێکی تر هەیە ناتوانم بەشداری بکەم لەبەر ئەوەی  ئاهەنگەکە هی خزمێکی دوور یان حەفلەکە هی ئەوە نییە بەشداری بکەم).

یەکێکی دیکە تەمەن ٢٤ ساڵ دەڵێ:

(بەشداری دەکەم، لەهیچ شت ناترسم زۆر حەز دەکەم لەگەڵ کەسانی دەوروبەرم تێکەڵ بم بەشداری لەبۆنە کۆمەڵایەتیەکان بکەم)

کچێکی دیکەی تەمەن ١٩ساڵ دەڵێ: (سەرەتا کەمێك شەرم دەکەم بەڵام دوایی لام ئاسایی دەبێت)

کچێکی تەمەن ٢٣ ساڵێك دەڵی (بەڵێ بەشداری دەکەم چونکە ئەکەر کەسێك شەخسیەتی هەبێ قەد ناترسێ و شەرم ناکات)، لەوراپرسیانە وادەردەکەوێت مەسەلەی خود ناوەڕۆکی کێشەکانە لەبەشداریکردن وبەشدارینەکردنی ئاهەنگ و بۆنەکان وکەلەوەدەترسن خەڵك

بەتێڕوانینێکی دیکە مامەڵەیان لەگەڵدا بکات یان ئەم جۆرە پاساوو هێنانەوە بۆ بەشدارینەکردن پەیوەندی بەتەسەوری ئەو کەسە خۆیەوە بێت کەرەنگە ئەرێیانە سەیری دەوروبەری خۆی بکات یان نەرێیانە.

بەگوێرەی لێکۆڵینەوە دەرونیەکان لە (١٠) کەس یەکێکیان ترسی کۆمەڵایەتیان هەیەو ناوێرێ بەئاسودەیی تێکەڵ بێت و لەبۆنە کۆمەڵایەتیەکان بەشداری بکات، کەنیشانەکانی شەرمکردن لەسور هەڵگەڕانی دەموچاو شڵەژان و شپرزەیی و دوودڵی دەردەکەوێت ئەم جۆرە کەسانە واخۆیان رائەهێنن کەبەشداری بۆنە ئاینی و کۆمەڵایەتیەکان نەکەن و ئەو ئەرکانە دەخەنە ئەستۆی کەسانی لەخۆیان گەورەتر، هەندێ جاریش بۆ قەرەبووکردنەوەی ئەو نەوێرانەش پەنا بۆ خواردنەوە دەبەن کەبەهۆیەوە مێشکیان سڕ دەبێت و بوێرانە قسەدەکەن و تێکەڵ دەبن و کونی قسەو پێکەنینیان دەکرێتەوە کەهەست بەتام و چێژ دەکەن، هەندێ لەلێکۆڵینەوە دەرونیەکان پێیان وایە ترسی کۆمەڵایەتی زیاتر لەقۆناغی هەرزەکاریدا دەردەکەوێت کاتێ مرۆڤ دەچێتە قۆناغێکی نوێی کۆمەڵایەتیەوە بەدوای ناسنامەو پایەو رێزی کۆمەڵایەتی دەوربەر دەگەڕێت و دەوروبەری شتی وای لێدەکەن کەرەنگە لەرووی قەبارەی لەشەوە واهەست بکرێ توانای ئەنجامدانی ئەو داوا کۆمەڵایەتیانەی هەبێت، بەڵام لەرووی دەروونی و هۆش و توانای ئەقڵییەوە هێشتا ماوێتی لەبەر ئەوە دەکەوێتە نێوان ململانێی ئارەزووەکانی خودو کۆمەل ̌و ئەو هەستەی کەدروست بووە بەهۆی زۆری قەدەغەکراوەکانی دەروبەر وەکو لایەنی سێکسی و تێکەڵبوون لەگەڵ رەگەزی دیکەو حەیاو گەڕان بەدوای هاوسەنگی لەو هاوکێشەیەدا، لێرەدا ئەوەی پێویستە رێنمایی دەروونی ئەو کەسانە بکرێت بۆ ئەوەی وشیار بکرێنەوەو زاڵبن بەسەر ئەو ترسە کە بووتە رێگر لەبەردەم چالاکییە کۆمەڵایەتیەکانیان کەمتمانەو باوەڕ بەخۆبوون تیایدا درووست بکرێت ئەمیش پەیوەستە بەخێزان و شێوازی پەروەردەوە کەمنداڵ تیایدا هەست بەبوون ورەزامەندی و گرنگی خۆی بکات.

## پیاو کێیە؟

**پێوەر بۆ پیاو بوون لەکۆمەڵگەوە هەڵدەقوڵێ، لەکۆمەڵگەی باوك سالاریدا پیاو ئەو کەسەیە ماڵ و منداڵی بکاتە قوربانی هەڵوێستێك کە پێی دەوترێ پیاوەتی.**

پیاو بوون تەنها بۆ پیاو نییە، بەڵکو هەندێجار ژنیش پیاوە، نەك بەو واتایەی کە نێرە، بەڵکو بەو واتایەی کە ئەدگارەکانی پیاو لەروانگەی کوردەوارییەوە لە کەسایەتیدا هەیە ئەمیش کەمکردنەوەیە لەمێیەتی مێ، ئەو ئەدگارانەش رەنگە لە کۆمەڵگەیەکەوە بۆ یەکێکی دیکە جیاواز بێ، لەوانەشە کەسێك لە کۆمەڵگەیەکی دیاریکراودا چەند ئەدگارێکی تێدابێ ئەو ئەدگارانە مەرجی پیاو بوون بێت، بۆ نموونە ئەو پیاوەی کە ژنەکەی هانی بدات لە بەڵێنێك یان هەر کارێکی دیکە بەرامبەر کەسێکی دیکە پەشیمان ببێتەوە پێی دەڵێن پیاو نییە، یان ئەگەر هاوکاری ژنەکەی بکات لە گسکدان و خاوێنکردنەوەی ماڵ و یەکێك بیبینێ پێی دەڵێن هۆمەرە، واتە ملکەچی ژنەکەیەتی، یەکێك ئەگەر لە بۆنەیەکی وەکو تازیە نەبینرێ دەڵێن پیاو نییە، یەکێك بەڵێن شکێن بێ، یان دوو روو بێ، یان درۆزن بێ، یان فێڵباز بێ، یان ئەم جۆرە ئەدگارانە لە پیاودا پەسەند نییە، یان ئەگەر کەسێك لێی بقەومێ و کەسێکی دیکە نەیناسێ و هاوکارییەکی چاکی بکات دەڵێن پیاوە، یان دەڵێن پیاوەتی خۆی کرد، زۆرجاریش بۆ بەدەستهێنانی نازناوی پیاوەتی کەسی واهەیە لەسەر حەسابی منداڵی

خۆی یارمەتی کەسی دیکە دەدات، یان لە هەڵوێستێکدا ئەو پیاوە رۆڵی چاکی گێڕاوە ئیدی سیفەتی پیاوەتی پێوە دەمێنیٚ، لە ناو خودی گۆمەڵگایەکیشدا سیفاتەکانی پیاوبوون رەنگە لە روانگەی کەسێك (ژن، باوك، دایك، یاسا، ئاین، کلتوروکۆمەڵگە...تد) ەوە بۆ کەسێکی دیکە جیاواز بێت، لەرووی بایۆلۆژییەوە پیاو واتە نێر، لەم روانگەیەوە مرۆڤ هەرکە نێر بوو، واتە پیاوە، بەهەمان شێوەش میٚ کە بەنیشانەکانی رەگەزی مێینە لەپیاو جیادەکرێتەوە وەکو کۆئەندامی زاوزیٚ، ریش و سمێڵ، نیشانەکانی تری جەستەیی کە نێرو میٚ لە یەکتر جودا دەکاتەوە، بەڵام لەروانگەی کۆمەڵایەتییەوە پیاوبوون مەرجی خۆی هەیەو مەرج نییە هەر کەسێك نیشانەکانی نێرێتی پێوە بوو ئیدی ئەوە پیاوە، چونکە کە دەڵێین پیاو لەروانگەی کۆمەڵگەوە، یان لەو روانگەیەی کە لە لاشعوری کۆمەڵایەتی تاکدا هەیە نیشانەی خۆی هەیە کە رەنگە لە هەڵوێستە کۆمەڵایەتی و هەڵچوونی و ئابوورییەکاندا دەربکەویٚ، مەرج نییە ئەو روانگەیە ئاشکرا ببێت، بەڵام لەکەسایەتی ئەو تاکەدا تواوەتەوەو بە ئاسانی لێی رزگار نابیٚ، چونکە هەموو تاکێك دان بەوەدا نانێت کە ئەو باوەڕی بە شتە باوەکانی کۆمەڵگە هەیە یان نا، چونکە هەندێك وا خۆی نیشانی دەوروبەر دەدات کە رۆشنبیرە، یان لەگەڵگۆڕاندایە بە مەنتیق و قسەکردن ئەو کەسێکی نویٚ خوازەو راستیەکەشی وانییە، پیاوبوون زۆرجار دژ بە یاسایە، دژ بەماڵ و منداڵە، دژی مرۆڤ خۆیەتی ئەگەر لەو روانگەیەوە بیٚ کە لەکۆمەڵگادا هەیە، لەرووی سایکۆلۆژییەوە مرۆڤ خاوەن هەست و سۆز و ویژدان ولێبوردن و بەزەیی و پابەند بوونە بە بەهاکانەوەو دەبیٚ لە گەڵیدا بگونجیٚ، کە ئەم خۆگونجاندنەش یەکێکە لەمەرجەکانی تەندرووستی دەروونی، کەسێك ئەگەر بێویژدانی بکات بە پارەی حکومەت باڵەخانەیەکی خراپ درووست بکات و ساختەی تێدا بکات و خۆی دەوڵەمەند بکات و بەو دەوڵەمەندییە وەك دەڵێن پیاوەتی بکات ئەوە پیاوە ئیتر گرنگ نییە کە دزی کردبێت و لەکویٚ و چۆن پەیدای کردبێت، چونکە کاری دزیکردنەکە شاراوەتەوە، یان تەنها چەند کەسیك دەزانێت، یان ئەگەر ناسراو بێت ئەگەر ئەو ناسینەش بە خراپەکاریش بووبێت بەلایەوە گرنگ نییە، چونکە ئەوە پەیوەندی بە ناخەوە هەیەو ئاشکرا نییە، بۆیە کورد وتویٚتی لە سەر کانی ژنان دادەنیشیٚ بۆ ئەوەی بڵێین ئە سەگبابە کیٚ بوو، ناو هێنان لێرەدا ئامانجی خراپەکارییەکەیە، بەڵام ئەو کەسە ئەگەر مەرجی تەندرووستی تێدا بوو ئەو رەفتارە ناکات، کەواتە ناشیناسن لەبەر ئەوەی تەندرووستی دەرونی تەواوە، هیچ کارێکی سەرنجڕاکێش ناکات

و وەکو خۆی دەمێنێتەوەو کەس نایناسێت، چونکە هەندێ دەستەو گروپ بەلایانەوە گرنگە کەسێك ناسراو بێت، گرنگ نییە سەرچاوەی ئەو ناسراو بوونە چی بێت، لەکۆمەڵگەی کوردەواری یەکێك ناسراو بێت بەتایبەتی بەچاکەو پیاوەتی واتە لەهەڵوێستە کۆمەلایەتیەکان دیار بێت بەهۆی بنەماڵەکەی یان بەهۆی قسەکردنی لەناو کۆڕو کۆمەڵ یان بەهۆی هەڵوێستە جوامێریەکانی کەهاوکاری خەڵك دەکات و لێبوردەیەو لەقسەو قسەلۆك ناکۆڵێتەوەو هاوکات شان و شەوکەتێکی کارێزمایی هەیە ئەوە پیاوی تەواوەو خەڵك حەسابی بۆ دەکات و هەمیشە بۆنەکانی ئەم کەسە لەپرسەو شایی و هەر بۆنەیەکی دیکە هەمیشە دەوروبەری قەرەباڵغ دەبێت، کاریگەری بنەماڵەو ئاغایەتی و سەرۆك هۆزێتی بۆ نەوەکانی دواتر دەمێنێتەوە کەدەبینی کەسێك خۆی هیچ نییە بەڵام کەلەو بنەماڵەیەیە هەر بەو چاوەوە تەماشا دەکرێ کەتەماشای رابردووی بنەماڵەکەی کراوە.

کابرایەکی هەژار بمرێت رەنگە تازیەکەی ساردو سڕبێت، بەڵام هەر ئەو هەژارە ئەگەر لەچاو تروکاندنێکدا بووە وەزیرێك، یان لەناکاو دەوڵەمەند بێ ئەوا خەڵکێکی بێ شومار روویان تێدەکردو پرسەیەکی گەرموگوڕی دەبوو، ئەمەش ئەوە دەگەیەنێت کە وەزیر بوونە، یان دەوڵەمەند بوونە سەرنجی خەڵکی راکێشاوە نەك خودی کەسەکە، ئەمە پێوەری کۆمەڵگەی کوردەوارییە بۆ پیاو بوون لە رووی دەروونیەوە، لەراپرسیەکدا خەڵك بەم شێوەیە دەڕواننە پیاو:

مامۆستایەك دەڵێ: پیاو سەروەرە، پیاو مەوقیفە، پیاو نەترسە، پیاو لێبوردەیە، پیاو هاوکارە، پیاو تەواوکەری ژیانە، پیاو کەسایەتیە، پیاو ئارامگرتنە، پیاو بەخێوکارە)

پیاوێکی تەمەن ٣٧ساڵ: پیاو ئەو تاکەیە کەلەنێو کۆمەڵگەدا کەسایەتی هەبێ لەرووی پەروەردەو بژێو کێشە کۆمەلایەتیەکانی چارەسەرکەر بێ، وەپیاو وەنەبێ تەنها بەرەگەزی نێر بوترێ بەڵکو زۆر ژنیش هەیە لەناو کۆمەڵگەدا بەژنێکی لێهاتوو یان پیاوانەیە، یان بەهەیبەت، یابەچارەسەرکەری کێشەکانی دادەنرێ، لەوانەیە زۆر روداومان گوێ بیست بووبێ کەئەوەی ژن کردوێتی پیاویش پێی ناکرێ کەواتە پیاو بریتیە لەو تاکەی کە ماڵ بەڕیوە دەبات لەرووی بژێوی پەیداکردن و سەربەخۆبوون.

ژنێکی مامۆستا: (پیاو بەرای من کەسێکە کەدڵ گەورەو فراوان و لێبوردە بێ و رێزو خۆشەویستی بۆ خێزانەکەی و دەوروبەری هەبێ و بەبەزەیی بێت و نموونە بێت لەهەڵسوکەوت و

ڕێزلێنان بۆ یەکەم خێزانەکەی بەتایبەتی و کۆمەڵیش بەگشتی بەڵام لەهەمان کاتدا سوربێ لەسەر بڕیارە ڕاست و دروستەکانی و واقیع بینانە بێت)

یەکێکی تر دەڵێ: (بەرای من پیاو ئەو کەسەیە کەبەرێز بێت واتا ڕێز لەخێزان و ماڵ و منالی بگرێت ڕێز لەکەسانی دەوروبەر بگرێت، نەك لەناو کۆمەڵگەی ئێمە پیاو بەوە دادەنێن کەئەبێ بەس خزمەت بکرێت لەلایەن ژنەکەیەوە یان عائلەکەی و ئەمر بکات بەسەر کەسانی تر بەتایبەت ئافرەت چونکە پیاویش مرۆڤێکە پێویستە گیانی هاوکاری هەبێ گوێ نەدا بەوەی کەیارمەتی خێزانی بدات بڵێن ئەوە ئۆمەرە چونکە پێغەمبەریش درودی خوای لێ بێت یارمەتی خێزانەکانی داوە)

فەرمانبەرێك: (پیاو نێرە، ژنی هێناوە، ڕاستگۆیە لەگەڵ دەوروبەری و ڕێزی خۆی و غەیری خۆی دەزانێ چەند باشترین لەگەڵ خەڵك ئەوەندە پیاوترە)

بەڵام لێکدانەوەی لۆژیکیانە بۆ پیاو بوون شتێکی دیکە دەڵێت، کە هەر کەسێك بە گوێرەی باوەڕی خۆی هەڵیدەسەنگێنێت، کەسێکی موسڵمان کە سەری بڕوا نوێژی نەڕوا لەوانەیە کچەکەی خۆی بدا بەکەسێك کە وەکو خۆی بێت و هەر لەو جۆرەش بەپیاو دەزانێت، بەهەمان شێوەش بۆکەسێك پێچەوانەی ئەوە بێت.

مامۆستایەکی پیاو: پیاو بوونەوەرێکی خوای گەورەیە لەرووی تواناو تاقەتەوە لەئافرەت بەهێزترە، بەڵام لەئێستای کۆمەڵگا نیو چارەکی کۆمەڵگایە.

مامۆستایەکی ئافرەت: بەڕای من پیاو جوانی ماڵەو پێویستی سەرەکی ماڵ و ژیانە

مامۆستایەکی ئافرەت: بەشێوەی گشتی پیاو لەکۆمەڵگای ئێمە باڵادەستە خۆی زاڵ دەکات بەسەر ڕەگەزی بەرامبەر بەڵام پیاوی باشیش هەیە بەڵام دەگمەنە.

مامۆستایەکی پیاو: پیاو مرۆڤی نێری تێگەیشتووە لەرووی جەستەییەوەو هیچی دیکە نا، نەپێوەرە بۆ هیچ بەهایەك نەهیچ ئەولەویەتێکی هەیە بەسەر ڕەگەزەی مێ، مەگەر لەرێگەی ئەو خاسیەتە تایبەتیانەی کەدەشێ هەر ڕەگەزێك لێیان بەهرە مەند بێت، مرۆڤ هێشتا لەقۆناغی کۆرپەلەییدایەو ماوێتی بگات بەمرۆڤایەتی .

مامۆستایەکی ئافرەت: بەرای من پیاو ئەوەیە کەدەسەڵاتی بەسەر هەموو شتێك هەیە دەتوانێ شتەکان چاك بکات و نێکی بدات دونیاش بێ پیاو نابێ.

مامۆستایەکی ژن: پیاو ئەو کەسەیە کەدەبێت دەسەڵاتێکی گەورەی هەبێت لەناو خێزاندا بتوانێ خێزان پەروەدە بکات و ڕێگای راست پیشانی منداڵەکانی بدات.

-مامۆستایەکی پیاو: پیاو ئەو کەسەیە کەپیاوەتی خۆی بپارێزێ و بەکاری بێنێ لەرووی دەروونیەوە هاوسەنگ بێت و خۆگونجاو بێت لەگەڵ دەوروبەرو رەگەزەکەی تر، لە رووی کۆمەڵایەتی و ئیداری و ئیشی ناوماڵەوە بەگوێرەی پێویست و پەروەردەی منداڵەکانی بکات
.

مامۆستایەکی ژن: پیاو ئەو کەسەیە کەلەخێزانەکەی تێبگات و لێبوردنی هەبێت.

مامۆستایەکی ژن: بەشێوەیەکی گشتی خیانەتکار و خۆبەزلزانن و وادەزانن هەموو شتێکن، بەڵام بەشێکی کەمیشیان باشن دەتوانی متمانەی پێبکەی و پشتی پێ ببەستی.

ژنێکی ماڵەوە: لەکۆمەڵگەی ئێمە پیاو هەموو شتێکەو بڕیاردەرە گەورەی ماڵە تارادەیەك دیکتاتۆرە هەرچ خۆی بیەوێ دەیکات گوێ ناداتە زۆر شت وەکۆمەڵگەش ڕێگر نییە لێی.

پیاوێکی کاسب: پیاو ئەو پیاوەیە سیفەتی ژنانی نەبێت لاسایی ژنان نەکاتەوە وەکو بەردانەوەی قژی درێژ، پیاو ئەو پیاوەیە لەرەفز نەترسێت.

پیاوێکی مامۆستا: پیاو ئەو کەسەیەکەوا ژن دەهێنێت و دەبێتە سەرۆك خێزان و بەهێزترن لەژنان و لەژنەکەی ئەترسێت و بزانێ کەوا ئیشی ئەو دیارەو هی هاوسەرەکەشی دیارە، ئەو ئیش نەکات و هاوسەرەکەشی سەیری دراما بیانیەکان بکات.

پیاوێك: گومانم لەم پرسیارە هەیە...تۆ بڵێی پیاوی ئێستا ئەوە بێ کەجاران دەیانویست!

## کارکردنی پیاو لەماڵەوە:

**زۆر ئاساییە پیاو کاری ناوماڵ بکات، بەڵام لەبەر قسەی خەڵك رایناگەیەنێ کەلەماڵەوە کار دەکات، رۆژێکیش دێتەکایەوە بەلایەوە ئاساییە رایبگەیەنێ کەلەماڵەوە کار دەکات**

بۆهەر دیاردەیەکی کۆمەڵایەتی، پێویستە بارودۆخ و هەلومەرجە زاتی و مەوزوعیەکان لەبەرچاو بگیرێ، هیچ کاتێکیش بارودۆخە خودیەکان نەبوونەتە هێڵی سەرەکی و پێش گۆڕانی ژیان بکەون، پێشتر ئافرەت پەچەو عەبای نەبوایە لێی دەبووە شورەیی، (هەرچەندە ئافرەتی کورد هەرگیز پەچاو عەبای نەبووە بەڵکو لە دەروبەریەوە وەریگرتووە)، ئەگەر ئێستا ژمارەیەك لەپیاوان لەماڵەوە هاوکاری ژنەکانیان دەکەن ئەوا پێشتر ئەوەش نەبووە، هەروەها ژمارەی فەرمانبەران و مامۆستایانی ئافرەت بەرادەیەکی یەکجار زۆر پەرەی سەندووە، چەندە ئەو ژمارەیەش زیاد بکات ئەوەندە پیاو ناچار دەبێت لەماڵەوە کاربکات، ئەو هاوکێشانەی سەرەوە لەئەنجامی گۆڕانی هەلومەرجەکانی ژیان هاتونەتە ئاراوەو هیچ کەس و لایەنێك نەیسەپاندووە، گۆڕانکاریەکانی ئایندەش بەتایبەتی لەبواری پێشکەوتنە کۆمەڵایەتیەکان و بەپیشەسازیکردنی کوردستان بەمانا فراوانەکەی کەشتێکی حەتمیەو لەقازانجی مەسەلەی یەکسانی پیاو ئافرەتدایە، بەتەواوەتی کاری ناوماڵ لەنێوان ژن و مێرد دەکاتە واقعێکی حاشا هەڵنەگر، بەڵام سەبارەت بەبارودۆخە خودیەکان هێشتا زۆر کەس پێیانوایە تەنانەت کەئافرەت نەچێتە بەر خوێندنیش، لەهەمانکاتیشدا هەرپێشیانوایە کەدەبێت ئافرەت بەتەواوی لەهەموو

بوارێکی ژیاندا بەشداری پیاو بکات بێگومان ڕەوتی گۆڕانکاریەکان تەرازوەکەی بەلای دووەمدا دەشکێنێتەوە، لەئەنجامدا کارکردنی پیاو لەماڵەوە وەك کارکردنی ئافرەت دەبێتە شتێکی ئاسایی ...ڕەنگە هەموو پیاوێك حەز بکات لەماڵەوە خزمەتبکرێ بێ ئەوەی هاوکاری ژنەکەی بکات، بەڵام لەگەڵ پەیدابوونی منداڵ و ئاڵۆزبوونی ژیان و زۆربوونی ئەرکەکانی خێزان هاوکێشەکە دەگۆڕێت، بەپێی لێکۆڵینەوەکان ڕەگەزی مرۆڤ لەبنچینەدا بوونەوەرێکی هاوکارە، هاوکاری نەکردنی ئافرەتیش لەلایەن پیاوەوە لەئاکامی سەپاندنی دابونەریتێکی (باو) ەوەیە ئەگینا تەنها ڕەگەزی مرۆڤە کە لەرەفتاریدا گیانی هاریکاری هەبێت، ئەویش لەپێگەی خۆیەوە کار لەمنداڵەکەی دەکات، ئەو منداڵەی کەپیاو چاوەڕوانی دەکات و پێی شاگەشکە دەبێت، کەسایەتی ئافرەتیش لەسەر دەرونی منداڵ ڕەنگ دەداتەوە، گرفتی کۆمەڵگای ئێمەش لەنێوان (باو) و (هەقیقەت) دا دروست دەبێت، بەگرفتەدەرونیەکانی پیاویشەوە، ئێمە لەگەڵ نەریتی باوودا ڕاهاتوین و کەچی چەندان پیاو لەگەڵ هاوسەرەکانیان لەماڵەوە کاردەکەن، بەڵام لەبەر دێوەزمەی نەریتی باو دانی پێدا نانێن، لەوانەشە ئەگەر دەوروبەرەکەی بزانن سەر زەنشتیشی بکەن، کارکردنی پیاو لەماڵەوە سەپاندنی فەرمان نییە لەلایەن ئافرەتەوە، تەنها لەکاتێکدا سەپاندنە کەپیاو هەست بەکەمی بکات، هەستی پیاوەتی پیاویش وا ڕاهاتووە لەگەڵ بارودۆخە باوەکانی کۆمەڵگا بگونجێت، بەگۆڕانی کەلتورە باوەکان هەست ونەستیش دەگۆڕێن، تائافرەتیش لەماڵەوە بێت ئیستیعابی بۆ ژیان کەمتر دەبێت، لەکاتێکیشدا بەشێ لەئافرەتان پێیان خۆشە پیاوەکان لەماڵەوە کاربکەن کەکاتی ڤاڵایی زۆر بێت، بەڵام ئایا ئەگەر ئافرەتەکە لەفەرەمانگە بوو یان لەشوێنی کارکردندا بوو پیاوەکە پەنا دەباتە بەر ژنی دراوسێکەی بۆ بۆ خزمەتکردنی خۆی یا منداڵەکانی؟!بێگومان نەخێر، ئەوە نمونەیەکە دەسەلمێنێ کەبارودۆح هەژموونی خۆی بەسەر ژیانی مرۆڤەکان دەسەپێنێت، کاری ناوماڵیش ئەگەر لەکەسێتی پیاو کەم بکاتەوە ئەوا پیاوەکە لەبنەڕەتدا خۆی کەسایەتی لاوازەو هەست بەکەمی دەکات، منداڵیش کەدەبینێت باوکودایکی هاوکاری یەکتری دەکەن ئەویش گیانی هاوکاری تێدا چێ دەبێت، بەڵام ئەگەر باوکەکە لەدایکەکەی داو سوکایەتی پێکرد ئەوا منداڵ لاسایی ئەوەش دەکاتەوە، لەئەنجامدا فێری دەستدرێژی و توندوتیژی دەبێت و ئەو سوکایەتیەش بۆ ئایندەی منداڵەکەش دەبێتەباو.

کارکردن و کارنەکردنی پیاو بەستراوە بەقۆناغە کۆمەڵایەتی و ئابوری و سیاسیەکانی کۆمەڵەوە چونکە ئەو کارکردن و کارنەکردنە لەدایکبووی ئەمڕۆ نییە، ئەمڕۆش بەئاسانی هاوکێشەکە ناگۆڕێت، چونکە دروستبوونی بۆچوونەکان لای مرۆڤ ماوەیەکی زۆری کێشاوەو ماوەیەکی زۆریشی دەوێت هەتا دەگۆڕێت، لەگەڵ گۆڕانی بۆچوونەکان هەستەکانیش دەگۆڕێن، قسەش لەسەر ئەوروپاو هاوردنی دابونەریتی ئەوان راست نییە، چونکە دابونەریتی هەر میللەتێك رەنگدانەوەی قۆناغەکەیەتی، ئەگینا ئەوانیش لەسەدەکانی ناوەڕاست و پێش رێنیسانس هەڵسوکەوتیان لەگەڵ ئافرەتدا شێوەیەکی تر بووە لەچاو ئێستا، گۆڕانی ژیانیش لەکەس شەرم ناکات و حەتمیەتی مێژووە، لەکۆمەڵگەی کوردەواری پیاو هەیە یارمەتی ژنەکەی دەدات بەتایبەتی لەکاتی نەخۆشی و پیشەو هەرکاتێکی پێویست بەتایبەتیش ئەو ژن و پیاوانەی کەهەردووکیان لەدەرەوەی ماڵ کاردەکەن، سەبارەت بەم بابەتە لەراپرسیەکدا سەبارەت بەکارکردنی پیاو لەماڵەوە کەلەسەر ٧٠٠ژن و ٤٠٠پیاو ئەنجام درا بەم شێوەیە بوو سەبارەت بە ژنەکان

لە ٧٠٠ژن تەنها ٤٠ کەسیان دەڵێن کارکردنی پیاو لەماڵەوە نائاساییە

١١٠دەڵێن تارادەیەك ئاساییە

٥٥٠کەسیان دەڵێن کارکردنی پیاو لەماڵەوە ئاساییە

بەڵام سەبارەت بەپیاوان کە لەسەر ٤٠٠کەس راپرسی کراوە ئایا لەماڵەوە کاردەکەن و پێیان ئاساییە بەم شێوەیە وەڵامیان داوەتەوە

٣٠١کەسیان بەلایانەوە ئاساییە کار لەماڵەوە بکەن

٩٩کەسیان دەڵێ، زۆر بەکەمی

کۆی گشتی رێژەی ٪٣کارکردنی پیاو لەماڵەوە بەنائاسایی باس دەکەن

رێژەی ٪٩٧ پێیانوایە ئاساییە پیاو لەماڵەوە کاربکەن

لەراپرسیەکدا ئەو ژن و پیاوانە ئاوا رای خۆیان دەردەبڕن، ئێمەش وەکو خۆی هەندێکی دەخەینە روو:

- مامۆستایەکی پیاو: بەلامەوە ئاساییە کاری ناو ماڵ بکەم....ژیانی من چوار ساڵ لەبەشەناوخۆیی بووە لەبەشەناوخۆش دەبێ بەدەستی خۆت خزمەتی خۆت بکەی هەرلەبەر

ئەوەش زانیومە ئەم ئەرکەی ناومالّمان چەندە زەحمەتە بۆ کابانەکان بەلاّم بەخۆشحالّیەوە ئامادەم کەیارمەتی خانەوادەکەم بکەم بۆکاری ناومالّ .

- پیاوێك تەمەن ٤٣ساڵ: بەڵێ ژن و پیاو تەواوکەری یەکترن ئەو ماڵەی کەتێدا دەژین هی هەردووکمانە یارمەتیدانی ئافرەت بەئەرکی سەرشانی پیاو دەزانم بەهەردوو لایەن دەتوانین هەموو پێداویستیەکانی ژیان بەدی بێنین ژن و پیاو تەواکەری یەکترن لەژیان و بەڕێوەبردنی ماڵ.

مامۆستایەکی پیاو: بەلّی زۆرکارم کردووە بۆوەی خێزانم بزانێ کەئەم مالّە مالّی هەردووکمانە بۆ وەی رەنگدانەوەی لەسەر مندالّەکانم هەبێ بۆوەی کەشوهەوای رەفاهیەت و خۆشی بۆ مالّەکەم بێت، یارمەتیدانی ئافرەت شتێکی پیرۆزە، ئەگەر ژن و مێرد لەگەڵ یەکتر بەرێز بن و هاوکاربن مندالّەکان پەروەردەی باش وەردەگرن.

فەرمانبەرێکی پیاو: بەڵێ بێگومان زۆربەی کات یارمەتی ژنەکەم دەدەم چونکە جیاوازی نییە لەنێوان پیاووئافرەت ئەگەر ئەو کاتەی نەبێت کارەکە ئەنجام بدات خۆم دەیکەم)

مامۆستایەکی کوڕ: بەڵێ تائێستاش جلی خۆم بەخۆم دەشۆم و زۆر جاریش شیو لێ دەنێم، زۆرجاریش هیچ ژن لەماڵ نەبووە بۆ خۆم خواردنم بۆ هەموان ئامادەکردووە، بەنیسبەت جلشۆرین پێم گرنگ نییە هەر بەخۆم ئەشۆم نامەوێ دایك و خوشکم ماندووکەم ئاساییە.

-پیاوێك: زۆر کەم، پێویستی نەکردووە چونکە مالّمان سەربەخۆ نییە بەلاّم ئەگەر پێویست بێ یارمەتی دەدەم.

پیاوێك دەرچووی زانکۆ: زۆر شتێکی ئاساییە چونکە ئێمە وەکو ئیسلام خوای گەورە لەسەر ئێمەی داناوە وەکو مافێکی دیاریکراو بەرامبەر ئافرەت دەبێ رێزی بگرین و مافی بدەین .

گەنجێك- زۆر قەناعەت بەدەستی وان ناکەم  پێم وایە نایزانن بشۆن، زۆر لام ئاساییە.

لەراستیدا ئەگەر دیقەتی راوبۆچوونی ئەوپیاوانە بدرێ هەست بەگۆڕانکاری دەکرێ لەرەفتاری پیاو سەبارەت بەکارکردن و هاوکاریکردنی هاوسەرەکەی لەمالّەوە بەبەراورد لەگەڵ نەوەکانی پێشتر.

سەبارەت بەرا وەرگرتنی ژنایش کەئایا پیاوەکانیان لەمالّەوە یارمتیان دەدەن :

- ژنێکی مامۆستا: بەڵێ پیاوەکەم یارمەتی داوم لەزۆربەی کاتەکاندا لەبەرئەوەی هەردوکمان دەوامان هەیە وەمن بێجگە لەمامۆستایەتی کارێکی تریش دەکەم و ئەرکی مالّەوەش دەکەم بۆیە بەزۆربەی کارەکانمان هاوکاریەکتری دەکەین.

- ژنە مامۆستایەك دەڵێ: ئەگەر ئەمن لەماڵەوە نەبم ئەوا ئەو قاپوشتانەی پیس دەكات خاوێنی دەكاتەوە بەڵام ئەگەر خۆم لەماڵەوە بم ئەوا لەدەست لەپەرداخەكی نادات و تەنانەت ئیشی دەرەوەش هەر بەخۆم دەكەم.

- ژنێكی تر: بەڵێ هەندێ جار یارمەتی داوم لەكاتی پێویست بەڵام خۆم حەزناكەم پیاو لەئیشوكاری ناوماڵ یارمەتیم بدا هەركەسەو بەئیشی خۆی جوانە بەڵام لەكاتی پێویست یارمەتیم دەدات.)

- یەكێكی تر (بەڵێ زۆر زۆر یارمەتی داوم چونكە هیچ كارێك نییە تایبەت بێ بەژن و شمولی پیاو نەكات وەخۆشەویستی بنەمایەكی یارمەتیدانی هاوسەرەكەمە بۆ من )

- ژنێك: (هەندێجار یارمەتیداوم بەتایبەتی لەكاتی نەخۆشی یان من كارێكی گرنگترم هەبووبێ)

- ژنێك: (هەندێجار بەڵام زۆرجار یارمەتی نەداوم چونكە تەمبەڵە حەز لەئیشوكاری ناوماڵ ناكات، بەس داوا دەكات بۆی ببەم)

سەبارەت بەژنەكان مامۆستایەكی ژن دەڵێ: نەخێر پیاوەكەم یارمەتیم نادات لەبەرئەوەی لەگەڵ ماڵی خەسومم خەسوم و خوشكی پیاوەكەم یارمەتیم دەدەن لەئیشی ماڵ و بەخێوكردنی منداڵەكەم.

ژنە مامۆستایەكی دیكە دەڵێ: نەخێر چونكە لەناو كۆمەڵگەی ئێمە ئافرەت ئیشی خۆی هەیەو پیاویش ئیشی خۆی ئەگەر هەندێك كاری زۆر پێویست بوو ئەگەر یارمەتی ئافرەت بدرێ ئاساییە تەنها كاری گران یان لەكاتی نەخۆشی یارمەتی ئافرەت بدە ئەگەینا پێویست ناكات یارمەتی ئافرەت بدەی.

ژنەمامۆستایەك: نەخێر تەنها ئیشی سادەو سوك نەبێت

نەخێر بەدەگمەن تەنانەت ئیشی خۆیشی بەمن دەكات بەس هەندێحار نەبێ بەیانیان هێلكەو رۆن دەكات بەرای من هەر پیاوێك كاری ماڵەوەی نەكرد ئەمە بەمنداڵی هەموو كارێكی بۆ جێبەجێ كراوە تا گەورەش بووە نازی هەڵگیراوە بۆیە ناتوانن كاری ماڵەوە بكەن.

هەموو كارێك نا، بەڵام هەندێك كارهەیە ئەگەر یارمەتی ماڵەوە بدات زۆر ئاساییە.

مامۆستایەكی ژن: بەڵێ تارادەیەك ئاساییە چونكە زۆرجار پێویستە پیاو هاوكاری خێزانی بكات ئەویش لەكاتی ناتەواوی تەندروستی

مامۆستایەکی ژن: پیاوەکەم هەندێك جار یارمەتیم دەدات بەڵام زۆرجار یارمەتی نەداوم، چونکە تەمبەڵە حەز لەئیش و کاری ناوماڵ ناکات بەس داوا دەکات بۆی بێنم .

مامۆستایەکی ژن: بەبۆچوونی خۆم زۆر ئاساییە پیاوکاری ناوماڵ بکات.

مامۆستایەکی کچ: بەلامەوە ئاساییە هاوکاری یارمەتی خێزانی خۆی بدات

مامۆستایەکی ژن: بەڵێ زۆر ئاساییە چونکە پیاو بەئیشەوە جوانە

مامۆستایەکی ژن: بەلامەوە ئاساییە پیاو کاری ناوماڵ بکات و جیاوازی نەبێت لەنێوان پیاو ژن، چونکە پیاو بەئیشی ناوماڵەوە جوانە دەبێت زۆر زۆر هاریکاری ئافرەت بکات بەتایبەتی لەئیشی ماڵدا.

مامۆستایەکی ژن: زۆرئاساییە پیاو کاری ناوماڵ بکات، چونکە ئێسیتا جیاوازی لەنێوان پیاو و ژندا نیە

زۆر ئاساییە کاروباری ناوماڵ بکات بەڵام هەموو جۆرە کارێك نا بۆ ئەوەی نەبێتە لەدەستدانی کەسێتی پیاوەکە لەکۆمەڵگەی ئێمە.

مامۆستایەکی ژن: ئاساییە پیاوەکەم لەماڵەوە یارمەتیم بدات چونکە ژیانی ئێستا گۆڕاوە کەئافرەت و پیاو هەردووکیان بەیەکەوە لەدەرەوە کاردەکەن بۆیە پیاوەکەش یارمەتیم دەدات لەناو ماڵ لەکاتی تەنگانە، بەڵام بەشێوەی گشتی پیاوی شەرقی فێر نییە کاری ئافرەت بکات چونکە لەمنداڵییەوە فێر نەکراوە.

مامۆستایەکی کچ: باوکم یارمەتی داوین بەڵام براکەم نەخێر ناتوانێ پەرداخێك ئاویش بۆ خۆی بێنێ داوا لەئێمە دەکات کەبۆی بێنین، بەڵام باوکم یارمەتی زۆری داوین کاتێ دایکم لەنەخۆشخانە بووە ئەو هەموو شتێکی بۆ کردووین .

مامۆستایەکی کچ: بەڵێ بابم و براکەم یارمەتیان داوین، چونکە زۆرکات هەبووە بەتەنها فریای ئیشەکان نەکەوتوین یان هەر نەمتوانیوە ئیشەکە بکەم بەراستی خواردنی براکەم زۆرخۆشترە لەهی من.

مامۆستایەکی پیاو: دەڵێ کاری ناوماڵم کردووە تائێستاش جلی خۆم خۆم دەیشۆم و زوۆرجاریش شیو لێدەنێم .

مامۆستایەکی پیاو: بەڵێ دەبێ پیاو یارمەتی خێزان و دایك و خوشکی بدات من خۆم زۆر یارمەتیم داون زۆرئاسایە بەڵام چونکە ئەوە دەبێتە هۆی خۆشەویستی نێوانیان.

مامۆستایەکی پیاو: نامەویٚ کاری خۆم بەکەسانی دیکە بکەم، ئەندامانی دیکەی خێزانەکەم ئەوانیش وەکو من حەز دەکەن تەنها کاری خۆیان بکەن.

مامۆستایەکی پیاو: بەڵێ چونکە بەرزترین و ئازیزترین کەسی سەر زەوی کەپێغەمبەرە (ص) هەندێ کاری ناومالٚی کردووە بەهەمان شێوە حەزرەتی ئەبوبەکر و ئیمامی عومەر رەزای خوایان لیٚ بیٚت کاری ناوماڵیان کردووە بۆیە من کاری ناوماڵ بەواجبی پیاو دەزانم نەك ئافرەت

مامۆستایەکی کوڕ: من ئیش و کاری ناوماڵ دەکەم چونکە شتێکی ئاساییە مرۆڤ یارمەتی خێزانەکەی بدات لەلایەك بەڵام لەلایەکی تر من نەخۆشم هەیە هەموو کارێك دەکەم چونکە یارمەتی و هاوکاری بەڕای من دەبێتە مایەی خۆشی و دڵخۆشی خێزان.

مامۆستایەکی پیاو: بەڵیٚ چونکە یارمەتیدان هاوکاریکردن لەئیش و کاری ناوماڵ بناعەی خێزان پتەوتر دەکات و ریٚزو خۆشەویستی زیاتر دەکات لەژیانی هاوسەری چونکە هاوسەرەکەت لەم یارمەتیدانە هەست بەوە دەکات کەوا یارمەتی دەری هەیەو ریٚزو لەماندووبوونی دەگرێت راپەراندنی کاری ناوماڵ.

پیاو بەرای من کاری ئاساییە کەیاوەری ماڵەوە بدەین چونکە هەموو کارێك بەهەرەوەزی ئاسان دەبێت، بەڵام نەگاتە ئەو رادەیەی کەزاڵ بن لەسەرت یاخود سنور ببەزێنن.

پیاوێکی کرێکار: یارمەتیدانی ماڵەوە ئاساییە کەوا یارمەتی بدەیت بەڵام بەئەندازەیەکی دیاریکراو چونکە هەندێك ئیش هەیە تایبەتە بە ئافرەتان نەك پیاوان.

پیاوێکی کاسبکار: بەلامەوە زۆر ئاساییە چونکە ئێمە موسڵمانین ئاینەکەمان هانمان دەدات بۆیارمەتیدانی یەکتری لەهەموبوارەکانی ژیان هاوسەری ژیانیش نزیکترین کەسە بەنیسبەت هاوسەرەکەی لەناو ماڵ هەتا هەتایە بەیەکەوە ئەبن بۆیە پێویستەو واجبیشە کەوا کاری ناوماڵ لەگەڵی بکەی و یارمەتی بدات خۆشەویست محمد د خ دەفەرموێت باشترینتان ئەو کەسەیە کەلەگەڵ ماڵەوەتان باشبن

پیاوێکی دەسگێڕ: بەڵی زۆرکارم کردووە بۆئەوەی خێزانم بزانیٚ کەئەم ماڵە ماڵی هەردووکمانە بۆوەی رەنگدانەوەی لەسەر منداڵەکانم بێت یارمەتیدانی ئافرەت شتێکی پیرۆزە ئەگەر ژن و مێرد لەگەڵ یەکتر بەرێز بن و هاوکار بن منداڵەکان پەروەدەی باش وەردەگرن.

پیاوێك: من تارادەیەك لەکاری بچووکدا یارمەتی ماڵەوەم داوە، بەڵام زۆرنا چونکە دڵیان نایە ئیشم پێ بکەن بەڵام لەحاڵەتی نەخۆشیدا ئەوا دەبێ یارمەتی ماڵەوە بدەم لەکۆمەڵگای ئێمەدا ئەگەر پیاوێك ئیش بۆ خێزانی یاخود بۆدایکی بکات دەڵێن ئەوە ئۆمەرە.

پیاوێکی فەرمانبەر: بەڵێ کاری ناوماڵم کردووە، چونکە خێزانەکەم وەکو من وەزیفەی هەیەو هەورەها هاوکاریکردنی خێزانم بەواجب دەزانم ئافرەت بریتی نیە لەخزمەت کارێك بەڵکو هەردوکیان تەواکەری یەکترن.

فەرمانبەرێك: کاری ناوماڵم زۆر بەکەمی کردووە چونکە زۆر کەم لەماڵم بەڵام کەبەتەنیا بم کاری ماڵێ بەتەنیا دەکەم و هەموو کارێکی ناوماڵیش دەزانم.

مامۆستایەکی گەنج: هەندێجار بۆخۆدەرخستن کاری ناوماڵم کردوە

مامۆستایەك: ماڵمان جیا نیە بۆیە زۆرکەم کاری ماڵم کردووە

مامۆستایەکی پیاو: بەشە ناوخۆیی کاتی قوتابێتی فێری کردم کاری ناوماڵ بکەم

ژنێك: من وەکو ئافرەتێك قبول ناکەم ئەرکی ماڵەوە بەتەنیا لەئەستۆ بگرم بۆیە پیاوەکەم یارمەتیم دەدات

مامۆستایەکی ژن: پیاوی چاك ئەوەیە یارمەتی خێزانکەی بدات منیش حەسابی ئەوە دەکەم کە پیاوو پیاوەو ژنیش ژن

مامۆستایەکی ژن: من هاوسەرگیریم نەکردووە ئەوەی دەبێتە هاوسەرم بێگومان دەبێ یارمەتیم بدات ئەگینا شوی پێناکەم

ژنێك: بەڵێ بەئاسایی دەزانم پیاوەکەم یارمەتیم بدات چونکە ئافرەت بەتەنیا بەکاری ماڵەوە راناگات

ئاساییە بۆئەوەی خۆشەویستی لەنێوانیاندا هەبێت

ژنێکی مامۆستا لەرانیە: جل شوشتن و منداڵ شوشتن و قاپ شوشتن و مافور شوشتن بۆ پیاو ئاسایی نیە بەڵام هەندێ ئیشی دیکە ئاساییە

ژنێکی مامۆستا لەرانیە: ئەگەر پیاو کاری ناوماڵ بکات پێ دەڵێن ژنانیە

فەرمانبەرێکی تەندروستی لەدەربەندیخان: دەمێکە لای من ئاسایی بووە لەماڵەوە کاربکەم

کچە دەرچوویەکی پەیمانگەی وەرزشی: هاوکاریکردنی ژن زۆر ئاساییە بەڵام ژن لەکۆمەڵگای ئیمە بشمرێ هەر دەبێ ئیش بکات

ژنە فەرمانبەرێك: زۆر زۆر بەلامەو ئاساییە، بەڵام من هاوسەرەکەم ئیشم بۆناکات چونکە دایکی هیچ ئیشی پێنەکردووە ئێستاش فێر نابێت، بەڵام کارکردنی پیاو لەماڵەوە ئارامی بەئافرەت دەبەخشێ.

ئەگەر لەپرسی کارکردنی ژن لەماڵەوە وردبینەوە ژنی کوردەواری زۆر مەزلۆمە، کەهەر لەبەیانیەوە دەجولێ تا درەنگی شەو و هیچ پشودانێکی نییەو بەردەوام عەرەق دەکات و بێزار دەبێت، هەر ئەو عەرەقکردنەیە کەبێزاری دەکات و پرتەو بۆڵە دەکات، چونکە مرۆڤ رەگەزەکەی هەرچییەك بێ پێویستی بەماوەی پشوودانی لەش و حەوانەوەو بەخۆداچوونەوە هەیە، بەڵام ئەم لەم پشوودانە جیاوازیەکی یەکجار زۆری لەگەڵ پیاو هەیە، ئەگەر ١٠پیاو لەژورێکدا دانیشتبن ئەوا ژنەکە خواردن بۆ ئەو ١٠کەسە ئامادە دەکات بێ ئەوەی بۆ یەك جاریش بێ ئەو پیاوانە یارمەتی ئەو ژنە نادەن، ئامادەکردنی خواردنێك بێگومان ٣تا ٤کاتژمێری دەوێت وێڕای شوشتن و هەڵگرتنی قاپ و تفاقی تر کە بۆ هەر قاپێکی خواردن ئەو ژنە چەند جارێك هەڵدەستێ و دادەنێشێ و منداڵەکەشی لەو لاوە داواکاری هەیەو لەدەرگاش بدرێ هەر دەبێ ئەو بیکاتەوەو منداڵەکەشی قاچی لار بێتەوە یەکسەر پیاوەکە هانا بۆ ژنەکە دەبات و خۆی نابێ قسەی میوانەکەی ببڕێ رەنگە ئەو ژنە دەوامیشی هەبێت و پیاوەکەشی بۆ سبەینێ جلوبەرگی خاوێنی دەوێ ...بەو شێوەیە ئەو ژنە خۆی لەبیر دەکات و نەدەزانێت پیاسەکردن چییە نەدەزانێت جلکی جوان چییە نەدەزانێت گەشتوگوزار چییە، هێشتا وەوعی ژنی لادێنشین و کوردەواری و ماڵە جوتیاری جاران زۆر باشتر بوو لەوەی ئێستا کەسەرەڕای دەوامکردنی کارەکانی ناماڵیش هەر دەکات بێ ئەوەی یارمەتی بدرێ...تد

## پۆشاکی پیاو:

### جلوبەرگ ڕەنگدانەوەی ناوەوەی مرۆڤەو کار لەکەسی بەرامبەر دەکات

لە هەموو قۆناغێکی تەمەن مۆدێلێك هەیە بۆجلوبەرگ و پۆشاك، لەقۆناغی شیرەخۆریدا مۆدێلی ئاسوودەیی یان پشودانە، لەقۆناغی هەرزەکاری مۆدیلی تازەگەری و بڕوا بەخۆبوون و گوزارشتکردنە لەخود، یان لاسایکردنەوەی هاوڕێیانە..تد.

ڕەنکە کەسێك جلوبەرگێکی زۆر سادە وساکار بپۆشێ بەڵام لەوانەیە خاوەن هرز و بیرکردنەوەی گەورە بێت، بایەخ بەناخی خۆی داوە ڕواڵەتی دەرەوەی لەلا گرنگ نییە، ئارایشت وجوانکاری و گەڕان بەدوای فاکتەری جوانی دەرەوە لای پیاو وەکو ڕازاندنەوەی نوسینگەو ئۆتۆمبیل یەکێکە لەپێداویستیە لاوەکیەکانی مرۆڤ، بەڵام ئەگەر تێرنەکرێ مرۆڤ ناڕوخێنی، ئەو پێداویستیانە دوای تێرکردنی پێداویستیە بنەڕەتیەکان وئاسایشی دەروونین، زیادەڕۆیی لەجلوبەرگ و زووگۆڕینی و خەرجکردنی پارەیەکی زۆر بۆی خوویەکی کوشندەیە دووچاری تاك دەبێت، ئاکامەکەی ئەوە نییە تاك بکوژێت، بەڵکو وای لێدەکات کە بۆ بەهێزکردنی کەسێتی خۆی بشت بە ڕواڵەت و جلوبەرك ببەستێ بۆ بە دەست هێنانی ڕەزامەندی دەوروبەر و ڕزکار بوون لە دڵەراوکێ.

بەو پێیەش ناخ و ناوەڕۆکی خۆی ئەگەر فەرامۆش نەکات ئەوا هەوڵی چاکسازی و گۆڕینی خۆی نادات بۆ ڕاستکردنەوەی خووە خراپەکانی یان گۆڕینی جۆری بیرکردنەوەی شێوازێکی لۆژیکانەو سەردەمیانە بێ بۆ بنیاتنانی خودێك کە بتوانێ زاڵ بێ بەسەریدا وبیخاتە ژێر ڕکێفی ئەقڵەوە.

پۆشاك ئەگەر ئامانج بێت لەپێناو خودی خۆیدا ئەوا بەشێك لە کەسێتی ئەو تاکە دەخاتە ژێر رکێفی خۆیەوە، ئەو تاکە بەبێ گۆڕینی رۆژانەی قاتەکەی خۆی بەکەم دەزانێت و لەجیاتی ئەوە پەرە بە تواناو هزری خۆی بدات دەچێت قاتێکی دیکە دەکرێت چونکە لەو باوەڕەدایە بەو روالّەتە کار لە دەوروبەری خۆی دەکات، ئەگەر کاریگەری کەسێتی تاك لە سەر کەسانی تر بە جلوبەرکەوە بێ کەواتە مرۆڤ پێویستی بەوە نییە کەسێتی خۆی یان ناخی خۆی پەرە پێبدات و گۆڕانکاری بەسەردا بێنێت، ئەگەر جلوبەرك وروالّەتی دەرەوەی  مرۆڤ بۆ پڕکردنەوەی ئەو "کەمی" یە بوایە کە تاك هەستی پێدەکرد ئەوا شارستانیەت هەرگیز دروست نەدەبوو، بۆیە زانای دەروونی ئەدلەر جەختی لەسەر ئەو کردووە کە هەستی خۆ بەکەم زانین هۆکاریکی گرنگە بۆ بنیاتنانی شارستانیەت، چونکە مرۆڤ هەمیشە رەچە "نزعە"ی بەرکەمالّبوون "تکامل"ی هەیە بۆ تەواوکردنی کەسێتی و خۆرزگارکردن لەو هەستە نەرێنیە کە بەهۆی کۆمەلاّیەتی نەبوونی ناخ وناوەڕۆك دێتە ئاراوە .

مرۆڤ ئەگەرسەرقالّی پەرەپێدانی ناخ و تواناکانی خۆی بێ بۆ بەرەو پێشچوون ئەوا مەسەلەی جلوبەرك نابێتە ئامانج، بەلّکو ئامرازێکە بۆ داپۆشین و جوانی جلوبەرگیش لە پاك و خاوێنی و ئوتووکردنیدایە، زۆرن ئەوانەی سالاّنە پارەی سەدان کتێب بە کڕینی "قات" دەدەن و ماوەیەکی زۆریش بۆ باسکردنی قاتەکانیان بە فیڕۆ دەدەن تەنانەت هەلّسان و دانیشتنیان بە شێوەیەکە نا بۆ خزمەتی کارکردن، بەلّکو بۆ تێکنەچوونی قەدی قاتەکانیانە، زۆر گۆڕینی جلوبەرك بووەتە رکابەری نێوان هەندێ لە پیاوان لە جیاتی ئەوەی رکابەری نێوانیان لە سەر کارەکانیان بێت، خەریکبوونی مرۆڤ بەجوانی وئارایشت و خۆڕزاندنەوەی لە سەر حیسابی بیرکردنەوەو چارەسەرکردنی گەندەلّیە یان لەسەر حیسابی بنیاتنانی ئەقلّ و مەعریفەتە، ئەرکەکانی جلوبەرگ هیچ کاتێك کارکردن وبیرکردنەوەی نمایشکردن بۆ خودی خۆی، ئەرکی شاردنەوەی جەستەی تاك، ئەرکی پاراستنی لە سەرماو گەرما .

کەواتە قات ئامرازە نەك ئامانج، مرۆڤیش چەند هەست بە بچووکی ناخی خۆی بکات ئەوەندە روالّەتی خۆی گەورە دەکات .

جل و بەرگ یان پۆشاك لەدێر زەمانەوە چ لەرووی شێوەوە چ لەرووی رەنگەوە کاریگەری لەسەر ئەو مرۆڤە هەبووە کە لەبەری دەکات و هەروەسا لەسەر ئەوەش کە لەبەرامبەردا دیقەتی دەدات، ئەو کاریگەریەش بەرادەیەکە کەباری دەرونی مرۆڤ لەرەشبینیەوە بەرەو گەشبینی و بەپێچەوانەشەوە دەگۆڕێ، زۆر جار بڕی جلوبەرگ واتە ژمارەی پارچەکانی لەناو هەندێ کۆمەلّگا نیشانە بووە بۆ بڕی

سەروەت و سامانی خاوەنەکەی تا ژمارەی پارچەکانی زیاتر بووبێ زیاتر رێز لە خاوەنەکەی گیراوە، سەلامە موسا گەورە نوسەرو روناکبیری میسری دەڵێ ئەگەر جلەکانمان کۆن بووبن ئەوا هەست بەلاوازی و ونبوون دەکەین و هەروەها هەست بە کەرامەت و شکۆیی دەکەین ئەگەر جلەکانمان شایستە بووبن، ئەو تۆژینەوانەی کە دکتۆر (ئیستیل رای) پزیشکی رژینەکان و هۆرمۆنەکان لەزانکۆی جۆرج تاون دەریخستووە کەوا ئەو ژنانەی کەگرنگی بەجلەکانیان دەدەن ئەوا بەشێوەیەکی نەستیانە گوزراشت لەئاستی بایەخدانیان بەخۆیان دەدەن، باری دەرونی مرۆڤ بەفاکتەرەکانی دەوروبەر کاریگەر دەبێت و جلوبەرگیش یەکێکە لەو فاکتەرانە چ لەسەر ئەو کەسەی لەبەری دەکات چ لەسەر ورەی دەوروبەری، ورەی کەسەکان دەکەوێتە ژێر کاریکەری جلەکانیان و جلی هاورێکانیان لەشوێنی کارو لەدەرەوەش، تۆژینەوە کۆمەڵایەتیەکان دەریانخستووە کەشخەیی جلوبەرکی پیاو و جلی سەرنجڕاکێشی ئافرەت لەشوێنی کارکردن ورەی هاورێیانیان بەرزدەکاتەوەو بەشێوەیەکی بەرچاو بەرهەمیان زیاد دەکات بۆیە زۆر لەخاوەنکاران سورن لەسەر ئەوەی کارمەندانیان جلی باش و کەشخە لەبەر بکەن، چونکە ئەو کەسەی کە گرنکی بەجلوبەرکی نادات هەستی روخان لای دروست دەبێت کە بە گوێنەدان گوزارشتی لێ دەکات، بۆ نمونە کاتێك جلوبەرکی وەرزشی لەبەر دەکەی هەست بە گوڕوتین وچالاکی دەکەی، بەڵام کاتێکیش جلوبەرکی نوستن یان ماڵەوە لەبەر دەکەی وەکو بیجامە یان دشداشە ئەوا هەست بەخاوبونەوەو تەمبەڵی دەکەیت، هەروەها کاتێك جلی رەسمی لەبەر دەکەی وەکو چاکەت و پانتۆڵ (قات) ئەوا پابەند بون و جدێتی زاڵ دەبی بەسەرتا بەپێچەوانەی جلی رۆژانە وەکو کابۆو تی شێرت کە هەندێ جار عەمەلی دەردەکەون، پۆشینی جلوبەرگی کوردیش بەتایبەتی بۆ پیاو هەستکردنە بەغیرەت وئازایەتی و چوست و چالاکی بەڵام جلوبەرگی ئێستای ژن بۆ جوانی و کەشخەییە چونکە جلی ژنان عەیب دادەپۆشێ و بەهۆی رەنگاو رەنگی و ئالاو والاییەوە سەرنجی سێکسیانەی پیاو رادەکێشێ و دەیانوروژێنێ و هەموو ژنێکیش بەجلوبەرگی کوردیەوە جوانە، جلوبەرگ وەکو شتەکانی دیکە کاریکەری لەمنداڵییەوە دەردەکەوێت وەکو شتەکانی دیکەی ژیان، لەمبارەیەوە تۆژەرێکی دەرونی لەزانکۆی مەلیك فەیسەڵ دەڵێ: لەسەرەتای ژیانی منداڵیی جلوبەرك ئەوەندە گرنکی نییە هەرچەندە بۆ شیرەخۆر سەرنجڕاکێشە، بەڵام لەگەڵ گەورەبوونیدا شێوەو نیگارو رەنگەکان سەرنجی رادەکێشن و جلوبەرك و پێڵاوو یاریەکانی بەشێکی گرنگ دەبێت لێی و بایەخی پێدەداو دەیانپارێزێ و بۆیە زۆر کەس پێیوایە هەلێکی باشە بۆئەوەی رایبێنی لەسەر بەرپرسیارێتی و پشت بەخۆبەستن لەکاتی لەبەرکردن و داکەندنیدا، سەرەڕای ئەوەش بەسەرچاوەی شانازی پێوەکردن دادەنرێ لای هاورێ و میوان و کەسوکاری

کەنیشانی برادەرەکانی دەدات و داوایان لێ دەکات دیقەتی وێنەو نیگارەکانی بدەن، هەروەها ئەو تۆژەرە سەبارەت بە کاریگەری جلوبەرك و قۆناغی منداڵی دەڵێ:

لەیەکێك لەوتۆژینەوانە کەلەباخچەی ساوایان کراوە دەرکەوتوە کەوا منداڵان لەجلوبەرکی مامۆستا رادەکەن و بێزی لێدەکەنەوە کەبینوییانە قاوەیی لەبەر کردووە و ئارەزوی ئەوە ناکەن لەو مامۆستایە نزیك ببنەوە کەئەمیش نائاسودەیی دەگەیەنێ و نەگونجان لەکەڵ ئەوانەی ئەو جۆرە جلوبەرگە لەبەر دەکەن.

بیرت دەڵێ: کەسێتی ئەو سیستمە تەواوکارەیە لەمەیل و ئامادەباشی جەستەیی و ئاوەزی (عەقڵ) ی کە تارادەیەك جێگیرەو جوداکەرەوەیەکی تایبەتی تاکە، بەگوێرەی ئەوکەسێتییە شێوازی تایبەت بۆخۆگونجاندن لەگەڵ ژینگەی مادی و کۆمەڵایەتی دیاری دەکرێ، ئەمەش ئەوە دەگەیەنێ کە دووکەس نییە لەرووی کەسێتیەوە لێکبچن، هەرکەسەیان شتێکی هەیە لەوی دیکە جودای بکاتەوە، کەسێتیش تەواوکار نابێ بەلێکدان و کارلێککردنی پێکهاتەکانی نەبێ کەئەمانەن:

-لایەنی جەستەیی.

-لایەنی ئاوەزی .

-لایەنی میزاجی.

-لایەنی ئاکاری .

-لایەنی ژینگەیی.

واتە دەکرێ لەرێگەی ژیانی جەستەییەوە لەژیانی ئاوەزی تێبگەین، گالینۆس یەکەم کەس بوو جیاوازییەکانی کەسێتی و جیاوازیەکانی میزاج پێکەوە بەستەوە، گشتمانیش درك بەوە دەکەین کەوا میزاجی کەسێتی زۆرجار لەرێگەی جلکەوە گوازراوەتەوە، لەوانەشە ئامرازێك بێ لەئامرازەکانی شیفای هەندێ لەنەخۆشیەکان، رەنگ و کەشخەیی جلوبەرگ و پاراستنی ئەوەی کەسەکە لەبەریدەکا گەورەترین بەڵگەیە کەئەو کەسە خاوەن میزاجێکی باشە، جلوبەرگیش بووەتە ئامرازێك لەئامرازەکانی هەڵسەنگاندنی کەسێتی.

ئەرکە کۆمەڵایەتیەکانی جلوبەرگ رۆڵێکی گرنگ دەگێڕێ سەبارەت بەیەکەم تێڕوانین جلوبەرگ وەك ئامرازێك بۆ پەیوەندی، وەك پاڵنەریك بۆسەرنجراکێشان، بۆجودابوونەوە، بۆ سیستم و یاخیبوون بەکاردەهێنرێ.

هەستکردن بەجلوبەرگ پشت بە رای کەسیی ئەو تاکە دەبەستێ کەلەبەری دەکا.

خەڵکیش جۆری جلەکانیان بەپێی شێوازەکانیان دەگۆڕن، ئەوانەی کەجلی هاوشێوە لەبەردەکەن بەشێوەی گشتی لێکەوە نزیکن، بەڵام ئەوانەی کەجلوبەرگی جیاواز لەبەر دەکەن لەیەکدیەوە دوورن، زۆرجاریش هەمەجۆری جلوبەرگ رووبەرووی رەخنەی توندو زبر دەبێتەوە.

کاریگەری جلوبەرگ لەم دەستەواژەیە روون دەبێتەوە:

جلوبەرگ بەڵگەیەکە بۆ تاك، لەوانەیە شیاوبوون و نەشیاوبوونی ئەو تاکە بۆ چاوپێکەوتنێك بۆ بەدەستهێنانی هەلی کارێك دیاری بکات، جلوبەرگ مرۆڤ دروستناکات، بەڵام پەیوەندی نێوان خەڵك پێکدێنێ، لەوانەشە هێمایەك بێ وەك پاترییەك لە تێستەکانی دەرونزانی پشتی پێ ببەسترێ.

تۆژینەوەیەکی conner لەبارەی دەرخستنی کاریگەری جلوبەرگ لەسەر پێکهێنانی تێڕوانینی یەکەمجار ئاشکرای کردووە کەوا جلوبەرگ کاریگەریەکی زۆری لەپێکهێنانی تێڕوانینەکاندا هەیە، ئەم تۆژینەوەیە بەئامانجی نیشاندانی رادەی کاریگەری جلوبەرگ لەسەر تاکەکان و رادەی کاریگەریی ئەوانیش لەسەر جلوبەرگ ئەنجام دراوە.

لە تاقیکردنەوەیەکدا بۆ پێوانەکردنی کاریگەری تاك-کاریگەری جلوبەرگ-کارلێککردنی تاك و جلوبەرگ، تێیدا ٢٤٠کچە قوتابی لەزانکۆی ئەریزۆنا لەتەمەنی نێوان ١٨-٢٤ساڵ بەشداریانکردووە.

ئەنجامی ئەو تاقیکردنەوەیە دەریخستووە جیاوازی تاك کاریگەری بەهێزی لەسەرتێڕوانینی ماسولکەیی (الانگباع العچلی) و کاریگەری زۆر کەمتر لەسەر تێڕوانینی کۆمەڵایەتی و کاریگەریەکی  زۆر کەمیش لەسەر تێڕوانینی زەینی هەیە.

بەڵام دەرکەوت جیاوازی جلوبەرگ کاریگەری بەهێزی لەسەر تێڕوانینی کۆمەڵایەتی و کاریگەریەکی کەمتر لەسەر تێڕوانینی ماسولکەیی و زەینی هەیە.

کالێککردنی نێوان تاکوجلوبەرگ کاریگەری بەهێز لەسەر تێڕوانینی کۆمەڵایەتی دەکا، هەروەسا کاریگەریەکی کەمتر لەسەر تێڕوانینی ماسولکەیی و زەینی هەیە.

cornner پێیوایە ئەم لێکۆڵینەوەیە کاریگەری جلوبەرگ لەسەر پێکهێنانی یەکەم تێڕوانین (الانگباع الاول) روون کردۆتەوە، رادەی پەیوەندیش لەنێوان جلوبەرگ و پێکهێنانی تێڕوانینەکان بەجیاوازی رەهەندەکانی تێڕوانینی یەکەم جیاواز دەبێ.

Kliner چەندین تۆژینەوەی ئەنجام داوە کە پاڵپشتی ئەو پەندە کۆنە دەکا کەدەڵێ: جلوبەرگ مرۆڤ دروست دەکا، تۆژینەوەکە ئەوەی نیشان داوە کەوا پیادەکاران (ئەوانەی بەپێ

دەڕۆن) لەوانەیە بکەونە بەر کاریگەری جلوبەرگەوە لەملکەچبوونیان یان سەرپێچی کردنیان بۆ هێماکانی هاتووچۆی پیادە.

کاتێك پیاوێکی کاملّ پالّتۆیەك و بۆینباخێك لەبەردەکاو بەشێوەیەك دەردەکەویّ کە کەسێکی بەرچاوە، ئەوا زۆربەی خەلّك لەسەرپێچیکردنی هێمای هاتوچۆ بەدوای دەکەون زیاتر لەوەی ئەگەر جلوبەرگێکی داڕزاوی لەبەربووایە.

مامۆستایانی دوو لەکۆلێژەکانی دەرونزانی ئەزمونێکیان سەبارەت بەکاریگەری جلوبەرگ لەسەر قوتابیان رێکخست، لەجاری یەکەم بەجلوبەرگی پیاوێکی ئاینی کاسۆلیکی (کاهین) دەرکەوتن و پاشان بە بەدلەو بۆینباخ، دەرکەوت کەوا قوتابیان لەجاری یەکەم کەمامۆستایان بەجلوبەرگی کاهین بینی واپیشانیاندا کەئەو مامۆستایانە زیاتر خاوەن رەوشتن، ناوبانگییان باشە، ئاسایی نین، هەروەها پتر خاکەڕان لەوانەی کە بەبەدلەو بۆینباخ خۆیان پیشاندا.

zuninوتوێتی ئاسان نییە لەم رۆژگارەدا لەرێگەی جلوبەرگەوە پێشبینی خەلّك بکەین، چونکە زۆرجار بەهۆی جلوبەرگی فەرمی یان جۆرێکی دیاریکراوی جلوبەرگی کارێکی دیاریکراو هەلّدەخەلّەتێن.

هەروەها لەوانەشە تێکەلّوپێکەلّییەك دروست ببیّ، چونکە هەندیّ دامەزراوە پێویستی بەکارمەندانێك هەیە جلوبەرگی کۆن لەبەر بکات، هاوکات هەر ئەوانە لەژیانی تایبەتی خۆیاندا وابەباشی دەزانن جلوبەرگی نوێترین مۆدێل لەبەر بکەن.

هەروەها zunin وتوێتی هەندیّ بەلّگەی ماقولّ هەیە کەوا خۆنەگونجاندن لەگەلّ جلوبەرگدا دەگەڕێتەوە بۆ شێوازێکی لەپڕی ژیان، مەبەستیش لەوە ئازادی تاکە.

نموونەی سیمای کەسێتی سەبارەت بەجلوبەرگ زۆرە لەوانەش هی واهەیە بەبەردەوامی تازەترین مۆدێل لەبەر دەکا، کەسێکی دیکە دوای نەمانی مۆدێلەکە لەبەری دەکا، ئافرەت هەیە پرچی داهێناوە، هەندێکیان پرچی بەرەلاّکردووە، پیاو هەیە ریشی چەناگەی یان سمێلّی هەیە، کچگەلێکیش هەن بەجلی وەرزشەوە دەردەکەون، پیاو بەجلوبەرگی تێنس.

سیمبولەکانی جلوبەرگ هەمیشە جێگیر نییە، چونکە مۆدێلی باو پتر لەبەها کەسیەکان کار لەزەوق دەکا

## تۆژینەوەی جاکبسون jacobson١٩٣٦

ئەم تۆژینەوەیە سەبارەت بەگرنگترین ئەو بنەمایانە بوو کەجوانی دەبەخشێتە دیزاینی جلوبەرگ، بۆ ئەم مەبەستە کۆمەڵێکی ئامادەکرد کەکردنی بەدووبەشەوە: ٣٣کەسیان پسپۆڕبوون لە هونەری دیزاینی جلوبەرگ و ٦٦ یش پەیوەندییان بەلایەنی پسپۆڕیەوە نەبوو، لەبارەی بابەتەکەوە پرسیاری ئاراستەکردن، ئەویش بەنمایشکردنی دیزاینگەلێك کەهێڵەکانی لەرووی بنەماو گۆڕاوەکانەوە لێی کۆڵدراوەتەوە، تۆژەر روونکردنەوەی پێویستیشی سەبارەت بە هێڵەکان و شێوەکان و قوماش و رەنگەکاندا، زۆربەی وەڵامی بەشداربووان جەختیان لەسەر ئەوە کردەوە، کە زۆرترین بنەما کە جوانی دەداتە دیزاینی جلوبەرگ بریتیە لە هاوسەنگی و پاشان ئاواز (الایقاع)، ئەنجامی تۆژینەوەکە دووپاتیشی کردەوە کەوا جیاوازی بەڵگەدار لەنێوان پسپۆڕان و ناپسپۆڕان لەدیزاین دا هەیە، کە پسپۆڕان زیاتر گرنگی بە جوانی و دیزاینی جلوبەرگ دەدەن.

## تۆژینەوەی سیلفرمان silverman١٩٤٥:

سیلفرمان تۆژینەوەیەکی لەسەر دوو کۆمەڵە ئەنجام دا هەر یەکێکیان لە (١٢٠) کچی یەکێك لەکۆلێژەکان پێکهاتبوو، پێوەرێکیان بۆ کەسێتی و یەکێکی دیکەش بۆ زیرەکی بەکارهێنا، هەڵسەنگێنەرانی تاقیکردنەوەکە بۆ پێوانەکردنی دیمەنی کەسیی بۆهەریەکێك لە کچەکان لەرێگەی جلوبەرگیانەوە مامۆستایانی هەمان کۆلێژ بوون، بەپێی ئەنجامەکان ئەو کۆمەڵەیەی کە دیمەنی کەسیی خراپ دەنوێنێ کەسانی داخراون و لەخەڵك دەترسن، گرنگی بەجلوبەرگی خۆیان نادەن، دەترسن تێکەڵی رەگەزەکەی دیکەبن، زیرەکیشیان کەمە.

بەڵام کۆمەڵەی دووەم کە دیمەنی کەسیی باش دەنوێنن ورە بەرز بوون، بەوە جودادەکرانەوە کەئارەزووی تێکەڵبوونی خەڵك دەکەن، لەگەڵ رەگەزەکەی دیکە تێکەڵ دەبن، پلەی زیرەکییان بەرزە.

لەو تۆژینەوانە کەلەسەر کاریگەری رواڵەتی کەسیی و سەرکەوتنی کەسەکە لەژیان کراوە روون بۆتەوە کەوا کەسی خاوەن دیمەنی باش لەگەڵ خەڵك بەئاسانی تێکەڵ دەبێ، بەو پێیەش شارەزایی زیاتر پەیدا دەکا و هزروبیری بەپیتی هەیە، کەسێکی بخواز (گموح) دەبێ لەژیاندا، ورەی بەرزە، ئەمیش لەگەڵ بایەخی جلوبەرگ بۆتاك وکۆمەڵ گونجاوە.

## چێژوەرگرتن لەجلوبەرگ:

مەبەست لەچێژوەرگتن گەشەپێدانی هەستی جوانی تاکە، کەبتوانێ وەڵامی هەموو جۆرە پەیوەندیەك بداتەوە، ئەو کەسەی کەلەرووی تەنها سوودەوە شت دەخوات لەوانەیە جوانی لەو شتانە نەبینێ، چونکە شتەکان لەروانگەی ئەوەوە مەدلولی واقیعی هەیە.

ئەو پێویستیانەی کەکار لەرەفتاری پۆشینی جلوبەرگ دەکا:

جلوبەرگ تێرکردنی پێویستیە کۆمەڵایەتیەکان کەکار لەرەفتاری کۆمەڵایەتی جلوبەرگ دەکا بەدی دێنێ، پوختەی ئەم پێویستیانەش ئەمانەن:

## پێویستی بەئینتیما:

پێویستی لاوان بەئینتیما بەتوندی دەردەکەوێ کەکۆمەڵە تایبەتیەکانیان بەجیهانی راستەقینەی خۆیان دەزانن، جلوبەرگیش ئامرازێکە مرۆڤ بەهۆیەوە دەتوانێ گوزارشت لە هەستکردنی بەئینتیمای بە کۆمەڵەکەی و هەروەها لەسۆزە کەسییەکانی لەرێگەی رەفتاری لەبەرکردنی جلوبەرگ بکات، تاك جلوبەرگی باو لەبەر دەکا بۆ ئەوەی وەکو ئەوانی دیکە دەربکەوێ  ئەگەر چی زەحمەتیش بێ بۆی، کەمجاریش بینیومانە مرۆڤ لەسەر بیرۆکەی کەسیی (شخصی) وتایبەتی خۆی جلوبەرگی هەڵبژاردبێ.

لاوان بۆ گوزارشتکردن لەو پێویستیە ئەو مۆدەیە هەڵدەبژێرن کە لەلایەن کۆمەڵەکەیانەوە ستایش دەکرێ، چونکە ئینتیما بۆ کۆمەڵ لەجلوبەرگدا دەبێتە مایەی ئەو بڕوا بەخۆبوونەی کەتاك لەمیانەی ئینتیمای بۆ ئەو کۆمەڵەی هەمان جلوبەرگ لەبەر دەکەن بەدەستی دێنێ.

پێویستی بە موڵکدارێتی :

ئارەزووی موڵکدارێتی زۆرجار بۆ گەشەی دەروونی تاك پێویستە، ئەویش سەبارەت بەجلوبەرگ لە سوربوونی کەسێك لەکڕینی ژمارەیەکی زۆری جلوبەرگ دەردەکەوێ هەرچەندە زۆریشی لەو جلوبەرگانە هەیە وەك هەوڵێك بۆسەرنجڕاکێشان و شادمانیی کەسانی دیکە.

هەندێ کەس زۆرجار بەدوای جلوبەرگی گران بەهادا دەگەڕێن بۆ ئەوەی جیاواز بن، سوربوونی بەردەوامیش لەکڕینی هەر جۆرە جلوبەرگێك بەپاڵنەری موڵکایەتی، مەرج نییە ئەوەی هەیانە بەکاری بێنن.

## پێویستی بە پایەوپلە:

پێویستی مرۆڤ بۆ پایەوشکۆ بە بەرپرسیاری یەکەم دادەنرێ لە لەبزاڤی جیاوازی کۆمەڵایەتی کۆمەڵ، زۆرجار خەڵك پۆشاك بۆ خۆجوداکردنەوە لەیەکدی بەکاردێنن و هەروەها وەك ئاماژەیەك بۆ ناساندنی چینی کۆمەڵایەتیان، پاراستنی جیاوازی چینایەتی لەسەدەکانی نێوەڕاست بەزەبری یاسا بوو، بۆ نموونە چینی خانەدانەکان (النبلاو) نەیاندەهێشت عەوامی خەڵگ لاسایی جلوبەرگەکانیان بکەنەوە، ئەمە سەرەڕای جلوبەرگی هیبز بەدیزاینە جۆراوجۆرەکانی و دیمەنە نامۆکانیەوە کەسیمبولێکە بۆ لاوان لەسەردەمی ئێستاماندا، هەروەها بەنیشانەی جیاوازیی کەسێتیان ئەژمار دەکرێت.

پێویستی ئارەزووی بەدواداچوون (حب الاستگلاع) :

پێویستی ئارەزووی گەڕان (بەدوادا چوون) وەك هەر پێویستیەکی دیکەی کۆمەڵایەتی لەبەر جیاوازی هێزەکەی لەلای تاکەکانەوە بەجیاوازی ژینگەی مرۆڤ جیاوازە ئەویش لەجلوبەرگدا دەردەکەوێ، بەهۆی دیاردەی مۆدەو بڵاوبوونەوەی، گەنجان سورن لەسەر دووپاتکردنەوەی جیاوازیان و نیشاندانی ناسانەمەیان لەرێگەی سیمبولگەلێکی تایبەتەوە لەوانەش مۆدەی جلوبەرگ، کەبەدوای مۆدەی نامۆی نوێ دەکەون و ئارەزووی نزیکبوونەوەی و زانینی ئایدۆلۆژیا و داهاتەکانی دەکەن.

لاوان دەیانەوێ زۆر لەلایەنەکانی ژیان زیاتر لەوەی باوباپیرانیان کردویانە پەیڕەو بکەن، جلوبەرگیش ئەو ئامرازەیە بۆ بەدیهێنانی ئارەزووی گەڕان بەدوای ئەزموونی نوێ و تاقیکردنەوەی دۆزینەوەی مۆدەی تایبەت کەدیزاینەران بەناوی گەنجانەوە بێ ئەوانی دیکە بەرهەمی دێنن.

بڵاوبوونەوەی مۆدە بەهۆی پاڵنەری لاوانەوە سەرچاوەدەگرێ لەئارەزووی گەڕانیان بۆ ئایدۆلۆژیای رۆژاوایی، هەروەها هەوڵی لاسایکردنەوەی هەموو تازەیەکیش دەدەن سەرەڕای

ئەوەی زۆرجار دیزانەکانی دیکە گونجاوە بۆ جەستەو داب و نەریتەکانیان—ئەوان بەپاڵنەری ئارەزووی بەدواداچوون و دۆزینەوەی شتی نوێ و هەوڵی لاسایکردنەوە دەگەڕێن.

لەبەرئەوەی داهێنان لەهەر جۆرێك بێ لەوانەش جلوبەرگ، کە تایبەتە بەشێوەی نمایشکردنەوە دەبێتە مایەی رەخساندنی دەرفەتی وروژاندن و ئارەزووی گەڕان، کەواتە جلوبەرگی داهێنراویش پێگەی خۆی لەنێوان ئارەزومەندانی گەڕان و بەدواداچوون دەدۆزێتەوە.

دەریش کەوتوە بەپێی لێکۆڵینەوەکان رەنگی جلوبەرگ واتای دەرونی خۆی هەیە بەم شێوەیە:

رەنگی زەردی بریقەدار هەستکردنە بەئاسودەیی، رەنگی سوریش زیاد لەرەنگەکانی تر سەرنجڕاکێشەو کار لەوروژاندن و هاندان دەکات رەنگی شینی ئارام و تەواو و بەنەوشەیەیی ویقارە، سەوزیش مایەی هەستی سۆزو ئارامی و پشودانە سپیش زیاد لەرەنگەکانی تر کاریگەرو ئەرێنی و نورانی وبەرائەت دەگەیەنێ لەبەر ئەوە کەسێتی منداڵ دەکەوێتە ژێر کاریگەری شێوەو رەنگی جلوبەرکەوە .

هەر سەبارەت بەرەنگەکان دەروناسی کۆن وتوێتی رەنگ زمانێکی خۆڕسکە کار لەمرۆڤ دەکات، ئەمە دەروونناسی نوێش دووپاتی کردۆتەوە لەبواری خۆڕسکێتی کاریگەری رەنگەکان کاتێك روناکی رەنگ بەهەموو دوریەکانیەوە دەگاتە چاو لەوێوە بەهایبۆسلامۆسدا تێدەپەڕێت کەبەشێکی مێشکە دەستی بەسەر رژێنەکان و هۆرمۆنەکاندا گرتووە، لەبەرئەوە وەڵامگۆکان بەوشێوەیە رەنگڕێژدەبێ کەبگونجێ لەگەڵ دەلالەتی ئەو رەنگە لەغەریزەی مرۆڤدا وەکو سور کەبۆهاندان و وروژاندن بەکاردێ، سەوزیش بۆ گەشبینی و پشودان، زۆر لەخاسیەتەکانی کەسێتیش بەستراوە بەکۆمەڵی رەنگە گەرموهەستیارەکان وەکو قرمزی مەرجانی خۆخی سەوزی زومردی و شین و ئاسمانی زیوی لەسەر ئەو بنەمایەی کەوا کەسێتیەکی گەشبین و روخۆش و خۆشحاڵە پاکیزەو کۆمەڵایەتی و خەڵکی خۆش دەوێ لێرەدا بەکورتی کاریکەری رەنگەکان دەردەخەین:

سور: رەنکی سور هەست بەچالاکی و کرانەوە دەکرێ، وا لەدەوروبەر دەکات لابکەنەوەو سەرنجیان رابکێشێ بۆیە ئەگەر رەنگی سور بپۆشی ئارەزووی ئەوە دەکەی خەڵك بتبینێ کە خاوەن گوڕوتین و هەڵچوون و هێزیت

پڕتەقاڵی: رەنگێکی زیندوو و هاندەرە، بەڵام بەرادەی سور نا، ئەگەر حەزت لەپۆشینی ئەم رەنگە کرد مانای ئەوەیە تۆ مەیلی بوێری و سەرکێشی دەکەی و گوڕوتین و غیرەت پیشان دەدەی لەهەر شتێ ئەنجامی دەدەی.

زەرد: پۆشینی رەنکی زەرد روناکی بەخشە، رەنگێکە بەستراوە بەرۆژەوە، کاریکەری ئەرێنی و گەشبینی بەو کەسانەدەبەخشێ، کەلەبەری دەکەن.

سەوز: یارمەتیدەری هێنانە کایەی ئارامی و بێدەنگی و هاوئاهەنگی لەگەڵ دەوروبەر، ئەوانەی حەزیان لەم رەنگەیە سروشت و هەستکردن بەئارامیان خۆش دەوێ

پیرۆزەیی: ئەم رەنگە کەلەبەر دەکەی دەوروبەرت گرنگیت پێ دەدەن، کەسێتی ئەو کەسە دەردەخات کە دەم بەپێکەنینەو مامەڵەکردن لەگەڵیدا ئاسانە، ئەکەر تۆ لەئارەزومەندانی ئەم رەنگەی ئەوا گەنجێتی و درەوشانەوەی خۆت پیشان دەدەی.

شین: ئەم رەنگە لایەنی رۆحیانی و پابەندبوونی نیزامی تێدایە، ئەوەی لەبەریدەکات گوزارشت لەئارەزومەندیان دەکەن بۆ ژیان و ئاشتی و دڵنیایی و تەنانەت تەنهاییش، ئەوەی لەبەریدەکات بەلایەنی کەمەوە وەفاداری و راستگۆیی دەنوێنێت.

بەنەوشەیی: لەبەرکردنی بەنەوەشەیی هەستی متمانە بەخۆکردن و کەرامەت و رێز لەخۆنان دەگرێتەوە.

ئەرخەوانیی: لەبەرکردنی هەستی نەرم و نییانی و شان و شەوکەتی و لوتف دەبەخشێ .

ئەگەر ئارەزوی لەبەرکردنی ئەم رەنگەت کرد ئەویش بەهۆی ئارەزووتە بۆ گوزارشتکردن لەهەست ناسکیت.

رەش: ئەم رەنگە بەزۆری بزنسمامان لەبەری دەکەن بۆئەوەی گوزارشت لە هێزو دەسەڵاتیان بکات.

سپی: لەجلوبەرگدا نیشانەی پاکوخاوێنی دەگەیەنێ ئەوەی لەبەری دەکات لەگەرمای رۆژ دەپارێزرێ.

قاوەیی: نیشانەی پابەندبوونە بەکارو خێزان و هاوڕێیان، ئەوانەی ئارەزوی دەکەن توانای شۆڕبونەوەیان بەناخدا هەیە لەچارەسەرکردنی کێشەکان بەو پەڕی سادەییەوە و ئەوان کەسانێك حەسابیان بۆ نەکرێ .

شکسپیر لەبارەی جلوبەرگەوە دەڵێ: جلوبەرك مرۆڤ دروست دەکات، ئەڵبەتە کاریگەری جلوبەرگ لای شکسپیر بەڕادەیەکە جیاوازی دەبێتە هۆی جیاوازی مرۆڤەکانەوە، بەڵام بیرورای زانایان هەر چۆنێك بێت عەقڵ و مەنتیق هەرگیز لەگەڵ ئەوەدا نییە ئەو کەسەی جلوبەرگی کەشخەو گران بەهای لەبەر گوزارشت لەنایابی ناخی خاوەنەکەی بکات، بەپێچەوانەشەوە مەرج نییە ئەوەی جلوبەرگی هەرزان بەهاو جۆری خراپ بپۆشێ ئیدی خاوەنەکەی کەسێك بێ وەکو ئەو جلوبەرگەی دەیپۆشێ.

## مردنی جگەرگۆشە:

**لەدەستدانی منداڵێك کاردانەوەیەکی گەلێ گەورەی بەسەر باری سایکۆلۆژی دایکەوە هەیە، کە وای لێ دەکات بیر لە جوانی خۆی نەکاتەوە، تامی خواردن نەکات، تامی جلوبەرگی جوان نەکات، تامی گەشتو گوزارو سەیران نەکات، دونیا لەلای وەکو پووش وابێ.**

هەموو گیانداران بەمرۆڤ وئاژەڵیشەوە، غەریزەی خۆشەویستی بێچووەکانیان بە شێوەی جیاواز لەلاهەیەو هەمیشە لە پاراستنی بێچووەکانیاندان، مرۆڤ بە عەقڵ و غەریزە بەرگری لە منداڵەکەی دەکات و هەستی پێدەکات، هەندێ جاریش هەستی پێناکات، ئەو هەست پێنەکردنە سێ ئامانجی لەپشتەوەیە، یەکێکیان خۆشەویستی خود (حب الزات) ە کە هەوڵ دەدات بمێنێتەوەو منداڵەکەشی خۆش دەوێت کە لەخۆیەتی، ئەوی دیکەیان (نەمری) ە کە لە بێچووەکەیدا دەیبنێتەوە، سێیەمیش غەریزەیە، بە پێی لێکۆڵینەوەیەکی ئەمریکایی، رووەك بۆ بەرگریکردن لە خۆی و پاراستنی گیانی خۆی لە دوژمنەکانی پێی خۆشە مێروولە لە دەوروبەری کۆببێتەوە بۆ لەناودانی کرم و ئەو بوونەوەرانەی کە زیانی پێدەگەیەنن، هەرچەندیشە ئەگەر ئەو درەختە بەری گرت هەر ئەو مێروولانە زیان بەبەرەکەی دەدەن، بەڵام رووەکەکە مانەوەی خۆی لەلاگرنگترە، چونکە ئەگەر مێروولە بەرەکەی بخوات، بەلایەنی کەمەوە درەختەکە دەمێنێتەوە بۆ خستنەوەی بەری دیکە، ئەمیش نەمریی و مانەوەیە، کە بەهۆیەوە کێشمەکێشێك لە ژیانیدا بەرپا دەبێت، هەروەها ئاژەڵیش بە هەمان شێوە

بێچووەکانی خۆی خۆش دەوێت، بە ڕەفتارێکی غەریزیانەی تەواو، بەڵام ڕەنگە نەتوانێ ئەوە بکات کە مرۆڤ دەیکات، لە بەکارهێنانی پەنجەو دەستوپێ و زمان و عەقڵ، ئاژەڵ ئەوەی هەیبێ تەنها دەندوك و قۆچ و پەڕو باڵ و کلك و ڕاکردنە، ئەوەی مرۆڤ لە ژیانیدا پەیڕەوی دەکات، ئەگەر هەستی پێبکات، یان نەیکات ناوی دەنێین خۆشەویستی عەقلانی، چونکە دەتوانێ پەنجەکانی، زمانی، ناولەپی، بەکاربێنێ و بە گیان بەرگری لە بێچووەکانی خۆی بکات، هەندێ جار خۆی دەکاتە قوربانی بێچووەکەی، چونکە بۆ میکانیزمی بەرگریکردن عەقڵو تواناکانی بەکار دێنێ، شەونخوونی پێوە دەکێشێ، برسێتی و سەرماو گەرماو مەینەتی دونیا دەچێژێ بۆ ئەوەی بێچووەکەی پارێزراو بێت، هەمیشە ئارەزوی ئەوە دەکات بێچووەکەی لەبەردەمیدا بێ، بۆنی بکات، ماچی بکات، پارووی دەمی خۆی بۆ ئەو بێ، خەمی گەورەی دایکی مرۆڤ ئەوەیە منداڵەکانی ساغڵەم بن و مەرگیان نەبینێ، کورد واتەنی جەرگ سوتاو نەبێ، جەرگ واتە بەشێگ لە مرۆڤ، بەشێکی زۆر هەستیارو ناسك، سوتانی چەند بە ئازارو چەند بە سۆیە، ئازاری مەرگی منداڵێك بۆ دایك وەکو ئەو سوتانە وایە، کە چ ئەشکەنجەیەکی جەستەیی و دەروونی دەگەیەنێت، ئاکامی مردنی منداڵێك، یان لەدەستدانی منداڵێك کاردانەوەیەکی گەلێ گەورەی بەسەر باری سایکۆلۆژی دایکەوە هەیە، کە وای لێ دەکات بیر لە جوانی خۆی نەکاتەوە، تامی خواردن نەکات، تامی جلوبەرگی جوان نەکات، تامی گەشتو گوزارو سەیران نەکات، دونیا لەلای وەکو پووش وابێ، بەڵام لەگەڵ ئەوەشدا عەقڵی مرۆڤ هەمیشە زاڵە، دیسان جیاوازی مرۆڤ لەگەڵبوونەوەرانی دیکە دەردەکەوێت، ویژدان و بەهای ئایینی و کۆمەڵایەتی هەمیشە قەڵغانی پارێزەری برینی سایکۆلۆژی دایکن، کە هەمیشە دڵ و دەروونی خۆی دەمەزەرد دەکاتەوەو هەناسەیەکی پێش مەرگی ئازیزی وەبەر دێتەوەو گوڕوتوانا بەخۆی دەبەخشێتەوە، چونکە دایك هەروەکو چۆن بەرامبەر ئازیزەکانی هەستی ناسکە، ئاوەهاش درکی عەقلانیانەی بەم چەند خاڵە دەکات:

١- چارەنووسی زۆربەی دایكو باوکی مرۆڤایەتیە کە جگەر گۆشەکانیان لە دەست دەدەنو میکانیزمی ژیان دوای ئەوان ناوەستێ.

٢- مردن قەدەرەو زوو، یان درەنگ بەرۆکی مرۆڤ دەگرێ و گەورەو گچکە نازانێ، شتێکی بەڵگە نەویستە کە هەموو دەروونێك ئارەزووی مردن دەکات.

٣-مرۆڤ عەقڵی هەیەو دەتوانێ بەکاری بێنێ، بۆ زاڵبوون بەسەر باری نامۆیی دەروندا.

٤- مرۆڤ ویژدانی هەیەو نایەوێ بەهۆی کەسێکەوەژیانی کەسانی دیکەشی ناخۆش و مەرگەسات ئامێز بکات، ئەم ویژدانە هەر لە منالێییەوە پەروەردە دەکرێ، کەواتە زۆر پێویستە دایك ئاگاداری ئەوە بێ لە کاتی مەرگی جگەر گۆشەیەکی، هەمان هەست لای منداڵەکانی دیکەی دروست نەکات، کە ئەگەر یەکێك مرد ئەوانی دیکە دەبێ رەشپۆشی تەواوی ژیان بن و دەستە وەستان دابنیشن، چونکە ئەو جۆرە هەستە پاڵنەرە بەرهەم هێنەکانی مرۆڤ، لەوانەش پاڵنەری ئەنجامدانی کار لاواز دەکات و بەو پێیەش مرۆڤ جوڵەی کەم دەبێت، کەمی جوڵەش دەبێتە هۆی پەنگ خواردنەوەی بارگە هەڵچوونیەکانی مرۆڤ، لەوانەش خەم، کە ئەمیش دەبێتەهۆی ململانێی دەروونی .

٥- مرۆڤ لەبیرچونەوەی هەیەو هەموو کاتێك مردوو لەبیر نییە، بۆیە پێچەوانەی سروشتی مرۆڤایەتییە ئەگەر لە جیاتی لە بیرچوونەوە، پەنا بۆ وەبیرهێنانەوە ببردرێ، رێخۆشکەری ئەم هەستەش بێ ئیشییو بوونی کاتی ڤالاییە.

٦-مرۆڤ دەستە وەستان ناوەستێ و کار دەکات، بۆ ئەوەی خۆی بەو کارەوە سەرقاڵ بکاتو پاڵنەری راپەڕاندنی کار لەلای هەمیشە زیندوو بێت، بەو پێیەش ژیانی خۆش دەوێتو بە گەشبینییەوە تێی دەڕوانێ

٧-مرۆڤ خاوەن کانگای مەعریفەتە، کە دەزانێ ژیان نەوەستاوەو ناوەستێ، بەتایبەتی کاتی تێکەڵبوونی لەگەڵدەوروبەرو بەشداریکردنی خۆشیەکانیان.

٨- مرۆڤ هەمیشە دەیەوێ خۆی بەهێز پیشان بدات، بۆیە گەشبینی پیشان دەدات، ئەو گەشبینیە پیشاندانە، دەبێتە گەشبینی راستەقینە بەرامبەر ژیان.

دەست بەتاڵی و کاتی ڤالایی زۆرو بیرکردنەوەی بەردەوام لە مەرگی ئازیزان شکست بە مرۆڤ دەهێنێ، دەبێ دایکوباوك ئەوە بزانن، کە بیرکردنەوە لە مەرگی ئازیزانیان لە بەر چەند هۆکارێك بێ هوودەیە، لەوانەش: یەکەمیان — مردن گەڕانەوەی بۆ نییەو ئارەزووی مرۆڤە بەرەو ئارامی و گەڕانەوە بۆ ناوسکی دایك، دووەمیان: مرۆڤ بەو بیرکردنەوەیە رێ بۆ شکستخواردنی خۆی خۆش دەکات، سێیەمیان: پەیوەندی لەگەڵژیاندا پەیوەندی سلبی دەبێت، ئەگەر مرۆڤیش باوەڕی بە خواوهێزی قەدەر هەبێت، دەبێت باوەڕیش بەوە بکات، کە مردن زوو، یان درەنگ، هەر دەبێت، باشتر وایە شوێنەواری مردو و یادەوەرییەکانی شوێن بزر بکرێن و ئەو قەناعە دروست ببێت کە ئەمانەتێك لەلای مرۆڤ بووەو ئێستا دەگەڕێتەوە شوێنی

خۆی، مرۆڤی زیرەك و بەتواناو عەقڵانی ئەوەیە لەژیانی خۆی بەردەوام بێت، هەروەکو (ئەریك فرۆم) دەڵێ ئەگەر مردن لێرە بوو تۆ لێرە نیت، ئەگەر تۆش لێرە بویت مردن لێرە نییە.

بەداخەوە پۆشینی جلی رەش بووە بە سیمبولی ئازیز مەردە، دایکی جەرگ سوتاو پەنای بۆ دەبات، هەندێ جاریش پەنا بۆ جلی شین دەبات، هەر ئەم رەش پۆشینە، یان شین پۆشینە سەرچاوەی خەمۆکییە بۆ مرۆڤ و خەمەکەی زیاتر دەکات، چونکە رەنگی رەش دەبێتە هۆی دڵتەنگی و نائومێدی بۆ مرۆڤ بە پێچەوانەی رەنگی کراوە، کە رەنگە هەندێ خەم لەبیری مرۆڤ دەباتەوە، ئیتر نازانین بۆ پەنا بۆ جلی رەش دەبردێ لە کاتی مردنی ئازیزانداوپەنا بۆ جلی رەنگاو رەنگ نابردرێ، کە گەشبینی و خۆشی بە مرۆڤ دەبەخشێ؟دواجار پێویستە بیری مرۆڤایەتی بەو ئاراستەیە نەبێ، کە چەمکی مردنی جگەر گۆشە، سەرچاوەی لەدەستدانی خۆشییەکانی ژیان بێ، یان لەسەرخۆمردنی کەسێکی دیکە بێ.

## زەمكردن:

**خۆشترین کات لای مرۆڤە غەیبەتکارەکان ئەو کاتەیە کەغەیبەتی کەسێکی دیکە دەکەن و کەئەویش هات پێکەوە غەیبەتی یەکێکی دیکە دەکەن، ئەمە رەنگدانەوەی ناوەوەیە**

زەمکردن یان غەیبەتکردن دیاردەیەکی کۆمەڵایەتی و دەروونیە لەهەمانکاتدا، لەبەرئەوەی ئەو کەسە بەرێگەی لاساییکردنەوەی دایك و باوك و کەسانی دەوروبەر فێری دەبێت و پەیرەوی دەکات، دەروونیشە لەبەرئەوەی نارەزایی و کەموکورتی و نەبوونی تواناى راشکاوانە لەخۆیدا دەبینێتەوە پەنا بۆ زەمکردنی کەسانی دوروبەر دەبات هەندێ جاریش ملکەچکردنی کوێرانە بۆ ئەو کەسەی پێکەوە زەمی کەسێکی تر دەکەن، ئەو کەسانەی کەزەمی کەسانی تر دەکەن هەر خۆیشیانن سەرکۆنەی ئەو کەسەش دەکەن کە وەکو خۆیان هەمان دیاردە پەیرەو دەکەن، زەمکردن دەردێکی کوشندەیە هەمان کاریگەری هەر (خوو) یەکی ترە بۆسەر دەروونی مرۆڤ وەکو کاریگەری جگەرەکێشان، یان قومارچێتی یان ...تد

واتە دیاردەیەکە بۆتە بەشێك لەکەسێتی زەمکار (ئەوەی زەم دەکات) و لەو خووە تام و چێژ وەردەگرێت کەزۆرجار کوێرانە هێرش دەکاتە سەر دەوروبەر نارازییە لەدراوسێ لەحکومەت، لەفەرمانگەکەی خۆی لەمنداڵەکانی، لە...تد چونکە واهەست دەکات بەو زەمکردنە تای تەرازووەکە لەو هاوکێشەیەدا لەقازانجی خۆیداو پێیوایە ئەو شوێن و پایەیەکی بڵندی هەیە لای ئەو کەسەی کەپێکەوە زەمی کەسی سێیەم دەکەن، ئەم کەسانە کەپەیرەوی

لەو دیاردیە دەکەن لەحاڵەتی هەڵچوونی سلبیدان ئەو هەڵچوونە کە بووتە شەقڵ و مۆرکی کەسێتیان دەبێتە پەردەیەك لەبەردەم ئەو دووکەسە کەلایەنە چاکەکانی کەسی زەمکراو نابینن، ئەگەر بشیبینن نایدرکێنن بۆ ئەوەی ئەو شکستیەی خۆیان کەهەستی پێدەکەن بشارنەوە، ئەگەر ئەم حاڵەتە پێچەوانەش بکەینەوە کاتێك کەسێك ستایشی کەسێکی تر دەکات بەهەمان شێوە لایەنە خراپەکانی ئەو کەسە نابینن، دەتوانین بڵێین ئەم جۆر کەسانە کەلەرادەبەدەر  زەم دەکەن یان ستایش دەکەن بەرەشێتی یان سپێتی دەروانن ژیان واتە زێدەڕۆیی دەکەن  لەهەردوو جەمسەرەکەدا ژیانیش نەرەشە بەجارێك نە سپیشە بەجارێك، ئەمەش دەردی کۆمەڵگەی ئێمەیە یان خوازیاری دەسەڵات و پایەو پلەین یان کوێرانە ملکەچی ئەو دەسەلاتە بن، ئەو کەسەی کە هەڵدەستێت یەکاری زەمکردن واهەست دەکات لەسەنگ و بەهای کەسی زەمکراو کەم دەکاتەوەو پێیوایە خۆی پێ بەرز دەبێتەوە ئەمیش دەگەڕێتەوە بۆ هەستکردن بەکەمی بەڵام ئەم جۆرە کەسانە ئەگەر هەست بەرەزامەندی خۆیان بکەن پەتا بۆ ئەوە نابەن کەزەمی کەسانی تر بکەن گوایە لەبەهای ئەو کەسانە کەم دەکەنەوە و لەبەهای خۆیشیان زیاد دەکەن، دوای ماوەی زەمکردنەکە زەمکەر هەست بەگوناه دەکا لەبەرئەوە کەسێکی لەرزۆك و بێ متمانە بەخۆی دەبێت، هەردوو کەسە زەمکەرەکە لەسەرەتاوە پەیوەندیان  بەهێز دەبێت کەلەو کارەیە هاوبەشن و هامڕان بەلام دوای دەرچوون لەو رەوەشە دەرونیەی خۆیان و بەئاگا هاتنەوەیان  بێزیان لەیەکتر دەبێتەوە

لەراپرسیەکدا کەلەسەر (٤٥٠) کەسدا ئەنجامم دا لەشاری هەولێر رێژەی لەسەدا ٩٨باس لەوەدەکەن ئەگەر بۆجارێکیش بووبێ زەمی خەڵکیان کردووە، ئەمەش نموونەیەکە لەوراپرسیانە:

- پیاوێکی تەمەن٣٤ کەپیشەکەی مامۆستایە بەم شێوەیە باسی دەکات: (لەبەر ئەوەی من وەکو ئیسلام نەمزانیبوو زەمی خەڵك تاوانەو ئەنجامی دەدەیت بۆیە گرنگی زۆر نەبوو لەلام بەڵام پاش ئەوەی لەروانگەی ئیسلامەوە زانیم بەهیچ شێوەیەك باسی لێوە ناکەم ئەگەر هەشبێ دەچم بۆ لای کەسەکە بۆ لێخۆشبوون)

- پیاوێکی تر تەمەن ٣٧ساڵ کەمامۆستایە دەڵێ ( بەڵێ زەمی خەڵکم کردووە بەڵام بەپێی دابونەریتی ئاینی زەمکردن کارێکی خراپەو تاوانە بەردەوام ویستومە خۆم بەدور بگرم

لەم سیفەتە بەڵام هەندێجاریش توش بوومەو زەمم کردوە لەبەر چەند هۆکارێك کەلەوانەیە ئەو کەسە باسکرابێ بەخراپەو کەسیفەتێکی خراپی هەیە منیش باسی خراپیەکەییم کردووە....)

-یەکێکی تر تەمەن ٢٧ساڵ دەڵێ: (لەبەر ئەوەی کەلەمەجلیس دانیشتووم هەر باسی کەسێك بووە منیش لەگەڵ ئەوان بەشداریم کردووەو لەکۆتاییدا پەشیمان بووم چونکە زەم شتێکی زۆر خراپەو گوناهە)

- یەکێکی تر تەمەن ٢٨ساڵ دەڵێ: (بەڵێ زەمی خەڵکم کردووە بەڵام کەم زەمی ئەو کەسانەم کردووە کەوا زیانیان پێگەیاندووم وەیاخود ئەو کەسانەی کەوا دیاردەیەکی ناشیرین ئەنجام دەدەن لەکۆمەڵگاو ئەیانناسم وەبۆیەش زەمم کردوون زۆرجار لەبەر ئەوە بووە نزیکەکانم ئاگادار بکەم بۆ ئەوەی خۆیان بپارێزن لەو کەسە)

- یەکێك تر ٣٢ساڵ دەڵێ (بەڵێ بەڵام کەم ئەمەش لەبەرئەوەی جاروایە خەڵکێکی خراپ دەبینم ناچار دەبم زەمی بکەم چونکە زۆر خراپەو زۆر زەرەری خەڵکی هەیە یان لەیەکەك تورەدەبم بیرم نیە کەزەمی دەکەم بەڵام زۆربەی جار هەر وایە کەئاگام لەوە نییە کەزەمە یان لەبیرم نیە... )

- ٣١ساڵێك دەڵێ (لەبەرئەوەی زمان زۆر زەحمەتە راوەستێ کەسیش نییە زەمی خەڵکی نەکردبێت چونکە رۆژانە لەژیان توشی هەموو کاروکردەوەیەك دەبیت واتلێدەکات کەزمان توشی گوناهت بکات)

- تەمەن٣٨ساڵێك دەڵێ (لەبەر ئەوەی بەرەو روو نەکراوە هەموو شتێکی لەگەڵ باس بکەم لەکاتی ئامادەبونی ئەوان بەهۆی ترس و شەرم بەرژوەندی نەکراوە ئەوەی لەناو دڵمە هەلی برێژم بۆیە پاشملە قەرەبووم کردۆتەوە) .

ئەو جۆرە کەسانە کەغەیبەتی دەوروبەریان دەکەن بۆ ئەوەی خۆیان لەو دەردە کوشندیە رزگار بکەن دەکرێ بەرەخنەری بونیاتنەر رووبەرووی ئەو کەسە ببنەوە لەجیاتی ئەوەی زەمی بکەن چونکە لەوانەیە رەخنەکان بەسنگی فراوانەوە وەربگرێت و پەیوەندیشیان بەهێز بێت، مرۆڤ بۆئەوەی بزانێت ئاستی تەندروستی دەروونی چەندە ئەوا بێ خۆخەڵەتاندن دەکرێ بزانێ لەرۆژێکدا چەند زەمی خەڵك دەکات، یان چەند ستایشیان دەکات و چەند بەراشکاوی رووبەروویان دەبێتەوە و بەئەقڵ و مەنتیق قەناعەتیان پێدەکەی ئەو کاتیش تۆ کەسێکی ملکەچ نابی کەسێکی چاو شۆڕ نابی، زمانت پاراو دەبێت، متمانە بەخۆ دەکەیت

منداڵەکانیشت وەکو خۆت خاوەن متمانە دەبن، هەر بۆیەشە بۆ پەروەردەکردنی نەوەیەکی مەدەنی و دەروون دروست پێویستە بەئەقڵ و ڕاشکاوی بەرەنگاری گرفتەکانت ببییتەوە بۆ ئەوەی منداڵەکەت قوتابییەکەت کارمەندەکەت لاساییت بکەنەوە، کەواتە زەمکردن نیشانەی لاوازی و دڵەراوکێ و بێورەیی مرۆڤە و دەتوانێ لەو جۆرە هەڵوێستانە بەتەنها دابنیشێ و لێی رابمێنێ بۆئەوەی فێری ئەوە بێت چۆن کۆنترۆڵی خۆی دەکات و چۆن جڵەوی ئارەزووەکان دەخاتە ژێر رکێفی خۆیەوە.

زەمکردن دەگەڕێتەوە بۆ یەکێك لەپێویستیە بەدی نەهاتووەکانی تاك ئەویش دانپێدانانە لەلایەن کەسانی ترەوە.

زەمکردن بەبڕوای هەندێ لەتوێژینەوەکان دەگەڕێتەوە بۆ دەمارگیری، ئەگەر سەیری لۆژیکی دەمارگیری بکەین ئەوا لەبنەڕەتدا بەندە بە رووبەرووبوونەوەی دوو ناکۆك بەیەك، لەلایەکەوە زیادەڕۆیی لەخۆستایشکردن و پڕشکۆکردنی و شانازی پێوەکردنە بەخود لەلایەکەوەو زیادەڕۆیی لە زەمکردنی کەسانی ترو کەمکردنەوە لەگرنگیی و نرخیان، هەندێ لێکۆڵینەوەش پێیانوایە کەمکردنەوە لەنرخ و بەهای کەسانی ترو لەکەدارکردنیان دەگەڕێتەوە بۆ خۆبەگەورە زانین، هەندێ لێکۆڵینەوەی تریش پێیوایە کەمکردنەوە لەنرخی کەسانی تر یەکێکە لەنیشانەکانی خەمۆکی کەتوشی ئەو کەسە بووە لەقۆناغی منداڵی، ئەم کەسانە لەکاتێکدا کەگەورەن لەکردارو گفتاریان دژی خەڵکن و چاودێری قسەو کرداری خەڵك دەکەن و نیازیان خراپە و گومان دروست دەکەن بەرامبەر خەڵك و لەنرخی خەڵك کەم دەکەنەوەو لەبەرامبەردا لەنرخی خۆیان بەرز دەکەنەوە، لەلایەکی دیکەوە هەندێ لەپێکەنین وەك گاڵتەکردن و گاڵتەجاری بەکەسانی تر جۆرێکە لەرەفتاری نەرێنی بەمەبەستی کەمکردنەوە لەنرخی خەڵك و زەمکردنیان، چێژوەرگرتن لەرەخنەگرتن لەکەسانی ترو زەمکردنیان هیچ کەسێکی کۆمەڵ رزگاری نابێ و تەنانەت لەنێو گەلانی دونیاش ئەم دیاردەیە هەیە لەوانەش لەنێو گەلی عەر ەب بۆ نمونە ئیبن دورەید شاعیری عەباسیەکان دەڵێ حەزی خەڵك بۆ رەخنەگرتن لەکەسانی تر کەمکردنەوە لەنرخی یەکتر و زەمکردنی بۆیەکتر کەس رزگاری نابێ لێی، کەلەشیعرێکیدا دەڵێ:

کەس نییە لەزمانی خەڵك بەساغ و سەلامەتی رزگاری بێ
ئەو کەسە ئەگەر پێشەواش بێ دەڵێن بێ عەقڵە

ئەگەر خاوەن چاکەش بێ ئەڵێن دەست بادە
ئەگەر بێ دەنگ بێ دەڵێن کەڕو لاڵە
ئەگەر قسەکەریش بێ دەڵێن دەم بەتاڵە.....تد

لەکوردەواری ئەگەر یەکێك دەوڵەمەند بێ دەڵێن لەکوێی بوو؟ ئەگەر یەکێك هەژار بێ دەڵێن نان نییە بیخوا سواڵ ئەکا، ئیدی لەمەجلیسی کوردەواری زۆربەی باسەکانیان باسی خەڵکەو دۆزینەوەی خاڵی لاوازی کەسەکانەو هەندێجاریش ستایشی کەسانێکیش دەکرێ ئەگەر بەرژەوەندی لەباسکردنەکەدا هەبێ ....تد واتە خەڵك بەهیچ رازی نییە دیارە ئەمەش هۆکاری دەروونی و کۆمەڵایەتی خۆی هەیە، دەروونناسان دەڵێن چێژوەرگرتن لە رەخنەگرتن لەخەڵك سەرچاوەکەی دەگەڕێتەوە بۆ گرێی خۆ بەکەم زانین یان هەستکردن بەکەمی، کەرەخنەگرتن لەکەسانی تر بۆئەوانە سەرچاوەی خۆشی و چێژە، چونکە ئەو کەسەی کەموکروتی لەخەڵك دەدۆزێتەوە پێیوایە کەموکورتیەکانی خۆی دەشارێتەوەو پێیوایە ئەوە بەڵگەیە بۆ سەلامەتی خودی خۆی، ئەمیش وەك ئامرازێکە بۆ رزگاربوون لەگرێ دەرونییە شاراوەکانی ناوەوە، رەنگە لەمەدا ئەو کەسە، کە زەم دەکات راستەوخۆ بەو کەموکورتیەی خۆی نەزانێ، چونکە سەرچاوەکەی لەنەستەوەیە، لە لێکۆڵینەوەیەکی دیکەشدا ئاماژە بەوە دراوە کەوا هەواڵی ناخۆش هەمیشە زوو بڵاو دەبێتەوە، چونکە ئەو هەواڵە کەموکورتی بۆ خاوەنەکەی دێنێ، کەدەبێتە خۆشی هەندێکی دیکە، واتە ئەگەر کەموکورتیەك لەیەکێك روو بدا بۆ نموونە کەسێك کچێکی خۆی ئەدا بەکەسێك بەدڵی خەڵك نییە ئەوە یەکسەر بڵاو دەبێتەوەو دەبێتە بنێشتە خۆشەی سەر زاری خەڵك، خەڵکیش لەچیرۆکی ئابڕوی کەسانی تر تاموچێژ وەردەگرێ و تا پێی بکرێ گەورەی دەکاو باوەڕی پێ دەکات و زیاتر لەهەواڵ ۆ چیرۆکی خۆش و سەرکەوتن.

زەمکردن لێرەدا جۆرێکە لەلکاندنی دەروونی[1] (الاسقاگ النفسی ) واتە کەسێك کەزەم دەکات ئەو شتە باس دەکات کەکەموکورتیە لەخۆیدا رەنگە ئەمە بەلای ئەو کەسەوە خۆ پاککردنەوە بێ لەو شتە یان خۆ بێبەریکردن بێ لەبابەتێك، زەمکردن بەرادەیەك بڵاوە بۆتە

---

١ لکاندنی دەروونی(الاسقاط النفسي) ئەو حاڵەتەیە کەکەسێك هۆکاری شکست و کەموکورتی خۆی بلکێنێت بەکەسانی دیکەوە.

پەندی رۆژانە وەکو زەمکردنی ژنان لەلایەن پیاوانەوەو پیاوانیش لەلایەن ژنانەوە، لەنێو پیاوان دەڵێن ژن مەخلوقێکی مەزنە ئەگەر قەدری خۆی بزانێ، ژن وەکو دەریا وایە بۆ ئەو کەسەی دەکەوێتە ژێر رکێفیەوە، هەورەها  زۆر بەهێزە بۆئەو کەسەی لەژن دەترسێ، ژن چل ساڵ خۆشەویستی دەشارێتەوە بەڵام یەك کاتژمێر رکوکینە ناشارێتەوە، شەیتان مامۆستای پیاوەو قوتابی ژن، ئەگەر ژن روبکاتە خراپە هیچ گلی ناداتەوە، دەرگای بەختەوەری داخە ئەگەر لەو ماڵە ژنێکی تێدا بوو دەنگی هەڵبڕی، ژن ژانە، ژن پیاو ئەکاتە پیاو و پیاویش لەپیاوەتی ئەخا، دوو خوشك پێکەوە هەڵناکەن...تد. هەروەها ژنانیش بەم شێوەیە زەمی پیاو دەکەن : پیاو زەویەکی لماویە کەڵکی ئاودانی نییە بەدڵۆپە نەبێ، بەهێزیی پیاوی ئاسایی لەبەکارهێنانی دەسەڵاتیدایە لەشوێنی خۆی نەك بەکارهێنانی زمان لەغەیری شوێنی خۆی، پیاو منداڵن بەڵام گەورەن، سێبەری دیوارێکی روخاو لەپیاوێکی ناپاك بۆ ژن باشترە، رەحمەت لەو پیاوەی قەدری خەسوی زانی، پیاو ماڵ بۆ ژن دروست دەکات، ژنیش پیاو بۆماڵ دروست دەکات، پیاو مێژووە ژنیش جوگرافیا لەبەرئەوە ئەستەمە پیاو مێژووی خۆی بژێ ئەگەر لەسەر بانەکان و کەناراوەکانی و کەشوهەوای ژن نەبێ، خراپترین رەزیل رەزیلی سۆزو خۆشەویستیە.

زەمکردن پەیوەندی بە رکوکینەوە هەیە، کە لەبنەڕەتدا کاردانەوەیەکی مرۆڤە بەهۆی لاوازی و ترسنۆکیەوە هەرچەندیشە زوڵم لێکراو بن یان قوربانی بن، رکوکینە گوزارشتێکی هەڵچوونییە دەرەنجامی لاوازی و نەبوونی توانای بەرەنگاربوونەوەی راشکاوانەو وەرنەگرتنەوەی ئەو مافەی زەوتکراوە، بۆیە هەندێ کەس لێرەو لەوێ پەنا بۆ جۆرە بەباکردن (تنفیس) دەبەن و هەوڵ دەدەن بۆ بەتاڵکردنەوەی خەمەکانیان لەرێگەی هەڵگیرسانی ئاگری رکوکینە لەرێگەی زەمکردنەوە وەك گوزارشتێکی ئاشکرا بۆ ئەوەی لەناوەوە دەخولێتەوەو وشکوتەڕ پێکەوە دەسوتێنێ، لەپەیڕەوکردنی رکوکینەدا ئەو کەسانە گوزارشت لەو فشارە زۆرە دەکەن کەرووبەڕوویان دەبێتەوە بەهۆی هۆکارگەلێکی ناوەوە یان دەرەوە یان هەردوکیان:

هۆکارە ناوەکیەکان: لەئەنجامی لاوازی و لەجیاتی پەرەبەخۆدان و گەشەپێدانی بەهرەکان ...پەرە بەرکوکینەو غیرە ئەدرێ کەلەرێگەی زمان و زەمکردنەوە بەرپا دەکرێ، ئەوجا کەسی رك لەدڵ ئاگای لەخۆی بێ یان نا، کەئەمانەش دەبنە هۆی فشار لەسەر کەسەکە کەلەکۆتاییدا وا لەکەسەکە دەکات ناچار بێت رکوکینە بەکاربێنێت، بەڵام سەبارەت بە هۆکاری دەرەکی زۆر

کەسێك خۆی بەباشتر دەزانێ لەکەسانی تر و پەنا بۆ ئەم جۆرە رەفتارە دەبات. رکوکینە کەرێچکەی خۆی لەزەنکردندا دەدۆزێتەوە وزەیەکی کوێرانەی نەرێنیە ئامانجی تێکدانە لەسەر ئەم شێوانە دەردەکەوێت:

گاڵتەکردن و کەمکردنەوە لەکەسانی تر وەکو زەمکردن، دۆزینەوەی هەڵەو کەموکورتی خەڵك، لایەنگیری کوێرانە و نابابەتیانە، کەسانی خاوەن رکوکینە دەبنە مەترسی بۆسەر باری دەروونی خۆیان، کە لەراپرسیەکدا نووسەر ئەنجامی داوە خەڵك لەزمانی خۆیانەوە دەریدەخەن، بابزانین چۆن باسی خۆیان دەکەن سەبارەت بەزەمکردنی دەوروبەریان:

- پیاوێکی  تەمەن٥٢سالّ: بەڵێ زەمی خەڵکم کردووە لەبەر ناوەکە نییە، بەڵکو زەم بۆ چاککردنی کەسەکەیە، چونکە تۆ لەنێوان چاکی و خراپیدا شایەدی دەدەیت، وئینشەڵڵا نابینە کاری تێکدانی کەسایەتی ئەم مرۆڤە.

- مامۆستایەکی پیاو تەمەن ٣٩ساڵ: بەڵی زەمی خەڵکم کردووە، چونکە لەژیانی رۆژانەمان بەردەوامین لەکاری نەشیاو ئەم جۆرە کەسانە تا مردن چاك نابن

-سەرپەرشتیارێکی پیاو تەمەن ٥٩ساڵ: بەڵێ زەمی خەڵکم کردووە لەبەر زۆری ناهەقی واتە خەڵکی شیاو لەشوێنی شیاو نابینرێت یان ئەگەر دوێنێ کوڕی باش بوو ئەمڕۆ چووە سەر کورسی و پشت مێز  یەکسەر دەگۆڕێت واتە کوڕی دوێنێ نییە.

-مامۆستایەکی پیاو تەمەن ٣٧ساڵ: بەڵێ زەمی خەڵکم کردووە لەبەر ئەوەی ئەوەی زەمم کردووە کەسی نەشیاو  بووەنە پێویست بووە کەباسی لایەنە سلبیەکانیان بکەین.

-مامۆستایەکی ژن تەمەن ٤٥ساڵ: بەڵێ زەمی خەڵکم کردووە لەبەرئەوەی لەناو کۆمەڵگەی ئێمە ئەگەر نەتەوێ تووش دەبی ...جاخۆی ناشیرین و جوان نییە....بەڵام دەڵێم کەناو مەجلیسێك باسێك دەکرێت تۆش قسەك هەردەکەی ئایا ئەوە زەمە یان نا؟ نازانم.

-فەرمانبەرێکی پیاو تەمەن ٣٦ساڵ: نەخێر زەمی کەسم نەکردووە من لەژیانمدا پاش ملە باسی کەسم نەکردووە، چونکە پێم خووڕەوشتێکی ناشیرین بووە روو بە روو هەرچی هەبێ بەخۆییم گوتووە.

-قوتابییەکی کچ تەمەن ١٩ساڵ: نەخێر زەمی کەسم نەکردووە و ئەگەر شتێك لەدڵم بێت ئەوا روو بەروو پێی دەڵێمەوە هەرگیز زەمی ناکەم لای کەس.

سەرپەرشتیاریکی پەروەردەیی تەمەن ٤٤ساڵ: بەڵێ زەمی خەڵکم کردووە هەندێکیان موستەحەقی زەمکردنن لەبەرئەوەی سیفەتی خراپیان هەیە پێویستە لەناو خەڵك ئاشکرا بکرێن بۆ ئەوەی لەدوارۆژدا ئەم سیفاتانە تەرك بکات لەلایەکی تریشەوە هەندێ خەڵك هەن لەهیچ و خۆڕا دەکەونە ویزەی خەڵك هەر رۆژەی زەمی خەڵکێك دەکەن، بەڵام من لەگەڵ ئەوەدام زەمی خەڵك بکەم بۆئەوەی واز لەسیفەتە خراپەکانی بێنێ.

خوێندکارێکی تەمەن ١٨ساڵ: نەخێر زەمم نەکردووە، بەڵام رەخنەی رووبەرووی کردووە ئەویش بۆ چاککردنی کەموکورتیەکانی ئەو کەسە.

مامۆستایەکی پیاو تەمەن٣٣ساڵ: زەمی خەڵکم کردووە لەبەر ئەوەی شایەنی ئەوە بووە کەباسیان بکەم

کارمەندێکی ئافرەت تەمەن ٣٠ساڵ : نەخێز زەمی خەڵکم نەکردووە، چونکە ئەو خەڵکانەی کەهەڵسوکەوتم لەگەڵ کردوون خەڵکی باش و دڵسۆز بوونە لەبوارەکان لەهەڵسوکەوتکردن لەگەڵ دەوروبەریان مایەی زەمکردن نەبوونە.

لەزۆربەی درکاندنی ئەو کەسانەی کە ڕای خۆیان دەرخستووە سەبارەت بەزەمکردن هەست دەکرێ پەشیمانن لەو جۆرە رەفتارە بەڵام هۆکاری باسکردنەکەیان یان زەمکردنیان دەگەڕێتەوە بۆ دەق پێوەگرتن و فێربوونیان لەمەجلیسی خێزانی و ئەو هۆکارە دەرونیانەی تر کەلەسەرەوە باسمانکردن، کەدەکرێ پەروەدەو دامەزراوە پەروەدەییەکان لەخێزان ەو قوتابخانەو شوێنی دیکە هەڵوەستە لەسەر ئەوە بکەن و ئاگاداری ئەوە بن منداڵەکانیان باسی خەڵك نەکەن بێ مەنتیق و لۆژیك و هەروا پەلاماری کەسانی تر نەدەن، چونکە زۆربەی فێربوونی گەورەکانیش هەر دەگەڕێتەوە بۆ قۆناغی منداڵی و راهاتنیان لەسەر ئەو جۆرە رەفتارانە.

## درۆكردن:

**كەسی درۆزن راستەوخۆ تەماشات ناكات و ئەگەر لێی بڕوانی تەماشای شتێكی دیكە دەكات، كاتێكیش دادەنیشێ بە ئاسودەیی دانانیشێ و زۆر دەجولێ.**

درۆكردن لای لێكۆڵەرەوانی سایكۆلۆژی گواستنەوەی هەواڵە بە پێچەوانەی واقیع، واتە پێچەوانەی ئەوەی كە هەیە، هەندێك جار بەتەواوی پێچەوانەی واقیع دەگوازرێتەوەو هەندێك جاریش بەشێك لەو رووداوە یان نیوەی دەگوازێتەوەو هەندێك جاریش درۆزن خۆی زیادەی بۆ دەخاتە سەرو هەندێ جاریش بەو جۆرەی كە خۆی دەیەوێ دەیهۆنێتەوە، درۆكردن هەر لەگەڵبوونی بەرژەوەندی لەكۆمەڵگەی مرۆڤایەتی هەبووەو رۆژانە مرۆڤ بێئەوەی هەستی پێبكات درۆدەكات ئەویش لەكاتی زیادەڕۆیی لەرووداوەكان یان لەكاتی باسكردنی شتێك، بۆ نموونە كاتێ باسی گەرمای هاوین دەكات و دەڵێ كورە كوڵاین كوڵا، یان دەڵێن رەق بووینەوە رەق، درۆكردن بە ستراوە بە پیشەوە لەوانەش درۆكردن لەكاتی جەنگدا بۆ ئەوەی ورەی دوژمن بڕۆخێ یان ورەی سوپا بەرز بكرێتەوە، درۆكردن لەبواری دیبلۆماسیدا كاتێ وڵاتێك ئامادەیی خۆی دەردەبڕێ بۆ پشتگیری وڵاتێكی دیكە، یان لایەنێك بانگەشەی ئەوە دەكات كەوا بەدڵ و بەگیان لەگەڵ لایەنێكی دیكەدایە، ئەو جۆرە پشتگیریانە تەنها مجامەلەیەو هیچی دیكە، درۆكردن لە جەنگی درەروونیدا هەر وەكو گۆبلز وەزیری شەڕی ئەڵمانیا دەڵێ (درۆ بكە، درۆ بكە، درۆ بكە) هەتا خەڵكی بڕوات پێدەكەن، درۆكردن مرۆڤ فێری دەبێت .

هۆكارەكانی درۆكردن

١-بەرژەوەندی و بەدەستهێنانی قازانج: زۆرجار مرۆڤ رۆژانە پەنا بۆ درۆدەبات بۆ بەدەستهێنانی بەرژەوەندی و گەیشتن بە ئامانجەکانی خۆی بۆ نمونە بۆ ئەوەی خۆی لای کەسێك شیرین بکات و مجامەلەی بکات کەوا ئەو کەسێکە خەڵك ستایشی جوامێری و پیاوەتی ئەو دەکات کە ئەمە پێچەوانەی واقیعە، چونکە هیچ کەسێك ستایشی ئەمی نەکردووە، بەڵکو ئەم درۆزنە بۆ خۆ نزیك کردنەوە ئەوە دەڵێت .

٢-ترس لە سزادان: هەندێجاریش مرۆڤ بۆ ئەوەی رزگاری بێ لە سزایەك لە فەرمانگەکەی یان سەرۆکی فەرمانگەکەی ئەوا نەهاتنەکەی بۆ دەوام بۆ ئەوە دەگەڕێنێتەوە کەوا دایکی نەخۆش بووە یان خەسووی نەخۆش بووە لەراستیشدا وانەبووە ئامانجیش لەودرۆرکردنە پاساو هێنانەوەیە بۆ نەهاتنەکەی، ئەگەر منداڵیش بێ بۆ ئەوەی مامۆستاکەی سزای نەدا ئەرکی ماڵەوەی بەجێ نەگەیاندووە دەڵێ باوکم ئیشی پێم هەبوو .

٣-خەیاڵ: مرۆڤ هەندێ جار لە جیهانی رۆمانسیات و خەیاڵدا دەژی و هەندێ جاریش ئەو خەیاڵەی ئەوەندە زاڵە بە سەریدا دەیکاتە بەشێك لە واقیعی خۆی و قسەی خەیاڵی دەکات کە پێی وایە ئەوە راستیە

٤-تۆڵەسەندنەوە لەکەسانی دیکە: ئەگەر کەسێك رکی لەکەسێکی تر ببێتەوە لەبەرئەوەی دژی بەرژەوەندیەکانی بووە ئەوا ئەم بە هەلی دەزانێ، کە تۆمەتێك بخاتە پاڵ کەسانی دیکەو درۆیان بۆ هەڵبەستێ و تۆڵەیان لێبکاتەوە .

٥-دوورکەوتنەوە لەیادەوەری تاڵ و ناخۆش: بۆ ئەوەی مرۆڤ رۆژە تاڵەکانی ژیانی لەبیربچێتەوە پەنا بۆ درۆکردن دەبات و خۆی دەخاتە جیهانی خۆشترەوەو رەنگە باسی ئەوەش بکات کە سەردانی وڵاتانی دونیای کردووەو چەندین کاری چاکەی ئەنجام داوە

٦- فێربوون و راهاتن لەسەر درۆکردن: فێربوون و راهاتن لەسەردرۆکردن دەگەڕێتەوە بۆ قۆناغی منداڵی ئیتر ئەو منداڵە ئەگەر گەورەش بێت بەزەحمەت ئەتوانێ دەستبەرداری درۆکردن ببێت.ئەمیش بەهۆی کەسوکارو ئەوانەی هاتووچۆی خێزانی ئەو منداڵە دەکەن، کەلەکردەوەو قسەکانیاندا درۆ بەئاشکرا دەردەکەوێت و یان قسەو کردەوەیان یەك نییەو منداڵیش ئەو قسەو کردەوانە لێکدەداتەوە.

٧- خۆ دەرخستن و خۆهەڵکێشان: کەسێك لەبەر ئەوەی خۆی هیچی تیا بەسەر نییەو کەس گوێی ناداتێ و بۆ ئەوەی دەوروبەر ئاوڕی لێبدەنەوە درۆی شاخدار دەکات،

کەبەزیادەڕۆیی باسی پاڵەوانێتی خۆی و باوباپیرانی دەکات یان هەر باسێکی دیکە کە لەبنەڕەتدا باسەکە هەبووە ئەم شتی تری بۆ زیاد دەکات کە ببێتە مایەی سەرنجڕاکێشانی دەوربەری .

٨- لاساییکردنەوە: ئەمیش هەر دەگەڕێتەوە بۆ قۆناغی مندالّی و مێرد مندالّی کەبچوکەکان لاسایی گەورەکان دەکەنەوە یان لاسایی ئەو روداو بەسەرهاتانە دەکەنەوە کەبۆیان دەگێڕدرێتەوە یان سەیری فیلم دەکەن کەسەرسامن بەپاڵەوانی فیلمەکەو دەیانەوێ وەك ئەو پاڵەوانە بکەن یان خۆیان بخەنە جێی ئەو پاڵەوانە کەلەئەرزی واقیعیشدا ئەوە روونادات بۆیە پەنا بۆ درۆ دەبەن.

رۆژانە مرۆڤ درۆ دەکات بێ ئەوەی هەستی پێبکات و هەندێ جاریش درۆ دەکات و مەبەستی هەیە، ئەو درۆیانەی کە مرۆڤ هەستی پێناکات ئەوەیە زیادەڕۆیی لە وەسفی شتێکدا دەکات بۆ نموونە ئەگەر گەرما بێت دەڵێ مردین لە گەرمانا، یان رەقبووینەوە لە سەرمانا، یان دەڵێین ئەوەندە لێیاندا کوشتیان بە کوشتن، ئەو درۆیانەش کە مرۆڤ مەبەستێتی ئەوەیە بۆ ئاشتەوایی نێوان دوو کەس بەکاربهێنرێ کە دەڵێ کاکە تۆ لێبوردەیت و خەڵك وا دەتناسێ، مەبەست لەو باسکردنە بۆ ئەوەیە ئەو کەسە هان بدات کە شەڕ نەکات و چیدیکە بە دوای کێشەکەدا نەڕوات، یان کەسێك کەسێکی دیکە لە ماڵەکەی خۆیدا دەشارێتەوەو ئەگەر لێی بپرسن فلانە کەست نەبینییوە؟ دەڵێ نازانم بۆ ئەوەی شەڕو هەرا درووست نەبێت، رۆژانە هەر کەسێ قسەمان بۆ بکات بێ ئەوەی لە قسەکەی بکۆڵینەوە دەڵێین راست دەکەی، قسەی تۆیە، قسەکەت جوانە، ئەم جۆرە قسانە هەمووی درۆن و رۆژانەش مرۆڤ دەیکات .

رەفتاری کەسی درۆزن و ئاشکرابوونی

لێکۆڵەرەوانی دەروونی  دەڵێن کەسی درۆزن بە چەند نیشانەیەك دەناسرێتەوە لەوانەش: کاتێ قسەی لەگەڵدەکرێ راستەوخۆ تەماشات ناکات و ئەگەر لێی بڕوانی تەماشای شتێکی دیکە دەکات و کاتێکیش دادەنیشێ بە ئاسودەیی دانانیشێ و هەردوو قاچی لە سەریەکتر دادەنێ، چونکە لە هەڵوێستی بەرگریدایە وەك ئەوەی لە سەنگەردابێ و هێرش دەکرێتە سەری، لە نیشانەکانی دیکەی کەسی درۆزن ئەوەیە کە گۆشەی چاوی بچووك دەکاتەوە، چونکە درۆکردنەکەی دەبێتە مایەی دڵەراوکێ بۆی و هەروەها دەستیشی لەسەر رووی خۆی دادەنێ یان لە سەر دەمی دایدەنێ، چونکە نەستی ئاراستەی دەکات کە درۆکەی داپۆشێ و

هەروەها بە خێراییش قسە دەکات بۆ ئەوەی لەو گوشارە رزگاری ببێ کە لە کاتی درۆکردندا دووچاری دەبێ و هەوڵیش دەدات زیادەڕۆیی لە راستیەکانیدا بکات یان خۆی بە ئاسودە پیشان بدات بۆ ئەوەی بەرامبەرەکەی فریو بدات و بیخەڵەتێنێ، کەسی درۆزن هەوڵ دەدات لە بەرپرسیارێتی دوور بکەوێتەوە بۆیە شێوازی گشتی بەکار دێنێ و ئەو وشانە بەکار دەهێنێ کە سوکایەتی بە خەڵك دەکات و ناوناتۆرەی ناشیرین بداتە پاڵ کەسانی دیکە بەتایبەتی ناوی درۆزن کە خۆی تووشی بووە، درۆزن زوو شتی لەبیردەچێ لە بەر زۆری درۆ خۆی خۆی ریسوا دەکات، کەسی درۆزن کەسێتی زۆر لاوازو بێ بەهایەو هەمیشە دەیەوێ بە درۆکانی کۆشکێ بۆ خۆی درووست بکات و پایەو پلە بۆ خۆی دابین بکات و خۆی بە کەسێکی بە تواناو تێگەیشتوو نیشان بدات، کلۆدین بیلان ژنە دەورنناسی فەرەنسایی و دانەری کتێبی (دەروونی درۆزن) دووپاتی دەکاتەوە کەوا درۆکردن کاردانەوەیەکی خراپی لە سەر تەندرووستی هەیە چونکە درۆزن بە هۆی درۆکردنەوە هەست بە گوناه دەکات، یان ترس لە ئاشکرابوون، دەبێتەهۆی فشاری دەماری بەردەوام، ئەمیش کاریگەری سلبی لە سەر تەندروستی گشتی هەیە وەکو شڵەژانی نوستن، خێرایی هەڵچوون، دڵەراکێ، ژانەسەرو شتی دیکە لەو بابەتە کە بەهۆی ئەو هەستەوە سەر هەڵدەدەن، لە لایەکی دیکەوە د ئیبراهیم فەقێ دەڵێ مرۆڤ رۆژانە ٦٤ درۆ دەکات و منداڵیش رۆژانە رووبەرووی ١٤٨ پەیامی سلبی دەبێتەوە لە لایەن دایکو باوکیەوە ئەمەش یەکێکە لە هۆکارەکانی درۆکردن، هەروەها جای جای نیو بیر یی کە یەکێکە لە راهێنەرانی ئاژانسی فیدراڵی ئەمریکا و ماوەی ٣٠ یساڵە لەوێ کار دەکات و ماوەی ٥ ساڵ وەك ئەفسەر لەو شوێنە کاری کردووەو خاوەن هونەرو کارامەییەکی سەرکەوتووە لە بواری ئاشکراکردنی درۆدا کە لەو باوەڕەدایە کەوا درۆکردن بە ١٠ رێگا ئاشکرا دەبێت کە ئەمانەن :

١- یەکنەبوونی قسەکانی: یەکەم شت کە سەرنج رابکێشێ لە قسەکانی درۆزن ئەوەیە کە قسەکانی دژ بە یەکن، گێڕانەوەکانی چەند نا مەنتیقی بێ ئەمەندە ناراستی ئەو قیسانە دەردەکەوێ، لەبەر ئەوە باشتروایە بەدوای گەسێکی راستگۆدا بگەڕێی لە جیاتی ئەوەی کاتی خۆت بە فیڕۆ بدەی .

٢- پرسیاری چاوەڕوان نەکراو

تەنها ڕێژە ٤٪ی درۆزنەکان دەتوانن داهێنان لە درۆکانیاندا بکەن، بۆیە پێویستە سرپۆش و داهێنەرو لێهاتوو بێ لە درۆکانیان و چاوەڕێی وەڵامی درۆ مەکە بەڵکوخۆت فێری ئەوە بکە کە هونەری ئاشکراکردن بە فێڵ بۆ بەکار بێنی

٣-هەڵوەستە لە سەر شتی سەرەکی

د.مورین ئوسولیفان مامۆستای دەروونناسی لە زانکۆی سان فرانسیسکۆ دووپاتی دەکاتەوە یەکەم نیشانەی درۆکردن و نەپاراستنی ئەمانەت گۆڕانکارییە لە رەفتار، ئەگەر ویستت سەرنجی کەسێك راکێشی کە مایەی دڵەراوکێیە ئەوا دەبێ خۆت بە هێمنی پیشان بدەی واتە شێوازی فێڵ پەیڕەو بکە، د. سولیفان پێیوایە فێڵ پێوەری کەسی درۆزنە لە سەر شتە بنەڕەتیەکە، چونکە رەفتاری بەردەوامی ئەو کەسە دوورە لەهەڵسوکەوتی ئاسایی کە پێویستە وابێ، ئەمە نیشانەی ئەوەیە کەوا شتێك لە ئارادایە کورد واتەنی ئەو ماستە بێ موو نییە

٤- هەستی درۆزن

زۆر خەڵك ناتوانن زەردەخەنەی درۆ بکەن، د. سولیفان دەڵێ چونکە کاتی زەردەخەنەکە گونجاو نییە لەگەڵرووداوەکە یان لەگەڵشتی دیکە تێکەڵە، یان تێکەڵاوە لە نێوان دەمووچاوێکی توڕەو دەمووچاوەێکی بە زەردەخەنە، چونکە لێوەکان دەتوانن ئەوە ئاشکرا بکەن، دووپاتی دەکاتەوە کەوا زەردەخەنەی راستەقینە پەیوەند نییە بە قەبارەی لێو یان پڕنەبوونی، بێگومان هەستە درۆزنەکان بەڵگەیەکی راستەقینەیە بۆ بوونی شتێکی دژ بەیەك

٥- گرنگیدانی ساختە

د . سولیفان دەڵێ خەڵك دەڵێن هەست (حدس) ی ژن لەوانەیە درۆو ترازانەکانی پەیوەست بە سۆز ئاشکرا دەکات، هاوکات کەسێکی ئاسایی هەندێ جار کەسی درۆزن ئاشکرا دەکات و بە وردی دەتوانێت دیاری بکات، سۆزە ساختەکان هێمایەکی باشە بۆ ئاشکراکردن.

٦- وشەیەك کە زیاتر لە مانایەك هەڵدەگرێت :

د. بول ئیکمان دەڵێ دەکرێ درۆ لە میانەی ئەوەی کە گوزارشتێك زیاتر لە یەك مانا هەڵبگرێت ئاشکرا دەکرێت، زۆر جار گوزارشتەکە زۆر کورتە، هەندێ جار ئەو کەسە وا دەردەکەوێ بەختەوەرەو لە هەمان کاتیشدا وادەردەکەوێ بێزارە .

٧- گەڕان بە دوای شتە ناکۆك بەیەکەکان

ڕێسای گشتی ئەوەیە هەر شتێك لە کەسێکەوە دەربچێ وەکو تەتەڵەی زمان یان دەنگ ئەوە نیشان دەدەن کە ئەو کەسە راستگۆیە یان درۆزنە، ئیکمان بۆ نمونە دەڵێ خاوەن دەنگی حەپەسێنەر (المندهش) وا درۆ دەکات بە وەڵامی هەر پرسیارێك شتێکی ناکۆك بەیەك لە کردەوەو قسەیدا دەردەکەوێ، ئیکمان ئەم دژ بەیەکانە وا لێك دەداتەوە پەیوەندی نێوان دەنگ و وشەو هێمایە هەموو ئەم دژبەیەکانەی رەفتار لە هەندی کەسدا دەردەکەوێ و بە ئاسانی ئاشکرا دەبێت .

٨- هەستکردن بە نارەحەتی

هەر کەسێك کەوا چاو وەك زمانێکی پەیوەند بە شێوەیەکی سروشتی بەکار نەهێنێ مانای وایە ئەو مرۆڤە راشکاو نییە، لەمبارەیەوە دەروونناس برمان جین دەڵێ سەیری دوور دەکەن، عەرەق دەکەن، سەیرکردنیان سروشتی نییە و شڵەژانییان پێوە دیارەو هەموو رەفتارێکیان نا سروشتیە و نیشانەی دڵەراوکێیە .

٩- زیاد لە پێویست دەڵێت

کاتێ بە یەکێکیان بڵێی لە کوێ بووی؟ بە دوورو درێژی و هەموو شتێك باس دەکات کە پێویست ناکات

١٠-راستیەکان فەرامۆش مەکە

گرنگ ئەوەیە راستیەکان ئاشکرا بکەین زیاتر لەوەی بە دوای درۆکاندا بگەڕێین چونکە لە روانگەی تۆوە خەڵك درۆزن دەردەکەوێ بەڵام لە هەمان کاتیشدا راستیش دەڵێن.

## شەرمکردن:

**کەسی شەرمن پێی خۆشە ئەو کارەی بۆ کەسێکی تری دەکات بەزیادەوە بیکات، کاتێکیش کەسێك کارێکی بۆدەکات زۆر شەرمەزار دەبێت.**

شەرمکردن، یان بێبڕستی، بێهێزی، بێتوانایی، لاوازی دەروونی، بەستەڵەکبوون، بێمتمانەیی وسڕبوون و ترسنۆکی ..تد، کەهەرهەمووی نەکردنە، واتە نەکردنی قسەورەفتار، کەپێویست بێ لەکاتوشوێنی خۆیدا بکرێ، شەرمکردن وەکو نەمانی نەوتە لەچرا، کە کزدەبێ و رووناکی نامێنێ هەرچەندیشە ئەو چرایە چاکیش بێ، کەواتە شەرمکردن هەڵچوونێکی نێگەتیڤەو نەخۆشیەکی کوشندەیە، چونکە رێگە نادات ئەو کەسە گەشە بکات، کە تواناکانی خۆی پیشان بدات و پەیوەندییە کۆمەڵایەتیەکانی فراون بکات و دەنگ بۆ مافی خۆی هەڵبڕێت و لەئاست جەورو ستەم بەگۆ بێت، هەستی کەسی شەرمن هەروەکو تۆژەرانی دەروونی دەڵێن بەم شێوەیەیە (کاتێك کەسێکی تر کارێکم بۆ دەکات هەست بەشەرمەزاری دەکەم و کاتێکیش کار بۆ کەسێك دەکەم هەست دەکەم ئیشەکەم تەواو نەکردووە)، شەرمنەکان زۆر هەلی ژیانی خۆیان بەهۆی شەرمنیانەوە لەدەست دەدەن بەهۆی ترسان لەچوونە پێشەوەو هەستکردنیان بەکەمی، ئەگەر لەخەڵك بپرسی ئایا شەرم دەکەن ئەوا رێژەیەکی زۆریان دەڵێن نەخێر شەرم ناکەین، بەڵام بەرەفتاریاندا دەردەکەوێ کەئەوان شەرمنن، چونکە ئەو کەسەی کەلەوە دەترسێ کەخەڵك بزانێ ئەو شەرمنە پێیوایە ئەو شەرمکردنە کار لەکەسێتی و شایستەی کۆمەڵایەتی ئەو دەکات بەتایبەتیش و زۆر بەتایبەتیش بەرامبەر رەگەزەکەی تر، هەر ئەم هۆکارەشە وا

لەهەرزەکاران بکات خۆشەویستییان بۆ رەگەزی دیکە بشارنەوەو نەیدرکێنن یان خۆیان وا پیشان بدەن کەئەوان شەرمن نین، بۆیە زوو دەکەونە داوی خۆشەویستیەکی کرچوکاڵەوە.

(شیك) و (واتسن) واپێناسەی شەرمکردنیان کردووە، کەبریتیە لەمەیلی هەستکردن بەشڵەژان و دڵەراوکێ و نەبونی توانا لەکاتی هەڵویستەکانی کارلێککردنی کۆمەڵایەتیدا، شەرمکردن بەوەوە بەستراوە کەکەسی شەرمن توانای کۆمەڵایەتی نەبێت زیاتر لەوەی ترس لەهەستی نەرێنی ناوەوەی خۆی بێت، کە رەنگە نەزانێ چییە.

هەندێ لەلێکۆڵەرەوان دەڵێن مەرج نییە کەسی شەرمن کۆمەڵایەتی نەبێت، چونکە کۆمەڵایەتی بوون ئەوەیە تۆ ئارەزووی کارلێککردنی کۆمەڵایەتیت هەیە تەنانەت ئەگەر لەناخیشەوە بێ، چونکە کەسانێك هەن بەهیچ شێوەیەك شەرمیش ناکەن، بەڵام هیچ کۆمەڵایەتی نین لەهاوکاریکردن و لەرکابەرێتی و لەیارمەتیدانی خەڵك و لەهاورێییەتی و لەخزمایەتی و دراوسێیەتیش، شەرمکردن حاڵەتێکی دەروونی ئەوتۆیە، کەمرۆڤ دەستەوەستان دەوەستێ و هیچی پێناکرێ و تەنانەت زۆر جار تێر ناخوات بەتایبەتی لەحزوری کەسانی ترداو هەندێجار لەکاتی نانخواردنیش کەوچکەکەی لەدەست بەردەبێتەوەو ئەگەر دەست بۆ پەرداخە ئاوێکیش ببات پشتی دەستی لەپەرداخەکە ئەدات و ئاوەکە ئەرژێ و زیاتر سوور هەڵدەگەرێ و ئەو خواردنەی کەنزیکی نەبێت دەستی بۆنابات دەبێ لەپێشی دابنێی نەخاسمە لەحزور رەگەزەکەی تردا.

کلتوری کۆمەڵ بڕیاری داوە منداڵی عاقڵ کەم جوڵە بێت و ژنی شەرمن شارێك بێنێ و پیاوی شەرمنیش شانەیەك نەهێنێ، ئەگەر لەرووی سایکۆلۆژییەوە بڕوانینە کەسێتی مرۆڤ ئەوا گرنگترین تەمەنی لەبندەستی دایکی بەسەر دەبات کەمنداڵییەو هەر لەم تەمەنەش کەسێتی دروست دەبێت ئەگەر شەرمن بێت یان نا، ئەی چۆن شەرمنبوونی دایکی کاری لێناکات، کەکۆمەڵ داوای لێدەکات کە دەبێ کوێرانە شەرمن بێت، چونکە لەم حاڵەتە حەیاو شەرم تێکەڵ دەبێت و لێك جیاناکرێنەوە واتە کەسێك حەیاو حورمەتی خۆی دەپارێزێ ئەوە پێویستیەکی کۆمەڵایەتی و مرۆییەو شەرمکردنیش شتێکی دیکەیە کاتێك ژنێك مافی دەخورێ و زوڵمی لێدەکرێ و بێدەنگ دەبێ لەئاستیدا، رەنگە ئەو بەگۆهاتنەی ژن یان کەسی شەرمن جۆرێك بێ لەسەرکێشی هەروەکو زانا کاتل ئاماژەی پێداوە کەپێیوایە شەرمکردن خۆپارێزی بێ بەرامبەر سەرکێشی یان هەر شتێکی نوێ.

زانایان لەوانەش (بلکونیز) و (زیمباردو) ئاماژەیان بەشەرمکرنی ئاشکراو شەرمکردنی نهێنی داوە، کەلە کەسەکاندا دەردەکەوێت، کەهەندێکیان بەهۆی پیشەکەیانەوە بەسەر شەرمنیەکەیاندا زاڵ دەبن و هەست ناکرێ شەرمنن هەرچەندیشە لەراستیدا شەرمنن وەکو پیشەی مامۆستایەتی ئەگەر مامۆستاکەش شەرمن بێت رۆژ دوای رۆژ ناچاردەبێت بەکردەوە بەسەر ئەوهەڵوێستەیدا زاڵ بێت و توانای بەسەردا دەشکێ، چونکە وا پێویست دەخوازێت، ئەو دوو زانایە لەلێکۆڵینەوەیەکیاندا بۆیان دەرکەوتوە کەوا شەرمکردن پێنج لایەنی هەیە کەئەمانەن:

هەستکردن بەشڵەژان لەهەڵویستە کومەڵایەتیەکان، ترس لەوەی کەخەڵك بەخراپ هەڵیبسەنگێنن، مەیل بۆ دوورکەوتنەوە لەهەڵوێستە کومەڵایەتیەکان، سەرنەکەوتن لەمامەڵکردن بەشێوەی گونجاو یان ئەنجامدانی رەفتارێکی ناشایستە.

یەکێك لەخاسیەتە باوەکانی دیاردەی شەرمکردن تاك هەست بەوە دەکات شتێك نییە بیڵێ، ئەمە لەمەجلیسی کوردەواریدا دیارە بۆیە ئەو کەسە شتی هەڵەقوبەلەق دەڵێ و بەلایەوە ئەوە گرنگە شتێك بڵێ، هەروەسا هەستکردن بەگەرماو سورهەڵگەڕانی دەموچاو، زۆر بیرکردنەوە لەوشتانەی دەیڵێت، ئارەزوی راکردن لەهەڵویستەکان، نەتوانین لەگەیاندنی ئەو پەیامەی پێویستە بەخەڵکی بیگەیەنێ، خۆسەرقاڵکردنی زۆر بە سەیرکردنی خەڵك بۆی، وشەکانی کەسی شەرمن بەستەڵەك کراوەو ساردوسڕن و تەنانەت نوکتە گێڕانەوەکانیشی ساردو سڕو بێ تامن، چونکە دەیەوێ زوو قسەکانی تەواو بکەن نەوەك پێی ببڕن، بۆیەشە زۆرجار کەقسە دەکات قسەکانی بەجارێ هەڵدەڕێژێ.

شەرمکردن ئەو کاتە توشی تاك دەبێت کەلەگەڵ کۆمەڵێك بێت نەك لەگەڵ تاکێك.

هەندێ لێکۆڵینەوەی زانستی واپێناسەی شەرمی کردووە، کەبریتیە لەحاڵەتی وەستانی رەفتار زیاد لەپێویست کەکۆمەڵێ سیفات لەگەڵیدایە لەوانەش سورهەڵگەرانی دەموچاو وعەرەقکردن و لەرزین و سیسبوونی روومەت و کردنی هەندێ جوڵە، کە پێویست نیە لەوانەش پەنجە تەقاندن و تێکالانی دەستوپەنجەکان و خوراندنی لووت و هەڵنەکردن بێ تەسبیح و شتی دیکە، لەگەڵ ئارەزوی زۆرمیزکردن و هەستکردن بەکەمی و نەمانی توانای قسەکردن، هەندێ کەسی تر دەڵێن: دووجۆری تر شەرمکردن هەیە شەرمکردنی کشاوە

کەنەکردنی ڕەفتارو بێدەنگی و کەمی قسەکردنە هەروەها شەرمکردنی پشتبەستن کە خۆخستنە تەك کەسانی ترو ملکەچکردنە بۆیان بەشێوەیەکی کوێرانە.

زانایان و توێژەرانی دەروونی لەو باوەڕەدان کەدیاردەی شەرمکردن ئامادەباشیەکی ویژدانی یان هەڵچوونە، لەپەیوەندی نێوان کەسی شەرمن و کەسانی تر دەردەکەوێ، شەرمنی نەخۆشیەکی وەزیفیەو پەیوەستە بەنەگونجاندنەوە ئەگەر کاتی بێت یان هەمیشەیی کەدەبێتە هۆی دەرکەوتنی کۆمەڵێ نیشانە لەکەسی شەرمن وەکو:

شڵەژانی گلاندەکان وەکو عەرەقدەردانی ناولەپ و ژێرپێ و وشکبوونی دەمولێو، فراوانبوونی موولوولە خوێنەکان کەدەبێـەهۆی سورهەڵگەڕانی دەموچاو یان چونەوە یەکی موولوولە خوێنەکان، کەدەبنە هۆی زەرد هەڵگەڕانی دەمووچاو.

تێکەڵکبوونی قسەکردن و هەناسەدان و گرژبوونوەی سینگ و شڵەژانی دەنگە ژێکانی، کەدەبنە هۆی پچڕانی قسەو هەناسەتەنگی و زمانگرتن و گۆڕینی ئاوازی دەنگ و ڕەقبوونی ماسولکەکان، کەدەبنە هۆی شڵەژانی بزاڤە ئیرادیەکان و نەمانی هاوسەنگی ولەرزینی دەستوپەنجەو گرژبوونەوەی ناوچەی دڵ کەهەستی دڵوەستان بەشەرمن دەبەخشێت، هەروەها دوابەدوای حاڵەتی شەرمنیەکە ماندووبوون و ئارەقکردن و خەم ولاوازی لەکەسەکە دەرئەکەوێ، کزبوونی چاوو کەمبوونەوەی هۆش و کەمبونەوەی زیرەکی لەو کاتەدا، بۆ نموونە قوتابییەك پارچە شیعرێکی لەبەرکردووە، بەڵام کەپەنجە هەڵدەبڕێ بۆ وتنەوەی شیعرەکە لەوانەیە نیوەی لەبیر بچێتەوە، هەڵوێستەکانی بارودۆخەکە لەمێشکی شەرمن دەخولێتەوەو نازانێ چۆن ڕەفتار بکات، ترس وتۆقین و هەستکردن بەخنکاندن و بەرزبوونەوەی پلەی گەرماو خاوبوونەوەو لەبیرچوونەوە.....تد

ئەلسمادونی واپێناسەی شەرمی کردووە: شەرمکردن کاریگەری هەڵچوونە بەرامبەر کەسانی دیکە لەهەڵوێستە کۆمەڵایەتیەکاندا.

ئەلبەهی: شەرمکردن بارێکی کۆمەڵایەتیە، لەوانەیە ترسی لەگەڵدا بێ کاتێك ئەو کەسە لەهەڵوێستی ئێستای دەوروبەری دەترسێ.

(جونز) و (بویگز) پێیانوایە شەرمکردن لەشێوەی ترس یان تۆقین یان بێدەنگی لەقسەکردن دەردەکەوێت .

شەناوی: شەرمکردن دەکەوێتەسەر هێڵێکی پلەپلە، کەسی شەرمن لەسەر سەرێکی هێڵکەیە، ئەوی بەرامبەریشی کە ترزل (متكبر) ە لەسەرەکەی ترێتی، هەردووکیان دوو سیفەتی خراپن، لەناوەڕاستی هێڵکەش حەیایە، کەئەمە سیفەتێکی باشە لەروانگەی ئاینی پیرۆزی ئیسلامەوە شەرمکردن بارێکی حەیای لەرادەبەدەرە دەبێتە هۆی سەرسوڕمان و بارگرژی، ئەمیش کارێکی خراپەو بەڵگەی لاوازییە نابێ لەمرۆڤدا هەبێ، چونکە دەبێتەهۆی بەدینەهێنانی خواست وئامانجەکان لەرووی پیشەیی و خوێندنیشەوە.

لای دەرونناسان و کۆمەڵناسانیش شەرمکردن بەنەخۆشییەکی کۆمەڵایەتی و دەروونی ئەژمار دەکرێت، کە زاڵ دەبێت بەسەر هەست ونەستی تاك هەر لەمنداڵیەوە، کەدەبێتە هۆی لەدەستدانی وزەی و تواناکانی و زاڵنەبوون بەسەر رەفتارەکانی خۆیدا.

حسین ئەلدرینی: شەرم مەیلی تاکە بۆ دوورکەوتنەوە لە کارلێککردنی کۆمەڵایەتی بەشێوەیەکی نەگونجاو.

تۆژەرانی دەروونی شەرمکردنیان بەگەلێ چەمکی دیکەوە بەستۆتەوە لەوانەش: سامکردن، حەیا، خاکەڕایی، ئیحراجبوون، بێ هەڵوێستی، ترسنۆکی، خۆدورگرتن، دڵەراوکێی جەماوەر، ترسی کۆمەڵایەتی.

لەراپرسیەکدا کە نووسەر لەسەر ٤٢٥کەس ئەنجامی داوە لەشاری هەولێرو خانقین و دەوروبەریان لەهەردوو رەگەزی نێرو مێ سەبارەت بەشەرمکردن رێژەی لە٩٠ی بەشداربووان شەرم دەکەن تەنها رێژەی ٪١٠ ی بەشداربووان دەڵێن شەرم ناکەین کە٪٦ی نێرن و ٪٤ مێن: کەبەم شێوەیە باس لەشەرمنی خۆیاندەکەن و ئێمەش وەکو خۆی نوسیومانەتەوە:

= فەرمانبەرێك تەمەن ٣٩ساڵ دەڵێ: هەموو کات شەرم ناکەم، بەڵام هەندێ کات شەرم زۆر پێویستە.

=رۆژنامەنوسێك تەمەن ٣٨ساڵ دەڵێ: هۆکاری شەرمکردن لای من یەکجار زۆرە، کەهەر لەمنداڵیەوە لەگەڵمدا ژیاوەو هەست دەکەم تا پیر دەبم هەر لەگەڵمدایە ئەم دەردە نەعلەتیە، لەهەڵسوکەوتی دایکوباوك و دەوروبەرەوە بیگرە تا دەگاتە کلتوری کوردی و سیستەمی دواکەوتووی پەروەردەو زاڵبوونی باوك سالاری و نەبوونی ژیانی شارستانی بەپێوەری جیهانیەوەو تەنانەت ئاینیش رۆڵی هەیە منیش بەشێکم لەم کلتورە شەرمنیە.

-دەرچوویەکی پەیمانگا تەمەن ٢٢ساڵ: نە خێر هەست بە شەرم ناکەم، چونکە شەرمت هەبی ناتوانی هیچ شتێك بکەی لە ژیانتا بەڵام بەداخەوە لە کۆمەڵگەی مە لەمنداڵی فێری ئەو شتە دەبین بەڵام لەکاتی ببمە دایك فێری منداڵم ناکەم کە شەرم بکەن لە هەمووشت، چونکە زۆر شت کەم هەیە پێویستی بە شەرم هەیە، بەڵام ئیحترام واجبە لە سەرمە ئەوەی مەرجە، کە فێری منداڵمان بکەین بەڵام لەکۆمەڵگەی مە بەس فێری وشەی عەیبەو وەمەکە بووین، دوای توشی زۆر شت دەبن، نازانم لۆ لێرە بەس وادەزانن پەروەردەی منداڵ عەیبەو مەکەیە.

- ژنە مامۆستایەکی دواناوەندی تەمەن ٢٤ساڵ لەبارەی شەرمکردنەوە دەڵێ:

من شەرم دەکەم لەبەرئەوەی لەزۆربەی ژیانی رۆژانەماندا شت روو دەدات شەرم دەکەین جواب بدەمەوە، یان زۆر شت هەیە لەگەڵ دایکم و باوکم و خوشك و براو مێردم شەرم دەکەم کەبیلێم.

- مامۆستایەکی پیاو تەمەن ٢٤ساڵ دەڵێ خۆم بەشەرمن دەزانم هەمووشی بەهۆی کاریگەری خێزانەکەم لەسەرم دەزانم، کەزۆربەی جار پێیان وتوم تۆ قسە نازانی توانای ئەم کارەت نییە بۆیە ئێستاش کەلەماڵ دەمەوێ قسە بکەم ئەم قسەیەم وەبیر دێتەوە کەدەڵێت تۆ قسەنازانی بۆیە قسەکە لەناخی خۆمدا دوبارە دەکەمەوە، لەبارەی ئاریشەشەوە کەدەمەوێ چارەسەری بکەم ئەو قسەیەم وەبیر دێتەوە کەپێم دەڵێن تۆ توانای ئەم کارەت نییە، بەڵام کاتێکیش ئەندامانی خێزانەکەم لەشوێنێك نین من لەوێ بەئازادی قسەی خۆم دەکەم بێ شەرمکردن.

-مامۆستایەکی ژن تەمەن ٢٤ساڵ دەڵێ: من کەسێکی شەرمنم هەرچەندە لەناو خێزانێك پەروەردەکراوم کەسی شەرمنی تێدانییە، هۆکاری ئەو شەرمنیەم دەگەڕێتەوە بۆ کۆمەڵگاو کەسانی دەروبەرم، چونکە کۆمەڵگاکەی ئێمە تاکو ئێستا شەرم و حەیا لەیەکتر جیاناکەنەوە، ئەگەر تێکەڵاوی ناو خەڵك بیت و هاوڕێیەتی رەگەزەکەی تر بکەیت و یاخود گفتوگۆکردن لەگەڵ کەسانی لەخۆت گەورەتر یان دەربڕینی رای خۆت لەبڕیارێك ئەوا بەکەسێکی بێ شەرم لەقەڵەمت دەدەن وات لێ دەکەن کەسێکی داخراو شەرمن بیت.

-مامۆستایەکی ژن تەمەن ٢٩ساڵ بەم شێوەیە باس لەشەرمنی خۆی دەکات: من زۆر شەرمنم لەوەدەترسم هەڵە بکەم لەحزوری هەرکەسێك لەو شوێنە کەمنی لێم، بەڵام وردە وردە زاڵ دەبم بەسەر شەرمنیەکەدا .

-کارمەندێکی ژن تەمەن ٢٤ساڵ بەڵێ خۆم بەشەرمن دەزانم کۆمەڵگە هەندێجار بەرپرسیارە بەرامبەر بەشەرمەکانم وەکو ئەمە عەیبە، ئەمە لەئیشی مە ناوەشێتەوە، ئەمە رەنگە جوان نەبێت و هەندێحار خۆم شەرم ناکەم لەشتێك کەدەمەوێ بیکەم، بەڵام دەترسم لەچواردەوروم، ئەگەر ئەم شتەم کرد قسەم لەسەر ئەکرێ لەکاتێکدا کەشتەکە لەبنەڕەتدا خۆی نەعەیبەیەو نەجێگای شەرمەزارییە، هۆکاری ئەم شەرمە دوو شتە بەپلەی یەکەم ئەو ژینگەیەی تێدا پەروەردە بووم، بەپلەی دووەم ئەو کۆمەڵگایەی ئێستا تێدا دەژیم.

-ژنێکی تەمەن ٢٤ساڵ دەڵێ خۆم بەشەرمن دەزانم، چونکە لەژێر یاساوداب و نەریتی کۆمەڵداین، بۆنموونە لەوانەیە حەزت لەزۆر شت بێ، بەڵام لەبەر رەخنەی دەوروبەرەکەت نایکەیت چونکە عەیبە.

- پیاوێکی تەمەن ٢٤ساڵ: بەڵێ خۆم بەشەرمن دەزانم، چونکە کاریگەری ژینگەی کۆمەڵایەتیە وای لێکردووم کەوا شەرم بکەم، لەلایەکی تر کۆمەڵە داب ونەریتێکی بۆماوەیی بۆ نموونە کاتێك بەرامبەر کۆمەڵە کەسێك قسەدەکەم ئەو کاتە شەرم دام دەگرێ، یاخود هەندێ کردار هەیە ناتوانم ئەنجامی بدەم کەشتێکی ئاساییە، بەڵام شەرمەکە رێگرە.

-فەرمانبەرێکی ژنی تەمەن ٢٥ساڵ: بەڵێ شەرم دەکەم، چونکە ئەترسم کەسی بەرامبەرم معلوماتی زیاتر بێت لەمن و گاڵتەم پێ بکات ئەو کات هەست بەشەرم دەکەم وەهەروەها لەمنداڵییەوە تێکەڵی خەڵك نەبوینە بەحوکمی ئەوەی کچین بۆیە شەرم لەهەموو کەسێك دەکەم ئەگەر معلوماتیشم هەبێت ناتوانم دەریبڕم.

-مامۆساتایەکی ژن تەمەن ٢٨ساڵ شەرم ناکەم، چونکە زۆر باوەڕم بەخۆمە وەبەردەوام دەمەوێت بەشێوازێکی جوان و لە سەرخۆم تەعبیر لەناوەوەی خۆم بکەم.

مامۆستایەکی ژن تەمەن ٢٥ساڵ: بەڵێ لەهەندێك حاڵەت شەرم دەکەم بۆ نموونە هەرلەو قاعەیە لەبەرامبەر سپلیت دانیشتوم رۆژێکیان مامۆستا دەرسی دەوتەوە هەستم بەسەرمایەکی زۆر دەکرد بەهاوڕێکەی تەنیشنم وت، ئەویش ویستی پێی بڵێ کەجێگەمان بگوازینەوە، بەڵام قبوڵم نەکرد، چونکە شەرمم دەکرد، چونکە هۆکارەکەی نەمدەویست

دەرسەکە بپچڕێنم و هۆسەیەکی بچووك دروست بێ لەقاعە، یان نەبادا قوتابیان (بەشدار بووانی خول) بەجۆرێکی تر لێم بڕوانن.هەروەها من شەرم لەمرۆڤی بەسالاچوان و بەتەمەن دەکەم، چونکە ئەوانە گەورەترن.وەشەرم دەکەم تەنانەت قسەش بکەم لەگەڵ بەڕێوەبەری قوتابخانەکەم چونکە مرۆڤێکی بەڕێزو خاوەن کەسایەتیەکی تایبەتەو ئەو زۆر بەڕێزەوە سەیری من و هاوڕێکانم دەکات، ئەگەر یەکەم جارم بێ بچمە ناو خەڵکانێکی غەریب شەرم دەکەم تا ئاشنایەتیش دروست نەبێ ناتوانم راستەوخۆ تێکەڵاویان بم، چونکە شارەزای ناخی ئەوان نیم کە چ جۆرە سروشتێکیان هەیە.

-مامۆستایەکی پیاو تەمەن ٢٢ساڵ بەڵێ زۆرجار شەرم دەکەم نەوەك شەرمەزاربم یان بشکێمەوە یان سوکایەتیم پێ بکەن بەتایبەتی بەرامبەر ئەو کەسانەی کەرێزی خەڵك ناگرن شەرم دەکەم چونکە خۆیان نەخوێندەوارو بێ شەرمن سوکت دەکەن ........هەر لەسەرەوە هەتا خوارەوە

-مامۆستایەکی کوڕ تەمەن ٢٧ساڵ دەڵێ تا رادەیەك بەڵێ چونکە رەنگە لەهەموو شوێنێك نەتوانم قسەبکەم و رای خۆم دەربڕم بەرامبەر بابەتێك یان هەر قسەیەك بۆیە لەهەندێ شوێن لەکاتی گفتوگۆکردن لەسەر بابەتێك من پێمباشە شەرمنی بنوێنم بەهۆی زۆری گفتوگۆی بابەتەکە بابەتێکی بێ سود بێ بەهۆی قسەی نابەجێ وە بۆیە ....

-کچێکی رۆژنامەنووس تەمەن ٣٦ساڵ لەکەرکوك: نەخێر شەرم ناکەم، چونکە شەرمنی نەخۆشییە

-مامۆستایەکی کوڕ تەمەن ٢٥ساڵ دەڵێ نەخێر شەرم ناکەم چونکە هەموو کات پرسیار لەخۆم دەکەم ئایا ئەو کەسەی لەبەرامبەرمە وەك من مرۆڤ نیە؟؟؟ مادام وەك من مرۆڤە چۆن دەکرێ من شەرم لەخۆم بکەم... سروشتی مرۆڤەکان وا دەرکەوتووە ئەگەر بزانن کەسێك شەرمنە ئەوا مافی ئەو کەسە دەخۆن لەهەموو لایەکەوە دیسان ئەو کەسەی کەدەیەوێ مافم بخوا وەکو خۆم مرۆڤە...مادام وایە دیسان ناهێڵم من مافی خۆم بخۆم ...وەناهێڵم کەسیش مافم بخوات .

کەسێکی تەمەن ٤٥ساڵ: من باوەڕم وایە ژیان هەمو راهێنانە مادام ژیان هەمووی راهێنانە دەکرێ لەگەڵ هەمو هەنگاوەکانی ژیان شەرمن بم؟ من ئەگەر شەرمم لە راهێنانێك بشکێ دڵنیام راهێنانێکی تر لەدوای دێ ...ئەگەر بچمە ناو کۆمەڵێك کەسەوە (قەرەباڵغی)

بۆچی شەرم لەقەرەباڵغی بکەم..ئەگەر من خۆم کەسێك بم لەو قەرەباڵغیە؟؟بۆشەرم لەخۆم بکەم؟؟؟

-مامۆستایەکی ژن تەمەن٢٥ساڵ : نەخێر، زۆر بەکەمی شەرم دەکەم بەڵام هەندێ حاڵەتی تایبەت هەبووە شەرمم کردوە بەهۆی ئەوەی لەکۆبوونەوەیەك بەشداریم کردووە کەسەکانم بۆیەکەم جار ناسیوە بەڵام ئەگەر کۆبوونەوەکە دوبارە بێتەوە بۆچەند جارێك ئەوا شەرم ناکەم بڕیاری خۆم دەربارەی شتەکان دەدەم.

- فەرمانبەرێکی بانك تەمەن ٢٦ساڵ: نەخێر لەو کاتەی کەخۆم بەراست بزانم لەبیروراکانمدا هەرگیز شەرم ناکەم یاخود کاتێك پێویست بکات  قسە بکەم دەیکەم، بەڵام هەندێکجار لەهەندێك بابەتدا پێویستە بێ دەنگ بی و رای خۆت دەرنەبڕی بێدەنگ دەبم چونکە کلتورو بەهاکان بەشێکی ژیانی ئێمەیە.

- مامۆستایەك کەلەوڵاتی نەرویژ دەژی دەڵێ شەرم دەکەم بەڵام هەموو کاتێك نا.

- مامۆستایەکی پیاو لەکەرکوك: شەرم غەریزەیەکی رێژەییە بۆیە ئاساییە هەموو مرۆڤیك رێژەیەك شەرم لە هەڵسەکەوتنەکانیدا هەبێت، بەپێی کەسەکانی بەرامبەری لەلایەك و ئەو کارەی ئەنجامی دەدات لەلایەکی دیکەوە.

- کامەندێکی پیاو تەمەن ٢٦ساڵ لەهەولێر دەڵێ: هەروەکو مرۆڤێك دەتوانم بڵێم لەهەندێك کاتدا شەرم دەکەم لەو کاتەی کەلەشوێنێك بم کەکەسانی لەخۆم گەورەتر دەبینم وەکو مامۆستاکانم هەورەها پیاوە گەورەکان یان بچمە هەندێك ماڵ بەمیوانداری دەتوانم بڵێم جۆرە شەرمێك دامدەگرێت ئەویش وەکو دابونەریت کەئێستاش زاڵە بەسەرماندا بەڵام لەزۆربەی کاتەکانی ژیانم هەست بەشەرمکردن ناکەم بەڵکو زۆر کۆمیدیانە رەفتار دەکەم بۆیە لەشوێنێك بۆ شوێنێکی تر جیاوازی هەیە.

-مامۆستایەکی ژن تەمەن ٢٦ساڵ: بەڵێ من خۆم لەناخی خۆمدا خۆم بەشەرمن دەزانم بەوەدا هەستی پێدەکەم لەشوێنێك یان مەجلیسێکدا کە کاتێك دەمەوێ رەئیەکی خۆم دەبڕم زۆر زەخت لەخۆم دەکەم تا دەتوانم دەری بڕم و هەندێجاریش هەر دەری نابڕم بەبێدەنگی دەمێنمەوە چونکە دەترسم ئەو رەئیەیەی من لای ئەوان قبوڵ نەبێ ببمە مایەی گاڵتەپێکردن هۆکاری ئەمەش هەستدەکەم ئەوەبێ کە من کچی بچوکم بوومە لەماڵەوە هەموکاتێ رەئی هەمو گەورەکان زاڵ بووە بەسەرمن و بۆم نەبووە بەئازادانە قسەی خۆم بکەم وەئەگەر

کردبێتیشم بەچاوی منداڵی تەماشا کراوم چونکە تەمەنم زۆر جیاواز بووە لەگەڵ ئەوانی تر بەڵام ئێستاکە ئەم شتانەم زانیوە هەوڵم داوە ئەم شتانە نەمێنێ کەئەم هەڵسوکەوتەی دەوروبەرم وای لێ کردوم بڕوا بەخۆبوونم لەدەست بدەم بەڵام ئێستا هەردەم لەهەوڵدان دام بۆ ئەوەی کەپێگەی کۆمەڵایەتی خۆم بەهێزبکەم لەرێگای خوێندنەوەوە هەوڵم داوە ئەو هەستە نەهێڵم.

- کاسبکارێکی تەمەن ٢٥ساڵ: من تارادەیەك خۆم بەشەرمن دەزانم چونکە لەهەندێك شوێن و هەڵسوکەوتا رەنگە پێویست بکات کەشەرم بکەم بەڵام زۆرجار ئەو شەرمنیە زیاتر زاڵ دەبێت بەسەرمدا بەتایبەتی لەناو مەجلیسێکدا کەلەخۆم بەتەمەنتر بن ئەوانەی کەدانیشتون قسەدەکەن یاخود لەناو کۆمەڵە کەسێك کەوا هەست دەکەم لەمن زاناترو زیرەك و بەتواناترن یاخود واهەست دەکەم کەرەنگە قسەو بۆچونەکەم بەهەند وەرنەگرن.

- مامۆستایەکی کوڕ تەمەن ٢٢ساڵ : بەڵێ ٨٠٪شەرمنم کەزۆربەی حاڵەت لەناو پۆلدا زۆر پرسیارم لادروست بوو شەرمم کردووە بیڵێم تێکەڵبوونم لەگەڵ دەوروبەر لەدروستکردنی برادەر ناتوانم هاوڕێیەتی بکەم لەگەڵ هاوپۆل و هاوکارانم شەرم دەکەم قسەبکەم نەوەك غەڵەت بکەم هەمیشە وائەزانم خەڵك سەیری من ئەکات هەمیشەو هەموکات محاسەبەی نفسی خۆم دەکەم بەبەردەوام لەگەڵ خۆم خەریکم لەجلوبەرگ و رەفتارەکانم نەوەك خەڵك رەخنە بگرن لێم ناتوانم لەگەڵ کۆمەڵە کەسێك قسەیەك بکەم یان بەسەرهات بگێڕمەوە نەوەك غەڵەت بکەم.

_پۆلیسێك: هۆکاری شەرمنی من دەگەڕێتەوە بۆ خێزان بەهۆی سەرکوتکردنم لەلایەن برا گەورەکانم نەکردنی هیچ قسەیەك کارکردنی بەردەوام بەمن جیاوازی کردن لەگەڵ براکانی تر نەبونی باوك زۆر کاریگەری لەسەر ژیانم هەبوو من بەهۆکارێکی سەرەکی دەزانم.

-مامۆستایەکی ٣٠ساڵ: بەڵێ شەرم دەکەم چونکە واهەست دەکەم گەر قسە بکەم ئەوا رەخنەم لێ دەگیرێ وەتا دەمرم هەر شەرم دەکەم

-پێشمەرگەیەکی تەمەن ٢٥ساڵ: خۆم بەشەرمن دەزانم چونکە زۆرجار کۆمەڵێك حەزو ئارەزوم هەیە ناتوانم دەریان ببڕم لەوانەیە لەکۆمەڵگای ئێمە عەیبە بێ بۆنمونە حەزم لەرەنگی سورە لەجلوبەرگ بەڵام من هەمیشە لەلایەن براو دایکم پێم وتراوە عەیبە خۆتۆمناڵ نیت ئەو رەنگە لەبەردەکەی.

-مامۆستایەکی پیاو ٢٧ساڵ: من شەرم دەکەم لەبەرئەوەی سیستەمی پەروەردەیی خێزانیم وای لێکردووم شەرم بکەم هەموو ئەو توندوتیژیەی لەلایەن باوکم و دایکم و خوشك و براکانم کەلەخۆم گەورەترن بەرامبەرم ئەنجام دراوە هەموو ئەو کۆبونەوە خێزانیانەی کەبوارم بۆ نەڕەخساوە قسە بکەم پرسیار بکەم کەپرسیارپم کردبێ زۆرجار بۆم روون نەکراوەتەوە، هەروەها سیستەمی قوتابخانە ئەو کاتەی قوتابی بووم لەوێ توندوتیژی زیاتر بوو، مامۆستام وەك دیکتاتۆرێك دەبینی دارەکەی دەستی و زمانە نەگونجاوەکەی کەبەکاری دەهێنا ئەوە نەك هانیدام شەرمم بشکێ بەڵکو پێی گوتم زیاتر شەرم بکە، لێم بترسە، توانای قسەکردنت نەبێت.

- فەرمانبەرێکی پیاو تەمەن ٣٧ساڵ شەرم ناکەم چونکە باوەڕم بەخۆم هەیە دەتوانم زاڵ بم بەسەر دەروونی خۆمدا، لەخێزانێك پەروەردە بووم کەوا تێکەڵی زۆر بووە لەگەڵ خەڵکدا، بۆیە زۆر پێم ئاساییە لەهەر شوێنێك بم زاڵ بم بەسەر دەروونی خۆمدا.

-مامۆستایەکی پیاو دەڵێ زۆرشەرم دەکەم بەڵام جیاوازی هەیە لەشوێنێك بۆ شوێنێکیی تر جاری واهەیە کەمیوانێکی دورمان دێت شەرم دەکەم کەبەخێرهاتنیان بکەم زۆرجار وابووە کەخۆم کردووە بەخەوتوو بەس بۆئەوەی بەخێرهاتنیان نەکەم وە زۆرجار لەپۆلا دانیشتوم شەرم ئەکەم کەبەهاوپۆلی خۆم بڵێ کەشتێکم دەوێت

.مامۆستایەکی ژن: زۆرجار لەگەڵ پیاوی خۆم زۆر قسە هەیە ناتوانم بیڵێم شەرم دەکەم.

- گەنجێکی کاسبکار: تا ئێستاش بۆم روون نەبۆتەوە بۆ شەرم دەکەم.

- مامۆستایەکی ژن تەمەن ٢٤ساڵ دەڵێ هەر لەسەرەتای هەرزەکاریمەوە شەرمم دەکرد لەکاتی نانخواردن بەتێری نانم نەدەخواردو لەکاتی گفتوگۆی خێزانیشدا موداخەلەم نەدەکردو دوورە پەرێز بووم، بەڵام ئێستا زۆرباش بومە ئەمەش دەگەڕێتەوە بۆ زیاتر تێکەڵاوبوونم لەگەڵ کەسانی دەوروبەردا.

-مامۆستایەکی ژن ٢٦ساڵ چونکە ئەترسم کەسی بەرامبەرم زانیاری زیاتر بێت لەمن گاڵتەم پێبکات ئەو مات هەست بەشەرم دەکەم و وەهەروەها لەمنداڵیەوە تێکەڵی خەڵك نەبومە بەحوکمی ئەوەی کچین بۆیە شەرم لەهەمەوو کەسێك دەکەم ئەگەر زانیاریشم هەبێت ناتوانم دەریببڕم.

-ئەندازیارێکی پیاو: بەڵێ شەرم دەکەم نەوەك رەخنەم لێ بگیرێت.

-ژنێك: شەرم دەکەم لەزۆربەی هەڵوێستەکان، چونکە ئەترسم هەڵە بکەم یان بۆئەوەی رەخنەم لێنەگرن و خاڵی لاوازم بدۆزنەوە .

-پیاوێك: زۆریش شەرم دەکەم چونکە هەر لەمنداڵیەوە پێیان وتوم شەرم بکە، عەیبە، وانابێ، وامەمکە، زۆر قسە مەکە، کەم بڵێ.

سەوزە فرۆشێك -شەرم دەکەم چونکە هەست دەکەم دەترسم لەهەڵەکردن وە خاڵی لاوازم دەرکەوێ .

-گەنجێکی ٢٣ساڵ: شەرم دەکەم چونکە دەترسم هەڵەبکەم.

-مامۆستا تەمەن ٢٧ساڵ: شەرم دەکەم، شەرم دەکەم لەخوای گەورە شەرم دەکەم لەدەربڕینەکانم کەببنە مایەی تانەلێدانی دەوروبەر هۆیەکەشی زاڵبوونی ترسێکە لەتانەو تەشەرو قسەی کۆمەڵگا، کۆمەڵگای کوردی وا فێری کردووین لەمنداڵییەوە ئەبێ کچ شەرم بکات.

- کچێکی ماڵەوە: شەرم دەکەم لەوەی بمشکێننەوە.

-دایکێك: شەرم دەکەم دەترسم ئەو شتەی من دەیڵێم راست نەبێت یان هەڵەی تێدا بێت

-کچێکی فەرمانبەر: ئەترسم کەسێك رەخنەیەکی روخێنەرم لێ بگرێ یان ئەترسم هەڵە بکەم یان یەکێك پرسیارم لێبکات نەتوانم وەڵام بدەمەوە.

- کارمەندێکی ژن: ئەترسم هەڵە بکەم لەبەرامبەر ئەو کەسەی قسەی لەگەڵ دەکەم.

-گەنجێکی فەرمانبەر: بەڵی شەرمنم بەتایبەتی بەرامبەر کەسێك خۆشم دەوێ لەرەگەزەکەی تر

- مامۆستایەك: بەڵی شەرم دەکەم زۆرجار ئەم شەرمە وام لێدەکات زۆربەی قسەکانم لەبیر بچێت یان ئەترسم نوتقم بگیرێ.

- ژنێکی ماڵەوە: لەشوێنە قەرەباڵغەکان شەرم دەکەم لەکاتی رۆیشتن کەخەڵکەکە سەیرم دەکەن.

- پیاوێکی کاسبکار: ٣٣ساڵ: شەرم دەکەم لەکاتی قسەکردن بەرامبەر خەڵك ئارەقەدەکەم رەنگم تێك دەچێ.

-پیاوێکی کاسبکار٢٤ساڵ: لەوە دەترسم قسەکەم رەواجی نەبێ.

مامۆستایەکی پیاو تەمەن ٢٦ساڵ شەرم دەکەم لەکاتی قسەکردن، لەهەڵە دەترسم، تاکاتی ئەم راپرسیە شەرمن بووم بەڵام لێرە بەدواوە بڕیار دەدەم چیتر هاوڕێیەتی شەرم نەکەم

-گەنجێك: لەگەڵ ئەوەی کەخۆم کەسێکی کۆمەڵایەتیم لەگەڵ خەڵك تێکەڵ دەبم، بەڵام هەر شەرمەکە لەسەرم زاڵە و لەگەڵ ئەوەشدا لەناو خێزانێکی کۆمەڵایەتیشم.

-قوتابیەکی ئامادەیی: شەرم دەکەم کاتێك دەچمە شوێنێك حەز دەکەم هاوڕێیەکم لەگەڵ بێ چونکە فێر نەبوومە پشت بەخۆم ببەستم.

- مامۆستایەکی پیاو: بەرادەیەك شەرمنم تائێستا پارەم لەباوکم وەرنەگرتووە پەیوەندیم بەس لەگەڵ دایکمدا هەبووە.

ئەگەر تێبینی بکەی زۆربەی ئەوانەی راپرسییان لەگەڵدا کراوە هۆکاری شەرمکردنەکە دەگەڕێننەوە بۆئەوەی کەلەهەڵەکردن دەترسێن، یان لەوە دەترسێن رەخنەیان لێبگیرێ، یان گاڵتەیان پێبکەن، واتەلەزۆربەی حاڵەتەکاندا مرۆڤەکان خۆیان لەگەڵ یەکتر بەراورد دەکەن و کەسێکی بەرامبەریان دەکەنە پێوەر ئەگەر ئەو کەسەش هەڵەبێ، ئەمەش دەگەڕێتەوە بۆ باوەڕ نەبوون بەخود، کەلەمنداڵییەوە تیایاندا نەچێنراوە، ئەمەش راستی ئەو بیردۆزە دەردەخات کەدەڵێ شەرمکردن بەتەنها نابێت واتە بەبوونی کەسێکی تر رودەدات و ئەوە دووپات دەکاتەوە کەشەرمکردن بەتەنها روو نادات، کەواتە تێکەڵنەبوونی دەوروبەر هەر لەمنداڵییەوەو بەتایبەتیش تێکەڵکردنی منداڵ بەیەکتر لەتەمەنی ساوایی، چونکە لەو تەمەنە منداڵ ترسی دەشکێ و فێری گفتوگۆو نانخواردن لەگەڵ کەسانیترو مامەڵەکردن دەبێت نەخاسمە لەکاتی یاریکردن.

شەرمکردن لێکدانەوەی زۆر هەڵدەگرێت، جان پۆل سارتەری فەیلەسوفی فەرەنسایی دەڵێ: شەرمکردن واتە وشیاربوونەوە لەبیرنەکردنەوە (واتە تۆ وشیاربوویتەوە کەبیرت نەکردەوە لەو ئیشە خرابە، بۆیە لێرەدا شەرمکردن وەك بوونی هەست بەرامبەر بوونی کەسێکیتر پێویستە بۆ مرۆڤ، چونکە ئەکەر شەرمکردن نەبێت من هەست بە تۆ ناکەم و تۆش هەست بەمن ناکەی، کاتێك کەسێك کارێکی ناپەسەند دەکات بەرامبەرت ئەو کاتە شەرم دەکات کەتۆ دەبینێتەوە ئەمەش حەیایە نەك بەمانای شەرمکردن وەك نەخۆشیی، واتە وشیاربووەوە بەرامبەر تاوانەکەی، وشیار بووەوە کە بیری نەکردەوە، ئەوەش گێلێتیە.

هەندێ لەتۆژەرانی بواری دەرونی دەڵێن: شەرمکردن لەسەر هیلێکە ئەمسەری هێڵکە ترزلیی (تکبر) ە و ئەو سەرەکەی کەسی شەرمنە کەخاکەڕاییە، واتە شەرمکردن بەتەنێ روونادات، ئەو کەسەی شەرم دەکات بەرامبەر ترزلێك شەرم دەكات لەوانەشە ئەو کەسە ترزل نەبێت، بەڵام کەسی شەرمن لەبەرئەوەی خۆی بەکەم دەزانێت بۆیە کابرای بەرامبەری بەترزل لەقەڵەم دەدات، بۆیە لەبەرامبەریدا دەلەرزێت و کار لەزمان و رۆیشتن و سورِی خوێن و هەموو جەستەی دەکات، کەنیشانەکانی شەرمکردنی تێدا دەردەکەوێت، لەمبارەیەشەوە د.فاخر عاقل پێیوایە شەرمکردنە کاتێك دەبێتە سیفەتێك لەسیفتەکانی کەسێك ئەگەر دیقەتی ئەو کەسە بدەی جۆرێك ئیفلیجبوونی پێوە دیارە تووشی لایەنی جەستەیی و دەروونی و زمان و گفتوگۆو هەموو شتێکی ئەو مرۆڤە دەبێت، لەهزری شڵەژاوو نادیارو قسەی پچڕ پچڕو گوزارشتی بێ واتاو سوربوونەوەی دەموچاو بەهۆی هەڵگەڕانی خوێن بەرەو لای سەر، ئەگەر واز لەرواڵەتەکانی دەرەوەی کەسی شەرمن بێنین، کەزۆر باسمانکردووە ئەوا لەناوەوەی ئەو کەسە چی دەبینین؟ئازارەکە لێرەوەیە، کە کەسی شەرمن هەوڵ دەدات بەهەموو شێوەیەك لەشەرمنیەکەی دوور بکەوێتەوە، بۆیە تووشی شڵەژانی عەقڵی و سەرسامبوونی دەروونی و تێکچوونی هزر و بیرکردنەوە دەبێتەوە، د فاخر عاقل پێیوایە شەرمکردن لەژیانی کۆمەڵایەتیەوە سەرچاوە هەڵدەگرێ و قەیرانی شەرمکردن روونادات بەبێ بوونی کەسانیتر، بۆیە لەزۆربەی راپرسیەکانیشدا کە نووسەر ئەنجامی داوە ئەوە دەردەکەوێت کەئاماژە بەوە دەدەن دەترسن هەڵەبکەن، هەروەها بوونی ئاگای کەسانی دەوروبەر دیسان شەرمنی درووست دەکات بەتایبەتی لەو کەسانەی کە نایناسێ.

شەرمکردن کارلێککردنی نێوان شانازی بەخۆوەکردن و دڵەراوکێ و حەزی سەرکەوتن و نەبوونی متمانەیە، سەرلەنوێ د. فاخر دەڵێ کەسی شەرمن حەز دەکات سەربکەوێ، بەڵام هەزار و یەك حەساب بۆخەڵك دەکات، کەواتە شەرمکردن حاڵەتێکی پەککەوتنە لەخۆگونجاندن لەگەڵ دەوروبەر، لەکۆمەڵگەی کوردەواری هەمیشە منداڵێك کەرەفتارێکی نەرێنی نواندووە بەراورد دەکرێ لەگەڵ منداڵێکی تردا ئەمە وا لەو منداڵە دەکات ئاواتی ئەوە بخوازێ ئەو منداڵە لەوێ نەبێ، هەر ئەمەشە مرۆڤ دەترسێ هەڵە بکات لەکەسی بەرامبەری لەهەڵوێستە جیاوازەکانی ژیاندا وەك لەراپرسیەکاندا دەردەکەوێ، زۆرجار دایك کەمنداڵەکەی نان ناخوات بانگی منداڵێکی تر دەکات کەبێت بەشەکەی ئەو بخوات ئەمە وای لێدەکات

لەیەکێکی تر بترسیٚ، دەروونناسان پێیانوایە شەرمکردن دەرەنجامی ترس و دڵەراوکێ و لاوازییە.

بەپێی رای شارەزایان نزیکەی تەنها رێژەی ٪١٠تا١٥ی منداڵان مەیلی شەرمکردنیان هەیە بەشێوەیەکی نائاسایی و ئەوانی دیکە شەرمنن، یان لەبەر ئەوەی شارەزاییان نییە، یان دەترسن لەخەڵکی بەرامبەر، یان ترس لەگاڵتەپێکردن، کەئەمیش دەبێتە هۆی لەدەستدانی متمانە بەخود.

بەپێی تۆژینەوەیەکی زانایان لەزانکۆی هارفارد کۆلیژی پزیشکی سەبارەت بەوێنەکردنی کۆئەندامی دەماری دەرکەوتووە کەوا شەرمکردنی نائاسایی منداڵان لەوانەیە بەهۆی گۆڕانکاری بێت کە لەمێشکیاندا روودات، زانایان وێنەکردنەکەیان بە لەرەی موگناتیسی بەکارهێناوە بۆ پشکنینی ژمارەیەك لەکەسانی شەرمن کە هەر لەمنداڵییەوە بەشەرمن ناسراوبوونە، کاتێك وێنەی کەسانێکی نەناسراو نیشانی ئەو کەسانە درا دەرکەوت کەوا جۆرە چالاکیەك لەگۆی مێشك یان هیە بەبەراورد لەگەڵ هاوڕێکانیان کە هەر بەمنداڵیی خاوەن چوست و چالاکی کۆمەڵایەتی بوونە.

لەتۆژینەوەیەکی دیکەدا کەلەلایەن کارل شورتز و هاوڕێکانی ئەنجام دراوە دەرکەوتووە کەوا کەسی شەرمن ٤کێشەی لەگەڵ خۆی هەیە: زۆر ئاگاداربوون لەخۆی، زۆرسەرقاڵبوون بەخۆیەوە، خۆهەڵسەنگاندنی نەرێنی، تەنهایی دەروونی، هەموو ئەم نیشانانە کە کارل شورتز ئاماژەی پێداوە کەسی شەرمن تەرکیز لەسەر خودی خۆی دەکاتەوە ئەم تەرکیزکردنەش لەو کاتەدا دەردەکەوێت کەکەسێکی تر یان کۆمەڵە کەسێك لەئارادابن.

فیلیب زیمباردو لەزانکۆی ستانفورد لەئەمریکا ئاماژەی بەشەرمکردنی ئەرێنی داوە کەدەڵێ: شەرمکردنی ئەرێنی ئەو شەرمکردنەیە کەگونجاوە لەگەڵ هەڵوێست، لەبەر ئەوە ئەو سیفەتە سیفەتێکی ئەرێنیە بۆ ئەو کەسەی، کەئەو رەفتارە دەگرێتە بەر، چونکە رەنگدانەوەی یان ئاوێنەی بەهای ئەدەب و پەروەردەو رەوشت دەگەیەنێ وێرای سیفاتی زەوق و خاکەڕایی و لوتفبەخشیی، بەڵام شەرمکردنی نەرێنی بەپێی بیروڕای زیمباردو تێکچوونێکە لەرەفتاری کۆمەڵایەتی تاك، چونکە شەرمکردنێکی بێ پاساوەو چەندین ئاکامی دەروونی خراپی بۆ سەر تاکەکە هەیە لەوانەش هەرەسهێنانی تەندروستی دەروونی.

بەپێی لێکۆڵینەوەیەکی فیلیب ساڵی ١٩٧٥ ڕێژەی ٤٠٪لەکۆی ٨٠٠ قوتابی خۆیان بەشەرمن دەزانن، بەپێ لێکۆڵینەوەکە شەرمنەکان خەریکی خۆیانن و بەخۆیانەوە سەرقاڵن و زۆربەی شەرمکردنەکانیشیان شاراوەیەو کەمی بەدەرەوەیە.

هۆکارەکانی شەرمکردن:

١-شێوازی پەروەردەی ناوازە بەبەردەوامی وەکو نازپێدانی زۆر یان توندوتیژی لەرادەبەدەر یان تۆقاندنی منداڵ و شکاندنەوەی و متمانەپێ نەدانی، ئەمە لەکۆمەڵگەی ئێمە زەقودیارە کاتێ کارێك بەمنداڵێك دەسپێرن و ئەنجامی نادات ئیدی ریسوا دەکرێ، کەبۆ جارێکی دیکە خۆی لەو هەڵوێستانە نەدات و دور بکەوێتەوە واتە لەکۆمەڵ دەکشێتەوە، کشانەوە دوای کشانەوە دەبێتە خوویەك ئیدی ناتوانێ دەستبەرداری بێ و دەقی پێوە دەگرێ وهەمان رەفتار کەلەگەڵیدا کراوە ئەویش لەگەڵ منداڵەکانی خۆی پەیڕەوی دەکات، ئەم حاڵەتەش بەروونی لەراپرسیەکاندا دەردەکەوێت.

٢-چاودێری لەرادەبەدەری منداڵ لەلایەن دایکوباوك و کەسوکاریەوە، لەچوونە دەرەوەو سەرجەم رەفتارەکانی لەنانخواردن و ئاو خواردنەوەو لەبەرکردنی جلوبەرگی و وردبوونەوە لەهەموو شتێکی، کەپێویست ناکات، هەروەها گێڕانەوەی هەر شتێك منداڵەکە دەیکات لەلای میوان و برادەرەکانی.

٣-منداڵ زۆربەی تەمەنی لەناو گەورەکان بەسەر بەرێت و رێگەنەدرێ هۆش و تواناکانی پەرەپێبدات، واتە دوور کەوتنەوە لەیاریکردن و هەڵبەزو دابەزو نەکردنی هیچ جوڵەیەك گوایە ئەو عاقڵە.

٤-بێبەشبوونی منداڵ لەسۆزو خۆشەویستی، مردنی دایك یان باوك یان نەدانی ئەو سۆزو خۆشەویستیە لەلایەن دایکوباوکەوە، کاتێك دایکوباوك هەستی نارازی بوون بەرادەیەکی زۆر بەرامبەر منداڵەکە دەردەبڕن و واهەست دەکات رکیان لێیەتی، چونکە دەبێ منداڵ هەست بکات کەخۆشەویستە.

٥-تێنەگەیشتنی دایکوباوك لەمنداڵ یان جیاوازی سروشتی دایکوباوك لەگەڵ سروشتی منداڵەکە، هەندێ جار دایك کەسێکی توڕەیەو باوك بەپێچەوانەوەو هەندێکجاریش پێچەوانەی ئەو حاڵەتەیە، واتە هەندێ جار شێوازی نەرم و پەروەردەییانە لەگەڵ منداڵەکە پەیڕەو دەکرێ و

هەندێجاریش شێوازی توند بەتایبەتی لای ئەو کەسانەی کەرۆشنبیری سایکۆلۆژییان کەمەو پەروەردەیی نین. .

٦-ژێرپێخستنی منداڵ لەلایەن دایکوباوکەوەو فەرامۆشکردنی بەتایبەتی سەبارەت بەخولیاو ئارەزووەکانی.

٧-هەستپێدانی منداڵ کەئەو زۆر زیرەکەو لەراستیدا وانەبێت.

٨-ناوەزەدکردنی منداڵ بەسیفەتی ناشیرین و خراپ وەکو لووت گەورە، لووت فش، گێلە، ناشیرین، بێ عەقڵ، حەیوان، دەماغسز، سەی، بیجی، ....تد

- دەستکورتی و نەبوونی، مەرجیش نییە ئەو نەبوونی و دەست کورتیە هی ئەو کەسە بێت کەشەرمنە بەڵکو نەبوونی و دەستکورتی باوباپیرانییش کاریگەری لەسەر نەوەکانی داهاتووش هەیە، چونکە ئەو دەستکورتی و نەبوویەش وای لەوان کردووە نەچنە پێشەوەو شەرم بکەن و ئەم شەرمکردنەش نەوەکانیش یەك لەدوای یەك فێری بن، هەستکردن بەکەمی و خۆبەراوردکردن لەگەڵ کەسانیتردا وا لەمرۆڤ دەکەن خۆی بکشێنێتەوە، کشانەوەی بەردەوامیش دەبێــتە شەرمکردن و بەمرۆڤەوە دەنوسێ و لەمە مەترسیدارتر بەراوردکردنی منداڵە بەکەسانی دیکەی هاوتەمەتی .

هۆکاری سورهەڵگەڕانی دەموچاو لەکاتی شەرمکردندا:

لەشی مرۆڤ وێڕای بوونی کۆئەندامی بەرگری ئامرازی دیکەش لەخۆ دەگرێ کەلەکاتی بەرەنگاربوونەوەی مەترسی یان هەڵوێستێکی وروژێنەر پێویستی پێی دەبێ، لەکاتی مەترسیدا پێویستی بەهۆرمۆنی تایبەت بەهاوکاریکردنی دەبێت بۆ بەرەنگاربوونەوەی شڵەژان و شەرم، لەم حاڵەتەشدا جەستەی مرۆڤ دووچاری دوو ململانێی ناوەوە دەبێتەوە ئارەزوی راکردن یان خۆراگرتن و خۆدەرخستن بۆ جێگیربوون لەرێگەی زاڵبوون بەسەر ئەم هەڵوێستەدا.

لەبارودۆخی بەرەنگاربوونەی مەترسیەکە ئاسانە کامیان هەڵبژێری بەرەنگاربوونوە یان راکردن، بەڵام لەم حاڵەتە کۆمەڵایەتیە بە راکردن یان ململانێ سەرکەوتوو نابێ هەرچەندە کۆئەندامی دەماری کەبەرپرسیارە لە سەر کۆنترۆڵکردنی ئێشوئازارەکانی فشاری دەروونی لەو پەڕی چالاکیدا بێ.

ئەم حاڵەتەی شەرمن وا لەخوێن دەکات لەدەوروبەری ماسولکەکانی لەش و مێشك کۆببێتەوە بەمەبەستی گەڕان بەدووای چارەسەرێکی گونجاودا، لەراکردن یان بەرەنگاربوونەوە،

لەم کاتەدا کەسەکە دەیەوێ خۆی رابگرێ بەو پەڕی هەوڵدانیەوە، دەرەنجامی کۆتاییش دەرپەڕینی خوێنە بەشێوەی پێچەوانەوە، واتە بەرەو سەرەوەی بۆئەوەی بتوانێ زاڵ بێ بەسەر شەرمکردنەکەدا.

بیرۆزەکانی شەرمکردن:

بیردۆزی شیکردنەوەی دەروونی: ئەم بیردۆزە پێیوایە شەرمکردن دەگەڕێتەوە بۆ سەرقاڵبوونی (من) بەخودی خۆی بۆئەوەی شێوەیەکی نەرگسیانە وەربگرێت و کەسی شەرمنیش بەشەڕانگێزی و شەڕخواستن ناسراوە

بیردۆزی فێربوونی کۆمەڵایەتی: ئەم بیردۆوزە شەرمنی دەگەڕێنێتەوە بۆ دڵەراوکێی کۆمەڵایەتی کەچەندین شێوە رەفتاری خۆکشانەوەی لێدێتە ئەنجام هەرچەندە ئەنجامی سروشتیانەی کشانەوەو دوورگرتن لەکەمکردنەوەی رادەی دڵەراوکێ کەم دەکاتەوە پاشان لەشەرمکردن، بەڵام هەلی فێربوونی کارامەییە کۆمەڵایەتیە گونجاوەکان لەدەستدەدات، بەڵکو لەوەش پتر دەبێــتە کۆسپ و رێگرەمەعریفی کەلەشێوەی پێشبینیکردنی فەشەل لەرووی هەڵوێستە کۆمەڵایەتیەکان دەردەکەوێت لەگەڵ هەستیاربونێکی لەرادەبەدەر سەبارەت بە هەڵسەنگاندنی نەرێیانە لەلایەن کەسانی ترەوەو هەروەها مەیلی خۆهەڵسەنگاندنیش بەشێوەی نەرێنی.

بیردۆزی ژینگەیی خێزانی: هەندێ لەهۆکارەکانی شەرمکردن دەگەڕێتەوە بۆ هۆکارەکانی پەروەردەی دایکوباوك و شێوەی پەروەردەکردنی هەڵەی منداڵەکانیان وەکو زیاد پاراستن و توندوتیژی و رەخنەگرتن و هەڕەشەی بەردەوام و سزای بەدەنی، (زیلر و رور) پێیانوایە شەرمکردن لەرێگەی درکپێکردنی ژینگەوە کار دەکات وکاری لێدەکرێت.

بیردۆزی بۆماوەیی: هۆکاری شەرمکردن دەگەڕێنێتەوە بۆ فاکتەری پێکهاتەی بۆماوەیی، کەهەندێ لەمنداڵان مەیلی روناکی دەکەن و هەندێکیان بێدەنگی و تەنهایی و تا گەورەش دەبن هەروا دەمێننەوە، بۆیە منداڵی شەرمنی بۆماوەیی شەرمنتر دەبێت ئەگەر دایکوباوك مامەڵەی دیاریکراویان لەگەڵدا کرد، ئەمەش بەپێی لێکۆڵینەوەیەك ساڵی ١٩٨٧ئاماژەی پێدراوە، کە لەرێگەی وەڵامگۆی فسیۆلۆژیانەوە نیشانەی شەرمنی لە منداڵەکان دەرخستووە.

(کارل شورتزو هاوڕێیانی) لەزانکۆی هارڤارد لەلێکۆڵینەوەیەکیاندا، کە٢٠کەسی گرتۆتەوە لەمرۆڤە بەتەمەنەکان کەلەتەمەنی منداڵییان بەشەرمن ناسراو بوونە، بۆیان

دەركەوت كەوا گۆڕانكاریەكانی مێشك كەدەبنە هۆی شەرمكردن دەكرێ لەرێگەی لەرەی موگناتیسیەوە وێنەبكرێن و دوای دوو دەیە (٢٠ساڵ) لەگەشەی ئەو منداڵانە ببینرێ.

شۆرتز بۆ گۆڤاری نیو سنتیس وتویێتی مرۆڤ بەهۆی تەكنۆلۆژیای نوێوە دەتوانێ وردترین گۆڕانكاری زوو وەخت بزانێ.

كاگان (kagan) ئاماژەی بەوەداوە كەوا شەرمكردنی كۆمەڵایەتی ترسنۆكییە لەهەڵوێستە كۆمەڵایەتیەكان و بنەمایەكی بایۆلۆژی هەیە لەمرۆڤدا، بۆی دەركەوت كەوا رێژەی ١-١٥٪ی منداڵانی ساغلەم لەتەمەنی ٢-٣ساڵ وادەردەكەون كەئارامن و ترسیان هەیە كاتێك ڕووبەرووی هەڵوێستێكی نائاشنا دەبنەوە، ئەمانە وەكو پشیلەی بێچوو وان شەرمن و بەحەزەرن، كەلەهەڵوێستێكی تازە نزیك دەبنەوە، هەروەها شەرمنی منالّیی دیارە دەگەڕێتەوە بۆ دوو رەهەند لەرەهەندەكانی كەسێتی وەكو ئاستی نزمی خاكەڕایی و ئاستی بەرزی تورەیی (العصبیە) .

زانا كاگان دوو كۆمەڵەی بۆ تاقیكردنەوە هەڵبژارد كۆمەڵێكیان تەمەنی (٢١مانگ تا ٣١مانگ) ان بوون كەكۆمەڵەی شەرمنن نیشانەكانی خۆدورگرتن لەهەڵوێستەكۆمەڵایەتیەكانیان پێوە دیارەو هۆگری دایكیانن و بێدەنگن و سەرناكەون لەنزیك بوونەوەیان لەكەسانی نەناسراو، واتە لەو هەڵوێستانەی كەپێی ئاشنا نین، بەلاّم كۆمەڵەی دووەم شەرمن نین وەكو ئەوانی دیكە خۆیان دوور ناگرن و لەكەسانی نەناسراو و نزیك دەبوونەوەو ژینەگەی نوێیان زوو دۆزییەوەو زوو هەڵوێستی تازەیان ناسیوەتەوە، دەركەوت كەوا شەرمكردن سیمەیەكە مرۆڤ فێری دەبێ، ئەو منداڵانەی كەشەرمن بوون (٢١-٣١) مانگان لەشەرمكردنەكانیان بەردەوام بوون تا ٧ساڵ و نیو بەپێچەوانەی ئەو كۆمەڵەیەی كەشەرم ناكەن، هەروەها منداڵانی هەردوو كۆمەڵەكە كاردانەوەی فسیۆلۆژیان لەبارودۆخی تاقیكردنەوەكە تێدا دەركەوت، منداڵە شەرمنەكان لێدانی دڵیان لەوانی دیكە پتربوو، هەروەها منداڵە شەرمنەكان ئەوەیان لێدەركەوت كەوا هەڵوێستە كۆمەڵایەتیەكان بۆ ئەوان فشارهێنە، بەلاّم ئەمە لەوانی دیكەدا دەرنەكەوت.

ئەم لێكۆڵینەویە جەخت لەسەر بنەمای بایۆلۆجی كەسێتی دەكاتەوە، لەوانەش شەرمكردنی كۆمەڵایەتی هەروەها ئاماژەشی بەوەدا كەوا ئەم رەهەندانەی كەسێتی لەلایەن سیستمی دەماری مرۆڤەوە دیاری دەكرێت بێگومان ئەزموونەكە سەرنجی جیاوازیی مێشكی منداڵەكانی نەداوە.

## چارەسەرکردنی:

ئاگاداربوون لەو هۆیانەی باسمانکردو پەیڕەونەکردنی لەپرۆسەی پەروەردەدا، هەروەها دەبێ بشزانین چارەسەرکردن بەگوێرەی حاڵەتی شەرمکردنەکە دەبێ، چونکە هێندەی کەسانی شەرمن حاڵەتی شەرمنیش هەیەو ڕێگاو ڕێسایەکی دیاریکراو نییە بۆ چارەسەرکردن، بەڵکو بەپێی حاڵەتەکەو سەرچاوەی دروستبوونی شەرمنیەکەیە، کەسەرەتا پێویستە بزانین هۆکارەکانی دیاردەی شەرمکردن چییە؟لەدەوروبەرەوە وەرگیراوە، یان دەگەڕێتەوە بۆ بونیادی کەسەکە؟بەڵام لەبەر ئەوەی زۆربەی لێکۆڵینەوەکانی دەروونناسی ئاماژە بەوە دەدەن کەدیاردەی شەرمکردن وەرگیراوەو مرۆڤ فێری دەبێت کەواتە چارەسەری سایکۆلۆژی باشترین ڕێگایە کەئەرکی خێزان و دامەزراوە پەروەردەییەکان و بەکلتوربوونی پەروەردەی دروستی منداڵە وەکو گۆڕینی ژینگەی منداڵەکەو هاندانی بۆ تێکەڵبوون لەگەڵ منداڵانی ترو بەشداریکردنی بەشێوەی سایکۆدراما کەرۆڵی وای بدرێتێ بەبێ ئەوەی هەستی پێبکات لەگەڵیدا بگونجێ..بۆ نموونە ئازاد کەقوتابییەکی شەرمنە پێویستە لەسەر مامۆستایان و دایك وباوك رۆڵی زیاتری بدەنێ لەبۆنە جیاوازەکاندا بۆ ئەوەی گرێکانی بکاتەوەو بەربەستە دەرونیەکانی بتوێنێتەوە، لەقوتابخانە مامۆستا دەتوانێ ئەو قوتابییە شەرمنە بکاتە چاودێری پۆل یان ڕۆژانی پێنجشەممە کەهەفتانە قوتابیان لەگۆڕەپانی قوتابخانەدا کۆدەبنەوە ڕۆڵێك بدرێتە ئەو قوتابییە وەکو شیعر خوێندنەوە یان هەر شتێکی تر یان دەتوانێ لەکارە هونەریەکان یان وەرزشیەکان بەشداری پێبکرێ، ئەگەر ئەو جۆرە بەشداریکردنە بەردەوام بوو ئەوا ڕۆژ لەدوای ڕۆژ ئەو قوتابییە زاڵ دەبێت بەسەر شەرمنیەکەیداو تواناکانی خۆی بەکاردێنێت، بەڵام خۆپاراستن لەچارەسەرکردن باشترە، کەپێویستە ئەو هۆیانەی باسمانکردن پەیڕەو نەکەین لەپەروەردەکردنی منداڵدا بۆئەوەی دووچاری ئەو بارە دەرونیانە نەبن.

هەنگاوەکانی بەرەنگاربوونەوەی شەرمکردن:

سەرەتا دەستنیشانکردنی هۆکارەکانی شەرمکردن بزانە، ئایا لەوە دەترسێی کەشتێك سەبارەت بە ڕوخسارو ڕواڵەتت وترابێ؟ کە رەنگە پەیوەندی بەجلوبەرگتەوە هەبێ.

وا ڕەفتار بکە کە لەبنەڕەتدا تۆ شەرمن نیت و ئەو پەڕی متمانەت بەخۆت هەبێت، سەرت بەرزبکەرەوەو سینگت دەرپەڕێنەو تۆزێك بەگورجوگۆڵی بڕۆبەڕێوەو لەگفتوگۆدا یەکلاکەرەوە بە هەرچەندە بەلاتەوە ناخۆشە بەڵام دەرئەنجامی باشی دەبێت بۆت.

بڕێك چاوەکانت بەراست و چەپدا بسوڕێنەوەو زەردەخەنە لەگەڵ دەوروبەرتا بنوێنەولەگەڵ کەسانی نەناسراو کەلەگەڵت راوەستاون باس لەکەشوهەواو ئەو شتانە بکە کەلەو رۆژەدا لەناو خەڵکدا باس دەکرێن

بەچاوێکی ئەرێنی سەیری خۆت بکە، چونکە یەکێك لەو فاکتەرانەی کەبڕوا بەخۆبونت زیاد دەکات دۆزینەوەی خاڵی ئەرێنیە لەخۆتداو ئەمەندە هەست بەتاوان و شەرمەزاری مەکە، لەوە مەترسە کەسێك لەهەڵوێستێکدا شتێك دەکات بەدڵی تۆ نییەو رەتت دەکاتەوە، بیر لەو بابەتە مەکەرەوە، خۆت رابێنەو چاودێری ئەو هاوڕێ و بردەرانە بکەن کەشەرمن نین و لێیانەوە فێر بە.

بەچاوێکی ئەرێنی لەخۆت بڕوانەو سود لەکاتەکانت وەربگرە و وا لەخۆت مەکە هەست بە بێ ئومێدی بکەیت.

لەلێکۆڵینەوەیەکی زانکۆی ستانفۆرد لەئەمریکا دەرکەوتوە رێژەی ٨٠٪بەشداربوان شەرمنن و لەقۆناغێك لەقۆناغەکانی ژیانیان شەرمن بوونە، لەلێکۆڵینەویەکی دیکەش دیارترین ترس لای زۆربەی خەڵك قسەکردنە لەبەردەم کۆمەڵێکی دیکە.

بەپێی لێکۆڵینەوەیەکی دیکە لەسەر جمکەکان کراوە شەرمکردن بنەمایەکی بۆماوەیی هەیە، ئەگەر بەراوردی نێوان گەورەو بچوك بکەین لەشەرمکردن خاڵی هاوبەشی نێوانیان هەیە لە دڵەراوکێ و ترس، بەڵام گەورە دەتوانێ حاڵەتەکەی بشارێتەوە، بەڵام بچووك ئەوە ناتوانێ.

لەلێکۆڵینەوەیەکدا لەسەر ٥٠٠ منداڵی تازە لەدایك بوو کراوە رێژەی ٢٠٪یان بەوەجیادەکرانەوە کەکۆئەندامی دەماری زۆر هەستیاریان هەیەو دەریش کەوت نیوەی ئەو منداڵانە لەتەمەنی دووساڵیەوە شەرمنن، نیوەی دووەمی ئەو منداڵانە خودان کەسێتی کۆمەڵایەتی کراوە بوونەو بەئاسانی رای خۆیان دەردەبڕن، جیاوازی نێوان ئەو منداڵانەش دەگەڕێتەوە بۆ کەسوکاریان کەراهێنانیان پێ کردوون و رایان هێناون لەسەر شتی تازەو بارودۆخی نائاسایی، جیاوازیکردنی رەگەزیانە کاریکەری خۆی هەیە لەدروستکردنی شەرم کەدەرکەوتوە رێژەی ٦٥٪ئەوانەی شەرم دەکەن رەگەزی مێن.

لەلێکۆڵینەوەیکی زانکۆی ستانفۆردی ئەمریکا کەلەسەر ١٠هەزار کەس لەسەرجەم چین وتوێژەکانی کۆمەڵ کراوە دەرکەوتوە کەوا رێژەی ٤٠٪ئەوانە زۆر بەحەیان هەروەها نزیکەی هەمان رێژەش لەوانەن  کە نەچوونەتە رێزی ئەو کەسانەوە بەڵام زۆر شەرمنن هۆکاری شەرمنی زۆرو حەیای زۆر بریتیە لە بۆماوەو نەبوونی کارامەیی کۆمەڵایەتی و تێڕوانینی نەرێنی بۆ خود.

بەپێی لێکۆڵینەوەکانی شارەزایانی دەرونی رێژەی ١٠-١٥٪ی منداڵان مەیل و ئامادەباشی شەرمکردنیان بەشێوەیەکی ناسروشتی لەگەڵدایە، باشترین شێوەی پەروەردەیی بۆئەوەی منداڵ شەرمن نەبێت ئەوەیە کەهەر لەسەرەتای ساواییەوە بەتایبەتی ئەو کاتەی منداڵ خەریکە دادەنیشێ یان گاگۆڵکێ دەکات لەگەڵ منداڵانی دیکە دابنرێت بۆ ئەوەی ترسی لەکەسانی تر بشکێ چونکەترسە کەوا لەمنداڵ دەکات نەچێـە پێشەوە یان تێکەڵ نەبێت.

## جنێو و تانەی ناوچەگەرێتی:

### جنێوی کوردەواری پاڵنەرێکی چەپێنراوی لەپشتەوەیە

جنێودان و پلارو توانجگرتن رەفتاری شەڕانگێزی مرۆڤن کەئامانجی زیانگەیاندنە بەکەسانی دیکە، ئەم دوو ؟دیاردەیە لایەنی ئاسایی و نائاسایی هەیە بەگوێرەی قۆناغەکانی تەمەنی مرۆڤ، لەتەمەنی منداڵیدا کۆمەڵە هۆکارێك هەیە کەپاڵ بەمنداڵەوە دەنێت پەنا بۆ جنێودان ببات لەوانەش سەرنجڕاکێشانی دایکوباوك و دەوروبەر، لاساییکردنەوە، بەرپەرچەدانەوەی توندوتیژی و تۆڵەسندنەوەو...تد، بەڵام جنێودانی منداڵ بەردەوام نابێت، ئەگەر بەردەوامیش بوو تادوای قۆناغی منداڵییش ئەوا دەبێتە بەشێك لەکەسێتی مرۆڤەکەو خووی پێوەدەگرێت و ئیدی ئەم جنێودانە نائاساییە کە لە نێوان شارو شارێکی دیکە یان لەنێوان دووناوچەدا هەیە، هۆکاری کۆمەڵایەتی و دەروونی لەدوای ئەم جۆرە رەفتارەوەن، هۆکاری زەق و دیار کەبەئاراستەیەکی سایکۆلۆژیدا گوزەردەکات فاکتەری دەمارگیرییە بەهەموو شێوەکانیەوە، کەکوێرانە جنێودان یان توانجتێگرتن وەکو جنێودانی نێوان دووکەس لەدووناوچەی جیاواز یان نێوان دوو هۆزی یان دوو...تد بەکاردەهێنرێت و تەرووشك پێکەوە دەسوتێن، لەلایەکەوە لایەنگری ئەو کەسە دەکات، کەتوانج یان جوێن بەکەسانی ناوچەیەکی تر دەدات لەبەرئەوەی

خەڵکی فلانە ناوچەیە، یان فلانە عەشیرەتە، یان دەچێتە پاڵ ئەو کەسەی کەجنێوی پێدراوە لەبەرئەوەی خەڵکی ناوچەکەی یان شارەکەیەتی بەبێ ئەوەی هۆکاری هێرشکردنەکە بزانێ تەنها لەبەرئەوەی خەڵکی ناوچەکەیەتی، بەگوێرەی بیردۆزی شیکردنەوەی دەروونی ئەو جۆرە بەرگریکردنە دەمارگیرییە، دەمارگیرییش کوێرانەو نازانستی و نادرووستانە دەڕوانێتە رووداوەکان، واتە راستی بەرامبەرەکەی ناخوێنێتیەوەو هەڵەی خۆی و لایەنگرانیشی نابێنێ یان نایەوێ بیانبینێ، تورك بەهۆی دەمارگیریە دژی کورد دەڵێن: نەدار دەبێ بەماشە نەکورد دەبێتە پاشا.

هەرچەندە کورد لەمێژوودا پاشایەتی بەخۆییەوە بینیەوەو کورد جگە لەوەی پاشای خۆی بووە پاشای کەسانی تریش بووە لەمێژوودا، لەمێژووشدا کوردێك بەناوی سەلاحەدین ئەیوبی پاشای گشت نەتەوەکانی ئیسلام بوو بەتورکیشەوە، لەو پەندە تورکیەدا دەمارگیری بەچاو دەبینرێ و هەستی پێدەکرێ، کوردیش بەمنداڵی ترسنۆك دەڵێت هەی تورکومان واتە ترسنۆك، رەنگە لەبەرئەوەی کورد چەند تورکمانێکی بینیبێ ترسنۆك بووبن، بەڵام مەرجیش نییە وابێت، چونکە ئەم ناوزەدکردنە جۆرێکی دەمارگیرییە دژی تورکمان، یان هەندێ کەس کوێرانە هێرش دەکەنە سەر خەڵکی موسڵ و دەڵێن موسڵاوی رەزیلن، هەروەها فارس و عەرەب و عەجەم و هەموو گەلانی رۆژهەڵات و رۆژاواش دژی یەکتر پەندیان هەیە کەدوورە لەواقیعەوە، تەنها وەکو گوزارشتکردن لەناخ و هەڵوێستەوە ئەو پەندانە رۆژانە بەکاردێنن، عەرەبیش دەڵێ کورد قسەی یەکەو نابێ بەدوو واتە کورد کەللەی رەقە، بەڵام بۆچی ئێمە کەللەرەقین تا ئێستا تۆژینەوەی زانستی بۆنەکراوە لەلایەنە ئەوانەوە، ئەو جۆرە تۆمەتبارکردنەی گەلان دژی یەکتر دەمارگیرییە.

زانایانی شیکردنەوەی دەروونی پێیانوایە دەمارگیری ئەرکێکی دەروونی دەبینێ کەخاڵیکردنەوەی ئەو هەستە هەڵانەیە کەدروست بووە، یان کەڵەکەبووە، وەکو رکوکینەو بارگرژی و شەڕانگێزی چەپێنراوو لەرێگەی هێرشکردن یان توانجگرتن، ئەمیش وەك بەرگرییەك لەخود یان بەرگریکردن لەو کەسەی یان ئەو شارەی کەخۆشی دەوێ، چونکە کەسی دەمارگیر بەچاوێکی کەمتر دەڕوانێتە کەسانی دیکەو دانیش بەلایەنەکەی دیکەدا نانێت، وەکو دەمارگیری نازیەکان بەرامبەر گەلانی دیکە کەخۆیان لەلوتکەی هەرەمەکە داناو گەلانی دیکەش بەتایبەتی عەرەب لەبنکەی هەرەمەکە، هەموو ئەو دەمارگیرییانە کەهەیەو وەکو

دەمارگیری خەڵکی ناوچەیەك بەرامبەر ناوچەیەکی دیکە، یان گەلێك دژی گەلێکی دیکە، یان ڕەش پێست بەرامبەر سپی پێست، ئەو تۆمەتانە هیچی بەلێکۆڵینەوەی زانستی نەهاتۆتە ئاراوە، بەڵکو بەهۆی رکوکینەو هەستی هەڵەوە سەری هەڵداوەو دواتر پەیڕەوکراوەو بووەتە پەند ئەگینا کێ لێکۆڵینەوەی کردووە کە کورد کەللەرەقە، یان تورك ترسنۆکەن یان موسڵاوی ڕەزیلن، ئەگەر راستیەکیش لەئاردابێت ئەوا ناچێتە چوارچێوەی راستی بەڵگەنەویستەوە، هۆکارێکی دیکەی جنێودان و توانجگرتنی نێوان خەڵکی دووشار یان دوو گەل بریتیە لە نەستی خەڵك بەتایبەتی خەڵکی رۆژهەڵاتی جیهان لەوانەش کوردستان و عێراق کەزۆربەی جنێودانەکان ناوهێنانی خوشکو دایکە کەراستەوخۆ هێرش دەکرێتە سەر ئەندامەکانی لەشی و ناوگەڵ، ئەمیش دەگەڕێتەوە بۆ پرۆسیسی چەپاندنی سێکسی، چونکە تاك کەئارەزووی سێکسی نەشکێ ئەوا بەشێوەیەکی نەستیانە (لاشعوری) ئەو ئارەزووە مت دەکات کەدواتر بەشێوەی جیاواز وەکو خەون یان جنێودان یان هەر رەفتارێکی دیکە گوزارشتی لێدەکات، کەهەندێجار ئافرەتیش ئەو جنێوانە بەکاردێنن، بەپێی شیکەرەوانی دەروونی ماوەیەك جۆرە ئۆتۆمبیلێك دەهاتە میسر کڕیاری کەم بوو، بەڵام کەئۆتۆمبیلەکەیان گۆڕی بەجۆری باریك و تیژ لەئەندامی نێرینە دەچوو، بۆیە خەڵك بەشێوەی نەستیانە لاشعوری مەیلی کڕینیان دەکرد، کەواتە جنێودانیش بەناوهێنانی ئەندامی سێکسی جگە لەوەی پەیوەندی بەشەرەف و ناموسەوە، مەیلی سێکسی مرۆڤە کەئارەزووی نەشکاوە ئەگینا بۆ لەهەموو جنێوەکانی دیکە زیاترەو خوشکو دایکیش پەیوەندیان چیە بە کەسێکەوە کەخۆی تاوانبارە، هۆکاری دیکەی ئەم دیاردەیە گیانی تۆڵەسەندنەوەیە، چونکە مرۆڤ لەئەنجامی توندوتیژی کەدوچاری دەبێتەوە ئارەزووی تۆڵەسەندنەوە لەگیانیدا خۆی مەڵاس دەدات، ئەو شەڕانگێزییانەی بەئازاردانی کەسانی دیکە دەردەبڕێ و بەتایبەتیش لەو کاتەی کەکەش و هەوای کۆمەڵایەتی یان دەروونی ڕێخۆشکەر دەبێ بۆی، ئەو ئازاردانەش یان زارەکییە وەکو جنێودان و توانجگرتن یان جەستەییە وەکو لێدان و زیان گەیاندن بەکەسانی دیکە، یان نیازخوازییە، کەکەسی شەڕانگێز ئەگەر خۆی پێی نەکرێ زیان بگەیەنێ ئەوا لەدڵەوە ئاواتی ئەوە دەخوازێ ئەو کەسە زەرەرمەند بێ، فاکتەری خۆبەکەمزانین و ناهاوسەنگی هۆکاری دیکەی ئەو دیاردە ناشیرینەیە، کەجنێودەر دەیەوێ بەجنێو لەگرنگی خەڵکی دیکە کەم بکاتەوە بۆ ئەوەی تای تەرازوەکە لەقازانجی خۆی بێت و هاوسەنگی بۆ بگەڕێتەوە، ئەم جۆرە کەسانە زوو دەچنە پاڵ کەسانی

جنێودەرو لەگەڵیاندا هێرش دەکەنە سەر خەڵکی شارێکی دیکە یان هۆزێکی دیکە، فێربوون ولاساییکردنەوەش فاکتەری دیکەی ئەو دیاردانەیە، کەمنداڵ لەناو خێزان و کۆڵانەوە فێریان دەبێت و لەگەڵیاندا گەورە دەبێ و پاشان لێی دەبێتە خوو و پێوەی ئالۆدە دەبێت بۆنموونە زۆر کەس لەکۆمەڵگەی ئێمەدا هەندێ جنێوی رۆژانە هەیەلەگەڵ هەموو شتێکدا بەکاری دێنێ، کەدەڵێت عەرزی بگێم....ئیبادەی کرد...دایکی گا.....تد تەنانەت ئەگەر شتێك لێیان ببێتە گرفت یان کەسێك لێیان یاخی بێ یان ..تد، ئەمەش نەخۆشیەکی کوشندەیەو کلتورێکی سەقەتە، بۆچوونەکانیش کاریگەرییان هەیە لەسەر سەرهەڵدانی جنێوو توانجگرتن لای خەڵکی، بۆ نموونە ئەگەر کچێکی جوان بەشوێنێکدا تێپەڕێ دەڵێن: ( سەگبابە دەڵێی بەرخە، ئێستا نەیدەی بەعەرزا.....تد)، لەرووی بۆچوونەکانەوە خێزان باوەڕی بەجۆرە شێوازێکی ژیان هەیە لەبەر ئەوە هێرش دەکاتە سەر شێوازێکی دیکە کەباوەڕی پێی نییە، بۆنموونە هەندێ جۆری کارکردن هەیە باوەڕیان پێی نییە دەڵێن بەگەوادی نان پەیدا دەکا، ئەو هێرشکردنە لەگیانی منداڵدا چەکەرە دەکات و نەوە دوای نەوە بەکاردەهێنرێت، سیفەتی نەرگزی، کەبەشێوەیەکی متبوو لەگیانی خەڵکدا هەیە وایان لێدەکات خۆی لەدەوروبەرو خەڵکی شارەکانی دیکە بەچاکتر بزانێ، هەر بۆیە جوانی و پیاوەتی و ناوچەی خۆی و دانیشتوانی شارەکەی بەدانیشتوانی شارێکی دیکە بەباشتر دەزانێ، ئەو بەباشتر زانینەو ئەو بەباش نەزانینەی خەڵکانی دیکە دەبنە پاڵنەری چەپێنراو، کەبەهۆیەوە جوێن دەدرێ یان توانج دەگیرێ، هەروەسا کەللەرەقی سەرچاوەیەکی دیکەیە، کەدەبێتە مایەی دروستبونی هەستێك کەبەهۆی ئەو هەستەوە جوێن بەکەسانی دیکە یان ناوچەیەکی دیکە بدرێ، عەلی وەردی دەڵێ: لەسەدەکانی ناوەڕاستدا دوو سوار بەلای پەیکەرێکدا تێدەپەڕین یەکێکیان دەڵێ ئەم پەیکەرە زەردە ئەوی دیکەیان دەڵێ شینە، هەردووك دەبێ بەمشتومڕیان، ئەم دەڵێ زەردەو ئەو دەڵێ شینە، لەراستیشدا هەردووکیان هەر راست دەکەن، چونکە لایەکی پەیکەرەکە بەزەرد رەنگ کرابوو لایەکەی دیکەی بەشین، هەر یەکە لەو سوارانە لەبەر کەللەرەقی دەیانویست بەوی تری بسەلمێنی کە پەیکەرەکە هەر ئەو رەنگەیە کەخۆی دەیلێ، تا لەدواجاردا هەردووکیان بەشمشێر و جنێودان بەردەبنە گیانی یەکتر، ئەگەر سایکۆلۆژیانە ئەو شەڕە جوێن و شمشێرە لێکبدەینەوە واتای کەللەڕەقی و بەراست زانینی بیروڕای خود دەگەیەنێ ئەگەر بیروڕاکان هەڵەش بن، لەکوردەواری خۆشماندا بەسەرهاتی زۆر هەیە لەوانەش کەدەڵێن (بشفرێ بزنە) کەدوو کەس زۆر

هاوڕێی یەکتری دەبن لەناکاو قەلەرەشێك دەبینن یەکێکیان دەڵێ ئەوە قەلەڕەشەو ئەوی دیکەیان دەڵێ بزنە، یەکەم دەڵی ئەوەتا فڕی قەلەڕەشە، ئەوی دیکەیان دەڵێ بشفڕێ هەر بزنە، ئەم مشتومڕە نەزۆکە هەستی رکابەری و دەمارگیری و کەللەڕەقی لەمرۆڤدا نیشان دەدات کەبەزۆر شێوە گوزارشت لەخۆی دەکات، لەوانەش جنێودان و هێرشکردنی زارەکی کەدەگاتە ئاستی عەشیرەت و ناوچەو گەلیش، ئەم جۆرە رەفتارانە بنەمایەکی سایکۆلۆژی مێژوویی دورودرێژی هەیە، رەگوریشەی لەناو خەڵکیدا داکوتاوەو لەناو هەموو گەلانی دونیادا بەشێوەی جۆراوجۆر هەیە، گۆڕانکاری تیایدا بەستراوە بەگۆڕانکاری لەژێرخانی ئابوری و نەمانی بێکاری و کاتی ڤالاًیی و هەروەها گۆڕانی سیستمی سیاسی کەبتوانێ دیموکراسی و ئازادی بۆ تاکەکان فەراهەم بکات و ئەم گۆڕانەش لەکۆمەڵگەیەکەوە بۆ کۆمەڵگەیەکی دیکە جیاوازی هەیە، کۆمەڵگەی رۆژهەڵاتی کەخاوەن کلتورێکی دەوڵەمەندە لە جنێوو توانج و تەشەر بەهۆی چەپاندنی سێکسیەوە چاوەڕێ ناکرێ وەکو کۆمەڵگەیەکی رۆژاوایی گۆڕانی بەسەردا بێ، نەخاسمە لەکۆمەڵگەی رۆژهەڵاتی بەتایبەتیش لەعێراق و کوردستان راپەڕینێکی پیشەسازی بەخۆو نەبینیوە، کەژێرخانی ئابوری بگۆڕێ و پاشان پەیوەندییە کۆمەڵایەتیەکان گۆڕانی بەسەردا بێ لەبەرئەوە گۆڕان تیایدا سست ولاوازە، بۆیە لەوڵاتێکی وەکو تورکیا دوای روخانی دەوڵەتی عوسمانی لەسەردەمی مستەفا کمال ئەتاتۆرك کەبەسەردەمی کەمالیزم ناسراوە بڕیاردرا کلتوری سواو و کۆن کەبارە لەسەر کۆمەڵگەوە بگۆڕێ، لەوانەش لەسەرنەکردنی تەڕبووش کەجۆرە کلاوێکی لوولەییەتورکەکان لەسەریان دەکرد لەگەڵ چەندین گۆڕانکاری دیکە، چونکە ئەوان پێیانوابوو گۆڕان لەرواڵەت گۆڕان لەسایکۆلۆژی تاکدا درروست دەکات، بەڵام مێژوو ئەوەشی دەرخست کەگۆڕان بەرواڵەت نییە، چونکە کلتور کاریگەری گەورەی دەرونی لەنەستی نەوەکاندا بەجێدێڵێ، دەکرێ ئێمەی کورد لەرێگەی میدیاوە بەهەموو جۆرەکانیەوە بەهاوکاری لەگەڵ پەوروەردەو فەلسەفەی پەروەردەیی دەمارگیری لەتاکدا بڕەونێنینەوەو بەرنامەی تایبەتی بۆ دابڕرێژین هەرچەندیشە زۆر لەدراما کوردییەکان پڕ توندوتیژی و پلارو جنێو دانن کەتیایاندا رەچاوی پەروەردەو درووستکردنی گیانی مەدەنیەت نەکراوە.

# خۆگونجاندن و دەروون درووستی

**هەموو خۆگونجاندنێك ساغلەم نییە،چونكە ئەگەر وابێت كەواتە خود هەروەكو خۆیەتی.**

یەكێك لەبنەماكانی كەسێتی سەركەوتوو یان دەروون درووستی ، خۆگونجاندنە كەپێویستە مرۆڤ هەوڵ بدات توانای خۆگونجاندنی لەلادروست ببێ و هەر كاتێكیش توانی خۆی بگونجێنێ مانای وایە كەسایەتی تەواو یان زەمینەیەكی لەباری هەیە كە كەسایەتیەكی سەركەوتوو بێ، بەڵام ئەم خۆگونجاندنە ئەوە ناگەیەنێ كەسایەتی خۆت لەدەست بدەی، واتە مرۆڤ كەچووە شاری كوێران دەبێ دەست بەچاویەوە بگرێ، بەڵام نابێ چاوەكانی بدۆڕێنێ، خۆگونجاندن ئەوەیە مرۆڤ هەوڵ بدات هاوسەنگی خۆی رابگرێ لەنێوان پێویستیەكانی خۆی و پێویستیەكانی ژینگەدا، خۆگونجاندنی خێزان ئەمڕۆ ئەوەیە كەپێویستە دایك و باوك بزانن و بتوانن خۆیان لەگەڵ ئەوەدا رابێنن، كەچیتر لێدان و توندوتیژی شێوازی راست و دروستی پەروەردە نییە، كەمنداڵ پێی گوێڕایەڵ بێ و لەهەمان كاتدا باری دەرونی و كەسایەتی ئایندەشی تەواو بێ، پیاو دەبێ ئەوە بزانێ كە ژن كۆیلەی ئەو نیە، بۆیە پێویستە باوەڕ بەوە بێنێ كەئەویش وەكو ئەو وایەو كۆیلایەتی قبول ناكات، لەوانەشە نەگونجاندنی مرۆڤ ئێستا زیاتر بۆ ئەوە بگەڕێتەوە كە گۆڕانكاریەكان خێراو كتوپڕن و پێداویستیەكانی مرۆڤ زیادی كردووە، بەڵام لەگەڵ ئەوەشدا ئەقڵی مرۆڤی ئێستاو وشیاری زیاترە لەرابردوو، كەواتە بەهەر شێوەیەك بێ پێویستە مرۆڤ لەو دەردە كوشندەیە خۆی رزگار بكا كەنەتوانێ خۆی بگونجێنێ، چ خۆگونجاندنی ژن و مێرد بێ لەگەڵ یەكتر، یان بوك لەگەڵ خەسوو، یان دراوسێ و دراوسێ...تددەتوانین بڵێین خۆگونجاندن

واتە قوربانیدان بەھەندێ شت لەپێناو ھەندێکی دیکە، چونکە عەقڵی فراوانخوازی چیتر جێی نابێتەوەو دەشێ دان بەکەسانی تری دەوروبەریشماندا بنێین، خوگونجاندن تەنھا ئەوە نییە، کەبتەوێ بەڵکو ئەوەشە کە ئەوانیش دەیانەوێ، واتە ئەگەر شتێکت دەوێ دەبێ دەست بەرداری شتێکی دیکە بێ، بەڵام نەك لەسەر حەسابی کەسایەتی و بەھا مرۆییەکان، ھەڵبەتە مەبەستمان لێرەدا ئاڵوگۆڕکردنی شتەکانە (پێویستیەکانە)، کەپێویستە مرۆڤ زاڵ بێ بەسەر کۆسپ و تەگەرە شەخسی و کۆمەڵایەتیەکان کەدەبنە ھۆی روخانی مرۆڤ، بەڵام ئەگەر ئەو مرۆڤە زاڵ نەبوو یان نەگوجا دەبێتە ھۆی بێزاربوون وخەموپەژارەو ھەندێجاریش دەبێتەھۆی خۆکوشتن، خۆکوشتنیش لوتکەی بێزاربوون و نەگونجانی مرۆڤە لەگەڵ دەوروبەردا، بڕوابەخۆبون و رەزامەندی لەسەر کاروپیشە دەبێتە ھۆی ھاوسەنگی و خۆگونجاندن سەرەتا لەسەر مرۆڤ پێویستە بەتایبەتی لەسەر خێزان کەپێویستە تۆوی بڕوا بەخۆبوون و متمانە لەگەڵ تاکەکانیدا بچێنێ، لەژیانی رۆژانەماندا زۆرن ئەوانەی گلەیی و گازەندە لەدەوروبەری خۆیان دەکەن کەکارەکەیان بەدڵ نییە، یان کارەکەیان بەگوێرەی دڵی ئەوان بەڕێوەناچێ، گەر تۆ دەتوانی خۆت بگونجێنی ئەو خۆگونجاندنە بۆ بەھێزکردنی کەسایەتی خۆتەو لەروخان دوور دەکەویتەوە، بەپێچەوانەشەوە نەگونجانت دەبێتە ھۆی روخانت، لەم روانگەیەوە پێویستە ھەوڵ بدرێ کێشە دەرونیەکانی نێوان ئەندامانی خێزان نەھێڵدرێ وەکو کەللەرەقی و قەناعەت نەکردن بەتایبەتی لەنێوان ھاوسەراندا کەھەریەکەیان لەژینگەیەکی جیاوازەوە ھاتوون و جیاوازی لەسروشتیاندا ھەیەو ھەر یەکەیان دەیەوێ ئەوەی لەمێشکی خۆیدایە جێبەجێی بکات، بەڵام راستی ژیان ئەوەیە ئەگەر شتێکمان بوێ دەبێ واز لەشتێکی تر بێنین، ئەو وازھێنانە قوربانیدانە، واتە خۆگونجاندنە، ھەموو ژن و مێردێك داب ونەریت و شێوازی بیرکردنەوەیان وەکو یەك نییە، بەڵام بۆ خۆگونجاندن ھەریەکەیان شێوازێکی تازە دێنێتە ئاراوەو واز لەھەندێ لەشێوازەکانی ژیانی پێشتری دێنێ بۆ ئەوەی بگونجێ، کەواتە بۆ ئەوەی مرۆڤ بتوانێ کەسایەتیەکی خۆگونجاندنی ھەبێ پێویستە یەکەم جار تێڕوانینی بۆ ژیان واقیعیانەبێ و نەڕواننە بەرزتر لەخۆمان بەداخەوە دەمرین، پاشان ئاستی خواستەکانی مرۆڤ دەبێ بەپێی توانای مرۆڤەکە خۆی بێ و ھەوڵی بۆ بدات، فراوانبوونی ئاسۆش نیشانەیەکی تری خۆگونجاندنی مرۆڤە، کەنابێ مرۆڤ بەرەھایی بڕوانێتە ئەرێنیەکانی ژیان و وەك چۆن ناشبێ بەرەھایی لەسیفاتەکانی ژیان بڕوانێت.

## کەسی نەرگزی:

**کەسی نەرگزی زیندانی خودی خۆیەتی، بۆیە ئەویتر رەتدەکاتەوە (مستەفا حجازی)**

بەپێی لێکۆڵینەوەکان نەرگزیەت ئەفسانەیەکی یۆنانیە لەوشەی نارسیسەوە هاتووە، کە ناوی لاوێك بووە کچێك زۆر خۆشی ویستووە، ئەم کچە لەداخی فەرامۆشکردنی لەلایەن ئەو لاوەوە مردووە، بۆیە بەپێی ئەفسانەکان خواوەند تۆڵەی ئەو کچەی لەکورەکە (نارسیس) کردۆتەوە کەوای لێکردوە عاشقی خۆی بێت، نارسیس بەرادەیەکی زۆر عاشقی خۆی دەبێت، نارسیس کاتێك دەڕوانێتە ناو بیرێك و وێنەی خۆی دەبینیێ وێنەکەی خۆی زۆر پێ جوانەو عاشقی وێنەکەی خۆی دەبێت و لەپڕ خۆی بۆ هەڵدەداتە ناو بیرەکەوەو لەئاکامدا دەمرێت و لەشوێنەکەی گوڵە نەرگزێك دەڕوێت، دوابەدوای ئەوە سیفەتی نەرگزی دەبڕێتە باڵای ئەو کەسانەی کەخۆیان زۆر خۆش دەوێت و خۆیان زۆر پێ جوانەو و عاشقی خۆیان دەبن، فرۆید لەبارەی نەرگزیەتەوە دەڵێ ئەفسانەی نارسیس کەکەوتۆتە داوی خۆشەویستی خۆیەوە هۆکاری پێوە لکانی ئەو سیفەتەیە بەو کەسانەی کە خۆیان زۆر خۆش دەوێت و لەفەرهەنگی دەروونناسیشدا ئەو سیفەتە دیاریکراوەو بەشێوەیەکی زانستیانە لێیکۆڵدراوەتەوەو مشتومڕی لەنێوان زانایان درووست کردووە، بەڵام سەرەڕای ئەو مشتومڕە ئەوە لەو فەرهەنگەدا جێگیر بووە کەکەسانێك خۆیان لەرادەبەدەر خۆش بوێت دەچنە قاڵبی کەسێتی نەرگزیەوە، ئەم

کەسانە لەخودی خۆیاندا کەسێك هەیە لەگەڵیدا نگرۆبوون و پێیان وایە ئەو کەسەی لەگەڵی نگرۆبوون تەواوکەری خۆیانە، بەپێی لێکدانەوەی فرۆید ئەم حاڵەتە گوزارشتە لە قۆناغێکی گەشەکردنی سێکسی کەمنداڵ لەیەکەم ساڵی تەمەنیدا لەدەوروبەری خودی خۆیدا چەقی بەستووەو بەچەندین قۆناغی سێکسیدا تێدەپەڕێ، بەپێی لێکدانەوەی هەندێ لەلێکۆڵەرەوان خاسیەتی نەرگزیەت لەحاڵەتی ئاساییدا گوزارشتە لەرێز لەخۆنان و ئەمیش پێویستیەکی دەروونی مرۆڤەو دەبێ تێربکرێ .

کاتێ مرۆڤ دووچاری ئەم حاڵەتە دەبێتەوە لەهەر پیشەیەکدا کار بکات کاریگەری لەسەر پەیوەندی بەدەوروبەریەوە دەبێت تەنانەت نەرگزیەت کار لەکاری رۆژنامەنوسی و نووسینی کەسانی رۆشنبیریش دەکاتەوەولەنوسینەکانیاندا رەنگ دەداتەوە تەنانەت شاعرانی گەورەی دونیاش لەهۆنراوەکانیاندا بەنهێنی و ئاشکرا گوزارشتیان لەو حاڵەتە کردووە، سیاسەتمەدارانی نەرگزیش کاتێ لەهەڵبژاردنەکاندا دەدۆڕێن نارەزایی خۆیان بەرامبەر ئەنجامەکان دەردەبڕن و پێیان سەیرە کەسەرنەکوتوون چونکە ئەوان سەرەڕای مامەڵەو سیاسەتی خراپیان هەر چاوەڕی ئەوەن کەسەربکەون، دیکتاتۆرەکانی دونیا ئەوەی خۆشحاڵی دەکردن ئەو پێداهەڵدان و وەسفکردنانە بوو کەشاعیران و نوسەران وەسفیانیان دەکرد، کەسانی نەرگزی هەرگیز نابنەکەسانی دیموکراسخواز، چونکە بیروڕای کەسانی تر بەپەسەند نازانن واتە بێ ئەوەی سیاسەت بزانن خۆیان دژە دیموکراسین، ناتوانن گۆڕان لەخۆیاندا دروست بکەن، چونکە باوەڕیان بەوەی خۆیان زۆر قایمەو بەشێوەیەکی دەمارگیرییانە مامەڵە لەگەڵ هزرو بیروڕای خۆیان دەکەن ئەمیش دەبێتەهۆی ئەوەی لەشوێنی خۆیان چەق ببەستن و پێان سەیرە خەڵك داوای گۆڕانیان لێبکات، کەسانی نەرگزی تەنانەت ئەگەر بچوکترین دەسەڵاتیش هەبێ ئەو دەسەڵاتە هەمووی لەخۆیدا دەکاتەوەو نایەوێ کەس بەشداری دەسەڵاتی بێ ئەی کەواتە چۆن دیموکراسخواز دەبێ، کەسانی نەرگزی کێشەی خودیان هەیە وەکو نامۆبوون، فرۆید دووپاتی کردۆتەوە کەوا پەیوەندی لەنێوان نەرگزیەت و مەیلی ئەو کەسە ترازاوانە هەیە کەسیفەتی ماسۆشیانەی هاوڕەگەزییان هەیە، لەلایەکی ترەوە و کێشمەکێشی چینایەتی بنەمای دروستبوونی ئەو نامۆبوونەیە کە بەنەرگزیەت لای هەندێ کەس ژنە دەروونناس (کارین هۆرنی) زیاتر ئەمە روون دەکاتەوە کەوا نەرگزیەت گوزارشت نییە لە خۆ خۆشویستن بەڵکو گوزارشتە لەنامۆبوون لەخود دا، بەهەمان شێوە نامۆبوونی دەروونی و کۆمەڵایەتی لەلایەن مارکس و هیگڵیشەوە ئاماژەی

پێدراوە کە کێشەی خودە، دیارە بەپێی بیروڕای ئەوان رەگوڕیشەی کۆمەڵایەتی و ئابوری ناسراوە، کاتێك مرۆڤ هەژار بێ نیشتمان بۆئەو هیچ ناگەیەنێ چونکە ئەو لەوڵاتی خۆیدا نامۆیە، هەر ئەم نامۆبوونەیە ئەو کەسە هەموو شتێك کەژیانی ئەو نەگۆڕێ رەتی بکاتەوە، لەمروانگەیەوە لەم کێشمەکێشە چینایەتیەوە بەردی بناغەی رەفتاری سایکۆلۆژی تاك دیاری دەکرێت، کەچی بەپێچەوانەی ئەمیشەوە قوتابخانەی شیکردنەوەی دەرونی لەو باوەڕەدایە ئەو ململانێیانە پەیوەندە بەقۆناغی گەشەی سێکسی تاکەوە لەقۆناغی منداڵیەوەو هەر ئەو قۆناغەیە تابلۆی ژیانی سایکۆلۆژی دەکێشێ، ئەگەر لەو مشتومڕەی نێوان فرۆید و مارکس و هۆرنی وردبینەوە خاڵێکی هاوبەش هەیە ئەویش گرفتی دەروونی تاکە جا ئەو گرفتە هەر یەکەیان دەیگەڕێنێتەوە بۆ سەرچاوەیەك ئەما ئابوریە یان کۆمەڵایەتیە یان سێکسیە.

لەلایەکی ترەوە خود هەمیشە مایەی مشتومڕ بووە لەنێوان زانایانی دەروونی و کۆمەڵایەتی، کۆمەڵناسان لەو باوڕەدان کۆمەڵگا و خێزان ئەو دەسەڵاتەن کەسەرچاوەی پێکهاتەی سایکۆلۆژی تاکن و ریشاڵە دەرونیەکانی بۆ دروست دەکەن و دەبێ ئەو تاکە بکرێتە قوربانی کۆمەڵ و ملکەچی ئیرادەی دەسەڵاتی کۆمەڵایەتی بێ، کەچی دەروونناسی پێیوایە زیاتر گرنگی بەباری دەروونی تاك بدرێت و کۆمەڵ لەخزمەتی تاکدا بێ، رەنگە ئەم بیرۆکەیەی دەروونناسی یەکبگرێتەوە لەگەڵ هزری لیبرالی رۆژواییدا کەهەمیشە ئازادی تاك لەپێشەوە دادەنێت و یاساکانی لەخزمەت تاکدا دادەڕێژێ و رەهایی رەفتاری پێدەبەخشێ و هەر لەوێشەوە یاسای هاوسەرگیری نێوان ترازاوانی سێکسی هاوڕەگەزیی لەپەرلەمانی وڵاتەکانیاندا داڕیژراوە، ئەم یاسایە ئەوپەڕی بەرجەستەکردنی مەیلی نەرگزیانەی تاکە لەچوارچێوەی رەهابوونی رەفتاریدا، ململانێی نێوان (منی باڵا) و (من) و (ئەو) دا راستییەکی حاشا هەڵنەگرە، کەخود هەمیشە لەنێوان دوو بەرداشدایە، ئەوەیش بەرداشی (منی باڵا) و (ئەو) دایە کەلەلایەك خود دەبێ ملکەچی (منی باڵا) بێ و لەلایەکی تر دەبێ جڵەوی (ئەو) بکات و لەهەمان کاتدا گوێڕایەڵیش بێ بۆیان، ئەم ململانێیەیە سەرچاوەی پەشێوی خودەو سەرچاوەی ئەو نەرگزیەتەیە کە فرۆید ئاماژەی پێدەدات، لەهەمان کاتدا کارین هۆرنی ناتوانێ لەم روانگەیەدا رابکات، چونکە نەرگزیەت ئەگەر نامۆبوونیش بێ کەواتە سەرچاوەی ئەو نامۆبوونە دەگەڕێتەوە بۆ ئەو کێشمەکێشەی نێوان خود لەنێوان (منی باڵا) و (ئەو) دا، تاك کاتێك رەهاو ئازادە غەریزەو حەزەئاژەڵیەکانی ئەو تێر بکات و گوێ نەداتە منی باڵاو

نەرگزیانە رەفتار دەکات و حەساب بۆکەس ناکات، ئەمیش عەقڵ و لۆژیکی کۆمەڵایەتی پەسەندی ناکات، خۆ ئەگەر تاك بەرەو ملکەچبوونی تەواوی منی باڵا هەنگاو بنێت ئەوا کەسێکی سۆفی دەبێت و لەخەڵوەتدا ژیان بەسەر دەبات و لەپێناو ئەم سۆفیگەریێتیەدا کەسێکی نامۆ دەبێت، لەهەردوو حاڵەتەکەدا نەرگزیەت ئەگەر عیشقی خود بێت و ئەگەر نامۆبوون بێت زانایان کۆمەڵایەتی و دەروونی دووچاری تەنگژەیەکی قورس دەکات، بەڵام ناوەندی زێڕینی ئەرستۆ کەبانگەشەی دژایەتی زێدەڕۆیی دەکات و دەیەوێ تاك لەپێناو سەقامگیری دەروونی نەرەشبینی تەواو بێ و نە گەشبینی تەواو، بە پێی وتەکانی ئەرستۆ ژیان خۆڵەمێشیەو پێویست ناکات مرۆڤ خۆی دووچاری تەنگژەی یەکجەمسەری بکات، ئەم تێڕوانینەی ئەرستۆ زانایانی هەردوولا ئەهوەن دەکاتەوەو لەو ملاملانێیانەی نێوانیان رزگاریان دەکات، لەهەمان کاتدا ئەگەر بەپێی ئەفسانەکە بێ کە لەتۆڵەی کچە عاشقەکەی نارسیس نارسیس مردبێ کەواتە دەبێ رکوکینەو تۆڵەسەندنەوە هەوێنی کێشەو گرفتەدەرونیەکان بێ نەك ململانێی ژیان، وادیارە ئێستاشی لەگەڵدابێ تۆڵەسەندنەوە لەتاك هەر دەکرێتەوە، بەڵام لەگەڵ ئەوەشدا تەنها هەر نێر نییە تووشی نەرگزیەت بووبێ بەڵکو نەرگزیەت سیفەتێکە دووچاری هەمووتاکی مرۆڤایەتی دەبێتەوە.

فرۆید پێیوایە نەرگزیەت ناوازەیی و ترازانە لەلایەك و قۆناغی گوازەرەوەی خود خۆشویستنە لەلایەکی دیکەوە، کیرنبرگ سیستمێکی سەبارەت بەکەسێتی پۆلین کردووە کە پشت بە باتۆلۆجی من و منی باڵا دەبەستێ، کیرنبرگ ئاماژەی بەکەسێتی ئاست بەرزو کەسێتی ئاست نزمی پەشێوی داوە، هەردوو ئاستەکەشی لەیەکدی جیاکردۆتەوە بەپێی پلەی میکانیزمەکانی چەباندن یان میکانیزمەکانی ئینشقاقی، بەپێی ئەو پۆلێنکردنە کەسێتی هستیری هاوتایە لەگەڵ سیماکانی عوسابی ئاست بەرز، بەڵام کەسێیتیە ناگەیووەکان ئاستی مام ناوەندین، کەچی کەسێتی نەرگزی لەئاستی نزمی سیماکانی عوسابیەتدایە، هەموو کەسێك پێکهێنەرەکانی نەرگزیەتی لەکەسێتیدا هەیە ئەمە پێی دەوترێ نەرگزیەتی تەندروستی healthy narcissismمەبەست لێی رێزگرتن لەخود بەپێچەوانەی نەرگزیەتی باتۆلۆجی (pathological narcissism) کە تاك منی خۆی پف ئەدات واتە گەورەی دەکات، زانا یۆنگ ئەمە لەلێکۆڵینەوەیەکی خۆیدا دووپات دەکاتەوە کەلەسەر فوسامیەکان

و عوسابیەکان و کەسانی ئاسایی ئەنجامی داوە کەئەمیش لەسەر بنەمای تیۆرەکەی فرۆید کراوە کەبەوە جیادەکرێتەوە کە لیبیدۆی تاك تەرکیز دەکاتە سەر خود .

هەروەها جاکوبسون هامرایە لەگەڵ فرۆید سەبارەت بە نەرگزیەتی تەندروستی کە بەشێکە لەخودی ئەرێنی کەتیایدا هێزی لیبیدۆ بەسەر خودو بابەتیشدا دابەشکراوە، جاکوبسون ئاماژە بەوە دەدات کەوا زۆرئاساییە خودی خۆمان خۆشبوێت هەروەکو کەسانی ترمان خۆشدەوێت، بەرای ئەم کابرایە نەرگزیەتی درووست بنەمای پێویستی پەیوەندی خۆشەویستی جێگیرو بەردەوامە، هەروەها زاناو لێکۆڵەرەوەی دەروونی (پۆل فیدرین) سەبارەت بە نەرگزیەتی تەندرووست ونەرگزیەتی نەخۆش گەیشتە ئەم ئەنجامانە:

١-نەرگزیەتی تەندرووست وەك دژە شەحنەیەکی دەروونی بەرامبەر هەوڵەکانی بابەتەکەو یارمەتیدانی (بۆنمونە وەکو هیواو خواست) بەکاردێت بەڵام نەك وەکو جێگرەوە، هەرچەندە نەرگزیەت وەك جێگرەوە بەکاربێت ئەمەندە وێنەکە نەخۆشیانەتر دەبێت

٢- سنوری من لەحاڵەتی ئاسایی بەرگری دەکات، لەکاتێکدا من بەتەواوی جێگیرە بەپێی دژە شەحنەی گونجاو

٣-کاریگەریەکان بەبێ سۆزی توند دەتوێنەوە واتە بەبێ وەبەرهێنانی سەرلەنوێی حاڵەتی نەرگزیەت

٤- ئاستی چێژوەرگرتن لەشەحنەی دەرونی نەرگزی زۆر بەرز نیە لەکاتێکدا ئاستی وەکو ئەم چێژە حەشاردراوە لەهەستی منی جێگیر بەرزە بەپێی توانا.

٥-رەزامەندی لەخەیاڵاتی نەرگزی هەستی و نەستی بەندە بە بەتاڵکردنەوەی لیبیدۆی راستەقینەی بابەتەکە

٦-ناوەڕۆکەکانی خەیاڵاتی نەرگزی هەستی و نەستی زیاتر هاوتایە لەگەڵ راستی و کەمتر منداڵانەیە.

٧-خاڵی شەشەم زیاتر بەهۆی خەیاڵی موژدەبەخشی سەرکەوتوو پاڵپشت دەکرێ، کە زیاتر مەزن دەبێت و زیاتر ئەستەم دەبێت بەهەمان ئەو پێوەرەی کەئاراستەی نەرگزی نائاسایی لادەدات.

بیرستن ٤جۆر کەسێتی نەرگزی دیاریکردووە کەهەرکەیان خاسیەت و سیفاتی خۆیان هەیە:

یەکەمی: کەسێتی بارانۆییparanold personalities کەسێتی نەرگزیەتی توند کە بەهەوەس و شێتی خۆ بەگەورەزانینی درۆینە جیادەکرێنەوە، خۆبەستنەوەی توند بەبیرکردنەوەی عەقلانی، دیالۆگو پێشبینیکردنی فێڵ لەسەریان و هەڵخەڵەتاندنیان لەلایەن کەسانی ترەوە، هەروەها تواناو چالاکی عەقڵییان سەبارەت بەسکاڵا رێکخراوە، بەغیرەو نادڵسۆزی و قابلیەتی بریندار‌بوون و هەستکردن بەهێرش وەسف دەکرێن، لەنرخی باوانیان کەم دەکەنەوەو لۆمەی خەڵکی دەکەن زۆر بەشێوەی رکوکینانە، خۆیان بەزاڵ دەزانن بەسەر کەسانی لاوازو نەخۆش و ئەوانەی کەموکورتی خەلقییان هەیە، زۆر گرنگی بەخۆیان دەدەن، دوور دەکەونەوە لەچالاکی کۆمەڵایەتی، پێشیان خۆشە لەپێگەی بەرزو دیار بن و رکیان لەوکەسانەشە کە پێگەی بەرزیان هەیە.

جۆری دووەم: کەسێتی نەرگزی: کەسێتی یاخی و دژ بەکۆمەڵ: غەش و فرتوو فێڵ و تەنافبازی و ناتەواوی لەهەستکردنیان بەگوناه، رێزنەگرتن لەخەڵك، شانازیکردن بەخودو کەمکردنەوەو لەنرخی باوکان کەبەخششیان نییە.

جۆری سێیەم: کەزۆربەی خەڵك هەیەتی کەسێتی پشت بەستووە ( dependent personality)، ئەمانە نەفس نزمن و بیرکردنەوەیان بەشێوەیەکی لاوازەو دەستپێشخەری و سەربەخۆییان نییە، خۆیان لەبەردەم ئەو کەسانەی سەرپەرشتیان دەکەن بەسلبی دەردەخەن، ئەم کەسانە هەمیشە لەو باوکانە دەگەڕێن کەمیسالی و بەخشندەن.

جۆری چوارەم: کەسی ئیحجامی) avoldant) ئەمانە سیمای نەرگزی بەهێزیان هەیە و گوزارشتی لێناکەن، بەنزمی خۆیان هەڵدەسەنگێنن و بەسوك تەماشای دەکەن، کەواتە سیفاتەکانی کەسانی نەرگزی وەکو کەسی بارانۆیی و دژە کۆمەڵ و پشت بەستوو و دواجاریش گۆشەگیر هەریەکەیان جیاوازن لەیەکتر لەرادەی نەرگزیەتی ئەمیش لەمیانەی هەستکردن بەخود.

## مرۆڤ لەنێوان وێنەی خۆی و خەیاڵیدا:

**گرفت نییە مرۆڤ نەزانێ، گرفت لەوەدایە خۆی نەناسێ.**

مرۆڤ بۆ شیتەڵکردنەوەی ناسینی خودی خۆی رۆناچێتە قوڵایی خودەوە، چونکە خۆناسین (معرفە النفس) وەك ئەرستۆ دەڵێت زۆر ئەستەمە، بەڵام ئامۆژگاریکردنی کەسانی دیکە کارێکی سانایە، کەواتە رەنگە خەڵك ناسینیش لەخۆناسین ئاسانتر بێت، چونکە مرۆڤ کەخودی خۆی نەرگزیانە خۆش بوێ وای لێ دێت (نازانێ، کە نازانێ)، وا هەست دەکا هەموو شتێك دەزانێ لەلایەکی دیکەشەوە، د. عەلی وەردی دەڵێ: (مرۆڤ هەمیشە هەق بۆ لای خۆی رادەکێشێ) چونکە هەق نادرێت بەڵکو وەردەگیرێت، جا لەترسی ئەو هەق نەدانە مرۆڤ پێشتر دەکەوێتە ململانێوە، کەلەمیانەیدا چەند وێنەو رۆڵێك دەبینێ بەمەبەستی سەرکەوتن، بۆ نموونە نووسەری نیورۆسی (عصابی) خۆی لەزۆر وێنەی جیاوازدا دەبینێتەوە، هەندێکجار ئەو وێنانە حەزو ئارەزوون یان هەستن، وابڕواش دەکات ئەوە وێنەی راستەقینەی خۆیەتی لەوانەیە شیعرێك یان پەخشانێك بنووسێ زۆر سادەش بێ، بەڵام خۆی وەك گۆتە یان پووشکین دێتەپێش چاو، هەر رەخنەیەك لەبەرهەمەکەی بگیرێ لای ئەو رەخنەیەکە لە هەستێکی تایبەتەوە سەرچاوەی هەڵگرتووە، ئەمەش ئەگەر هەروا بەردەوام بێت ئەوا دەبێتە بەشێك لەکەسێتی ئەو نووسەرە، ئەمیش لەوێنەی ئەو نوسەرەدا دەردەکەوێ کەخۆی بەخودان قەڵەمێکی بەهێزو بڕشت و هزر دادەنێ، ئومێدێکە ئەو نووسەرە ئارەزوو دەکا وابێ، یان لەوانەیە نووسەرێکی وا

سەرنجی راکێشابێ جۆرە خاسیەتێکی هەبێ، لەراستیدا ئەوە نییە، ئەو وێنەیەش ناواقیعیە، چەند ناواقیعییش بێ ئەمەندە سەرنج و راوبۆچوونی خەڵکی سەبارەت بەخۆی لاپەسەندە، واتە ئارەزوو دەکا کەسانی دیکە باسی بکەن و ئەو کەسانەشی خۆش دەوێ کەباسی دەکەن، ئەم خۆشەویستیەش دەبێتەسەرچاوەی خۆشەویستییەکی نیورۆسی بەسەر ئەدەب و نووسیندا رەنگ دەداتەوە، ئەم جۆرە وێنانە کە ئەو جۆرە نوسەرە خۆی تێدا دەبینێتەوە بەوە جیادەکرێتەوە، کەدیاردەیەکی نەستیە، سەرەڕای ئەو خۆ بەزل زانین و ئەو تڕزلییە ئەو مرۆڤە، یان ئەو نەخۆشە ناشزانێ کە خۆی بەکەسێکی نمونەیی دەزانێ، هەروەها ئاگاشی لەئاکارە ناکۆکەکانی خۆی نییە، هەستێکی وای لادروست دەبێ کە ئەرکێکی زۆری لەسەر شانە، بەڵام هەڵەش دەکات کەئەم ئەرکانە بەهای رەسەن بن، لێرەشدا تەنها مەبەستی خۆهەڵکێشانە، کورد واتەنی (بچمە شارێ کەس نەمناسێ خۆم هەڵبڕم پڕ بەکراسێ) .

ئەگەر مرۆڤ هەموو بایەخێکی بۆ ئەوە بێ خۆی رازی بکا کەئەوە وێنەی خۆیەتی ئەوا ئەو باوەڕەش لەخۆیدا بەرجەستە دەکا کەئەقڵی کارامەیەو خاوەن هزرەو نووسەرێکی چاکە یان سیاسەتمەدارێکی بلیمەتە، ئەگەر هەڵەش بکا ئەو هەڵەیە بەپیرۆز دەزانێ و چەندەها بەڵگەی بێ مانا دێنێتەوە، (نایاب) بوونی مرۆڤیش لەهەر شتێکدا خۆی لەخۆیدا میحنەتە، چونکە دەبێ لەململانێی بەردەوامدا بێ بۆ ئەوەی بۆ خەڵکی بسەلمێنێ کەئەو بەراستی نایابە.

ئەگەر مرۆڤ لەخودی راستەقینەی خۆی وردبێتەوەو لەگەڵ وێنە خەیاڵیەکەیدا بەراوردی بکا ئەوا تێ دەگا لەچ گاڵتە بەخۆکردنێکدایە، ئەو کاتە رەخنەی گاڵتەپێکردن بەخودی خۆی دەکەوێتە پێشەوە، چونکە وێنەی خودی کە لەئەنجامی ئەم لەخۆکەمکردنەوەیە دێتە کایەوە دوور دەبێت لەواقیع، وەك دووری وێنەی خەیاڵی، دەشتوانرێت پێی بوترێ وێنەی گاڵتەجاڕی.

لەکۆتاییدا ئەگەر سەرنج بدەینە ململانێی نێوان وێنەی خەیاڵی و خودی راستەقینە ئەوا هەر شتێك کە ئەو هەستی پێدەکات و هەر شتێك خەڵك تێبینی بکات، پاش ئەوە لەهەوڵێکی بەردەوام پتر نییە بۆ پڕکردنەوەی ئەو کەلێنەو گوشار خستنەسەر خۆی کەبگاتە ئاستی بەرکەماڵی.

لەم کاتانەدا ئەم مرۆڤە وشەی (پێویستە) لەسەر یەك دووبارە دەکاتەوە، پێویستە وام بکردایە، دەبوایە شیعرەکەم وا لێبکردایە، یان وابیرم نەکردایەتەوە....تد.

لەناخی دڵیشەوە بەتەواوی قەناعەتی ساویلکانەی کەسێکی نەرگزی، ئەمیش لەمیانەی ئەو باوەڕەی کە لەتوانایدایە بەرکەماڵ بێت دەردەکەوێ، ئەگەر زۆر هوشیارتر بێ لەگەڵ خۆیدا.

وێنەی خەیاڵی کە کەسێك دەیەوێ سیمایەکی جێگیری دەبێ بەپێچاوانەی وێنە ئەسڵیەکە یان راستەقینەکە، چونکە وێنە راستەقینەکە، کەناجێگیرە بەدوای خەیاڵێکەوەیە بۆ ئەوەی جێگیر بێ، مەبەست لەو وێنە خەیاڵییە ئەوە نییە کە هەوڵ بدا بۆ ئەوەی بیگاتێ، بەڵکو بیرۆکەیەکی جێگیرە لەمێشکیدا دەسوڕێتەوەو دەبێتە رێگرێك لەپێش گەشەکردن، چونکە یان نکوڵی لەبوونی خەوشەکان دەکات، یان دووریان دەخاتەوە، وێنە راستەقینەکانیش سادەو ساکارن، بەڵام وێنە خەیاڵییەکان بەفیزو لووت بەرزن ئەم دیاردەیە زۆر لەمێژە هەستی پێکراوە، لەفەلسەفەی هەموو زەمانێکدا ئاماژەی پێکراوە، فرۆید بۆ یەکەمجار لەتیۆری نەخۆشی نیوروسی ئاماژەی پێکردووە کە بەزۆر زاراوە ناوی بردووە وەك (من)، (نەرگزیزم) (بەرزە من)، ئەم دیاردەیە گرنگیانەی تیۆرەکەی ئەدلەر پێکدێنێن، نەك تەنها فرۆیدو ئەدلەر بایەخیان پێداوە، بەڵکو لەلایەن کەسانی دیکەش وەك فرانس ئەلکساندەر و برنارد کلۆیك...تد بایەخی پێدراوە.

کەواتە بابزانین وەزیفەکانی ئەم دیاردەیە کامانەن؟

وادەردەکەوێ کەپێویستە زیندەگییەکان دابین بکا، هەروەکو چۆن زۆربەی نووسەران بەهەموو شێوەیەك شییان دەکردەوە، هەروەها هەموویان لەسەر یەك خاڵی رێککەوتن، کە ئەم دیاردەیە ناوجەرگەی نەخۆشی نیوروسی پێکدێنێت کە روخانی یان لاوازکردنی زەحمەتە.

فرۆید کەیەکێکە لەوانە هەڵوێستی نەرگزیانەی رەگ داکوتراو بەیەکێك لەکۆسپە مەترسیدارەکانی سەر چارەسەرکردنی شیکردنەوەی دەروونی دادەنێ.

ئەو کەسەی کەلەکۆتاییدا دەبێ بەکەسێکی نیوروسی هەلێکی کەمی لەژێر دەستدایە بۆ رۆنانی باوەڕ بەخۆبوون، ئەویش لەئەنجامی ئەو ئەرکە قورسانەی کە دوچاری بووە.

ئەم جۆرە باوەڕە کەتێیدا ماوەتەوە لەئاکامی پەرەسەندنی نەخۆشیە نیوروسیەکە زیاتر لەنگ دەبێت، چونکە ئەو حاڵەتەی کەناتوانێ وازی لێ بێنێ بۆ بنیاتنانی ئەو باوەڕە شیمانەی وێرانبوونی هەیە، زەحمەتیشە ئەم حاڵەتانە لەکاتێکی کەمدا چاك بکرێنەوە، رەچە نیوروسیەکان دەبنە کۆسپ لەپێش نەخشەدانانی خودی، چونکە ئەو کەسە بەو شێوە نیوروسیە بەرێوە دەچێ نەك خودی خۆی بەرێوەبەرێ، سەرەڕای ئەمانە توانای نەخۆش بۆ رێچکەدانانی

خۆی بەبەردەوامی لاواز دەبێ بەهۆی پشت بەستنی بەکەسانی دیکە، وەك یاخیبونی کوێرانە، یان شەیدای داهێنان و .. بەشێوەیەك کەجیا نەکرێتەوە لەگۆشەگیری، ئەوەش دەبێتەهۆی ئیفلیجبوونی تواناو چالاکی بەهۆی چەپاندنی بەشێکی زۆری وزەو سۆزەکانی، ئەو هەموو فاکتەرانەی سەرەوە دەبنە هۆی ئەوەی کەپەرەسەندنی ئەو حاڵەتە ستەم بێ، لەکۆتاییدا ئەم ململانێیە بنەڕەتییە دەبێتەهۆی کەرتبوونی کەسێتی، لەبەر ئەوە نەخۆش هەستێکی بەهێز دەکات بەتواناو بایەخ، چونکە باوەڕی بەتوانای گشتی خۆی توخمێکی کاریگەر پێکدێنێ لەتوخمەکانی وێنەی خەیاڵی بەشێوەیەك هەمیشە ئەو نەخۆشییە نیورۆسیە هەست بەلاوازی خۆی ناکا لەبۆشاییەکدا، بەڵکو لەجیهانێکی پڕ لەدوژمن دایە کە خۆیان ئامادەکردووە ئەم کابرایە فریو بدەن و گاڵتەی پێبکەن و زیانی پێبگەیەنن، لەبەر ئەم هۆیە هەمیشە بەرهەمەکانی خۆی لەگەڵ بەرهەمی کەسانی دیکە بەراورد دەکا نەك لەبەر ئەم هۆی خۆ بەزل زانین و لووت بەرزیە، بەڵکو لەبەر پێویستی و هەستکردن بەلاوازی و بێ دەسەڵاتی و لەشتێکیش دەگەڕێ هەستێکی وای پێببەخشێ کەبەرهەمەکانی باشترو بەنرختره لەبەرهەمی ئەوانی دیکە.

لێرەدا پرسیارێك خۆی قیت دەکاتەوە کەئایا نووسەر چۆن سەیری ئەو هەڵەو خەوشانەی خۆی دەکات؟!روانینی نوسەر بۆئەو جۆرە خەوشانە پشت بەپەسەندکردن و ڕەتکردنەوەی ناتەواوی خود دەبەستێت.

ئەویش بەگوێرەی بارودۆخی شارستانی و باری ململانێ بنچینەییە زاڵەکە بڕیار دەدات کەئەوە پەسەندە یان نا؟

لەو ململانێیە کەس (جۆر) ی بەزیوو ترس و بێ دەسەڵاتی بەعەیب و عار لەقەڵەم نادا، لەبەر ئەوە هەوڵ دەدا ئەو خەوشانەی بەرهەمەکانی یان کارەکانی لەخۆی و خەڵکانی دیکە بشارێتەوەو بەهەموو شێوەیەکیش پاساوی دەدا، مرۆڤی بێ بەڵگەو بەزیوو بیروڕا دەستدرێژکاریەکانی پاساو دەدا کەدژی یاخیبوەکانی ڕێگایەتی، بەڵام جۆری دەستدرێژکار هەستەکانی خۆی زۆر بەناسکی دێتەپێش چاو کەزۆر لاوازو پەڕپووتە، هەردوو جۆرەکەش ئەوەی واقیع بێ ڕەتی دەکەنەوە تەنها لەبەر ئەوەی بەگوێرەی دڵی خۆیان نییە:

بۆ نموونە کەسی بەزیوو ناچار دەبێ ئەو ڕاستیە ڕەت بکاتەوە کە ئەو کەسێکی خۆشەویست و ڕەسەن و دەست پاك نییە، بەڵام چەشنی دوورە پەرێز نایەوێ لوت بەرزیەکەی واپیشان بدا

کەلەخودی خۆیەوە هەڵقوڵاوەو دەبێ خۆیشی دوورەپەرێز رابگرێ، لەبەر ئەوەی ناتوانێ لەگەڵ خەڵکانی دیکە هەڵسەوکەوت بکا، وەك دەستورێك هەردووکیان رەچە سادیەکان رەت دەکەنەوە، بەم شێوەیە ئەوەی بەخەوش دادەنرێت و رەتدەکرێتەوە ئەوەیە کەناگونجێ لەگەڵ وێنە جێگیرەکە کەهەڵوێستی باو دروستی کردووە لەبەرامبەر خەڵکانی دیکەدا.

دەتوانیین بڵێین فەرمانی بەرگریانەی وێنەی خەیاڵی بونی ململانێکانی رەتدەکاتەوەو لەبەرئەم هۆیە دەبێت ئەم وێنەیە جێگیرو بەرجەستە بێ، چونکە نەخۆش ناتوانێ تۆزقاڵێك راستی بڵێ، کەواتە دەتوانین بڵێین توندی ململانێکان و کەللەرەقی وێنە خەیاڵییەکەدا هەیە.

جگەلەو ئەرکانەی باسمان کرد وێنەی خەیاڵی ئەرکی دیکەشی هەیە ئەویش بەململانێ یبنچینەیەکەییەوە بەستراوەتەوە، کەوێنەیەکە لایەنی ئیجابیشی هەیە نەك تەنها شاردنەوەی نیشانە ناپەسەندەکانی ململانێ کەجۆرێك لەئەفراندنی هونەری دەنوێنێ و تێیدا ناکۆکەکان (تناقچات) لەبەرژەوەندی خۆیاندان لەشێوەی ململانێش لەروخساری ئەو کەسە خۆیان پیشان نادەن، بۆ نموونە کەسێك نیشانەیەکی خۆسەپێنی تێدا دەردەکەوێ ئەویش بەزینە کەپێویستی بەهێزیش هەیە لەپێناو بەزەیی و چاکەخوازی و هەروەها خۆشەویست و بەخشندە بێ، گۆشەگیریش بەپلەی دووەم دێن لەگرنگیدا سەرەڕای حەز لەتێکەڵبوونی خەڵکانی دیکەو دووپاتکردنەوەی سەربەخۆیی و ترس لەپابەندبوون و هەستکردن بە رکوکینە، هەروەکو نزیکبوونەوەی نێوان گۆشەگیری و پێویستی میهرو سۆزی مرۆیی سەرەڕای خولقاندنی شڵەژان و دڵەراوکێی بەردەوام لەگەڵ ژیاندا، ئەنگێزە دەستدرێژکاریەکانیشی لەخۆ سەپاندن و زەوتکردن و لێ نەبوردن دەردەکەون، بێگومان ئەم مەیلە دەست درێژکارییانە هەلێکی گەورەی ئامادەباشی بۆ خۆشەویستی و رووخۆشی زەوتکردووەو لەگەڵ ئەمەشدا رووبەرووی گۆشەگیرییەکەی دەبێتەوە.

بێ ئەوەی ئاگاداری ئەم پاڵنەرانە بێ وێنەیەکی خەیاڵی هیچوپووچی سەبارەت بە خۆی لادروست دەبێت وەك : ئەو کەسێکی خۆشەویستە، هاوڕێیەکی مەزنە، ماقوڵیش نییە هیچ ئافرەتێك غەیری ئەو کەسی دیکەی خۆش بوێ ...تد.)

هیچ کەسێکیش نییە وەك ئەو بێت لەرووی بەزەیی و سۆزو خێرخوازی، ئەو سەرکردەی لێهتاووە لەکاتی خۆیداو سیاستەمەدارێکی بلیمەت و رۆمان نوسێکی سەرسوڕێنەرەو

داهێنەرەو هەزار حیسابی بۆ دەکرێ، پاشان ئەو فەیلەسوفێکی مەزنەو پیاوی دانایەو یەکێکە لەمرۆڤە دەگمەنەکان.

وێنەی خەیاڵی لەوانەیە پێی بوترێ خودی خەیاڵی یان خود فریودەر، بەڵام ئەمە تەنها نیوەی راستیەکە دەگەیەنێ، ئایا لێرەوە وێڵ و سەرگەردان دەبێ، بیرۆکەکانی خۆزگەخوازی لەگەڵیدا دەژی لەراستیدا سەرنج رادەکێشێ بەتایبەتی لەبەر ئەوەی لەگەڵ کەسانێك روودەدات کەلەلایەکی دیکەن و لەواقیعێکی تاڵدا دەژین، بەڵام ئەمە خەیاڵێکی تەواونییە، ئەو کەسە مەخلوقێکی خەیاڵی نییە، فاکتەرە واقیعیەکان رستوونی، هەروەها لەراستیشدا پاشماوەی کەسە رەسەنەکانیش دەگرێتەوە، لەکاتێکدا دەسکەوتە گەوەرکان خەیاڵین، ئەو کاتە توانستە شاراوەکانی ژێرەوەی زۆرجار راست دەردەچن، ئەوەی زیاتر پەیوەندی بەمەسەلەکەوە هەبێ، ئەوەیە کە لەپێویستیە ناوەوەییە راستەقینەکان دێتەکایەوە، ئەمژی فەرمانە راستەقینەکان بەجێ دێنێ و کاریگەرییەکی بەهێزی راستەقینەی بەسەر داهێنەرەکەیەوە دەبێ، لەمیانەی گەڕان بەدوای نیشانەتایبەتیەکانی دەتوانین بگەینە ئەنجامێکی ورد سەبارەت بە بونیادی کەسایەتی کردەیی بۆ کەسە دیاریکراوەکە، بەڵام وێنەی خەیاڵی بەنیسبەت کەسی نیورۆسیەوە بەهایەکی واقیعیی هەیە بەچاو پۆشین لەبڕی ئەو خەیاڵەی کەتێیدا دروست بووە، چەند رەگ داکوتراوو بێ ئەمەندە وێنەی خەیاڵی خودی بۆ دەردەکەوێ لەکاتێکدا خودی راستەقینەی دەشارێتەوە، هەڵگەڕانەوەی وێنەی راستەقینەی سەرەوخوار حەتمەن بەهۆی سروشتی ئەرکەکانی خۆیانەوە کە وێنەکەی لێ دەکەوێتەوە روو دەدات، هەر فەرمانێك هەوڵی سڕینەوەی نیشانە کردەییەکانی کەسایەتی دەدات و پاش چاو پێخشاندنەوە بەژییاننامەی زۆر لە نەخۆشەکان تا ئێستاش وابڕوا دەکرێ بنیاتنانەوەی رزگاربوونی ژیانە بەهەمو مانایەك، لەبەرئەوەی ئەو بەرگرییەیە کەنەخۆش تەبەنای دەکات ئەگەر چی هێرشیشی بکرێتە سەر، ئەوا پاساوی خۆی هەیە، یان بەلایەنی کەمەوە لۆژییکییە، چونکە هەرچەندە وێنەکەی راست و درووست بێ ئەوا دەتوانێ هەست بەگرنگی و سەرکەوتن و هاو ئاوازی بکات، سەرەڕای سروشتی فریودەرانەی ئەو هەستانەی، لەم کاتەدا لەتوانایدایە خۆی بەسەر پشك دابنێ کەهەموو جۆرە فەرمان و بڕو بیانوو لەسەر ئەساسی ئەو سەرکەوتنە بانگەشەدراوەی پێشکەش بکات.

بەڵام ئەگەر بوار درا وێنەکە بقۆزێتەوە ئەوا رەنگە هەرەشەی رووبەرووبونەوەی هەرلاوازییەك لەخۆیدا لێ بکرێ بێ ئەوەی هەقی هەبێ پەڵپی هیچ شتێکی تایبەتە بگرێ، بەوەی کەکەسێکی بێ نرخە تەنانەت لەدیدی خۆشیەوە، ترسێکی وا گەورەش لەمێشکێدا دەخولێتەوە کەهەر ئێستا پارچە پارچە دەکرێ، بەڵام ئەم کارە لەوانەیە هەلێکی پێ ببەخشێ کەدەبێتە بونەوەرێکی زۆر باشترو نرخی تایبەتی خۆی هەیەو بەنرختریشە لەوێنە خەیاڵییەکەی، بەڵام ئەم هەستە نوێیە مانایەك نابەخشێ تادەربازی بێ لەو تاریکیەی لێی دەترسێ، هەر لێ پرسینەوەیەك یان هەر رەخنەیەکی دەرەکی یان هەر چاوێك بەدوای شکست هێنانیەوە بێ لەبەرزکردنەوەی ئاستی وێنەکەی، لەوانەیە وای لێبکات بتەقێتەوە یان بڕوخێت.

کەواتە پێویستە ژیانی خۆی رێك بخات بۆ ئەوەی دووچاری ئەم جۆرە مەترسییانە نەبێتەوەو پێویستە حاشا لەو بارودۆخە بکات کەسەرنجی رادەکێشێ و سیمای خۆی تیانیەو دوور بکەوێتەوە لەو کاروبارانەی کەبڕوای نیە سەری لێ دەرچێ لەکۆتاییدا، هەچەندە وێنە خەیاڵیەکەی بەمەبەستی نەهێشتنی ململانێ بنچینەیەکە هاتۆتە ئاراوە، تارادەیەك سەردەکەوێ، بەڵام لەهەمان کاتدا کەرتبونێکی نوێ لەکەسایەتی دروست دەکات لەکەرتبوونە ئەسڵییەکە ترسناکترە، بەشێوەیەکی گشتی، مرۆڤ وێنەی خەیاڵی بۆ خۆی دروست دەکات، چونکە ناتوانێ واقیعیانە بژێت، وێنەکە وەك دەردەکەوێ دژی ئەم کارەساتە دەوەستێ، بەڵام بەهۆی تێڕوانینی بۆ خۆی لەسەر بنچینەیەکی دیاریکراو تارادەیەك نەبێ ناتوانێ خۆی رابگرێ، کەوا لەژێر فشاری داواکارییە تایبەتیەکانی کەبۆی نایەتەدی شۆڕشێکی گەورە دەکات.

پاشان لەنێوان خودپەرستی و قێز لەخۆکردنەوە دەسوڕێتەوە، واتە بێ ئەوەی بتوانێ جێگیر بێ!.

بەم شێوەیە ململانێی نێوان هەوڵە چەوساندنەوەییە ناکۆکەکان لەلایەك و نێوان جۆرێك لەدیکتاتۆریەتی خودی سەپێنراو بەهۆی شڵەژانی ناوەوەی لەلایەکی دیکەوە دەخولقێت.

بەرپەرچدانەوەش لەدژی ئەم دیکتاتۆریەتە خودییە هەروەك بەرپەرچدانەوەی کەسێکە دژی دیکتاتۆریەتی سیاسی، لەوانەشە پەیوەندی لەگەڵدا پەیدا بکات، واتە هەست بکات ئەو کەسێکی نایابەو نموونەییەو بەدڵی دیکتاتۆرەو لەسەر پەنجەکانی دەوەستێ بۆئەوەی لەئاستی پێویستیەکانی ئەو دیکتاتۆرەدا بێ، یان یاخیبوونی رابگەیەنێ دژی رکوکینە، دانیش نەنێت

بەو پابەندیەی کەبەزۆر بەسەریدا سەپێنراوە، ئەم جۆرە کەسانە زۆرن تێیاندا هەیە خۆی بەبەرکەمالْ دەزانێ و لەپۆلی منی بالآدایە تێشیاندا هەیە گوێ بەهیچ کەسێك نادات و مەیلی هەڵچوون دەکات و ملهوڕە، جۆری (بەگوڕ) شۆرشگێڕیش هەیە کەوا بڕوا دەکات ئازادەو لەژێر باری بەها سەپێنراوەکان دەناڵێنێ و ئێستا دەیەوێ بیڕوخێنێ، هەرچەندە هێشتا دیلی وێنە خەیاڵیەکەیەتی .

هەندێکجار مرۆڤ راڕایە لەقۆناغێکدا وەك ئەوەی کەوتبێتە نێوان دوو جەمسەری دژ بەیەکەوە، هەندێکجار دەیەوێ کەسێکی خێرخواز بێ هەندێکجاریش بەپێچەوانەوە، یان بیەوێ لەخود پەرستیەوە بچێتەقۆناغی بەرکەماڵی ئەم جۆرەهەولآنە لەکۆتاییدا شکیست دێنێ، بەلآم هەوڵێکە بۆ دەربازبوون لەتەڵەزگەیەکی بێ کۆتا، دژوارترین هۆکاریش بەکاردێنێ ئەگەر یەکێکیان شکستی هێنا ئەوا پەنا بۆ ئەوەی دی دەبات.

ئەم ئاکامانە هەموویان لەدواییدا یەکدەگرنەوە بۆ دروستکردنی پەرژینێکی بەهێز دژی ئەو رێڕەوە راستە کەئەو کەسە دەیەوێ بیگرێتەبەر، لەتوانای کەسێکیشدا نییە پەنجەی پەشیمانی بگەزێ سەبارەت بەهەڵەکان، چونکە هەست بەهەڵەکانی ناکات.

## نەخۆشیەکانی نووسەر:

**نوسەری دەماری لەنوسینەکانیەوە هێمای وا بەکاردێنێ کوتومت هێمای تراژیدییای خودی خۆیەتی بێ ئەوەی هەستی پێبکات.**

ئەریك فرۆم شرۆڤەکارانی دەرونی رادەسپێرێ کە پێوسستە مرۆڤ هەندێ دەق ئەدەبی وەکو شاکارەکانی بلزاك و دوستویفسکی و کافکا بخوێنێتەوە، کەتێڕامانی قوڵی مرۆڤی تێدایە کەلەکتێبەکانی شیکردنەوەی دەرونیدا نییە، چونکە ئەوەی شاعیران و رۆماننوسان دەیزانن هەروەکو فرۆید دەڵێ زانست هەرگیز پێی نەگەیشتووە بۆیە فرۆید وتویێتی ئەوان شێخی ئێمەن، لەگەڵ ئەوەشدا نووسین رەنگدانەوەی باری دەروونی نووسەر خۆیەتی و رەنگە ئەوەش پەیوەندی بەلایەنی نەخۆشییە دەمارییەکانی نووسەرەوە بێت، ئەگەر لەرووی دەرونیەوە مرۆڤ (نوسەر) شیبکەینەوە دەکرێت بڵێین مرۆڤ یا نوسەر گیرۆدەی خەوو خەیاڵە ئەفسونەناویەکانێتی کە لەواقیعدا بۆی نایەتەدی، ئەگەرچی ئەم خەوو خەیاڵانەش بەرەو پێشەوە بێ یان بەرەو دواوە باری هەڵچوونی مرۆڤ پێکدێنێ بەهەڵچوونە ئەرێیەکان وەکو خۆشەویستی، کاتێك ئەم خۆشەویستیە دەبێتە پەردەیەك بۆ نەدیتنی لایەنە نەرێیەکانی بەرهەمی کەسێکی خۆشەویسیت کەدەبێتــە بابەتی رەخنە، هەروەها هەڵچوونە نەرێیەکانیش وەکو رکوکینەو تورەیی، کاتیك ئەم رکوتورەییە دەبێتە پەردەیەك بۆ نەدیتنی لایەنە ئیجابیەکانی بەرهەمی

کەسی رەخنەلێگیراو، واتە رەخنەیەك لەمەنتیقەوە دوور بێ ئەوەی رەخنەگر یا نووسەر هەستی پێبکات لەبەر ئەستوری پەردەی رکو تورەیی یان حەزو خۆشەویستی، بێگومان ئەم هەڵچوونە ئیجابی و سلبیانە بەشێکی گەورەی ژیاننامەی نەستی مرۆڤ پێکدێنن و رۆڵێکی باڵا دەبینن لەدیاریکردنی رێڕەوو بۆچوونەکانی مرۆڤ سەبارەت بە ژیان و دیدو بۆچوونەکانی هەر لەم راوانگەیەشەوە لەگەڵ رەگەزەکانی ژیان یان دەوروبەر رەفتار دەکەن... بێگومان نوسەریش کەسێکە لەخەوخەیاڵێکی تایبەتەوە کەکۆمەڵێك بارو هۆکار دروستی دەکات لەنگەر دەگرێت بۆ تیشکە خستنە سەر روداوەکانی ژیان و هەڵسەنگاندنیان، یان بەروانگەی ئەو ژینگە سایکۆلۆژیەی کە مرۆڤ بەحەزو ئارەزووی خۆی بۆ خۆی وێنای دەکات، یان لەروانگەی ئەو ژینگە واقیعیەی کەهەیە بێ ئەوەی نووسەر بتوانێ بیگۆڕێت یان ئەم دوو ژینگەیە پێکەوە یان هەر یەکەیان بەجیا کەلای مرۆڤ درووست دەبێت و حوکمیان لەسەر بیروبۆچوون و هەڵسوکەوتی نووسەر کەم تازۆر هەیە... نووسەریش کەسێکە وەکو خەڵکیتر تووشی ئەو دەردانە لەژیانی رۆژانەی خەڵکانی عەوامیش بەشێوەیەك یان ئەوی دیکە دەردەکەوێت بەڵام بەبەرجەستەیی نابینرێت وەکو لەونوسەردا دەبینرێت ئەویش لەکلاورۆژنەی نوسینەکانیەوە بەپێی بارودۆخی دەوربەر و خێزان و چەندێتی ئاسایش و دڵنیایی و رادەی بێبەشبوون و چەوسانەوەو دەردەسەری و نائومێدی کەلەسەرەتاکانی تەمەندا تووشی دەبێت دەردەکەوێت.

نووسەری توش بوو بەحاڵەتە دەماریەکان (الحالات العصابیە) لەهەستکردن بەچەوسانەوە دەژین، هەستیارە بەرامبەر سادەترین دەردو حاڵەتە وروژێنەرەکان، کاتێك نووسەری دەماری یان توشبوو بەو حاڵەتە، دەبینین وێنەی تێڕوانینی خۆی لەسەر رووداوێك دەردەخات یان بیەوێت وێنەی راستی رووداوێك بکات تراژیدیای نوسینەکەی وەکو گەیەنەرێك بۆ نەوەکانی داهاتووی لەرێی وێنەکردنی ئەو رووداوە حەشار دەدات.

مرۆڤ مێژوو نانوسێتەوە لەپێناو زانست بۆ زانست، بەڵکو بۆئەوەی دەنوسێتەوە کەکار لەدەوروبەرو ئەو خەڵکانەی مەبەستی نوسەرن بکات، ئەویش بۆ پیشاندانی ئەو دیاردەو رووداوانە کەئەم مەبەستێتی، چونکە یادە هەستەوەریەکانی کەسێك کەبەندە بە ژییاننامەی خۆیەوە دەکرێت بەراورد بکرێت بەمێژوونامەیەك، هەروەها ئەو یادەوەرییەی تەمەنی منداڵی لەرەگوریشەوەو دروست نادروستی بەرابەر دەکرێتەوە لەگەڵ مێژووی سەرەتایی میللەتێك کەلەئایندەدا دەنوسرێتەوە.

ترسناکترین دیاردەش لەروداوێك یان نوسینێك چاوەڕوان بکرێ لەسەر بابەتێك یان بەرهەمی نوسەری دەماری یان هەڵگری سەروسیمای کەسایەتیەکی دەماری سمبولییە لەزاراوەو ناوەرۆکی رستەکاندا (سیمبول ) وەکو ئامێرێکی سایکۆلۆژی وایە رەنگە ببێتە هۆی گواستنەوەی چالاکی یان وزەو هەمو دیاردەیەکی سایکۆلۆژی یان نیشانەکانی کەسێتی نەخۆش دەبێتە سیمبول (هێما) ەکە، گریمان ئەم سیمبولە مانای شتێك لەخۆی گەورەتر دەگەیەنێت، واتە هێشتا شتێکی شاراوەو نەزانراوە بەتایبەتیش کاتێك جەستەی مرۆڤ خۆی لەخۆیدا ئامێرێکە دەبێتە هۆی گواستنەوەی چالاکی، هەروەها رۆشنبیرییش ئامێرێکی ئاوازییانە دروست دەکات واتە سیمبولێك بۆ گواستنەوەی چالاکییە غەریزەیەکان وەکو (لیبیدۆlibido —وزەی سێکسی شاراوە) بەشێوەی هێماو هێماگەری شتێکی نوێ نیەو شێوازێکە هەر لەسەر هەڵدانی مرۆڤەوە هەبووەو تا ئێستاش کاری خۆی هەیە، بەڵام زیاتر هێماگەری لەکۆمەڵگایەکی داخراوی وەکو کۆمەڵگای کوردەواری کەبەربەستێکی گەورە لەنێوان ئاگاو بێ ئاگایی بەرجەستەیەو درکاندنی هەر کێشەیەکی دەرونی لەنەستەوە شتێکی ئەستەمە، ئەویش لەبەر پەسەندی و ناپەسەندی کۆمەڵایەتی ئەو کێشەیە کەهیچ کەسێك دان بەسلبیاتی خۆیدا نانێت و ناچار دەبێت فێڵێك بەکار بێنێ بۆ گوزارشتکردن لەدەردەکانی و کەسانی دەوروبەریش پێی نەزانن ئەمیش بەهێما گوزارشت لەخۆی دەکات، واتە نایەوێ بەئاشکرا ناخی خۆی دەربخات یان ئەم گوزارشتە کپ دەکاتەوەو پاش سەردەمێکی تر بەشێوەیەکی ناڕاستەوخۆ و لەسەر شێوەی هێما دەری دەبڕێت، رەنگە خۆیشی نەزانێ ئەم هێمایە گوزارشت لەو شتە کپبوانەی رۆژانی رابردووی دەکات.

نوسەری دەماری لەنوسینەکانیەوە هێمای وا بەکاردێنێ کوتومت هێمای تراژیدییای خودی خۆیەتی بێ ئەوەی هەستی پێبکات، کاتێك حەز دەکات خێڵەکەی یان حزبەکەی رۆڵی سەرکەوتن لەنوسینەکەدا یان روداوەکە بنوێنێ چونکە کەسایەتی بزربوی خۆی کە رۆژێك لەرۆژان نەیتوانیوە گوزارشت لەخۆی بکات لەکەسایەتی ئەکتەرەکانی ناو رووداوەکە بەرجەستە دەکات یان لاسایی باوکی بکاتەوە کەرۆڵی سێکسی و ئابوری بەو دراوە کەدەسەڵاتدارە لەناوخێزان و خێڵەکەشیدا، ئەم حەزو بەسەرکەوتن و گرێیانە دەبێتە حەیاڵێك لەنەستیدا کەبەئەندێشە دەمار (neurotic fiction) ناودەبرێت، کەلەلایەن زانای دەرونی (ئەدلەر) هەوەداهێنراوە مەبەستیشی (خەیاڵێکە کەلەواقیعدا نایەتەدی یان زۆر دوورە لەبەدیهێنانی و

خاوەنەکەشی بەدوای ئامانجە منایەتیە ناواقیعیەکاندا دەگەڕێت)، نووسەر ناچار دەبێ ئەو کەسایەتیە لەنوسینەکانیدا بەرجەستە بکات یان رووداوێك بخولقێنێت کەئاهێکی وەبەردا بێتەوە لەبری ئەو حەسرەت و ئارەزوە بەدی نەهاتوانەی ژیانی واقیعی، یان پاڵەوانی رووداوەکە ببێتە هێمایەك کەسایەتی خۆی تێدا بەدی بکات بەتایبەتی بەهێماکردنی ئەو گرێ دەماریەی یان ئەو دەردەی کەتوشی بووە، لەم سۆنگەیەوە نووسەر لەدەرەوەی خوێندنەوەی رووداوەکە بەئاشکرا تووشی نوشوستی دەبێت چونکە دەسەڵاتی هێماگەرێتی لەرووداوەکان و بەهێماکردنی چەوسانەوە لەویژدانی زاڵترە لەو جێگیربوون و بێ دەنگی و کپبوونە کەلەسەرو سیمای دەردەکەوێت.

نەرگزیزم حاڵەتێکە کە نوسەر توشی دەبێت و لەنوسینەکانیدا رەنگ دەداتەوە بێ ئەوەی دانی پێدا بنێت بەڵکو هەندێکجاریش هەستی پێ ناکات لەبەر گرێ کۆنەی خۆشەویستی یان گرێ کۆنەی رکو تورەیی، نەرگزیزم بریتیە لەخود خۆشویستن یان زیادەڕۆیی لەو خۆشەویستیە، لەشیکارە دەروونی قۆناغێکی سەرەتاییە لەقۆناغەکانی گەشەی دەروونی، ئەویش لەزیاد بایەخ پێدان و کەم بایەخدان بە خەڵکانی دیکە دەردەکەوێت، بەڵام نەرگزیزم لەگەڵ تاکدا بەردەوام دەبێت هەرچەندە ئەگەر ئەو قۆناغەشی بڕیبێت چونکە تیایدا چەکەرەی کردووە، واتە کاروفرمانی لەسەر ئەو مرۆڤە کەم تازۆر دەمێنێن بەو پێیە مرۆڤ خۆشەویستیەکی نەخۆش ئامێز بەخۆی دەبەخشێ کەکار لەجەستەو هزروبیروباوەڕی دەکات و توشی ترازانی سێکسی دەکات ئەمیش ئاکامی سلبی لەکەسێتی دەنەخشێنێ و لەکارەکانی رۆژانەیدا رەنگ دەداتەوە بەتایبەتیش لەکاری نوسیندا.

نووسەر کەوەسفی رووداوێك دەکات شتێك نابینێ ئەگەر خودی خۆی نەنوێنێ و مەیلەکانی تێدا بەرجەستە نەبێ، پاشان هەر رووداوێك لەسروشت و بۆچوونەکانی نووسەر جیاوازی هەیە لە لەگەڵ مەیلە نەرگزی وپێویستیە تایبەتەکانی، لەرووداوێکی ساکاردا نەك هەر وەلای دەنێت بەڵکو بەشێوەیەکیش دەستدرێژی لێدەکات تارادەیەك بەشەڕخوازیش تاوانباری دەکات لەسەر مافەکانی و ئازادی لێ سەندنەوەی لەژیاندا.

بۆ ئەوەی تێکستەکانی رووداوێك یان نووسینێك بەشێوەیەکی راستەقینە بخەینەگەڕ پێویستە دادگایی توشبوونی نەرگزیزم لەنوسین خۆی بکەین و ئەگەر گەیشتینە راستی ئەو توشبوونەوەی ئەوا ئێمە بڕوامان نییە بەتوانای وێناکردنی رووداوەکە لەلایەن ئەو نوسەرەوە

چونکە تواناى نەرگزیزم توانایەکى هەڵقوڵاوى ناخى مرۆڤە، بایەخ بەتێربوونى خودى پێویستیەکانى ئەدان نەك بەپێویستى خەڵك و دەوروپشت سەبارەت بەو رودواە چونکە خۆبەزلزانینێك یان رالەخۆبوونێك لەلایەن نوسەرەوە بۆشاییەکى گەورە بەجێدێڵێ کەهەرگیز بەپێدا هەڵدان و بەخۆ بەراوردکردن لەگەڵ خەڵکیدا پڕنابێتەوە، ئەم جۆرە کەسانەش چاوەڕیی خۆشەویستى و رالێبوونى خەڵکییە بەرامبەر سیمایەکى هیچ و پووچ کەئەو کەسە بەخەیاڵ لەخۆیدا دەیبینێ و ئەو خۆشەویتسیە نییە کەداواى دەکات ئەمەیش دەبێتەهۆى دوورکەوتنەوەى لەخەڵکى و واى لێدێت کەنەخودى خۆى خۆش بوێت نەخەڵکى تر بەجارێك هەڵسوکەوتى دەبێتە کۆمەڵێك رەخنە لەخودى کەسانى دیکە نەك ئەدەبەکەیان، بەڵام ئەدەب وەکو گۆڕەپانێك بۆ پلارتێگرتن و رەخنە لێگرتن بەکاردێنێت.

هەورەها حاڵەتى سادیزم (sadism) کە یەکێکە لەو حاڵەتانەى کار لەنوسەر دەکات و حومکى بەسەردا ئەدات و لەنوسینەکانیدا رەنگ دەداتەوە...ئەم حاڵەتە چێژوەرگرتنێکى شێتانەیە لەئازاردانى خەڵکانى دیکە و شێواندنى مەیلە بنەڕەتیەکانى کە لەبوونى مرۆڤدایە.

ئەگەر نوسەر بەرهەمەکەى بۆکارى مێژوونووسى روداوێك بخاتەگەڕو خۆیشى نوسەرێکى سادیخواز بێت لەمەیل و بۆچوونەکانى ئەوا ئاوڕ ناداتەوە تەنها بۆ ئەو رووداوو بابەتانە نەبێت کەمەیلە سادیەکانى تێر دەکات و لەگەڵ ئەو نوسینانەى کەرەنگدانەوەى کەسێکى سادیست تیا دەردەکەوێ، هەروەها گوێ ناداتە یاساو داب و نەریتە شارستانیەکان بۆ ئەو کەسانەى کەدەبنە پاڵەوانى روداوەکەو پشتگوێخستنى هەڵەى مێژوویى کەپێویستە سەرزەنشت بکرێ، هەروەها نابێ تۆڵەو شەڕو وێرانکردن و تاوان بەداستانێك وێنا بکات کەپاڵەوانێتى و قوربانیدان و توانستى مرۆڤایەتى لەو بەد رەفتاریە پاساو بکات.

نوسەرى سادیخواز هەڵوێستە مرۆڤایەتى و هزریەکان لەگەڵ هاودژەکانیان و بڵاوبوونەوەیان و توانستى بڵاوبوونەوەى دووریانى فیکرى بەسەرگەوتنى شەرمەزارى و خاوبوونەوە لەروداوەکان دەبینێ، نەك لەبەر ئەوەى روداوەکە یان رەنگو رووى روداوەکە ناتوانێت رووداوى ژیارى بخولقێنێ بەڵکو لەبەر ئەوەیە چونکە سەروسیمایەکى سادیانەى تێدا دیارە وەکو دەردێکى دەروونى رێگەى راست ببینێ هەموو روداوەکانى ناداتێ، پاشان ئەم دەردە دەبێتە کۆسپێك لەبەردەم راستر وێناکردنى خەمە راستەقینەکانى رووداوەکەو زیاتر پشتگیریکردنى

خەمەکانی خۆی کە لە ڕەگوڕیشەی سایکۆلۆژییانەی خۆیەوە درووست بووە، ئەم شێوازەش لەفەرهەنگی نوسیندا هەڵەیەکی کوشندەیە.

بەگوێرەی دابەشکردنەکەی ئەریك فرۆم بۆ کەسایەتی سادیزم هەموو کەسێك (نوسەرێك) کەم نا زۆر بەشێك لەسیفاتی کەسایەتی سادیخوازی تێدا بەدی دەکرێ، هەندێکیان حەزدەکەن خەڵکی ئازار بچێژێ یان ڕەخنەیان لێ بگیرێ هیچ نەبێ لەو ڕەخنە گرتنە تای تەرازووەکە لەقازانجیدا دەبێت (واتە لەقازانجی کەسی سادیستدا دەبێ ) خۆ ئەگەر بۆی بڕەخسێ ئەوا خۆی هەڵدەستێ بەکاری ڕەخنەگرتنەکە، مرۆڤ واهەست دەکات کەسی ڕەخنەگر بەهێزو خاوەن توانست و سەربەخۆییە، بەڵام لەراستیدا کەسی سادیست لاوازو بێ دەسەڵاتە، ئەو بێ دەسەڵاتیەش لەدەست بەسەرداگرتنی کەسێکی ترو ریسواکردنی ئەو کەسە قەرەبوو دەکات، بەبێ ئەم کارە واتە بێ ئازاردان و ڕەخنەگرتن لەکەسانی تر ئەو کەسە (ڕەخنەگر) هەست بەنامۆبوون و گۆشەگیری دەکات، هەروەها کەسی سادیست هەیە حەز دەکات خەڵکی پشتی پێ ببەستن یان دەسەڵاتی ڕەهاو بێ کۆت و بەندی هەبێت و خەڵکی لەژێر دەستیدا بن، هەروەها شێوازێکی تری ئەم کەسایەتیە بەپێی دابەشکردنەکەی ئەریك فرۆم هەوڵدانە بۆ دەست بەسەرداگرتنی جەستەیی و ڕۆحی و هەندێکجاریش زەوتکردنی سۆزو عەقڵی کەسانی دیکە، بۆ ئەوەی مرۆڤی تووشبوو بەم دەردانە زیاتر خۆی بەرجەستە بکات هەوڵ دەدات ئارەزووەکانیشی بەرجەستە بێت ئەمەش زیاتر لەنوسین و کاری ڕەخنەگرانە دەچەسپێ و حەز دەکات بکەوێتە ململانێیەکی بێ کۆتاشەوە، بەلاشیەوە گرنگ نییە سەردەکەوێ یان ژێر دەکەوێ بەڵکو گرنگ ئەوەیە، کورد واتەنی (تا گوێزێکی مابێ گوێز گوێزان بکات)، ئەگەر چی ئەو گوێزەش بدوۆڕێنێ، هەندێکجاریش بۆ ئەوەی شیرین نەبێت و بخورێ بەپێویستی دەزانێ دڕکی هەبێ و بچێتە گیانی خەڵکانی دیکە لەکاتێکیشدا ئەم دڕك دارییە پێویست نییە، ئەم جۆرە کەسانە هەمیشە مرۆڤی نامۆو ڕەشبینن، هەوەرکو فرۆم دەڵێ سەروسیمای ئەم دەردانە لەمپەرن لەبەردەم پێشکەوتن و توانستی مرۆڤ و داماڵینی لەبەختەوەری و هەورەها نائومێدبوونی، لای فرۆم ئەم جۆرە کارانە هەوڵدانێکە بۆ ڕزگاربوون لەکەسی ڕکابەر یان کێشەیەك بۆ ئەوەی ملکەچی بکات یان گوێڕایەڵی بێ و بیهێنێتە ژێر بار ئەمیش مانای وایە بەڕەخنەگرتن یان هێرشکردنە سەر ئەدەبەکەی کەسی دووەم دێنێتە پایەیەك کەلەخوارەوەی خۆیەوە بێ.

هەوەرها فرۆم دەڵێ رووخانی جیهان دوا هەوڵ و تێکۆشانی کەسی رووخێنەر کە رەخەنەگرە لێرەدا هەڵدەستێ بەرووخانی جیهان بۆ ئەوەی جیهان بەسەریدا نەڕوخێ .

فرۆم دوو جۆر رووخان دیاری دەکات، رووخانی مەنتیقی و رووخانی نامەنتیقی، هەرچی رووخانی مەنتیقیە ئەوەیە کەلەپێشدا باسمانکرد، بەڵام مەیلی رووخان هەیە کەلەئەنجامی حاڵەتێکەوە سەر هەڵدەدات، وەکو بەرپەرچدانەوەی هێرشەکانی دەرەوە بۆ سەر ئەو کەسەو ژیان و کەرامەت و بیروباوەڕی ئەمیش شتێکی ئاساییە (فرۆم) یش بەروخانی مەنتیفی ناوی دەبات.

لەوانەشە نوسەر سیفاتی کەسایەتی ماسۆشیزم (masochism) ی تیا بەرەجەستە بووبێ بەپێچەوانەی کەسایەتی سادیزمەوە، کەسی ماسۆشی تاموچێژ لەو ئازارە وەردەگرێ کەلەلایەن کەسانی ترەوە دەیکاتێ و لەنوسینەکانیشیدا کەسایەتی وابەرجەستە دەکات کەنەخۆشیەکەی تیا بەرجەستەبکات و هەروەها ئەو رووداوانەی کە ویژدانە کۆمەڵایەتیەکەی ئازار دەدات دەست نیشان دەکات لەگەڵ دەرخستنی ئەو شێوازانە کەهەڵدەستێ بەچەوسانەوەی توێژە کۆمەڵایەتیەکان کەوێنەی جوان بۆ نوسەر یان وێژەوان دروست دەکات چونکە لەو شێوازەدا تاموچێژی ئەو ئازارانەی ئاراستەی دەکرێ لەحاڵەتی ئاساییدا بۆی نایەتە دی مەگەر تەنها بەچێژوەرگرتنی ئەو سزایەی کەکەسی رکابەر یان بابەتەکە بەنووسەری دەگەیەنێت، بەپێی ئەم شێوازە نەخۆش ئاسایە توخمەکانی چەوسانەوەو توندوتیژی کە سەرکردەکانی مێژوو لەسەر رۆڵەکانیان دەیسەپێنن هۆیەکانی تاموچێژ وەرگرتن دەبینێ چونکە پێویستی بەملکەچکردنی بۆ رووداوەکان و توندوتیژی و شڵەژان و خوێن رشتن و بەندیخانەکان تێر دەبێت، ئەم نوسەرە ئەو بیرەوەرییانە بەشێوەیەك باس دەکات کەپێویستی زەرورین (ئەویش بەنیسبەت خۆیەوە نەك بەنیسبەت خەڵکەوە) بەوێنەی وێژەی جوان وێنەی دەکات و بۆن و بەرامەو خەیاڵێکی وای دەداتێ کەپەسەند بێ، لای خەڵکی و نەوەکانی هەرچەندە تفتوتاڵیش بێ، ئەمیش لە دەردانە بەدی دەکەین رەنگە نوسەر لەکاتی نووسینی مێژووی ئەدەبەکەی بۆ روداوەکانی ببێتە قوربانی لەرووی سایکۆلۆرژیاوە، ئەم بەقوربانی بونەش لەپێناو ساغکردنەوەی بابەتەکە نییە بەڵکو جۆرێکە لەخۆئازاردان کەبەگیانی نووسەر خۆشە، لەگەڵ ئەمەشدا ناکرێ ناوەڕۆکی هزری و ئاوەزی و کەلتوری لای نووسەر وەلابنرێت چونکە نووسەر بێ پشت بەستن بەعەقڵ و مەنتیق وێنایەکی ویژدانی شرۆپرە پێویستی بەتەونکەرێکە کەبتوانێ ریشاڵە هزرییە ئاوەزیەکان بهۆنێتەوە، ئەو تەونەش بەتێڕوانینی بابەتیانەیە بۆ مەسەلەکان ئەگەر ئازاریشی بدات.

لێرەدا بۆمان دەردەکەوێ کەسیفاتەکانی هەردوو کەسێتی سادی و ماسۆشی پڕ بەپێستی یەکترن، واتە یەکتر تەواو دەکەن، هەریەکەشیان بەشێوەیەکی نەستیانە پێویتسی بەوی دیکە هەیە بەتایبەتیش کاتێك کەسی رەخنەگر کەسێکی سادیست بێت و رەخنە لێگیراویش کەسێکی ماسۆشیست بێ، ئەوا هەردو کەسایەتیەکە لەنەستەوە بەیەکتر شاد دەبن بێ ئەوەی بەئاشکرا دانی پیپێدا بنێن، کەسی ماسۆشی هەرچەندە رەخنەی لێ دەگیرێ ژینگە سایکۆلۆژیکەی شادمانە بەو رەخنانە چونکە ناوی دەکەوێتە ناوانەوەو لەگۆڕەپانی نوسین یان سیاسەت ناوی دەهێنرێ، کورد واتەنی (لەسەر کانی ئاو گ... دەکات بۆ ئەوەی ناوی بهێنن)، کەواتە پەیوەندی نێوان ئەو دوو کەسایەتیە پەیوەندیەکی تەواو کاریە، بەڵام ئەم تەواوکاریە لەسۆنگەیەکی سایکۆلۆژی نەخۆشداریەوە سەرچاوە هەڵدەگرێت، واتە تەواوکاریەکی ئاسایی نییە بۆ ئەوەی ئەو حاڵەتانە یان نەخۆشیانە کار لەبەرهەمی نوسەر نەکات دەبێت نووسەر چەند فاکتەرێکی خودی تیا بەرجەستە ببێ بۆئەوەی راستگۆیی لەبەرهەمەکەی بەرجەستە بکات لەحاڵەتی هەڵچوونی ئیجابی وەکو خۆشەویستی یان لایەنگیری کوێرانە بۆ مەسەلەیەك یان بابەتێك یان دەسەڵاتێك کەگونجاوە لەگەڵیدا، یان هەڵچوونی سلبی وەکو هێرشکردنە سەر دەسەڵاتێکی دیکە یان بابەتێکی گونجاو کەوێکناگونجێن، کارەکانیشی بەشێوەیەك دەخاتە گەڕ وەکو بەشێکی مێژووی نوسراو لەسەر روداوەکان و بەگوێرەی ئەو هەڵچوونانە کەباسمانکرد رەنگە توشی چەندها نەخۆشی و گرفت بێ کەکار لەنوسینەکەی دەکات، کاتێك خۆشەویستی هەیە بەرامبەر رووداوێك کەکەسانێك تیایدا بەشدار دەبێت کەسایەتی خۆی (نوسەر) تیا ببینێ و ئەمیش لایەنگیرێکی کوێرانە یان دەمارگیریانەی لا دروست دەبێ، یان رکێکی تۆڵەخوازی بەرامبەر روداوێك کەباپیرە گەورەی تیا شکستی هێنابێ، ئەوا ئەم جۆرە هەڵچوونانە دەبنە هەوێنی بەرهەمەکەو مەرجی بابەتی تیا بەرجەستە نابێ.

ئەو نوسەرەی لەگەڵ مەسەلەکەی یان بەرهەمەکەی هەڵنەچێ و بەبەرزیدا هەڵنەشاخێ و بەناخیدا رۆنەچێ لەگەڵیدا کارلێك ناکات و هەقی خۆی ناداتێ، هەڵچوونیش دوا رەفتاری هۆشمەندی تاکە کەسە بۆ گرنگێتی بەرهەم و زیندوێتی ئەو بەرهەمەو راستی ئەزمونەکەی، ئەو هەست و نەستانەی کەلەنوسەردا خۆی مەڵاس داوە لەحاڵەتی هەڵچووندا دەردەکەوێ، ئەگەر ئەو هەست ونەستەی بەپێچەوانەی بابەتەکەیان روداوەکە بێ وەکو سەرکەوتنی ئەو کەسایەتیەی کەخۆی تیا دەبینێتەوە لەو دەوروپشتەی تیا دەژی ئەگینا دوور دەکەوێـەوە

لەپرەنسیبەکانی و ئەویش تێکوپێکی ئەدات بەشێوەیەکی درۆزنانەو فریوخواردوانە یان لیٚ دەگەڕیٚ و بەپوخت و پاکی بەدەستەوەی دەدات یان ئەگەر نوسەر ئاسایش بژێت و دڵنیا بیٚ کاتێك سەربەستە لەوەی دەیلیٚ سەبارەت بەروداوەکە ئەوا وێناکردنەکەشی راست و رەوان دەبیٚ، بەڵام ئەگەر لەسایەی نەبونی ئاسایش و دڵنیایی و ئارامی و هەست بکات چاودێری لەسەرە، بیٚ ترس و لەرز لەشتێك وازبێنیٚ و لەیەکێکی دیکە بدویٚ ئەوا ئەو جۆرە بەرهەمە گوزارشت لەروداوەکە ناکات بەگوێرەی ئەوەی بابەتێکی شێواو شڵەژاو پێشکەش دەکات کەخزمەتی ناکات و رووی راستی بەرهەمەکەو رەگوریشەی دەرناخات، کاتێکیش نوسەر بەرهەمێك دەنوسیٚ بۆ سودو هاندەرێکی دەروونی و دڵدانەوەی کەسێك یان دڵڕازیکردنی کەسێك یان توڕەکردنی کەسێك نییە، ئەوا بەرهەمێکی راست و دروست پێشکەش دەکات، روداوێکی راست وێنا دەکات و لاپەڕەکانی مێژوو روناك دەکاتەوەو هەمیشە ئەو بەرهەمە نەمرە.

هەروەها رۆشنبیرۆی نوسەر کار لەنوسینێك کەلەسەر بابەتێك یان رووداوێك نوسرابیٚ دەکات، بێگومان ئەم حاڵەتانە و بەرجەستە بوون و بەرجەستە نەبوونیشی لەچەند حاڵەتێکی نائاسایی کەلەنوسەردا دەبێت دەردەکەوێت و کار لەبەرهەمەکەی دەکات لەوانەش دەردە دەورنیەکان وەکو دەمارداری (neurosis) کە پەشێویەکی هەڵچونیە لەئەنجامی ململانێکانی ناوەوەی مرۆڤ و پەرتبوون و لێکترازانی پەیوەندییە کەسایەتیەکان، نیشانەکانیشی نیگەرانییە لەئەنجامی هەست بە ئاساییشنەکردنی مرۆڤ بەهۆی فشارو پاڵەپەستۆی دەوروبەرەوە پەیدا دەبیٚ، ئەم دەردەش کەم تازۆر لەمرۆڤدا هەیە، بەڵام زیاتر بەرجەستە بوون و هەستپێکردنی لەلایەن کەسانی ترەوە لەنوسیندا دەردەکەویٚ چونکە نوسین هەرچەندە بابەتی و زانستیش بیٚ بۆن و بەرامەی خودی نوسەری پێوە دەبێت .

## مەی:

**دانیشتنی یەکەمجار لەگەڵ مەیخۆران، کەتاموچێچی دەروونی و گرنگیپێدانی بۆ گەنج هەیە هۆکاری سەرەکی فێربوونی خواردنەوەیە.**

مەی نۆشی یان مەی خواردنەوە دیاردەیەکە نەك تەنها لەنێوەندی گەنجان و لاواندا باوە، بەڵکو لەنێوەندی کەسانی گەورە تەمەن و بەساڵاچووانیشدا بەدی دەکرێت، بەڵام بەشێوەیەکی کەمتر، ئەڵبەتە ئالوودەبوونی بەساڵاچووانیش هەر دەگەڕێتەوە بۆ قۆناغی لاوێتی، کە دواتر ناتوانێ وازی لێبێنی و دەبێتە پیری مەیخانە، هەر چەندیشە هۆکاری دەروونی تەنها هۆکار نین، بەڵکو هۆکاری کۆمەڵایەتی و ئابووریش رۆڵیان هەیە لەم دیاردە کۆمەڵایەتییە، وەلێ تەنها ئاماژە بەفاکتەرە دەروونییەکان دەدەین لەوانەش لاساییکردنەوەو تێکەڵبوون لەگەڵ مەیخۆران و چێژ وەرگرتن لەدانیشتنی خواردنەوە، خواردنەوەی باوك و برادەرەکانیشی لەماڵەوە دەبێتە هۆی فێربوونی منداڵەکانیشی، قۆناغی منداڵی وتێر نەمژینی مەمکی دایك، کە بۆ قەرەبوو کردنەوەی قۆناغی لاوێتی ئەو کەسە پەنا بۆ خواردنەوە دەبات بەئامانجی تێر بوون، ئەمە هۆکارێکی نەستیە، هەندێ کەس پەنا بۆ خواردنەوە دەبات بەمەبەستی بەباکردنی خەم

و ئیش و ئازارەکانی تا بەتەواوی فێری دەبێت و دواتر ناتوانێ دەستبەرداری ببێ بەتایبەتی ئەگەر کەسێکی بێ ئیرادەبێ، گەنج ئارەزووی ئەوە دەکات بزانێت تامی خواردنەوە چییەوشتێك ئاشکرا بکات، کەتامی کرد، ڕەنگە خۆشییەکی لێ ببینێ پاشان دووبارەی دەکاتەوەو خووی پێوە دەگرێت، ئارەزووی خۆ بە پیاو زانین و شانازی پێوەکردن و خۆ هەڵکیشان بەرامبەر رەگەزی دیکەو کەسانی دەورووبەر، هەندێ کەس پێیانوایە خواردنەوە هەوەسی سێکسی پیاو دەکاتەوە، بۆیە پەنای بۆ دەبەن لەراستیشدا پێچەوانەکەی ڕاستە، ئارەزووی تیکەڵبوون لەگەل کەسانی دیکە ئەوانەی هەست بەتەنیایی دەکەن و واهەست دەکەن بەوخواردنەوە لەتەنیایی رزگاریان دەبێت، مامەڵەکردنی ئەو کەسە لەگەڵ داوودەرمانی دیکە، کەبەرەو خواردنەوە رایدەکێشێ چ لەبەر بۆنەکەی یان خوو پێوەگرتنی دەرمان بێ، ئاسانی هەڵگرتن و پاراستن و گواستنەوەی مەی وهەرزانیەکەی، هەبوونیی وا لە هەرزەکار دەکات بیر بکاتەوە، کەپارەکەی لەچیدا خەرج بکات؟!، نەبوونی هۆشیاری تەندروستی سەبارەت بە زیانی مەی خواردنەوەوکاریگەری لەسەر خێزان و پەروەردەکردنی منداڵ و رەچاونەکردنی هاوسەر وپیرۆزیی خێزان، هەندێ لێکۆڵینەوە ئاماژە بەوە دەکەن، کەوا جگەرەکێشان هەنگاوێکی ڕێخۆشکەرە بۆ خواردنەوە، بیردۆزی رەفتارگەری (المدرسە السلوکیە) ئەم خووە دەگەڕێتەوە بۆ فێربوون لە دەوروبەر (فێربوون لەباوك، لەپیاوی ناودار، هونەرمەندی ناودار..تد)، ڕێکخراوی تەندروستی جیهانی لەلێکۆڵینەوەیکدا دەریخستووە کەوا بەشێوەی عەقڵی یان دەروونی هۆکارێکی پاڵ بەمرۆڤەوە دەنێت خۆی تێر بکات بێ ئەوەی بزانێ عاقیبەتی ئەو رەفتارە چییە؟هەروەها تاوان و لاساری وترازانی کۆمەڵایەتی هۆکاری دیکەی خواردنەوەیە، بۆ هەندێ منداڵ رەنگە بێزاربوون و یاخیبوون لەدەسەلاّت یان تۆڵەسەندنەوە لە دایکوباوك و دابونەریتی کۆمەڵکە پەنا بۆ خواردنەوە ببەن، هەندێ کەس بەئامانجی سەرنجڕاکێشان پەنا بۆ خواردنەوە دەبەن، رەنگە لەبەرئەوە بێ، هەست بەکەمی بکات، یا متمانەی بەخۆی نەبێت، ئەگەر جارێك یان دووجاریش بەو پاڵنەرەوە پەنای بۆ برد، ئەوا فێری دەبێت، فێر بوونەکەش دەبێتە خوویەك یان لەبەر تێکەڵبوونی مادەی ئەلکهول لە خوێنیدا یان لەبەر پڕکردنەوەی کاتی ڤالاّیی

کەهۆکارێکی کاریگەرە بۆ خواردنەوە، لەژیانی رۆژانەو هەڵهاتن لە بێزاری، هەستکردن بە گوناه یان لەئەنجامی ململانێی دەروونی ئەو کەسە پەنا بۆ خواردنەوە دەبات، کە دەزانێت خراپە وەك ئامرازێك بۆ خۆکوشتنی ناڕاستەوخۆ وپاشان دەبێتە خوو لەرەفتاریداو ناتوانێت وازی لێبێنێت، کە لە ئاکامی ئەم هۆکارە دەروونیانەش سیماو نیشانەی سایکۆپاتی لەوکەسەدا دەردەکەوێ و رەنگە لاساری بنوێنێ، یان تاوان ئەنجام بدات، بیرکردنەوەشی مەنتیقی و لۆژیکیانە نابێ، لەرووی هەڵچونیشەوە ئەوانەی ئالودەی خواردنەوە بوونە دووچاری شلەژان و بارگرژی لەکارەکانی رۆژانەیان دەبنەوە ئارەزووی ئەو کەسە بۆخواردنەوە زیاتر دەبێت، ویستوئیرادەی لاواز دەبێت و بەرامبەر ژیان دەستەوەستان دەوەستێ، ئیفلاسبوون و لاوازبوونی لەگەڵ کۆمەڵ و ماڵومنداڵی و جیابوونەوەو هەڵوەشاندنەوەی و پەرتەوازەبوونی خێزان، لەکەمەڵگەی ئێمە ئەوانەی دەشخۆنەوە زیادەڕۆیی دەکەن لەخواردنەوەو دەستبەردای پێکەکەیان نابن تابەتەواوی سڕ نەبن، قەدەغەکردن و یاساغکردنی مەی زیاتر وا لەمرۆڤ دەکات هەوڵ بدات تاقی بکاتەوەو تامی بکات چونکە مرۆڤ هەمیشە هەوڵ دەدات زیاتر بزانێ و خۆی پێوە پیشان بدات ئەم راستیەش قوتابخانە دەرونیەکان سەلماندوویانەو هەر بۆیە گەنج پەنای بۆ دەبات چونکە گەنج دوای قۆناغی منداڵی لەجیهان و فەزایەکدا دەژی زیاتر هەوڵدانە بۆ زانینی نهێنیەکانی ژیان و پەی پێ بردنی.

## تلیاك خۆرەكان:

**مرۆڤ ئەیەوێ بزانێ ئەودیوی پەردە چی هەیە بۆیە تلیاك تاقیدەكاتەوە، كە یەكەمجاریش تاقیكردەوە خووی پێوە دەگرێ و ناتوانێ دەستبەرداری ببێ**

هەموومان دەزانین كەوا پرسی پەنابردن بۆ مادە هۆشبەركان و ئالۆدەبوون پێوەی بووەتە پرسێكی جیهانگیری و نەتەوەیی، هەر ئەم بەجیهانی بوونەیەتی پاڵی بە نەتەوە یەكگرتوەكانەوە ناوە هەر لەزووەوە هەوڵی رێ لێگرتنی بداو چەندین گۆنگرەو كۆڕو سمیناری لەبارەوە ئەنجام بدا، وێرای دەیان كۆڕو سیمناری ناوخۆی وڵاتانی جیهان، پرسی مادە هۆشبەرەكان لەهەرێمی كوردستان ئەركێكی گەورەیەو پێویستی بەیاسای پەرلەمان و حكومەتە، كە رێگە لەتەشەنەكردنی بگرێت بۆئەوەی گەنجان و لاوان گیرۆدەی نەبن و كەسوكاریان رەنج بەخەسار نەبن، پرسەكە هەر چۆنێك بێ ئێمە لەروانگەی كۆمەڵایەتی خۆمانەوە هەنگاوی بۆ دەنێین و بەپێی توانای پەروەردەیی و كۆمەڵایەتی و یاسایی واقیعییانەی خۆمان رێی لێدەگرین، باشترین هەنگاویش كەحكومەتی هەرێمی كوردستان بینێت كەبەرهەمەكەی بۆ ئایندەی دوورو نزیك بەرجەستە بێت رێگرتنە لەچاندنی رووەكی هۆشبەركان، چونكە كوردستان ئەفغانستان نییە حكومەت نەتوانێ كۆنترۆڵی بكا، كەسەرچاوەی چاندنی رووەكی حەشیشەو ئەفیۆن و دەیان مادەی دیكەیە، لەمبارەیەوە ئەوەی پێویست بێ حكومەتی هەرێمی كوردستان بیكات داڕشتن و جێبەجێكردنی

یاسای بەرنگاربوونەوەی چاندن و بازرگانیکردن و پەنابردنە بۆ خواردنی ئەو هۆشبەرانە، چونکە ئەگەر بمانەوێ سوود لەئەزموونی گەلان وەربگرین ئەوا ئەزموونی ئەفغانستان کەبەئاشکرا کێڵگەی حەشیشەو تلیاك و ئەفیۆن و کۆکاینی هەیە باشترین پەندە، کە رێگە نەدرێ لەکوردستان بیر لەو بابەتە بکرێتەوە، چونکە پرسی پارەو پوول و بازرگانی دێوەزمەیەکی بێ بەزەیی و دڕندەیە ئەگەر ڕێی لێنەگیرێ پتر پەل دەهاوێ و راست و چەپ دەپێچێتەوە، لەبیریشمان نەچێت سەرقاڵبوونی هەر حکومەتێك بە پرۆسەی سیاسی جەنجاڵ و پرۆژەی ئابوری تایبەت رەنگە بابەتی چاندنی ئەو مادە هۆشبەرانە بەهەند وەرنەگیرێ و بەمێشکی زۆر کەسدا نەیەت، بۆیە داڕشتنی یاسایەك لەمبارەیەوەو جێبەجێکردنی ئەرکێکی پیرۆزە، هەروەها ئەرکی حکومەتی هەرێمی کوردستانە سانسۆری توند لەمبارەیەوە دابنێت و ئۆفیسی تایبەتی بۆ بەرەنگاربوونەوەی مادەهۆشبەرەکان دابمەزرێنێت، بەڵام ئەوەی گرنگ بێ دۆخی سایکۆلۆژی و رەفتارو کەسێتی تاکەکان و بیروبۆچوونیانە سەبارەت بە مادە هۆشبەرکان، بۆ ئەوەی بتوانین بەرەنگاری ئەو پرسە گرنگە ببینەوە دەبێ لەرووی سایکۆلۆژییەوە لەبابەتەکە بڕوانین، چونکە پەنابردن بۆ مادە هۆشبەرەکان هەر وەك پەنابردنە بۆ قومارو قومارچێتی کەپەیوەندی بەپێکهێنان و بونیادی کەسێتی و پەروەردەیی تاکەکانی کۆمەڵگەوە هەیە، بۆیە نابێ خۆمان سەقاڵ بکەین بەبیردۆزو میتۆدگەلێك کەبەرەنگاربوونەوەی هۆشبەرەکان تەنا بیردۆزییانە بێ، هەوڵ بدەین ئەوەی لەتوانای خۆمانە بەکاری بێنین، ئەمیش ئەو ناگەیەنێ چاوەڕێی حکومەت و پەرلەمانی کوردستان نەبین لەجێبەجێکردنی پرۆژە یاسایەك لەم هەمبەرەدا.

بەپێی توانا دەکرێ لەم کەناڵانەوە بەرەنگاری بڵاوبوونەوەی هۆشبەرەکان و ئاڵوودەبون پێوەی ببینەوەو تاکەکانی لێ بپارێزین:

١-میکانیزمی پێکهاتەی سایکۆلۆژی تاك و بەهای خێزان، سەرەتای تەمەنی منداڵی زۆرگرنگە بۆ پابەندبونی منداڵ بەبەهای خێزان و کۆمەڵگاکەی و باوەڕبوونی بەئازادی تاك لەچوارچێوەی سنوری کۆمەڵایەتی و دروستکردنی بەهایەك، کەتاك لەپرسە ئاڵۆزو نامۆکانی وەك هۆشبەرکان بگەڕێتەوە بۆ خێزان و وا گۆش بکرێ کە رەچاوی بەهاکانی خێزانەکەی بکات، ئەمیش پێویستی بەهۆشیارکردنەوەی خێزان هەیە پێش ئەوەی کلتوری پەنابردن بۆ هۆشبەرەکان پتر بڵاو ببێتەوە، بەو شێوەیە بناغەی چۆنێتی بیرکردنەوەی ساغلەم لای تاك دروست دەبێت، ئاشکرایە لای هەموان کەخێزانی کۆمەڵگەی کوردەواری کلتوری خۆی هەیەو پاراستنی ئەو کلتورەش پاراستنی تاکەکانێتی لەرەفتاری نامۆو دزێو، تا بەدیرۆکی خێزانی

کوردەواریشدا شۆڕبینەوە بۆمان دەردەکەوێ کەوا رەفتاری نامۆ زۆر کەمتر بووە بە بەراورد لەگەڵ هەنووکەدا، مەبەست لێرەدا ئەوەیە چێکردنی چۆنێتی بیرکردنەوەو چۆنێتی گوزارشتکردن لەباری دەرونی ئاوێنەی پابەندبوونی تاکە بەبەهای خێزانەوە.

٢-دوورکەوتنەوەی خێزان و قوتابخانە لە پەروەردەی توندوتیژو و فەرامۆشنەکردنی منداڵ، چونکە بەکارهێنانی توندوتیژی گیانی تۆڵەسەندنەوە لای منداڵ دروست دەکات و بۆئەوە پەنا بۆ رەفتاری سەرنجڕاکێش دەبات کەئەویش لاساری و قومارو هۆشبەرەکانە، پێویستە خێزان و مامۆستا پەیوەندی سۆزو خۆشەویستی لەگەڵ منداڵ دروست بکەن و هەستی ئینتیمای بۆ کۆمەڵ و خێزان لای بەهێز بکەن، وای لیَ نەکەن هەست بەکەمی بکات و رەفتاری شەڕخوازانەی لەلادروست بێت، چونکە بۆ تەژیکردنی ئەو هەستانە رەفتاری لاسارو دژە کۆمەڵ دەبێت.

٣- زۆرکردنی ماوەی دەوامی قوتابخانەو گەڕانەوەی سیستمی خۆراکی قوتابخانە بۆ ئەوەی مانەوەی ماوەیەکی زیاتر لەقوتابخانە بچەسپێ بۆ ئەوەی هەلی کاتی ڤالآیی منداڵ کەم ببێتەوەو بەو کەمکردنەوەیە هەلی دوورنەکەوتنەوە لەبەهاکان کەمتر دەبێتەوە، ئەمەش ئەرکی وەزارەتی پەروەردەی حکومەتی هەرێمی کوردستانە، چونکە هەمومان دەزانین ئەو ماوەیە منداڵ لەدەرەوەی قوتابخانەیە یان لەدەرەوەی ماڵە زۆر زیاترە لەماوەی قوتابخانە کە زەمینە خۆشکەرە بۆ پڕکردنەوەی ئەو ماوەیە بەشتی سەرنجڕاکێشی وەکو جگەرەو هۆشبەرەکان و تێکەڵبوونیان لەگەڵ گروهی هاوڕێی بەدفەڕو ناپاك، بەهەمان شێوە دەبێ بەشێکی پرۆگرامەکانی خوێندن تەرکیز لەپرسی کۆمەڵایەتی بکات لەپاراستنی بەهای کۆمەڵایەتی و بوونی وانەی رۆژانەی رێنمایی دەروونی، کە بسپێردرێت بە مامۆستای دەروونناسی یان رابەری پەروەردەیی، پێویستە یاسایەك هەبێ بۆ ئەوەی مامۆستا بتوانێ لەدەرەوەی قوتابخانە لەقوتابییەکەی بپرسێتەوەو بەودوایدا بچێ و وەزارەتی پەروەردە پاڵپشتی ئەو پرسە بکات و خێزانیش پەسەندی بکات، لەقوتابخانە دەبێ شانۆو رادیۆو رۆژنامەی پەروەردەیی هەبێ و خودی قوتابیان بەشداری تێدا بکەن و خۆیان بەڕێوەی ببەن، کەزۆربەی بابەتەکانی تایبەت بێ بەو پرسەو پرسگەلێگی گرنگ کەپەیوەندی بەکەسێتیەوە هەبێ .

٤-میدیا: ئەرکی میدیاە پرسە کۆمەڵایەتیەکان تاوتوێ بکات و بەرنامە کۆمەڵایەتیەکان چڕبکاتەوەو بایەخ بەمامۆستایانی ئاینی و دەروونی و پزیشکانی دەرونی بدات بۆ بڵاوکردنەوەی کلتوری دژە مادەی هۆشبەرو وشیارکردنەوەی خێزان لەو بارەیەوە.

٥- دامەزراوە کۆمەڵایەتیەکانی وەزارەتی کاروکاروباری کۆمەڵایەتی و رێکخراوەکانی کۆمەڵگەی مەدەنی کاربکەن بۆ گێڕانی کۆڕو سیمنیاری بەردەوام لەگشت دامودەزگانی دەوڵەت بەشێوەی سیستماتیك و سازکردنی کۆبونەوەی دایکان وباوکان، لەهەر شوێنێك بێ

٦- دەرکردنی یاسایەك بۆ سزادانی ئەو کەسانەی بازرگانی بەو بابەتەوە دەکەن.

٧- دانانی رۆژێك بۆ بەرەنگاربوونەوەی مادەی هۆشبەرو دەستخۆشی لەو کەس و لایەنانە بکرێت کەگرنگی بە بەرەنگاربوونەوەی ئەو بابەتە دەدەن.

٨- هاندانی خوێندنەوەو سەرزەنشتکردنی ئەو کەسانەی پەنا بۆ هۆشبەرەکان دەبەن.

-چۆنێتی چارەسەرکردنی تووشبوانی مادە هۆشبەرەکان:

ئەوانەی کە ئالّوودەی مادەی هۆشبەر بوون بێگومان لەرووی پزیشکی و دەرونی و کۆمەڵایەتیەوە تووش بون، دەبێ لەو روانگەیەوە بەرەنگاری ببینەوە، پێش هەمووشتێك ئەو کەسە دەبێ دوور بخرێتەوە لەمادەی هۆشبەر بۆ ئەوەی لەسەر ژیانێکی نوێ رابهێنرێت و تا بکرێت کەشوهەوای دەرونی و کۆمەڵایەتی بگۆڕێت باشترە بۆ لەبیرچوونەوەی ئەو رەوشە کەتێیدا ژیاوەو هۆکارێك بووە بۆ هاندانی بۆ مادەی هۆشبەر، ئەوانەی بەهۆشبەرکانەوە ئالّودە دەبن کارەساتێکی گەورەیان بەسەر خۆیان و خێزان و کۆمەڵگادا هێناوە، چونکە بەدوای ئەوانیشدا کەسانی دیکەش، هەر بەرنامەیەکیش بۆ ئەوانەی بڕیاری وازهێنانی یەکجارەکی دەدەن لە ئالودەبوون بەمادە هۆشبەرەکانەوە پێویستە رەچاوی ئەم خالّانە بکرێت:

سەرەتا هەوڵی لابردنی کاریگەری ئەوهۆشبەرانە بدرێت لەسەر لەشی ئالّودەبوو کەئەمیش کارێکی پزیشکیەو پێویستی بەتیمی پزیشکان هەیە کەپسپۆر بن لەو بارەیەوە و دەکرێ لەهەرێمی کوردستان یان لەنەخۆشخانەکانی هەرێمی کوردستان تیمی تایبەت هەبێ بۆ بەدواداچوونی چارەسەرکردنی ئەو ئالودەبوونە، کەلێرەدا ئێمە ئەوە بۆ پزیشکان بەجێدێڵین، بەڵام ئەوەی لەبەر دەست و توانامان بەسەردا بشکێ چەند لایەنێك دەگرێتەوە ئەوانیش لایەنی دەروونی و خێزانی و کۆمەڵایەتی و دەستەی هاوڕێیانی ئەو کەسەیە، بۆیە ئاماژە بەهەندێ خالّ دەدەین:

١- چارەسەری پزیشکی بۆ رزگاربوون یان پاکبوونەوەی لەشی ئەو ئالّوودەبووە لەپاشماوەی مادەی هۆشبەرو چاکردنەوەی کۆئەندامەکانی ئەو کەسە کەبەهۆی مادەی هۆشبەرەوە تێکچووە، ئەمیش پێویستی بەتیمێکی پزیشکی دەبێت.

٢-چارەسەری بنەڕەتی ئاشکراکردنی هۆکاری گرفتەکەیەو شۆڕبوونەوەیە بەقوڵایی ناخی کەسی ئالۆدەبوو و هەوڵدان بۆ چارەسەرکردنی دەروونی و چارەسەرکردنی رەگوڕیشەی گرفتەکە لەرووی خێزان وئاشنا کردنی نەخۆش بەمەترسیەکانی مادە هۆشبەرەکان و یارمەتیدانی کە قۆناغی ئارەزوی بۆ هۆشبەرکە ببەزێنێ و بچێتە قۆناغی دڵنیایی بێ هۆشبەر، بۆیە لێرەدا پێویستە پەیوەندی دۆستایەتی و متمانە لەگەل ئالۆودەبوو چێ بکرێت .

٣- بەدواداچوونی دەروونی بۆ گفتوگۆکردنی رابردووی ئەو کەسەو پاڵپشتیکردنی بزاڤی ئایندەی و هاوکاری دەرونی بۆ بەرنگاربوونەوەی ئاریشەکان لەرێگەی بەرنامەی شیاندنی دەروونی و چارەسەری دەرونی و گەشەپێدانی بەهرەی کۆمەڵایەتی و بەهرەی زاڵبوون بەسەر گوشاری هاورێیانی بەدفەڕ و ناپاك و دۆزینەوەی هەلی کار بۆ ئەو کەسانە بەمەبەستی سەقالکردنیان و نەهێشتنی کاتی ڤالاییان.

٤-گۆڕینی هزرو چەمکەکانی ئالۆودەبوو (نەخۆش) سەبارەت بەژیان و دروستکردنی متمانە لەلای، چونکە لەبنەڕەتدا پەنابردنی تاك بۆ مادە هۆشبەرەکان پەیوەندی بەبیروبۆچوون و چەمکی ئەو تاکەوە هەیە سەبارەت بەژیان، بێگومان تاك هەر کاتێك تێڕوانینی بەرامبەر خودی خۆی نێگەتیڤ بوو زیاتر پەنا بۆ ئەو رەفتارانە دەبات، کەمایەی سەرنجراکێشانی دەوروبەرە، بۆیە پێویستە تێڕوانینی ئەو تاکە بەرامبەر خودی خۆی و نیشتمان و کۆمەڵگەکەی بگۆڕین و متمانە لەلای دروست بکەین، کە ئەو کەسێکی بەرهەم هێنەو توانای بەرهەمهێنانی هەیەو خاوەن کەسێتی خۆیەتی، دەبێ بەوە ئاشنای بکەین کەخاوەن دەسەڵاتەو دەبێ خۆی خۆی بەڕێوە بەرێت و زاڵ بێت بەسەر هەوەس و ئارەزووەکانی، ئەمیش پێویستی بەتیمێك (دەستەیەك هاورێ) هەیەبۆ رێنماییکردن.

٥-خێزان رۆڵی سەر لەنوێ بنیاتنانەوەی ئەو کەسەی هەبێت و هەوڵی گۆڕینی شوێن و هاموچۆی ئەو خێزانانە بکات کەدوورن لە کێشەو ئاریشە و گوێبیستی داواکاری و هەست ونەستی ئەو کەسە بن و کەشوهەوایەکی وای بۆ دروست بکەن کەئەو لەبیری بچێ و بەهەڵەی بزانێ پەنای بۆ ئەو مادە هۆشبەرانە بردووە.

٦- درووستکردنی متمانەو خۆ دۆزینەوە: پێویستە لەسەر خێزان متمانە لای کەسەکە دروست بکات و رەفتارێك نەکات نیشانەی بێ متمانەیی بێ بەرامبەر نەخۆشەکەو و گومان لەرەفتارەکانی بکەن و ئەویش هەستی پێبکات، بەڵکو بەپێچەوانەوە دەبێ متمانەی

لەلادروست بکەن بۆ بەهێزکردنی ئیرادەو شکۆی دەروونی و خۆی لەخۆشەویستی و پڕبایەخی بدۆزێتەوە نەك لەپەنابردن بۆ هۆشبەرەکان.

٧- زیادەڕۆیی نەکردن لەچاودێری لەکاتی وەرگرتنی چارەسەری: لێکۆڵەرەوانی دەروونی پێیانوایە خێزان لەترسی ئەوەی کوڕەکەیان نەکەوێتەوە دۆخی پێشتری زۆر نازی ئەدەنێ و لەرادەبەدەر چاودێری دەکەن و ڕێگەی نادەنێ پشت بە کەسێتی تازەی خۆی ببەستێ، کە ڕەنگە هەر ئەم هۆکارەش بووبێ پاڵی پێوەنابێ بۆ پەنابردن بۆ مادەی هۆشبەر و هەمان کەش و هەوای وەبیر دێتەوە کەلەسایەیدا ئالودەبوو بووە.

٨-پێشبینی ناواقیعی خێزان: نابێ خێزان پێیوابێ پرسی چاکبوونەوەکە یەکجاریەو نەخۆشەکەیان پشت گوێ بخەن و لەبیریان بچێتەوە کوڕەکەیان بەمادە هۆشبەرەکانەوە ئالودەبووە، بەو شێوەیەش پالپشتی چاکبوونەوەی ناکەن.لەوانەشە خێزان واپێشبینی بکات چاوەڕێ بکەن کەکوڕەکەیان دەگەڕێتەوە بۆ نەخۆشیەکە یان بەتەواوی نکوڵی لێدەکەن، بۆیە پێویستە جڵەوی خێزان نە توندو نە شل بێت.

٩- دوورکەوتنەوەی خێزان لە سەرزەنشتکردنی نەخۆش و گێڕانەوەی بابەتەکەی لەبەردەم میوان و خزم و برادەرانی چونکە لەکۆمەڵگەی ئێمە دەستور وایە کەهەر دانیشتن شەوان یان لەکاتی سەردانی یەکتر وردو درشت باس دەکرێ لەوانەش بابەتی ئەو ڕۆژ و دووبارەکردنەوەی بەبەردەوام لەبەردەمی ئالوودەبوو، چونکە نەخۆشەکە دەوروژێنێ بۆ دۆخی ئالودەبوونەکە، لەوانەش ئەو ڕەفتارانەی کەپێشتر ئالودەبوو کردویەتی وەك تانەو تەشەر دژی بەکاری دێنن.

١٠-پەیوندی نێوان خێزان و کۆمەڵ دەبێ باشتر بکرێ بۆ دۆزینەوەی دۆخێکی لەباری کۆمەلایەتی و دروستکردنەوەی فەزایەکی کۆمەلایەتی نوێ بۆ نەخۆشەکە، خێزان هەوڵی ئەوە بدات پەیوەندی خێزانی لەگەڵ ئەو خێزانانەدا ببەستێ کە منداڵیان هاوتەمەنی منداڵەکەی ئەمانە بۆ ئەوەی هاوڕێیەتی تازە دروست بێ و ئەو ئالودەبووەیان دەستبەرداری هاوڕێ کۆنەکانی بێ، کەهێشتا بەردەوامن لەسەر پەنابردن بۆ مادەهۆشبەرەکان.

ئەمەی باسمانکرد مشتێکە لەخەروارێك و بێ کۆتاییە، بەلام ئەوەی کۆتایی هەبێ ئەوەیە مرۆڤ خۆی و منداڵی بپارێزی نەك دوچاری نەخۆشیی ببێ چونکە وەك وتویانە خۆپاراستن لەچارەسەرکردن باشترە.

## سەفەر:

### سەفەرکردن و گەڕان بەدوای ئەو دیوی تاریکی یا ئەودیوی سنور خولیاو ئارەزووی دێرینی مرۆڤەو هەمیشە ویستوێتی ئەو سەفەرە بکات

سەفەرکردن لەمەنزڵێکەوە بۆ مەنزڵێکی تر ماوەکەی هەرچەند بێت و بۆ هەر غەرەزێك بێت یەکێکە لەپێویستییە سایکۆلۆژی و کۆمەڵایەتیەکان و مرۆڤ ئارەزووی ئەنجامدانی دەکات و بەزۆر شێوە ڕێی بۆ خۆش دەکات لەپێناو گەڕانەوەی باری هاوسەنگی و بێزاربوون و نەهێشتنی هەستە نەرێنی و هەڵچوونە کپکراوو مەیلە چەپێنراوەکانی ژیانی رۆژانەی کە لەئەنجامی دەقگرتن بە زەمکانێکەوە لێی پەیدا بووە.

پاڵنەری سەفەرکردن و گەڕان بەدوای ئەو دیوی تاریکی یا ئەودیوی سنور خولیاو ئارەزووی دێرینی مرۆڤەو هەمیشە ویستوێتی ئەو سەفەرە ئەنجام بدات ئەگەر بۆ شوێنێکی دووربێت یا نزیك و لەهەر پێناوێکدا بێ، لەهاوسەنگی دەروونی و بەدەستهێنانی مەعریفەت و ئاشراکردنی نهێنیەکان و تیژکردنی ئارەزووی گەڕان و رەوینەوەی دڵەراوکی و خەمۆکی و سەیرکردنی دونیاو خۆبەراواردکردن و دۆزینەوە گەشتە مێژووییەکانی ماجەلان و کریستۆف کۆڵمبس بەدەوری زەوی و دۆزینەوەی کیشوەری ئەمریکاو ئەوانی دیکەش سەلماندنی ئەو راستیەن، گەڕانی زانایان بە بۆشایی و چوونە سەر مانگ و هەسارەکانی تر وئاوات خواستن بۆ

دۆزینەوەی ژیان لەسەر هەسارەکانی تر بەڵگەی ئارەزوو و خولیای مرۆڤن بۆ سەفەرکردن و وئاشکراکردنی نهێنیەکان و دۆزینەوەی راستیەکان، وەلی لەم زەمەنە بێ سنورەدا کە بەگلۆبالیزم ناوزەد کراوەو بووەتە پاسەپۆرتی سەفەرکردن بەشێوەیەکی ئاسان و گواستنەوەی خێرا بەفرۆکەو پاپۆرو شەمەندەفەرو وئۆتۆمبێل مرۆڤ سەفەرەکانی زیاتر کردووەو رێژەیەکی زیاتری خەڵکیش ئەو ئارەزووە بەدی دێنن، هەندێ کەسیش بەهۆی هەژاری و تەمبەڵی و ترس و خەم وخەفەت و نەخولقاندنی ئارەزووی سەفەرکردن و دەقگرتن بە بارێکی دەروونی نەگۆڕو رەوشێکی کۆمەڵایەتی و ژینگەیی جێگیرەوە بەخەیاڵیدا نایا سەفەرێك بکات وەك خولیاو ئارەزوو.

سەفەرکردن هەندێکجار بۆ بازرگانییە و هەندێکجاریش بۆ دۆزینەوەی هەلی کارو گەڕان و سوڕانە بەدونیادا و گۆڕینی کەش و هەواو بۆ خۆشی و رابواردن، دوای گەڕانەوە مرۆڤ دەچێتە بارودۆخی ئاسایی کۆمەڵایەتی و دەروونی خۆی، بەڵام هەندێجار سەفەرکردن کاریگەری خۆی لەسەر مرۆڤەکە دەبێت و پێوەرێکە بۆ رەفتاری مرۆڤ و بەرەوپێشبردن وپاراستنی گیانی رەسەنایەتی و هەندێجاریش تاقیکردنەوەیە بۆ مرۆڤ خۆی و کەسانی تریش کورد واتەنی سەفەرو مەعامەلە سەنگی مەحەکن، مەبەست لێی گۆڕان و نەگۆڕان و هەڵوێستی مرۆڤ لەو ماوەیەدا دەردەکەوێت، تێڕامانێکی سایکۆلۆژییانە لەم پەندە گرنگی کاریگەری سەفەرکردن لەسەر مرۆڤ دەردەخات و دیارە مرۆڤ دەکەوێتە بازنەی ئەگەری گۆڕان گا بەنەرێنی گا بەئەرێنی، هەر ئەمەشە وایکردووە لە کۆچکردن و سەفەرکردن بکۆڵدرێتەوە، چونکە مرۆڤ بەتایبەتی مرۆڤێك لەکۆمەڵگایەکی تەژی لەداب و نەریت کە بچێتە شوێنێك و کەس نەیناسێ رەنگە خۆی هەڵبڕێ پڕ بەکراسێ.

مرۆڤ لەکۆمەڵگایەکی پڕاوپڕ لەداب و نەریت و بەهای کۆمەڵایەتی و پێوەری جیاجیا بمانەوێ و نەمانەوێ پابەندەو ناتوانێ بەئارەزووی خۆی هەموو رەفتارێك بکات تەنانەت جل و بەرگیشی بەدڵی خەڵك لەبەردەکات، چونکە لەچوارچێوەیەکدا ئازادەو بەهۆی ترسی لەدەوروبەر ناتوانێ بەئارەزوی خۆی هەموو رەفتارێك بکات، بەڵام هەر ئەم کەسە کەبەسەفەر چووە وڵاتێکی بێگانە ئایا خۆیەتی کە بەرگەی نەگۆڕان ناگرێ وهەموو رەفتارەکانی دەکەونە بەر رەحمەتی ئەو ژینگە نوێیەی کە بەسەفەر بۆی چووە، یان کەش و هەوای ئەو ژینگە تازەیە بەهێزەو وروژمی بۆ ئەم هێناوە؟من پێم وایە لەلایەك مرۆڤ (تاك) کۆیلەو لاساییکەرەوەی

کۆمەڵە واتە ئەگەر ببینێ ئەو کۆمەڵە کڵاوەکەیان فڕێ داوە ئەوا ئەمیش کڵاوەکەی فڕێ دەدات، یان ببیستێ خەڵکی ئەو وڵاتە بەپێ خاوسی دەگەڕێن ئەمیش وەکو ئەوان دەکات، کەسێك کە دەبینێ لەوێ ئازادییەو کوڕێك کچێك بلاوێنێتەوەو شوێنێکی دەست بکەوێ بۆ سێکس کردن لەگەڵێداو ئەمیش وەکو ئەوان بکات و وەکو ئەوان ئاژەڵی وەکو سەگ و پشیلە بەخێو دەکات، یان ببینێ گەنجانی ئەو وڵاتە سەکسوکەو خەنافسیان داناوەو گوارە لەگوێ دەکەن و ملوانکە لەمل دەکەن و ئەنگوستیلەی جۆراوجۆرو سەیر لەپەنجە دەکەن ئەمیش لاسایی ئەوان دەکاتەوە، ئەم لاساییکردنەوەیە رەنگە بۆخوگونجاندن بێ یان بۆ لاساییکردنەوە، یان ئەو خۆی بەنامۆ دەزانێت لەنێو حەشاماتی ئەواندا بۆ قەرەبووکردنەوەی دەروونی پەنا بۆ ئەو دیاردانە دەبات، هەندێ جاریش دەکەوێتە ژێر کاریگەری حەشاماتی خەڵکەوە، کاتێکیش مرۆڤ کەوتە ژێر کاریگەری خەڵکەوە وەکو ئەوان دەکات ئەگەر شتی نامەنتیقییش بێ هەروەکو  زانا گۆستاڤ لۆبۆن دەڵێت تاك لەنێو حەشاماتدا هزری عەقل و مەنتیق لەدەست دەدات و دەگۆڕێت و وەکو ئەوان دەکات، یان وەکو کورد دەڵێت ئەگەر دووگا لەدۆڵێکدا بلەوەڕێن ئەگەر خووی یەکتر وەرنەگرن رەنگی یەکتر وەردەگرن، ئەوجا نەخاسمە کەسێك سەفەر بکات بۆ وڵاتێك ئەو هەموو خەڵکە ببینێ پرچیان بەجۆرێك چاککراوەو گوارە لەگوێ و خاوەن سەکسوکەو جۆرە رەفتارێکن ئەوا ئەم بۆ ئەوەی هەست بەجیاوزی و نامۆبوون نەکات دەچێ رەنگ و رووی خۆی دەگۆڕێ و هەندێ جاریش رەفتارو چۆنێتی بیرکردنەوەشی دەگۆڕێ، گرفتەکەش لێرەدایە کەبەو رەفتار گۆڕینە فێرببێ یان بەو رابواردنانە کە کردوێتی فێرببێ یان بەو مادە هۆشبەرە کەپەنای بۆ بردووە فێرببێ و نەتوانێ وازیان لێ بێنێ و بێتەوە وڵاتەکەی خۆی هەمان رەفتار بنوێنێ و خۆی واپیشان بدات ئەو جیاوازەو کەسێکی مۆدێرنە، ئەم کەسە ئایا وەکو خۆی دەمێنێتەوە یان دەگۆڕێ، زۆرجاریش بەپێچەوانەوە کەسانێك سەفەر دەکەن فێری شتی چاك دەبن لە پەیڕەوکردنی یاساو فێربوونی زمان و هونەری موزیك و نیگارکێشان و سینەماو شانۆو وەرزش و پیشەی جۆراوجۆرو پیشەسازی و کاری درومان و دارتاشی و بازرگانی و بەدەستهێنانی بڕوانامەو فێربوونی کاری رۆژنامەگەری و بوارە جۆراوجۆرەکانی میدیاو دەیان پیشەی دیکەی بەنرخ و کە دەگەڕێنەوە سوود بەخۆیان و خێزان و کۆمەڵگە دەگەیەنن، هەندێ کەسیش لەبواری پەروەردە شت فێردەبن و ئەزموون و شارەزایی وڵاتان دەگەڕێنێتەوە بۆ وڵاتەکەی خۆی و سوود بەدەوروبەری خۆی دەگەیەنێ، هەندێجار کاریگەری

سەفەرکردن بەگوێرەی کەسێتی مرۆڤ و هەوڵوێست و بیروباوەڕی بەژیان دەگۆڕێت، کەسانێك کە چاك دمەزرابن و خاوەن بەهاو داب و نەریتی خۆیان بن و ئەخلاقیاتی خۆیان بپارێزن ئەوا رەفتاری چاك ئیزافەی کەسێتی دەروونی و کۆمەڵایەتی خۆیان دەکەن ودەیگوازنەوە بۆ وڵاتەکەیان وکەسانی تریش فێردەکەن، سەفەرکردن کار لەداب و نەریت و زمان و کلتور و جلوبەرگ و شێوازی ئارایشست و خۆجوانکردنی مرۆڤ و چەمکی جوانی لای مرۆڤ دەکات ئەگەر مێ بێ یان نێر، کەسانێك دەتوانن لەچەندین رووی جیاوەزەوە سوود لەسەفەرکردن ببینن ئەمیش بەگوێرەی کەسێتی و شێوازی پەروەردەیی ئەو کەسەو بیروباوەڕی دەگۆڕێ وەکو ئاماژەمان پێدا، لەسەفەرکردندا دەبێ مرۆڤ لەخۆی بپرسێ بۆ سەفەردەکات، دەیەوێ چی بەدیاری بۆ خۆی خێزان و دەوروبەری بێنێتەوە، رەنگە فێری ئەوە بێ نەمامێك بنێژێ چونکە لەوێ وڵاتێکی خۆشی بینیوە پڕبووە لەسەوزایی، یان واز لەجگەرەکێشان بێنێ کە بینوێتی ئەوێ وڵاتێکی پاك و خاوێنەو هاوڵاتیانی ئەو وڵاتە وڵاتی خۆیان خۆش دەوێت و گرنگی بەژینگە دەدەن، چەمکی سەفەرکردن و کۆچکردن لەرووی زەمەنەوە جیاوازە چونکە کەسێك کە بۆماوەی دوو هەفتە گەشتێك بۆ وڵاتێك دەکات و کەسێکیش ماوەی دە ساڵ لەوێ بمێنێتەوە گومانی تێدانییە ئەگەری گۆڕانی کەسێتی لەهەریەکەیاندا  گا بەنەرێنی گا بەئەرێنی لەیەکتر جیاوازە، کەواتە لەسەفەرکردندا دەکرێ مرۆڤ رەفتارو ئەزموونی پەسەندو مەعریفەتی پڕ بەها بۆ خۆی و نیشتمانەکەی بگوازێتەوە، بەپێچەوانەشەوە مرۆڤ کەسێتی و رەسەنایەتی خۆی لەدەست دەدات و لە وڵاتی خۆیشیدا نامۆ دەبێت.

## مێژوو:

**مێژوو مرۆڤ درووست ناکات، بەڵکو مرۆڤ لەناو پرۆسەی مێژوودا خۆی درووست دەکات (فرۆم)**

بێگومان روداوی مێژوویی دەبێت سەرەتایەکی هەبێت، سەرەڕای هەموو شتێکیش کاتێکی دیاریکراوی خۆی هەیە، کەواتە کات یان زەمەن سەرەتا دەست نیشان دەکات و خولقێنەری رۆحی مێژووە، کەوابوو خولقێنەری روحی زەمەن کێیە؟

دەتوانین بڵێین جوڵە (الحركە) خولقێنەری زەمەنە، هەموو مێژوویەك (زەمەن) ەکەیەتی هەموو (زەمەن) ێکیش جوڵەکەیەتی هەموو (جوڵە) یەکیش خولانەوەی ئەستێرەی تاریکە کەزەویە بەدەوری ئەستێرەیەکی روناکدا کەئەویش خۆرە، ئەگەر مەبەست لەخولانەوەی گەورەی (زەمەن) بێت لەسەرشێوەی خولانەوەی زەوی بۆخۆر، کەواتە دەتوانین بڕیار بدەین کەوا (جوڵە) یەکەم رووناکیە، زەوی و هەتاو لەپەیوەندی نێوانیاندا هاوبەشن لەدروستکردنی یەکەم چاووگی (زەمەن) کاتێك رووناکی هەتاو بڵقی یەکەم بێت لەدەرکەوتنی زەمەنی .

مێژوو ئەنجامەکەشی (گەرما دەبێت)، کەئەمیش هاوبەشییەکی ترە سەبارەت بەو ئاکامە، (گەرما) ی بەکشان و چوونە ناویەکی و توندو تیژی و دابەزاندن و دابەشبوون و شڵەژانی، ( جوگرافیا) کاریگەرانە بەشداری دەکات لەدروستکردنی مێژوو، مێژووش ئامرازەکانی دژە چەوسانەوە دروست دەکات بۆ چەوسانەوەی (جوگرافیا) .

کەواتە مێژوو هەرچەندە خۆی ئەنجامە، کردارێکی رەتکردنەوەشە بۆ کاری جوگرافیا، ئەم کارە بەرپەرچدانەوەیەش لەراستیدا خۆی کاردانەوەیە، ئەمەش رەفتارەو مێژووش وەك رێڕەوێکی زیندووی رەفتار سەبارەت بەکەسێك ناژمێردرێن کەواتە مرۆڤ چۆن بوونی ئەو رەفتارە دەبێت و

چۆن بوونی ئەقلانیزم بۆ ئاوڕدانەوە ئامرازێکی گرنگە بۆ تێگەیشتنی ڕەهەندەکانی ئەو ڕەفتارە؟ (ترس) و (خۆشەویستی) دوو ئامرازی بنەڕەتی مرۆڤن بۆ ڕووبەڕووبوونەوەی چەوسانەوەی جوگرافی.

مرۆڤی سەرەتایی دیاردەی سروشت ترساندوێتی و لەهەمان کاتیشدا ئەو ترسەی بەخۆشەویستیەکی رووکەش رەتکردۆتەوە، چونکە زانیوێتی بەرك و تورەیی رەتناکرێتەوەو ئەو هەستەی بەخۆی داوە بەمەبەستی زاڵبوون بەسەر مەترسیەکان هێزە نادیارەکانیشی خۆش دەویست و لەگەڵیدا دەژیا، واتە خۆی لەگەڵدا گونجاندووەو لەناخیشدا ئەو خۆگونجاندنە خۆبەدەستەوە دان بووەو ترس و مەینەتیشی دەگەڕاندەوە بۆ ئەو هێزە نادیارانەو خۆشەویستیەکەی تکاکاری بۆ ئەو هێزە خولقاند، ئەو خۆشەویستیەی کردە ئەلتەرناتیڤی ئەو ترسە جیاوازیکردن لەنێوان ئەو دوو فاکتەرە بنەڕەتیە واتە (ترس) و (خۆشەویستی) سەرچاوەی مێژوویی لەدەروندا دروستکرد گەورەترین گرفت لەدەروونناسی کۆمەڵایەتی کەمێژوو پێشکەشی دەکات گرفتی (درۆ) یە رووداوە درۆکانی مێژوو دەرون رەتیان دەکاتەوە، چونکە پەتی درۆ کورتە، واتە درۆ لەسەر پێ ناوەستێ بەتایبەتی لەبەردەم گیانی تاقیکردنەوە یان دادگای ئایندە، تۆژینەوەکان لەمێژوی درۆ لاوازتر و بەدتر نادۆزنەوە، بۆ درۆ ئەوە بەسە کەحەیای بچێ لەبەردەم دادگای مێژوودا، هەروەکو چۆن میسۆلۆژیای خورافی لەبەردەم راستیەکانی داهاتوو خۆی راناگرێ ئاوەهاش رووداوە درۆکان لەبەردەم راستی چۆك دادەدەن، لەو کاتەدا کەخۆشەویستی کوێرانە بەرامبەر کێشەیەك، سەرکردەیەك، نیشتمانێك پێدەگرێت، ئەو پێگرتنە قەناعەتی دەرون لای تاکەکان دروست دەکات کەدرۆو راست جیاناکەنەوە، چونکەهەستە درۆکان دەبنە بەشێك لەگیانی ئەو کەسانە هەستەکانیش رۆڵی گوێزەرەوە دەبینن سەبارەت بە رووداوی رابردوو بەمەبەستی گواستنەوەی لەجیهانی واقیعیەوە بۆ جیهانی ئەقلانیزم، لەنەستیشدا بەشەکانی رووداو دەبنە واقیعی دەروونی، نەستی مرۆڤیش هەمەلایەنترو گەورەترە لەهەستی، لەبەرئەوە خوێندنەوەی مێژوو پێش هەموو شتێك وێناکردنێکی تاکییە، واتە تایبەتە بەتاکەوەو لەیەکێکیشەوە بۆ یەکێکی دیکە جیاوازە، بەچاودەبینرێ، واتەهەست پێکراوە دەگوێزرێتەوە، مرۆڤ بەوشیارییەوە درککردنی لەئاستێکی فراواندا بەکارهێناوە بەدرێژایی سەدەکان وەك رۆشنبیرییەك بۆ بەهێزکردنی (منی تاك) بەمەبەستی رزگارکربوون لەترس و خۆپاراستن لەکەرتبوونی (من-الانا) لەبەرامبەر سەختی جوگرافیاو هۆیە ئازاربەخشەکانی، کاتێك

ناوشیاری لەئامادەباشیدا دەبێت ناکرێت چالاکیەکانی رتبکرێنەوە ئەگەر لەئەنجامی خەفەقانی وشیاری وای لێبکرێت بەفەرمانی حەزو ئارەزووەکانی هۆش رەفتار بکات، بۆئەوەی ناوشیاری نەست لەسەر ئەو شێوەیە رەفتار نەکات پێویستە وشیاری بەماریفەت تێربکرێت بۆ پڕکردنەوەی بۆشاییەکانی ناوشیاری بۆئەوەی ئەو ناوشیاریە ناچار نەبێت رێگەیەکی هەڵەو چوونەپێست (التقمص) و حاڵەتی پڕوپوچ بگرێتەبەر، گەورەترین کار مرۆڤ بینوێتی بەمەبەستی تێرکردنی وشیاریی، سەرکەوتنێتی بەسەر فاکتەری ترس و نەزانراوەکان بەزمانی زەمەن لەوانەیە رابردوو نەزانراو بێت، بۆئەوەی ترس مرۆڤ نەترسێنێ پێویستە بەدوای رابردودا بگەڕێت بەخوێندنەوەی رووداوەکانی رابردوو بەگیانێکی رەزامەندی بۆ وشیاری.

(نامۆبون-الاغتراب) یەکێکە لەو فاکتەرانەی کەجێگەی مشتومڕە لەسۆنگەی دەروونناسیەوە سەبارەت بە پەیوەندی بەمێژووەوە وەك کردەو پێویست. .ئەم فاکتەرە لەکاتێکدا وەك هەستێکی ئەقلّیی یا ویژدانی دروست دەبێت لەگەڵیدا حاڵەتێك لەحاڵەتەکانی لێکدابڕان و کەرتبوون لەنێوان جیهانی هەست و جیهانی نەستدا دووبارە سەر هەڵدەدات، نامۆ لەجەستەی کۆمەڵایەتی، نامۆ لەروداوەکان، کاتێك تاك بەو جۆرە دەبێت دووچاری باری نقوومبوون لەخەیاڵی خوددا دەبێت، زەمکان دەبێتە دووبەش لەئنتیمابوونی کۆمەڵایەتی، پەیوەندیش بەدوو جیهانەوە دەکات: جیهانی خودی یان جیهانێکی نامۆی ترلەکۆمەڵگایەکی تر، سەرباری ئەو ئێش و ئازارەی کەدووچاری دەبێت لەپەیوەندیکردنی بەو جیهانە خودیەوە لەبەرئەوەی کەلەوانەیە پاڵێوراو بێ بۆ حاڵەتێك لەحاڵەتەکانی شیزۆفرینای هزریی، سەرەڕای ئەم مەترسییە، مەترسی پەیوەندیکردنی یان ئینتماکردنی بۆ خەیاڵگەیەکی نامۆ بەچوونە پێست (التقمص) ی حاڵەتی پێویست بوون بۆ کۆمەڵگایەکی تر، کەئەم کەسە لەرووی خواستەکانیەوە نانوێنێت پێویستیەکانیشی بەرجەستە ناکات کەبەدوای تێربوونیوێتی.

نامۆبوون بەنقومبوون لەجیهانی خود لەکاتێکدا درووست دەبێت کەنەستی تاك لەگەڵ لایەنە تاڵ و سوێرەکانی وشیاری ساویلکە بەیەکدا دەدەن پاشان تاك دەچێتە خەڵوەتی ناوشیاری تایبەتیەوە لەخود نامۆبووندا دەژی و خەمەکانی رووداوی مێژووی وەك چەشنێك لەگاڵتەپێکردن و فشقیات دێتە پێش چاو، گەشبینی تەکنیکی و سەرکەوتنی مەزنی پیشەسازی رۆژاوا تۆخمی پەیوەندیکردنی لەمێشکی مرۆڤی رۆژاوایی دروستکرد کەبووەتە حەسرەتی تاکی رۆژهەڵاتی و ژەهراویکردنی خۆگونجان و سەرهەڵدانی رکابەرایەتی و لەئەنجامدا هەست بەرووخان بەرجەستە

دەبێت لەبەرامبەر هەموو رۆشنایەکی شارستانی رۆژاوایی، ئەم هەستە رووخانە فاکتەری لکاندننی کۆمەڵایەتی (الاسقاگ الاجتماعی) لەسسەر مێژوو دروستکرد کەتاك نەفرەتی لەمێژوی خۆی کرد، هەروەها کۆمەڵیش نەفرەتی مێژوویی خۆی سەبارەت بەو دواکەوتوویە کرد، کەئەو مێژوویە دروستی کردوو، نامۆبوون لەواقیعی دەردەسەری بۆتە ئەلتەرناتیڤی گوزەران و لێکترازانی بەشەکانی ئەو دەردەسەریە وەك هەولێك بۆ سەرکەوتن بەسەریدا، لەوانەیە نامۆبونی ئەقڵیی مەترسیترین جۆری نامۆبون بێت کەبۆتەهۆی جۆشدانی وشیاری بەو شتە نوێیانەی کەلەئەنجامی ئەو نامۆبوونە هاتە ئاراوە، ئەگەر نامۆبونی ئەقڵی دروستبو ئەوا نامۆبوونی ویژدانی و ئەو چوارچێوە نوێیەی کەهاتە ئاراوە بەسەر ویژدانان زاڵ دەبێت و حاڵەتی هزریی تەڵخ دەکات، مێژووی هاوچەرخ بەنامۆبون مەلاشووی هەڵدراواەوە چونکە نامۆبوون خۆی بەرجەستەی ویژدانە، دەکرێ ئەزمونی ژاپۆن وەك کۆمەڵگەیەکی رۆژهەڵاتی بەئەزمونێکی سەکەوتوو بەسەرباری نامۆبوون لەقەڵەم بدەین، مرۆڤی ژاپۆنی نامۆنەبووەو بواریشی نەداوە بەدوژمنان کەهەستی نامۆبوون بەمرۆڤەکانی ببەخشێ بەڵکو بوارێکی وای رەخساندووە کەهەست بەرکابەرایەتی لەگەڵ دەوڵەتانی لەخۆی بەهێزتر بکات، کۆمەڵگای رۆشبیر بەکاریگەریەکانی پاڵنەری تەکنیك و مەدەنیەت نامۆ نابێت.

(نەرگزیزم) فاکتەرێکی دیکەیە لەو فاکتەرانەی کەکار لەرواداوەکانی مێژوو دەکەن، کاتێك نەرگزیزم دەبێتە نیرۆ (عصاب) یەکی بەهێز لەکەسانی دروستکەری ئەو روادوە، روداوی مێژوویی یەکلایەن دروست دەبێت، روداوی نەرگزی بەهەمولایەنەکانیەوە هەستێکی نەرگزیانەی پاڵپشت بۆ دروستکردنی زنجیرەیەکی وەك خۆی پێکدێنێت بۆ نەوەکانی داهاتوو، بۆ ئەو کەسانەی کەخۆیان لەم چەشنەکەسایەتیە دەبیننەوە، رووداوە مێژووییە دێرینەکانی نەتەوەیەك لەنەتەوەکان کەگیانی سەروەری بەسەر خەڵکانی تردا تیابەرجەستەبووەو کار لەنەوەی داهاتوو دەکاو هەمان هەست دەگوازێتەوە.

نەرگزیەتی نازیزم بووە هۆی هەڵگیرسانی شەڕی گێتی بەشێوازی خۆویستی نەك قوربانیدان، چونکە خولقێنەرانی ئەم رووداوە گێتیە بەردەوام کەسانی نیرۆیی و نەرگزی بوون، رووداوەکە لەئەنجامی رەفتاری فشاری نیرۆییانە بوون، ئەگەر کەسێکی ئەڵمانی ویستی گیانی نەرگزایەتی لەرەنگدانەوەی کەسەکانی نازییەوە وەرگرێت کەبوونەهۆی هەڵگیرسانی شەڕ، ئەوا دەکەوێـە ژێر کاریگەری تازەی نەرگزیەتەوە، هیچ بوارێك نییە بۆ سەرکەوتن بەسەر نازیەتا تەنها لەرووی

ڕەتکردنەوەی نەبێت ئەویش بەهۆی ۆرشنبیرکردن و سروش پێدان لەشارستانیەتەکانی تری دونیاو شارەزابون لەهەست ونەست و ناسنامەی ڕۆشنبیرەکانی تر، ئەوەی کەلەسنوری دیدو بۆچونی ئەم لێکۆڵینەوەیەدایە، ئەو فاکتەرانەی کەلەروانگەی دەروونناسیەوە کار لە دروستکردنی ڕووداوی مێژوویی دەکەن و لەهەریەکەشیان شێوازی ئیجابی شێوازی سلبی هەیە، چۆنێتی سودلێوەرگرتنیش لەچۆنێتی تەوزیفکردن و تێڕوانیندایە، دەروونناسی وابۆی دەچێت کەوا خراپ بەکارهێنانی ئەم فاکتەرانە بەستراوە بەدروستکردنی مێژوویەکی تاریك کەدەبێتە هۆی ژەهراویکردنی بیروڕای نەوەکانی داهاتوو، هەورەها بەهەندهەڵگرتنی ئەم فاکتەرانەش بەگیانێکی ئاشکراو روون بەندە بەدروستکردنی ڕووداوی مێژوویی وا کەمرۆڤایەتی لەسەر ڕێگای ڕاست و شارستانیەت و لەناوبردنی شەڕانگێزی و کۆتایی هێنان بەتوخمەکانی وێرانکاری و کاولکردن دادەنێن.

## سوتانی دەروونی:

**پڕوکانی عەقڵی و دەروونی و جەستەیی لەکارو فرماندا دەبێتە هۆی هەستکردن بەرەنج بەخەساری یان سوتانی دەروونی**

(هیربرت فریدنبیرگر) زانای شیکەرەوەی دەرونی ئەمریکایی یەکەم کەس بوو لەساڵی١٩٧٤زاراوەی سوتانی دەروونی هێنایە بواری بەکارهێنانەوە کاتێك سەرقاڵی ئامادەکردنی تۆژینەوەیەك بوو بۆ گۆڤارێکی پسپۆر بەناوی گورنال ئۆف سۆسیال اسیوس تیایدا ئەزمونە دەرونیەکانی خۆی لەگەڵ نەخۆشەکانی لەشاری نیوۆرك خستبووەروو، بەڵام تۆژینەوەکانی (ماسلاك کرستین) مامۆستای دەروونناسی لەزانکۆی بیرکرلی ئەمریکایی تۆژینەوەکانی سوتانی دەرونی زیاتر بەرەو پێشبرد.

ماسلاك پێیوایە سوتانی دەرونی بریتیە لەکۆمەڵێ نیشانەی شەکەتبوون و تەقینەوەی هەڵچوونی بێزاربوونی کەسیی هەستکردن بەناڕەزایی سەبارەت بەدەستکەوتە کەسییەکان و ئەدای پیشەیی، هەروەسا دەتوانین واپێناسەی سوتانی دەرونی بکەین کەبریتیە لە لەقۆناغێك کە تووشی مرۆڤ دەبێت بەهۆی زیادە فشاری ژیان کەلەدواجاردا دەبێتەهۆی هەرەس و

ئیرهاقبوون، که وا لەکەسەکە دەکات تووشی سوتانی دەرونی بێت کەلەرەفتارو هەڵسوکەوتی رۆژانەیدا دەردەکەوێت.

مەبەست لەسوتانی دەرونی ئەوقۆناعەیە کەمرۆڤ بەهۆی ئەو فشارانەوە توشی دەبێت کەدەبنە رێگر لەبەردەم کارو چالاکی و پیشەی رۆژانەی .

زۆر جار تێکەڵبونێك لەنێوان سوتانی دەرونی و فشاری دەرونی دروست دەبێ، بۆ روونکردنەوەی ئەم تێکەڵبوونە (نیوهاوس) لەسێ خاسیەتەدا بەرجەستەی کردووە کەئەمانەن:

سوتانی دەرونی دەرەنجامی فشاری دەرونی کارە بەهۆی تێکەڵبوونی رۆڵەکان و زیادبوونی قەوارەی کار.

سوتانی دەرونی تووشی ئەوانە دەبێت کەزۆر میسالیانە سەیری کار دەکەن و خۆیان دەخەنە ژێر باڵی بەرپرسیارێتیەوە.

سوتانی دەرونی بەو ئەرکەوە بەستراوەتەوە کەکەسەکە ناتوانێ بەدی بێنێ.

هەندێ لەزانایانی دیکە دەڵێن سوتانی دەرونی نیشانەیەکە لەنیشانەکانی فشاری دەرونی، ئەو کەسانەی کەپاڵنەری کارکردنیان بەهێزەو ئاوات و ئامانجیان زۆرەو هەموو کاتێ خۆی تەرخان دەکات بۆ راپەڕاندنی کارەکانی و لەئەنجامدا تووشی سوتانی دەرونی دەبێت لەبەردەم کەسانی تردا، بۆیە توشی خەو زڕاندن و شەکەتبوون و بێ تاقەتی دەبێت و هەروەها توشی کەم تەرکیزی زەینی و کرداری دەبێت و دوو دڵی و شەڕانگێزی و سەرێشەو دابەزینی فشاری خوێن دایدەگرێ  جگە لەهەستیاربوونی بەرامبەر کەسانی دیکە، سوتانی دەروونی پێی دەوتری وەستانی دەروونی کاتێك مرۆڤ ناتوانێ گونجاندن لەنێوان سروشتی خۆی و سروشتی کارەکەی درووست بکات بۆیە سووتانی دەروونی دروست دەبێت، چەند جیاوازی لەنێوان ئەو دوو سروشتە ببێت ئەوا سوتانی دەرونی زیاتر دەبێت.

هۆکارەکی سووتانی دەروونی:

١- تێکەڵبوونی رۆڵ و پیشەی رۆژانەو زۆری ئەرك وکارەکان و نەگونجاندنی لەگەڵ تواناکانی مرۆڤ.

٢- بۆچوونی کارمەند بەرامبەر ئەو شوێنەی کاری لێدەکات و هەروەها بەرامبەر ئەو کەسانەی لەگەڵیدا کاردەکەن وخاسیەتەکانی کارو بوونی رۆتین و نەگونجاندن لەگەل ئەو فاکتەرانەی دەوروبەری سوتانی  دەروونی دێتە کایەوە.

٣- لەدەستدانی کۆنترۆڵ یان نەبونی سەربەخۆیی سەبارەت بەو کارانەی کەپێویستە رایپەڕێنیٚ

٤-هەستکردن بەگۆشەگیری و نەبوونی پاڵپشی و هاوکاریکردن.

٥-کەمی پاداشت و کەمی یان نەبوونی هاندەرو رازی نەبوون و ستایش نەکردن و رێز نەگرتن و رەخنەگرتن هەر هەموویان بەشێوەی نەرێنی کار لەفەرمانبەر دەکەن.

نیشانەکانی سوتانی دەرونی:

١- سۆزی نەرێنی وەکو هەستکردن بەشکست و توڕەبوون و خەمۆکی و بێزاربون و دڵەراوکیٚ و هەستی نەرێنی وەکو گاڵتەجاڕی و رەشبینی بەرامبەر بابەتەکانی رۆژانەی.

٢-نیشانەی دەرونی وەکو نەبوونی توانای کارو لەئەستۆنەگرتنی بەرپرسیارێتی و نەمانی گوڕوتین و تەنگەتاوی و شەڕانگێزی و نەمانی سەبر.

٤-خەوزڕاندن و هەرەسهێنان و بەرزبونەوەی فشاری خوێن و نالەباری تەندروستی و کەمی خواردن و ئیرهاقی زۆرو سەرێشەو ماندوبون و سکاڵاکردنی زۆر و کەمبوونەوەی سیستمی بەرگری نەخۆشیەکان.

بۆ خۆپاراستن لەسوتانی دەروونی دەبیٚ مرۆڤ سیٚ شت لەژیانیدا بزانیٚ کەئەمانەن: ئامانج لەو پیشە کارەی دەیکات، ئامانجی تایبەتی لەژیانتا، کێشەو گرفتەکانت چین و بەگوێرەی گەورەی و بچوکی ریزبەند بکرێن بۆئەوەی بتوانی زاڵ بی بەسەریاندا، ئەگەر هیچ کۆسپێك هاتۆتە رێگەت بۆ بەدینەهێنانی ئەو ئامانجانە ئەوا دەتوانی زانستی ولۆژیکیانە مامەڵەی لەگەڵدا بکەیت و دەبیٚ ئەوەش بزانی جەنجاڵی و قەرەباڵغی ژیان و زۆربونی پێویبستیە مادی و کەمالیەکانی مرۆڤ تا زۆربن فشاری دەرونی و سوتانی دەرونیش زۆردەبن و کەسیش لێی بەدەر نابیٚ، بۆیە دەبیٚ ئەو هەستەلای خۆت درووست بکەی کەتۆ تەنها نیت .

مێژووی سوتانی دەروونی:

رەگوڕیشەی چەمکی سوتانی دەرونی دەگەڕێتەوە بۆ سەرەتاکانی سەدەی هەژدە، یەکێك لەپێناسەکانی سوتانی دەرونی ساڵی ١٧١٠زاینی ئاماژەی بەوەداوە کە سوتانی دەرونی بریتیە لە دەرچوونی ناچاری تاك لەماڵەوە بەهۆی هەراو هوریاو شڵەژان و هەڵچوونەوە، بەڵام ئەم چەمکە بەلێکۆڵینەوەی زانستی نەبووە، بەڵکو لەناوەڕاستی چلەکانی سەدەی رابردوو تۆژینەوەی لەسەرکراوە، فرۆدنبرگ ساڵی ١٩٧٤ کۆمەڵیٚ وتاری بڵاوکردەوە سەبارەت بەم

چەمکە تیایدا ئاماژەی بەوە داوە کەوا پیشەگەران کەتووشی سوتانی دەرونی دەبن رەفتاری نەرێنی دەنوێنن، بیرکردنەوەیان وشکە، گاڵتە بەزەبونەکانیان دەکەن، ئەم خاسیەتانە وا لەعەقڵ دەکات نەرمی نەنوێنیێ بەرامبەر گۆڕان کە ئەمیش دەبێتــەهۆی دانەهێنان، ماسلاك پێشەنگ لەم بوارە دوپاتی کردۆتەوە کەوا سوتانی دەرونی بەشێوەی نیشانە دەردەکەویێ لەمیانەی سیێ رەهەندەوە ئەوانیش نەمانی وزە یان شەکەتبوونی هەڵچوونی و هەست ساردی و وەلاّمگۆی نەرێنی بۆ خودو دەسکەوتە کەمە خودیەکانە، کەپێی دەوتریێ کەمی هەستکردن بەدەسکەوتی کەسیی، بۆ ئەم مەبەستەش پێوەرێکی دانا.

بیردۆزەکانی سووتانی دەروونی:

قوتابخانەکانی دەرونناسی هەریەکەیان لەروانگەی خۆیەوە لەسوتانی دەرونی کۆڵیوەتەوە بەم شێوەیە:

قوتابخانەی رەفتارگەری:

لەبەر ئەوەی قوتابخانەی رەفتارگەری جەخت لەسەر هۆکاری ژینگەیی دەکاتەوە سەبارەت بەو رەفتارانەی مرۆڤ فێری دەبیێ کەواتە هەست و نەستەکانی تاك دەکەونە ژێر کاریگەری ژینگەوە، لەبەرئەوەشی سوتانی دەرونی حاڵەتێکی ناوەکی مرۆڤە وەکو دڵەراوکیێ و هەست و نەستەکان کەواتە بیردۆزی رەفتارگەری وادەڕوانێتە سوتانی دەرونی کە بارێکی ناوەوەی تاکەو دەرنجامی هۆکارە ژینگەیەکانە ئەگەر ئەو هۆکارنەمان دیاریکرد کەواتە سوتانی دەورنیش دیاری دەکەین، بۆیە ئەم بیرۆدزە ئەوە رەتدەکاتەوە سوتانی دەورنی تاك بگەڕێتەوە بۆ مامەڵەی تاك لەگەڵ تاکی هاوڕێی بەڵکو بۆ سەرجەم هۆکارە ژینگەیەکان و فشارە دەورنیەکانی ژیانی رۆژانەشی دەگەڕێتەوە.

قوتابخانەی مەعریفی:

ئەم بیردۆزە پێیوایە رەفتاری مرۆیی نەبەستراوەتەوە بەهەڵوێستێکی راستەوخۆ کە روودەدات، بەڵکو مەعریفە فاکتەرێکە لەنێوان هەڵوێست و رەفتار، مرۆڤ هەمیشە بیردەکاتەوە کاتێك لەهەڵوێستێکدا دەبێت، واتە بەهەڵوێستەکە بیردەکاتەوە، پاشان بەپێی سروشتی تێگەیشتنی لەهەڵوێستەکە وەلاّمگۆی دەبێت، بۆیە بیردۆزی مەعریفی سەربەخۆییەکی زۆر لەرەفتارو بیرکردنەوە بەمرۆڤەکە دەدات زیاتر لەژینگە، بەلاّم ئەم بیردۆزە تەنها نەبەستراوەتەوە بە ئیدراکەوە لەشیکردنەوەی رەفتار، بەڵکو دیاریکەرەکانی رەفتار و

بەتایبەتیش پاڵنەر و هاندەری بۆ زیادکرد، لەبەرئەوە سوتانی دەرونی بەپێی ئەم بیرۆدزە لەوکاتەدا دروست دەبێت ئەگەر مرۆڤ ئیدراکی بۆ هەڵوێستەکە نەرێنی بوو و پاڵنەریشی لاواز بوو.

بیردۆزی شیکردنەوەی دەروونی:

بەپێی ئەم قوتابخانەیە رەفتاری مرۆڤ بەستراوەتەوە بەلایەنی بایۆلۆژی و ئەو لایەنی بایۆلۆژیە رۆڵی هەیە لەرەفتارەکانی مرۆڤ، ئەم قوتابخانەیە دەڵێ کەسێتی مرۆڤ سێ بەشە (ئەو، من، منی باڵا) ئەو مرۆڤ بەرەو رەفتاری غەریزەیانە دەبات و من یش رەفتاری مرۆڤ لۆژیکیانە دەکات، بەڵام منی باڵا بەرپرسیارە لەرەفتاری ئەخەلاقی واتە کۆمەڵگا پێوەری بۆ دادەنێت، لەبەرئەوە رەفتار بەسێ قۆناغی پێکەوە بەستراوەوە تێدەپەڕێ، (روداوێکی ژینگەیی، ئەزمونێك) دەبێتە هۆی حاڵەتێکی عەقڵی ناوەکی، هەڵچوونێك یان بیرۆکەیەك، یان ململانێیەك، کەرەفتارێکی دیاری لێدەکەوێتەوە لەبەرئەوە سەرچاوەی رەفتاری دەرەکی وەکو بێمێشکی و کەمی هەست و ئیجهاد کەسوتانی دەرونی دەنوێنێ کردارگەلێکی دەرونی ناوەکین وەکو هەڵچونەکان و دڵەراوکێ و بارگرژی نەك روداوگەلێکی ژینگەیی.

(کیریاکۆ و سوتکلیف) چوار سەرچاوەی فشارهێنیان دیاری کرد لەسەر مامۆستایان کەدەبێتەهۆی سوتانی دەرونی ئەویش خراپی رەفتاری قوتابیان و بارودۆخی خراپ و فشاری کات و لاوازی سیستمی خوێندن .

## پێكەنین:

**ئەو كەسەی لەهیچ نەترسێت لەپێكەنین دەترسێت**
**(گۆگۆل)**

ئەگەر هەناسە بەردەوامی بەژیان بدات، ئەوا پێكەنین بەردەوامی بەبەختەوەری مرۆڤ دەدات، لەبەرئەوەی پێكەنین هەموو خانەكانی لەشی مرۆڤ دەبوژێنێتەوەو گڕوتینی پێدەبەخشێ و لەخەمۆكی دەریدەكات و بەرەو جیهانی بێخەم دەیفڕێنێ، سیگمۆند فرۆید پێیوایە پێكەنین بەرامبەری ئەو (الهو) ە كەلەسەر بنەمای چێژ وەستاوە كەمرۆڤ بەشێوەیەكی گشتی پێویستی بەوەیە تاموچێژ لەژیانیدا وەربگرێ بۆ ئەوەی لەئێشوئازارو مەینەتی دونیا دوور بكەوێتەوە، لەلایەكی دیكەوە زانا (جێمس لانگ) وتویەتی: پێناكەنین لەبەر ئەوەی بەختەوەرین بەڵكو بەختەوەرین لەبەرئەوەی پێدەكەنین، پێكەنینش بەدەوڵەمەندی و هەژاری نییە، دەوڵەمەندی بەپێكەنینە نەك بەماڵ، پێكەنین پەینی گیانی مرۆڤەو هەروەكو چیرنۆفسكی دەڵێت: پێكەنین هەستی شكۆی دەرونیمان بەئاگا دێنێتەوە، واتە كاتێ مرۆڤ خەم دایدەگرێ تەنیا پێكەنینە خەمی دەرەوێنێتەوەو یەكێك لەئامانجەكانی شانۆی كۆمیدیش هەر ئەوەیە مرۆڤ بەرەو جیهانێكی بێخەم هەڵفڕێنێ، كاریگەری پێكەنین گۆگۆل ئاماژەی پێداوەكەدەڵێت: ئەو كەسەی كەلەهیچ ناترسێت لەپێكەنین دەترسێت، كەواتە پێكەنین هێزە بۆ

ئەوەی پێدەکەنیّ و وروژمە بۆ نەهێشتنی خەمۆکی و بێزاری، ئەم راستیەش لەوەدا بەرجەستە دەبێت کاتیّ دوو کەس پێکەوە روودەکەنە کەسی سێیەم و پێدەکەنن، ئەو کەسە دەسبەجیّ گومان لەخۆی دەکات و لەخۆی رادەمێنیّ ئاخۆ چ کەموکورتیەکی هەیە کەئەوودووکەسە پێی پێدەکەنن، ئەناتۆلی لۆناتشارسکی ئەو گوتەیەی گۆگۆلی پشت راست کردووە کەدەڵێت پێکەنین تەنیا نیشانەی هێز نییە بەڵکو خۆی هێزە، بۆیە پێویستە پێکەنین بەئاراستەیەکی راستدا ببردرێت بۆ چەسپاندنی متمانە بەخودو بەرجەستەکردنی گوڕوتین لەمرۆڤدا، مرۆڤ لەکاتی پێکەنین لەحاڵەتی هەڵچووندایەو نیشانەکانی هەڵچوونی لیّ دەردەکەوێت و دەکەوێتەحاڵەتی ئامادەباشی و وریا دەبێتەوەو بەئاگا دێت، مرۆڤ بۆ ئەوەی بەختەوەر بێت و کەسانی دیکە دڵخۆش بکات و کورد واتەنی دەرمانی حەوت دەردان بێت پێویستە هەڵوێستی پێکەنین وەکو نوکتە دروست بکات، ئەگەر هەر نەیتوانی، ختوکە بدات، یان تێکەڵی دیمەنە کۆمیدیەکان بێت، بۆیە پێویستیشە بایەخ بەشانۆی کۆمیدیش بدرێت، چونکە مرۆڤ لەو ساتانەدا خەمی ئێستاو رابردووش لەبیر دەکات و ئەگەرهەڵوێست دوای هەڵوێستیش رابردووی تاڵ فەرامۆش کرا ئەوا ئەو تاڵییە بەردەوام لەبیر دەکرێت و لەدەروونی مرۆڤ دەسڕدرێتەوە، ئەگینا ماتەمینی و خەم و پەژارە دەبێتە بەشێك لەکەسێتی مرۆڤ و جێی ناهێڵێت و دەبنە دۆستی یەکدی، پێکەنین گەشبینی و خۆشحاڵی و خۆش مەعشەری بەمرۆڤ دەبەخشێت و هەمیشە ئاسودەیی دەروونی دەکاتە میوانی خۆی و خوێنی دەمارەکانی گوڕتر گوزەر دەکات و کورەی خەم بەجیّ دەهێڵێت، پێکەنین لەمرۆڤێکەوە بۆ مرۆڤێکی دیکە بەگوێرەی ئاستی وشیاری و رۆشنبیری و شارستانیەتی تاك دەگۆڕێت، کەبەرواڵەت هەمووان هەر پێدەکەنن، بەڵام لەناخدا جیاوازن، هەر لەبەرئەوەشە ئەوەی کەسێکی وشیار دێنێتە پێکەینن رەنگە هەمان شت نەبێتە مایەی پێکەنین بۆ کەسێکی دیکە یان بەپێچەوانەوە زۆرجاریش پێکەنین وەك زانایان دەڵێن لەچەپاندنی شتێکەوە سەرچاوە هەڵدەگرێت کەمرۆڤ بەو شتە چەپێنراوەی خۆی پێدەکەنیّ، هەروەسا سەرکوتکردن و توندوتیژی سیاسی و چەوسانەوەی چینایەتی و ململانێکان شوێنەواری پێکەنین لەناو کۆمەڵ بەجیّ دێڵێت، پێکەنینی راستەقینە ئەو پێکەنینەیە کەلەویژدانەوەیە، لێکۆڵەرەوان دەڵێن: ئاژەڵانیش پێدەکەنن کەلەئاکامی خۆشیدا زەردەخەنەی خۆیان هەیە، لەمبارەیەوە چارلس داروین جیاوازی کردووە لەنێوان پێکەنینی مەیمونی باڵا کاتیّ ختوکە دەدریّ لەگەڵ مرۆڤ کەلێکچوونێك لەنێوانیاندا هەیە،

هەروەها رۆبەرت پرۆڤین وتویێتی مرۆڤ (هاهاها) پێدەکەنێ و مەینمونیش (ئەه ئەه ئەه) پێدەکەنێ، واتە مرۆڤ دەتوانێ درێژە بەپێکەنینەکەی بدات و بەردەوام بێت و لەهەر کاتێکی دیکەش ئەو هەڵوێستەی وەبیر بێتەوە توانای پێکەنینی هەیە.

د.لوتفی شەربینی راوێژکاری پزیشکێتی دەروونی دەڵێ پێکەنین تەنها گوزارشت نییە لەخۆشی و بەختەوەری بەڵکو ئەرکێکی کۆمەڵایەتیشە بۆ موجامەلەی کەسانی تر ئەوەتا ژاپۆنیەکان لەکاتی یەکتر بینین بەدەم یەکترەوە پێدەکەنن یان زەردەخەنە دەکەن، پێکەنین یان بەپێکەنینهێنانی خەڵك بووەتە بەخششێکی زانستی لەتیڤیەکان و شانۆو دراما کۆمەڵایەتی و کۆمیدیەکان بەکاردێت لەبەکارهێنان و نیشاندانی شتی خۆشی مرۆڤەکان و وەرزشوانان و ئاژەڵان و شتی تری دەگمەنی وەکو شاکارەکانی شارلی شاپلن و مستەر بین و هاردی و کەسانی دیکە بۆ گەورەو منداڵ هەموو مرۆڤێك بەگشتی بەمەبەستی دروستکردنی زەردەخەنە لەسەر لێوە کەئەمە ئەرکێکی دیکەی میدیایە بەتایبەتی لەم سەردەمە کەتاك سەرقاڵە بەئیشکردنی زۆرو تەکنۆلۆژیاوە.

پێکەنین سەرەڕای ئەوەی چارەسەرە بۆ خەمۆکی و نەخۆشیەکانی دیکەی مرۆڤ لەهەمان کاتدا مرۆڤ لەهەندێ کاتدا نابێ پێ بکەنێ و قاقا لێ بدا بەتایبەتی دوای نەشتەرگەری سك و ریخۆڵەکان چونکە لەوانەیە ببێتەهۆی هەڵوەشاندنەوەی داوی نەشتەرگەریەکە، ئەگەر کەسەکە فتق بێ یان ئەگەر تووشی مایەسیری بووبێ بەتایبەتی لەسەرەتای نەخۆشیەکە، هەروەسا لەکاتی شڵەژان و پەشێوی چاو، بۆ ژنی دووگیانیش قاقای زۆر باش نییە، لەکاتی بوونی نەخۆشی سیل لەکەسێکداو هەروەها لەکاتی هەوکردنی بەردەوامی سیەکان مرۆڤ توند پێ نەکەنێ باشترە.

پێکەنین وەك چارەسەرێك بەکاردێت لەرێگەی دەردانی هۆرمۆنێکەوەو بەهێزکردنی بەرگری لەمرۆڤدا، دوای چەند جارێك لەپێکەنین رێژەی خانەکانی خڕۆکە سپیەکان لەخوێندا زیاد دەکات، پێکەنین دەبێتەهۆی بەهێزکردنی ماسولکەکانی دەموچاوو سك و سوڕی خوێنی دڵ کەدەبێتەهۆی بەرزبونەوەی فشاری خوێن و زیادبوونی رێژەی ئۆکسجین، کاتێك مرۆڤ پێدەکەنێ ١٧ماسولکە لەدەموچاوو ٨٠ماسولکە لەلەش دەجوڵێ.

بۆ پێدەکەنین؟

ئەرستۆ دەڵێ ئێمە بەوانە پێدەکەنین کەلەئیمە کەمترن و هەروەسا بەوانە پێدەکەنین کەناشیرینن، خۆشیش لەوکاتە بۆمان دێ کەهەست بکەین چینێکی بەرزین.

سوکرات دەڵێ: گاڵتەجاڕی لەفەرامۆشکردنی خودەوە سەرچاوە هەڵدەگرێ

هیگڵ: پێکەنین دەرەنجامی ناکۆکی نێوان چەمکێك و واتای راستەقینەی ئەو چەمکەیە، هیگڵ ئاماژە بە دەکات کە چەمك واتە رواڵەتی دەرەوەو بەپێکەنین ئینکاری بوونی دەکرێ.

فرۆید: پێکەنین دیاردەیە ئەرکی دەرپەڕاندنی وزەی دەروونیە کەبەهەڵە کۆگا کراوە یان بەتەوەقوعی درۆیینە هەڵگیراوە

جون موریال: پێکەنینی مرۆیی بنەمای بایۆلۆژی هەیە وەك جۆرێك لەجۆرەکانی گوزارشت لەکاتی تێپڕبوونی مەترسییەك.

پیتەر مارتینسۆن: پێکەنین وەلامگۆی ئیدراکە کەبڕیار ئەدا کەوا بوونی کۆمەلایەتی شتێکی راستەقینە نیە.

مارسیل بانیۆل دەڵێ پێم بڵێ بەچی پێدەکەنی ...پێت دەڵێم تۆ کێی؟نوکتە سێکسیەکان و ئەوانەی لەژێرەوەن و شاراوەن زیاتر لەنێوەندی ئەوکەسانەیە کەلەتەمەنەوە لەیەکەوەنزیکن و لەرووی ئاستی کۆمەلایەتیەوە لێکەوە نزیکن، زیاتریش لەنێوەندی تلیاکخۆرو مەیخۆرو پیشەگەران و سنعەتکاران و بازرگاناندا باوە، هەرچی نوکتەی سیاسیش هەیە کەرەخنەی کۆمەلایەتی و ئەخلاقی تێدایە لەنێوەندی سیاسی و میدیاکاراندا هەیە کەزیرەکی و داهێنانی تێدایە، هەرچی نوکتەی کۆمەلایەتی هەیە کەگاڵتەجاڕی و هێرشکردن و جنێو شەڕانگیزی تێدایە لەنێوەندی کەسانی مەقهور و شکستخواردودا هەیە کەهەست بەجەورو ستەمی کۆمەلایەتی دەکەن، ئەم نوکتانە هەروەها لەنێوەندی مامۆستایان و فەرمانبەرانیشدا هەیە.

ئەو نوکتانەش کەشەڕانگیزی و تۆڵەسەندنەوەو توڕەبوونی تێدایە لەنێوەندی چینی کارگەراندا باوە.

کەسانی شارنشینیش بەنوکتە گاڵتە بەدەشتەکی دەکەن و لەنوکتەکانیاندا بەکەم تەماشایان دەکەن، هەروەها خەڵکی گوندنشینەکانیش بەنوکتە فشە بەژیانی ئەوان دەکەن لەخۆ دەرخستنی جەستەیان و جلو بەرگی نامۆو سفوریەت و شتی ناباو، چینی زەحمەتکێشیش دژی چینی بۆرژوزای و دەولەمەند نوکتەی هەیە کەبەسوك تەماشایان دەکەن بەتایبەتی بەداب ونەریتیان و رەفتاری گشتیان هەروەسا چۆن ئەو سەروەت وسامانەیان بەدەستهێناوە، بەو شێوەیەش هەر گەلەو شێوەی ژیانی شێوەی نوکتەگێڕانەوەو جۆری پێکەنینی خۆیان هەیە، لەکوردەواری خۆمانیشدا نوکتەکان دەقیان گرتووەو پێکەنینەکانش رەنگدانەوەی باری کۆمەلایەتیە، بۆ نمونە پیاو کەهەر کات باسی خەسوی کرد ئیدی دانیشتوانی ئەو شوێنەد ەست بەپێکەنین دەکەن و بۆ هەموانیش هەر وایە.

## توڕەبوون و سەبرنەگرتن:

**توڕەبوون لەهەموو مرۆڤێکدا هەیە، بەڵام هەموو مرۆڤێك شارستانیانە گوزارشتی لێ ناکات**

لەو بارانەی کە مرۆڤ لە ژیانی رۆژانەیدا تووشی دەبێت باری هەڵچوونە بە هەموو جۆرەکانیەوە بەتایبەتی رووە نەرێنەکانی هەڵچوون وەکو توڕەبوون، ترس، دڵەراوکێ، ...تد

لەمبارانەدا مرۆڤ لەژێر کۆنترۆڵی جەستەو هۆرمۆنەکانێتی، کە وەکو ئەسپ مرۆڤ پەلکێش دەکات کە ئاکامەکەی پەشیمانیی و ملنانە بەرەو هەڵدێرو زیان گەیاندن بەخود لەرووی جەستەیی و دەروونی و کۆمەڵایەتیەوە، لە رووی جەستەییەوە چاو کز دەبێت، رەنگی پێست زەرد هەڵدەگەڕێ و لێدانی دڵی زیاد دەکات و دووچاری لەرزین عەرەقکردن و چەندین باری نائاسایی دەبێتەوە، لەرووی دەروونیشەوە دووچاری دڵەراوکێ و خەمباری و شپرزەیی و نیگەرایی و هەستکردن بە گوناه و پەشیمانی دەبێت و لەرووی کۆمەڵایەتیشەوە لە خەڵك دوور دەکەوێتەوەو بەچاوێکی دیکە خەڵك تێی دەڕوانن و پێگەی کۆمەڵایەتی خۆی لە دەست دەدات، ئەم هەموو گۆڕانکارییە جەستەیی و دەروونی و کۆمەڵایەتیانە کار لەچالاکیە ئەقڵیەکانی دەکات توانای لێکدانەوەو بیرکردنەوەی بەگوێرەی پێویست نابێت و کار لەرەفتارەکانی لەگەڵ دەوروبەر دەکات و لەکێشە ئاساییەکانی رۆژانەی لەگەڵکەسانی دیکەو دەوروبەری پەنا بۆ توندوتیژی دەبات بەتایبەتی لەگەڵ هاوسەرو منداڵ و کەس و کاریدا وەکو

بەکارهێنانی جنێودان یان بەکارهێنانی تفەنگ و چەقۆو شتی دیکە، هەندێجاریش رکوکینە هەڵگرتن کە ئەمیش ئاکامی خراپی بەسەر کەسێتیەوە دەبێت و ئەو مرۆڤە لە رووی ئەقڵ و باری دەروونی و کۆمەڵایەتیەوە زۆر خراپتر دەبێت لە جارانی و لە خراپەکاری بەولاوە هیچی دیکەی دەستناکەوێت، بەڵام ئەگەر ئەو مرۆڤە سەبرو ئارامی بگرتایە دوو گرەوی دەبردەوە یەکیان زیان نەگەیاندنە بەخودو پاراستنی کەسێتیەو ئەویتریشیان تێڕوانینی ئەرێنانەی بەرامبەرە بۆی، کەواتە لە ململانێی نێوان هەڵچوون و ئەقڵدا دەبێ ئەقڵ بیباتەوەو غەریزە سەرەتاییەکان ئەقڵی مرۆڤ تاو نەدەن، ئاقڵمەندی لەو جۆرە دەبێ بکرێتە پێوەر لەژیانی رۆژانەداو مرۆڤ بتوانێ خۆی فێربکات، چونکە بۆ چارەسەرگرتنی کێشەکان هەر دەبێ بگەڕێینەوە بۆ سەبرگرتن و دۆزینەوەی مەنتیق، بەڵام دەبێ وریا بیت کەزۆر کەس ئەو سەبرگرتن و ئەقڵانیەتەی تۆ دەقۆزێتەوە، بەترسنۆکت لەقەڵەم دەدەن و کاری خۆیان بەرامبەرت دەکەن، چونکە دەزانن دڕکت نییە بەگیانیاندا بچەقێ، لێرەدا بوونی دڕك بۆتۆ قەڵغانەو بۆئەوانیش بەربەست، ئەمە ئەگەر باوەڕی پێ بکەی یان نا ئەوا لەکۆمەڵگەی ئێمەدا هەیەو دەقۆزرێتەوە هۆکاری ئەمەش دەگەڕێتەوە بۆ پەروەردی منداڵیی و رانەهاتن لەسەر ئارامی و ئەزیەت نەدانی کەسی بەرامبەر، منداڵی کەسانی روناکبیر پێیان وتراوە کەشەڕ لەگەڵ کەس نەکەن ئەو شەڕنەکردنەو ئەزیەت نەدانەی کەسانی تر دەبێتە مەینەتی بۆ ئەمان چونکە کەس لێیان ناترسێ و لێیان ئەدەن و بێدەنگی و سەبرگرتنیان دەقۆزرێتەوە، دەبێ ئەو بێدەنگی و سەبرگرتنە بکرێتە رێگەی پەروەردەی منداڵ و دروستکردنی نەوەی دەروون درووست، تەنانەت لەکڕینی شتومەك لەبازاڕدا کەزانیان تۆ مامەڵە ناکەیت و بێدەنگی شتەکەت بەگرانتر پێ دەفرۆشن.

## هەڵسەنگاندنی خەڵك:

### جوانی روخسارو رواڵەتی دەرەوە کار لەهەڵسەنگاندنمان دەکات سەبارەت بەکەسانی تر

لەپەیوەندیە کۆمەڵایەتیەکانماندا لەگەڵ کەسانی دیکەو چۆنێتی هەڵسەنگاندنیان بێ بەکارهێنانی پێوەرێکی زانستی، هەر کەسە بەشێوەیەك بەرامبەری خۆی هەڵدەسەنگێنێ، کەزیاتر پشت بەبۆچوونی شەخسی و میزاجی کەسی هەڵسەنگێنەر دەبەستێ، رەنگە رۆژێك لەرۆژان پرسیاری ئەوەت لێ کرابێ کە فلانە کەس کەسێتی چۆنە یان چۆن دەیناسی، یان بەکەڵکی ئەوە دێ ژنی بدەنێ یان بۆ کوڕەکەیانی بخوازن ـ یان خانووی پێ بفرۆشن یان مامەڵەیەکی لەگەڵدا بکەن، لەوەڵامی ئەوەدا رەنگە سەرمان سوڕ بمێنێ وەڵام بدەینەوە، یان گوێ نادەینێ و بەهەوەسی خۆمان دەیپێوین، بۆ نموونە: خۆشەویستی کەسێك رێگەنادات لایەنە خراپەکانی دەربکەوێت بەپێچەوانەشەوە راستە، یان بەهۆی جوانی روخساری کەسێك و رێکوپێکی شێوەی دەرەوەی بەئەرێنی ئەو کەسە هەڵدەسەنگێنین، زانای دەروونی (کارین هۆرنی) وتوێتی: جوانی روخساری کەسێك کار لەبیروبۆچوونی کەسێکی دیکە دەکات، کاتێك کەسێکی رێکپۆش و بەژنوبالا جوان بەئۆتۆمبیلێکی جوانەوە بەرەو پیرت دێت پێشوازیت بۆ ئەم کەسە جیاوازە لەپێشوازیت بۆ کەسێکی دیکە، کەلەوانەیە جلێکی شڕوپڕی لەبەردا بێت یان روخسارێکی ناشیرینی هەبێت، ئەمیش هەڵەیەکی هەڵسەنگاندنی ئێمەیە کەلایەنی

سۆزمان زاڵە بەسەر لایەنی ئەقڵماندا، کەوامان لێدەکات بەرووکەشی و سەرپێی کەسانی بەرامبەر هەڵبسەنگێنین، خۆئەگەر هەڵسەنگاندنمان بۆ کەسانی دیکە بەشێوەیەکی دادپەروەرانە بێت، ئەوا لەوانەیە ناخی مرۆڤێکی هەژار و پیس و پۆخڵ و جل شڕ پڕ لەبەزەیی و خۆشەویستی و لێبوردن بێت، کەئێمەی مرۆڤ لەکاتی هەڵسەنگاندنمان بۆ کەسانی دیکە فریو دەخۆین و لایەنی سۆز (دەروونی) مان زاڵ دەبێت بەسەرلایەنی ئەقڵ و مەنتیقدا، ئەم لایەنە دەرونیەشمان بەشێوەیەکی ئەوتۆ زاڵە دەکەوێتە ژێر کاریگەری دیمەن و وێنەکانی ژیانەوە، بۆ نموونە کاتێ باسی رووداوێکمان بۆ دەکەن کاریگەری باسکردنی ئەو رووداوە زۆر کەمترە لەکاریگەری ئەو کاتەی کەبەچاوی خۆمان دیمەنەکانی رووداوەکە دەبینین، زۆر لەرۆژنامەکانی دونیا گۆشەیەك بڵاو دەکەنەوە بەناوی وێنەکان لەخۆیان دەدوێن ئەگەر باسی ئەو وێنانە بنوسرێتەوە زۆری دەوێت، نوسینەکان لەبارەیەوە چەندیش زۆر بێت هێشتا کاریگەری هێندەی کاریگەری وێنەکە نییە لەسەر مرۆڤ، لەمبارەیەوە زانایان (ئارسەر، روبین ئەکریت) لەتۆژینەوەیەکی زانستییاندا لەسەر کۆمەڵە کەسێك سازداوە لەکاتی (پیشاندانی ئافرەتێك کەبەتەلەفۆن لەگەڵ پیاوێکدا قسەدەکات)، ئەگەر ئافرەتەکە بەهۆی ڤدیۆوە پیشان بدرێت دەسبەجێ ئەوە دەردەخات کەلەگەڵ پیاودا قسە دەکات، بەڵام ئەگەر تەنها گوێبیستی قسەی ئافرەتەکە بن بەبێ وێنە لەوانەیە وا دەربکەوێت قسە لەگەڵ ئافرەتێکی دیکەدا بکات، مەبەستی زانایان لەو تاقیکردنەوەیەدا ئەوەیە، کەدیمەنی کەسێك ببینێ لەرێگەی سیماو شێوازی دەموچاوی تێدەگەی و هەڵوێستەکانی ژیان پتر کارت لێدەکات، بەڵام بیستن بەتەنێ کاریگەری کەمتر دەبێت، ئەگەر بڵێین یارمەتی ئەو دایکە بدە، کە دوو منداڵی هەتیوی هەیە، لەوانەیە ناخت کەمتر بهەژێنێ لەو کاتەی کەدەیبینی دەستی هەردوو منداڵەکەی گرتووە، کەواتە دیمەنەکان یان وێنەکان کاریگەرییان زیاترەو زیاتر لەمێشکی مرۆڤ بەرجەستە دەبن، ئەمەش هۆکاریکە بۆ دەرکەوتنی وێنەو بایەخپێدانی لەرۆژنامەکان، کۆڕەکەی بەهاری ١٩٩١خەباتی دەیان ساڵەی کوردی بەرجەستە کرد، کەناخی حکومەت و گەلان وڵاتانی رۆژاوای هەژاند، بەڵام ئەو کۆڕەوە ئەگەر بەنوسین بمناخستایەتە بەردەم خوێنەران گومانی تێدا نییە کاریگەری هێندەی کاریگەری دیمەنەکانی بەرچاو نەدەبوو، بۆیە پێویستە هەڵسەنگاندنمان بۆ دەروبەرمان زانستیانە بێت، نەخۆشەویستی ببێتە پەردەیەك بۆ نەدیتنی لایەنە خراپەکان، نە رکوکینە ببێتە ئەو پەردەیە بۆ نەدیتنی لایەنە باشەکان و نە قسەی خەڵك ببێتە پیچوەرو

زانیاری سەبارەت بەبابەتێك یان كەسێك بەڵكو دوای هەموو زانیاری و داتایەك مرۆڤ دەبێ لێكدانەوەی لۆژیكانەی بۆ ئەو شتانە هەبێت .زۆرجاریش لەژیانی رۆژانەماندا مەیلی ئەوە دەكەین سەبارەت بەخۆمان گوێمان لەهەواڵی ناخۆش نەبێت، بۆیە لەكاتی هەڵەكرن هۆكارەكان دەگەڕێنینەوە بۆ بارودۆخ بۆ نموونە: ئەگەر لەكاركەمان دواكەوتین دەڵێین: چی بكەم ئۆتۆمبیلەكەمان نەهات، یان درەنگ خەبەرم بۆوە، یان منداڵەكەم نەخۆش بوو، بەڵام ئەگەر لەمبارەیەوە كەسانی دیكە هەڵبسەنگێنین كەبۆ دوادەكەون ئەوا دەڵێین خۆیان تەمبەڵن یان ئارەزووی ئیشەكەیان نییە.یان هەست بەبەرپرسیارێتی ناكەن، ئەگەر باسی بارودۆخەكەی بكات كەبۆ خۆمانی بەرەوای دەزانین لەوانەیە بڕوای پێ نەكەین، چونكە مرۆڤ ئەگەر هەڵوەستەیەك نەكات لەژیانیداو بەئەقڵ لێككدانەوەی نەبێت ئەوا هەمیشە خۆی بەخودان هەق و كەسانی دیكەش بەناهەق دەزانێت لەبەر ئەوەی مرۆڤ بەگوێرەی پێویست خۆی ناناسێت ئەگینا هەقی خەڵكی دیكەشی دەدا.لەم روانگەیەوە ئەفلاتۆن ئاماژەی بەدەروونی شەهوانی داوە كەمرۆڤ لەرووی ئارەزووە ئاژەڵیەكانیەوە برسییە، حیكمەت لەوەدایە چەند دەتوانێ زاڵ بێ بەسەر ئەو لایەنەداو جڵەوەكەی بەودەستەوە بگرێت و لەبەرامبەر شەهوانیەتدا مسەیەر نەبێت، بۆیە لەكاتی هەڵسەنگاندنمان بۆكەسانی دیكە نیشانە دیارەكانی ئەوان سەرنجمان رادەكێشێت لەوانەش جوانی رەگەزەكەی دیكە، ئافرەت بۆ پیاو پیاویش بۆ ئافرەت، لەمبارەیەشەوە زانا (ئیلین والستر) لێكۆڵینەوەیەكی لەسەر كۆمەڵە خەڵكێك ئەنجامدا لەكاتی ئامادەبوونیان لەئاهەنگێكدا دەركەوت ئەوەی پتر سەرنجی ئامادەبووانیان راكێشاوە زیاتر سیمای جوانی رەگەزەكەی دیكە بووە نەك زیرەكی و بەهرەو تواناو كەسایەتی، بەڵام كەلێشیان پرسیون باسی جوانییان نەكردووە، كەلەراستیشدا وانەبووە، بەڵام باپرسین بۆچی خەڵك یان ئەوانەی تاقیكردنەوەیان لەسەر كراوە لەلایەن زانا ئیلین والستەرەوە زیاتر پەنایان بۆ رواڵەتی دەرەوە بردووە نەك ناوەوە؟ئەمە لەكاتێكدا كەمرۆڤ بەرژەوەندی خودی خۆی بوێت بۆ كاتێكی كەمیش پەنا بۆ ئەو سیما تایبەتیەی جوانی دەبات، بەڵام سیما ئەرێنیە گشتیەكان، كەبەرژەوەندی گشتی تێدایە وەكو زیرەكی تواناو كەسایەتی بەهێز پشت گوێ دەخات، چونكە بەرژەوەندی خودی خۆی تێدا نیە، هەروەها مرۆڤ لەم كاتەدا لایەنی سۆزو دڵ كاریگەری لەسەر تاك زۆرە بۆیە هەڵسەنگاندنی بۆكەسانی دیكە تەواو نابێت، زۆر لەلێكۆڵینەوەكان ئاماژە بەوە دەدەن ئێمەی مرۆڤ بەو كەسە خۆشحاڵ دەبین كەرای لێمانە ئەگەر بزانیت كەسێك زیاتر رای

لێتە ئەوە زیاتر سەرنجت رادەکێشێت، بەڵام ئەگەر کەسێك بەلایەوە گرنگ نەبێت نابێتەهۆی سەرنجڕاکێشانی، بەپێی لێکۆڵینەوەکانی زانا لیۆن فستنگەر دەرکەوتووە کەمرۆڤ زیاتر ئارەزوی ئەوە دەکات هاوڕێیەتی کەسانێك بکات کەلێوەی نزیکن لەرووی شوێنەوە بۆ نموونە مرۆڤ ئارەزووی ئەوە دەکات لەگەڵ کەسانێکدا مامەڵە بکات کەدراوسێی بێ وەکو کڕینی سۆپایەك پێتخۆشە لای ئەو کەسە بێت کەدەیناسی، چونکە کورد واتەنی دۆی ترش لەماستی تاقینەکراوە باشترە، هەروەها دووچاری ترس و دڵەراوکێ نابێ، چونکە ئەو کەسە کەدراوسێتە واهەست دەکەی لێی شارەزایت و درۆت لەگەڵ ناکات و کۆنترۆڵت کردووە لەوانەشە وانەبێت، ئەمەش پەیوەندی بەلایەنی کۆمەڵایەتیەوە هەیە.

سەرباری ئەم ئیجابیاتە لەلێکنزیکبوونەوە لایەنی نەرێنییش هەیە، چونکە ئەوانەی زۆر لەیەکەوە نزیکن سنوری هەستەکانی یەکتر دەبەزێنن و یەکتر بریندار دەکەن، عەرەبیش گوتوویانە لەنێوان دۆستان و برادەران سنوری یاساو داب و نەریت نامێنێ، لێکچوونیش نیشانەیەکی دیکە سەرنجمان رادەکێشێت، کەهەمیشە پێمان خۆشە لەو کەسانەوە نزیك بین، کەهەمان بەهاو بیروبۆچوونی ئێمەیان هەیە، ئەگەر کەسێك لەگەڵیشمان باش بێت، بەڵام بیری سیاسی، یان ئاینی وەکو خۆمان نەبێت بەگرنگی نازانین، لەبەر هەمان هۆیە هەڵسەنگاندنی دەوروبەرمان بەهەڵەدا دەبەین، بۆ ئەوە بشزانین کامە راستە پێویستە مرۆڤایەتی ئامانجی سەرەکیمان بێت لەسەری برۆین بۆئەوەی بەو هەڵەیەدا نەچین و هەڵسەنگاندنیشمان لەسەر بنەمای ئەقڵمەندی و راستی ژیان بێت.

## دەمارگیری:

**عەقڵی تەسك سەرچاوەی دەمارگیرییە (مانۆ)**

دەمارگیری خەسڵەتێکە لەخەسڵەتەکانی نەرگزی بەکۆمەڵ، کۆمەڵایەتیبوونی مرۆڤ پرۆسەیەکی ئاوەزیانەیەو ماڵیبوونی ئاژەڵیش پرۆسەیەکی ئەنگێزانەیە، بەڵام ڕەنگە پرسیارێك خۆی قیت بکاتەوە، ئەی سەبارەت بە گیانداری دڕەندە؟!کورد واتەنی (تۆبەی گورك مەرگە) وەلێ مرۆڤایەتی باوکی دیکتاتۆر ودایکی خۆسەپێن و کوڕی باوك کوشتەو مرۆڤی دەمارگیری تێدا سەرهەڵدەدات، سەبارەت بە کۆمەڵایەتیبوونی مرۆڤ دەشێ بڵێین مرۆڤ توانای ئەوەی هەیە سەرتاپای پاڵنەر و ئەنگێزەکانی بە ئەنگێزەی زایەندی ودایکایەتی و بەشێوەیەکی شارستانیانە نەخشە بکێشی بێ ئەوەی شیرازەی کۆمەڵایەتی تێکبچێ.

پەیوەندییە کۆمەڵایەتیەکانی نێوان خودی تاکەکان وتاك و کۆمەڵ، خاوەنکارو کرێکار، قوتابی و مامۆستا، ژن و مێردو، باوك و کوڕو، بوك و خەسوو..تد هەوێنی کۆمەڵایەتی بوونە، کە بە چ شێوازێکە، ئایا شێوازی نەرێنی و دەمارگیرانەیە، یان شارستانی و گۆڕاوە؟!

دەمارگیری کۆمەڵایەتی هەورازێکی سەخت و دژوارە کە پەیوەندییە کۆمەڵایەتییەکانی نێوان تاك و خێزان و بۆچوونە دەروونیەکانیان لەهەمبەر یەکتردا بەستەڵەك کردووە، کەسی دەمارگیریش هەمیشە هەناسەسوارەو لەدڵەراوکێدایە، چونکە دەمارگیری لاوازبوون و نەجوڵانی هەستی مرۆییانەی مرۆڤەو بەستەڵەکبوونی هەستی کۆمەڵگایە، کە بەهۆیەوە

کوێرانە دەڕواننە کولتووری ڕۆشنبیری و کۆمەڵایەتیی یەکترو لە پەیوەندیەکانی ژن و ژنخوازی و خزمایەتیدا ڕەنکی داوەتەوە، کە هەرچەندیشە دامەزراوە سیاسی وکۆمەڵایەتی و پەروەردەییەکان خێرا بگۆڕین ئەوا بەگوێرەی یاساکانی پێشڤەچوونی کۆمەڵایەتی هۆشیاری تاکەکان لە ئاست کێشەکانیاندا درەنگتر دێنە گۆڕان، کە ئەمیش دەبێتە مایەی قەیرانێکی دەروونی و سەرهەڵدانی نەگونجاندنی کۆمەڵایەتی و بەڕەها بینینی ڕووداوەکان و دیاردە نەتەوەیی و مەزهەبی و کۆمەڵایەتی و تەنانەت ناهاوسەنگبوونی تاکەکانیش.

ملکەچبوونی تاك بۆ ئەو دەمارگیرییە کەبەهیچ کلۆجێك لایەنە نەرێنەکانی ئەو کەس و نەتەوەو خێزان مەزهەبە خۆشەویستانەی خۆی بەدی ناکات و ئامادە نییە دانیان پێدا بنێت، گۆشەگیرییەکی کۆمەڵایەتیی ئەوتۆ دروستدەکات کەپەرەسەندن روونەدات بەهەمان پێوەریش کەسی دەمارگیر لایەنە ئەرێنیەکانی دژەکەی نابینێ یان نایەوێ دانیان پێدابنێت بۆیە پێویستە تاك وریا بێت و درك بەوە بکات کەدەمارگیری نەبێتە بەشێك لەکەسێتی نەتەوەیی و مەزهەبی و کۆمەڵایەتی، بەو پێیەش هەندێجار دەمارگیری خۆدزینەوەیەکی نەستیانەی تاکە لەچارەسەرکردنی گرفتەکانی پەیوەندییە کۆمەڵایەتیەکان بەشێوەیەکی ئاوەزیانەو ئەقلانیزم، چونکە خودی دەمارگیری رەنگدانەوەی ئەم دڵەراوکێیەیە کەمرۆڤ لەسەرەتای منداڵیەوە بەهۆی شکەستەکانیەوە تووشی دەبێت ورەفتاری پێدەکات و ئەو رەفتارە فێربوون و خوو پێوەگرتنەو رۆژانە لەپەیوەندییە کۆمەڵایەتیەکاندا بەرجەستە دەبێت، دەمارگیری ئەرزشی بۆ خودی کەسی دەمارگیر نییە ئەوەنەبێت کەهەڵچوون بەباکردن و دڵدانەوەیەکی ئەو ساتەوەختانەیە کەمرۆڤ تێیدا بێدەسەڵاتەو توانای بەرەنگاربوونەوەی دژە تەوژمەکانی ژیانی کۆمەڵایەتی و سیاسی نەبووە، هەر بەهۆی دەمارگیری کۆمەڵایەتیەوە پەیوەندی کۆمەڵایەتییەکانی ئەو تاکانە لەکەدار دەبێت، کە رەنگە لەمەیدانەکانی پەروەردەیی ورۆژنامەوانی وکارگێڕی و حزبایەتی و..هتد پیادەیان بکات، ئەم جۆرە رەفتارە دەمارگیریانە لە ژێر فشاری بنەمای تام و چێژ و فەرامۆشبوونی لێکدانەوەی زانستیانە دەبێتە نەریت و خوو کەوا دەخوازێ لەم حاڵەتەدا دامەزراوە کۆمەڵایەتیەکانی لەرێگەی بڵاوکردنەوەی چەمکی شارستانی ورۆشنبیری تاکەکان هۆشیار بکاتەوە کە بەرەو هەڵدێری زیاتری دەمارگیری مل نەنێن، نەخاسمە کەتاك قابیلی گۆڕان و چاکسازیە کە دەشێ بەهۆیەوە پەیوەندییە کۆمەڵایەتیەکانی نێوان رەگەزو رەگەز، خێزان و خێزان ناوچەو ناوچە...هتد بەو ئاراستەیە ببەین کەدەمارگیری جڵەوی ڕەفتاری

کۆمەڵایەتی و میکانیزمە دەروونییەکان بەڕیوە نەبات هەموو جۆرەکانی دەمارگیری کۆمەڵایەتی و ناوچەگەری و ئەخلاقی ونەتەوەیی و...هتد لەدادگای ئاوەزدا ئامادەییان هەبێت و (خود) ی ساغلەم شایەد حاڵی رەفتارە دەمارگیرییەکان بێت بۆ ئەوەی کەسێتی ساغڵەم لەتاکەکاندا دروست بێت وئاییندەیەکی ئەقلانیزم بۆ نەوەکانی داهاتوو دابڕێژری کە لە ئاست پێداویستیە کۆمەڵایەتی و نەتەوەییەکانی کۆمەڵگەدا بێت، کە شانبەشانی گۆڕانکارییەکانی دونیای گلۆبالیزم رەوت بکات و باوکی دیکتاتۆر و کوڕی باوك کوشتە گیرۆدەی گرێی ئۆدیب و خۆبەکەمزان لە ئاست پەرەسەندنە کۆمەڵایەتیەکانی خێزان کۆسپ و تەگەرە نەنوێنێ، چونکە دەمارگیری نابیناو کەللەرەقە بەرامبەر گۆڕان و باوەڕی بەدیالۆگ نییە وئامادەش نییە دەستبەرداری کەللەرەقی خۆی ببێ ئەگەر زیانیشی پێ بگات وەکو ئەو باوکەی کە ئامادە نییە کچەکەی بە مێرد بدات تەنها لەبەر ئەوەی ئەو شووکردنە بەدڵی ئەو نییە ئەو دڵەی کە ڕەگوریشەی لەناو هەناوی دەمارگیری خزمایەتی و کۆنەپەرستیدا داکوتاوە، گۆردن ئەلبۆرت دەڵێ دەمارگیرەکان لەبۆچوونەکانیانەوە لەیەکەوە نزیکە و سیمای کەسێتیشیان هاوشیوەن.

# پیری:

**بەنەمانی مادەی کولاجینی نێوان شانەکانی لەش پیری سەرهەڵدەدات (لێکۆڵینەوەکان)**

بەساڵاچوون یان پایزی تەمەن قۆناغێکە لەقۆناغەکانی گەشەی مرۆڤ کەتەمەنی (٦٠-٦٥) ساڵی بەرەو سەروتر دەگرێتەوە، لەوانەیە لەسەرەتای پەنجاکانی تەمەنەوە رواڵەتەکانی دەربکەوێت وەکو چاوکزی و کەبیستن و کەم خواردن و پشتشئێشەو پوکانەوەی ددان و هەندێ نالەباری دیکە- کەلەوانەیە پیرەکان خۆیان رۆژانە گوزارشتیان لێبکەن کەدەڵێن پیری و سەد عەیب، بەخوا کەڵکم لێبڕاوە، چاوم کزبووە، وێڕای کۆکردنەوەی حەب و دەرزی و داوودەرمان و نازکردن بەسەر کوڕو کچەکانیاندا.

بەساڵاچوو ئەگەر پیاو بێت یان ژن ئایا توانای ژیری کەم دەبێتەوە؟ئایا پێویستە راوێژکاریان بکەین لەئیشوکارەکانیاندا؟

پیربوون یان بەساڵاچوون دیاردەیەکە هەر دەبێت بونەوەر پیایدا تێپەڕببێت، ئەویش نەك تەنها لەناو مرۆڤدا بەڵکو لەناو گیاندارانی دیکەش پیربوون هەیە.

لێکۆڵینەوە بایۆلۆژیەکان دەڵێن: مادەیەك لەلەشی مرۆڤ هەیە پێی دەڵێن کۆلاجین شانەکانی لەش پێکەوە دەبەستێتەوە بەنەمانی یان بەوشکبوونی ئەم مادەیە پیربوون بەتەواوی

دەردەکەوێت، چونکە ئەم مادەیە وەکو گەچ وایە بۆبەستنەوەی شانەکانی لەش، تۆژەرانیش لەبارەی مادەی کۆلاجینەوە وتویانە: کاتێ ئەو مادەیە وشك دەبێتەوە لەوانەیە کار لەئەندامێك لەئەندامەکانی لەش بکات وەکو دڵ یان گورجیلە یان مێشك و دەبێتەهۆی مردن.

پیربوون لەکەسێکەوە بۆ کەسێکی دیکە دەگۆڕێت بۆ نموونە پیاو تا ٥٠ساڵ لەژن زووتر پیر دەبێت، بەڵام پاش٥٠ساڵان پیربوونی ئافرەت خێراتر دەبێت، یا پیاوی رەش پێست ٥ساڵ زووتر لەپیاوی سپی پێست پیر دەبێت یان گوندنشینەکان لەشارنشینەکان زووتر پیردەبن.

هەندێ رواڵەتی پیربوون هەیە کەسێك لەکەسێکی تر پیتر نیشان دەدات وەکو زووتر کەوتنی ددانەکان بەهۆی نەخۆشی یان جگەرەکێشان هەروەها خودی جگەرەکێشان کەدەبێتەهۆی تەنگەنەفەسی و نەخۆشیەکانی دڵ، وێڕای سپی بوونی مووی ریش وسەر.

سەبارەت بەئێشو ئازاریشەوە پیاوی پیر زیاتر لەئافرەتی پیر قایمترو خۆڕاگرترە لەوانەشە ئەمە بۆ ئەوە بگەڕێتەوە کەئافرەت مندالّی دەبێت و زیاتر کاری لێدەکات.

هەندێ لێکۆڵینەوەی بایۆلۆژی دەڵێن رێژەی ئاو لەمێشکدا کەمترین رادەی لەتەمەنی نێوان (٢٠-٣٠) سالآندایە، پاش ئەم تەمەنە بەجێگیری دەمێنێتەوە، هەروەها پاش ٣٠سالآنیش قەبارەی مێشك وردە وردە کەم دەبێتەوەو شانەکانیش دەچنەوە یەك، لەرووی کۆمەڵایەتیەوە پیربوون دیاردەیەکی نوێ نییەو لەهەر کۆمەڵگەیەکدا رۆڵ و رێزی تایبەتی خۆیان هەیە، چونکە پیری کەپایزی تەمەنەو ئێستا گەڵاکانی زەرد هەڵگەڕاون و دەوەرێن، بێگومان ئەو پایزەو لەخۆیەوە نەهاتووە بەڵکو لەبەهارێکەوە هاتووە کەگەڵای سەوزەو ژیانەوەی تێدابووە، بەڵام رۆڵی خۆی لەژیاندا بینی و زانینەکانی بۆ خۆی کۆکردەوە، واتە زۆر شت دەزانێت بەڵام توانای جەستەیی کەم بۆتەوەو ناتوانێت کارەکانی ئەنجام بدات بۆیە لەکوردەواریدا وتویانە : ئایا ئەگەر گەنجەکان نەزانن ئایا ئەگەر پیرەکان نەتوانن، واتە گەنج دەتوانێ بەڵام لەوانەیە نازانێ، بەڵام پیرو بەساڵاچوو دەزانێ بەڵام لەوانەیە نەتوانێ.

زانایان و لێکۆڵەرەوانی دەروونی زۆر بایەخیان بەقۆناغی پیری داوەو هەوڵی چارەسەرکردنی ئەو نەخۆشیانەیان داوە کەلەماوەی پیریدا دووچاری مرۆڤ دەبێت، لەم بارەیەشەوە لقێکی نوێ لەبواری پزیشکی هاتەئاراوە بەناوی (نەخۆشیناسی پیری) کەدەریان خستووە پیری لەسەرەتای ژیانی ١٥ساڵی تا ٢٠ساڵی دەستپێدەکات بەڵام نیشانەکانی لەتەمەنی پاشتر دەردەکەوێت، چونکە پیربوون لەناکاودا نییە، بەڵکو هەنگاوەکانی لەتەمەنێکی پێشوەختدا دەستپێدەکات.

دیدوبۆچوونی پیر خۆی سەبارەت بەخودی خۆی قۆناغی پیرێتی لەرووی کۆمەڵایەتی و دەرونیەوە دێنێتە پێشوە، واتە ئەگەر مرۆڤ مووی سەری سپی بوو ترساو ددانی کەوت و ترساو خۆی بەدەستەوەدا مانای وایە پیرێتی هێنایە پێشەوە، بەڵام ئەگەر خۆڕاگرو چوست و چالاك بوو ئەوا دیدو بۆچوونی خەڵکیش بەرامبەری دەگۆڕێ، بەڵام ئەگەر مرۆڤ هیچ گوڕوتین و هیچ هیوایەکی بەژیانی خۆی نەمابوو ئەوا ئەو مرۆڤە خۆی بەدەستەوە دەدات، فەلسەفەی ژیانی کۆمەڵگەش سەبارەت بەپیری کاریگەری هەیە لەسەر تێڕوانین بۆ پیروئایندەی، پیری وڵاتانی ئەوروپا نەخشە دەکێشن و راوێژکاریان پێدەکرێ و بەشداری کۆمەڵ دەکەن و رێزیان لێدەگرێ و شوێنی حەوانەوەی شایستەیان هەیەو پایەی کۆمەڵایەتیان بەرزو بڵندەو پەیوەندیەکان لەگەڵ خەڵکیدا پتەوەو هەست بەهێزو توانای خۆیان دەکەن، چونکە متمانەیان بەخۆیان هەیە، لەکۆمەڵگەی ئێمەشدا تواناو هزر بەستراوە بەهێزو وزەوە نەخاسمە هێزی لەش ئەمەش بۆماوەی کۆمەڵگەی کشتوکاڵیە چونکە زیاتر هێزی جەستە رۆڵی هەبووە لەئەنجامدانی کارەکان، هەندێ پیریش هەن لەکۆمەڵگەی ئێمەدا بەشداری خۆشی و ناخۆشیەکانی خەڵکی دەکەن، کەسی پیر زۆر بەلایەوە گرنگەو دڵی خۆش دەبێت سەلاوی لێ بکەیت و لێی بپرسیتەوە، هەر لی نەپرسینەوەشە دەبێتەهۆی گلەیی و گازەندەی پیران کەلەنەوەی نوێتر رازی نین، پیرو بەساڵاچووان زۆر دڵخۆشن بەوەی نەوەیان خاوەن دەسەلات و ناودار و خاوەن پایەو پلەی کۆمەڵایەتی بێ، سەیر لەوەدایە لەکۆمەڵگەی کوردەواری پیرێتی یەکسەر دەبەستنەوە بە لەدەستدانی توانای سێکسی و هەر ئەوەشە پیاو یان ژن پێیان ناخۆشە کەپێیان بڵێن پیربووی بەڵام مەسەلەی سێکسکردن لەوڵاتانی ئەوروپا هەروەکو توانای گەدەو توانای ددان و چاو وایە و زۆر ئاساییەو مرۆڤ مات و مەلوول نابێ ئەگەر ئەو توانایەی نەمێنێ و ئەوە نابێتە پێوەر بۆ تواناو رێزگرتن .

## خەون:

**مرۆڤ لەشیکردنەوەی خەونەکانیدا چەند قوڵ بێتەوە، ئەمەندە شوێنەواری زانیاریەکانی تەمەنی منداڵی بەشێوەی زانیاریەکی نوێ بۆ دەردەکەوێ (فروید).**

بەشی گرنگی کەسایەتی مرۆڤ بەگوێرەی دابەشکردنەکەی فرۆید بریتیە لە (ئەو)، کەرۆڵێکی گرنگ دەگێڕێ لەپێکهێنانی خەونەکانی مرۆڤ، فرۆید پێیوایە سەرچاوەی خەون ئارەزوویەکە لەئارەزووەکانی پرۆسەی نوستن و کشانەوەی بەئەنقەستیشە لەدنیای دەرەوەدا.

بەو پێیەش دووکردار دێتە ئاراوە، یەکەمیان بواردان بەچالاکیە کۆن و سەرەتایەکانی تەمەنی منداڵی، بۆگوزارشتکردن لەخود، کەپێی دەگوترێ گەڕانەوە بۆ سەردەمی منداڵی، دووەمیان سستی و لاوازی بەرگریکردنی کارە چەپێنراوەکان کەباری نەست قورستر دەکات، سەبارەت بەخاڵی دووەم بوار بەخەون دەدات لەئەنجامی وروژێنەرەکانی ناوەوەو دەرەوە، کەکار لەنوستوو دەکەن و بەرێوەی دەبەن شێوازێك وەربگرێت ئەو خەونەی کەبەم شێوەیە دادەڕێژرێت پێکهێنانێکی دەرونیە لەقایلکردن وچارەسەری ئارەزو مەندانە دروست دەبێت و دوو فەرمانی لێکدراوی دەبێ، لەلایەکەوە لەگەڵ (من) هەماهەنگ دەبێت چونکە لەکاتی نوستندا ڕاژەی ئارەزووەکانی دەکات لەلایەکی دیکەشەوە بوار بەتێرکردنی رەچەیەکی چەپێنراو دەدات.

نەست سەرچاوەی خەونەکانە، فرۆید بەواقیعی دەروونی راستەقینە دەیژمێرێت و هەروەها بەشێکی فراوانی ئاوەز دەگرێتەوەو لەهەمانکاتدا بریتیە لەکۆگایەك بۆ سەرجەم رەمەکەکان، رەمەکی خۆشەویستی (ئایرۆس) و هەموو شێوازەکانی هەوڵدان لەپێناو ژیان و رەمەکی مردن (ساناتۆس)، کە هەموو شێوازەکانی ئەنگێزەو دەست درێژکارییەکان دەگرێتەوە.

ناوەڕۆکی ئەم جیهانە شاراوەیە واتە نەست بریتیە لەزانیاریەکانی تەمەنی منداڵی و ئارەزووە زایندەیی و شوێنەوارە دەرونیەکان، خەونەکانیش وێنەو رووی راستەقینەی بویەری نەستی مرۆڤ ئاشکرا دەکەن، مرۆڤیش لە شیکردنەوەی خەونەکانیدا چەند قوڵ بێتەوەو بەناخیاندا شۆڕبێتەوە، هێندە شوێنەواری زانیاریەکانی تەمەنی منداڵی بۆ دەردەکەوێت، خەونیش جێگرەوەی دیمەنێکی تەمەنی منداڵییەو بەشێوەی زانیاریەکی نوێ دەردەکەوێت، هەروەسا سیگمۆندفرۆید دەڵێت: نیتشە راستی گوتوە، کەبەشێکی مرۆڤایەتی لەخەوندا خۆی حەشارداوەو پێ نەگەییوە، دەمانەوێ بەرێگەیەکی راستەوخۆ بیگەینێ، لای سروپالیەکان ناوەڕۆکی خەون زۆر پڕ بایەخەو بەگرنگترین دۆزینەوەشی دادەنێن سەبارەت بەمەعریفەی مرۆڤ، لەلایەکی دیکەوە فرۆید پێیوایە سەرتاپای کرداری خەون نموونەی گەڕانەوەیە بۆ تەمەنی منداڵی، ئەوەی خەونەکە دەبینێ بۆ کۆنترین بارودۆخی رابردووی ژیانی خۆی دەگەڕێتەوە، کەژیانی رابردووی مرۆڤایەتی و کەلەپوورە سەرەتایەکەی نیشان دەدات، بەڵام سەبارەت بەتەکنیکی خەون دووکرداری پێویست دێنەئاراوە، ئەوانیش: چڕکردنەوەو گواستنەوەن، هەردوو کردارەکە هێزێکی دەرونیان هەیە لەکاتی خەون بینیندا وەك هێزێك گوزارشت لەخۆیان دەکەن بۆ دوو ئامانج یەکەم داماڵینی توندوتیژی لەو توخمانەی بەهایەکی دەرونی بەرزیان هەیە دووەم درووستکردنی بەهایەکی نوێ بۆ ئەو توخمانەی بەهایەکی نزمیان هەیە، واتە ئاڵوگۆڕو گواستنەوەیەك لەتوندوتیژییە دەرونیەکان لەکاتی خەوندا دروست دەبێت، جیاوازیش لەنێوان دەقی ناوەڕۆکی خەونەکان و دەقی هزرەکانی خەون لەئەنجامی ئەو ئاڵوگۆڕو گواستنەوەیە پەیدا دەبێت، فرۆید پێیوایە ئەوەی بەئاشکرا دەردەکەوێت بریتیە لەپێکهاتەی ناوەڕۆکی هزرەکانی خەون، نەك لەخودی خەونەکان، ئامانجی خەونیش توانای وێناندنێکی بێ سانسۆرە بۆ گەیشتن بەم ئامانج و ئەورێگەیەش دەگرێتەبەر، کەپێشتر لەلایەن نەستەوە بۆی خۆشکراوە، ئەو ئاڵوگۆڕانەش کار لەمادە چەپێنراوەکە دەکەن کەشیمانەی دەرکەوتنی لەبواری هەستدایە، لەسەر شێوەی نوکتەو ئەو نیشانانەی کەلەخەیاڵی کەسانی نیورۆسی دایە، فرۆید لەو

بڕوایەدایە هونەر تاکە مەیدانە تا ئێستا بەئاوێنەی توانای ڕەهای هزر تێدەڕوانین، تەنها لەهونەردا مرۆڤ بۆ تێرکردنی حەزەکانی لەنەستەوە فشاری دەخرێتە سەر، داهێنانی هونەرییش بەچەپاندن و زایەندەو نیورۆسیەوە دەبەستێتەوە، هونەر وەك كەسێکی نیرۆسی لەقەڵەم دەدات، بەڵام جیاوازی لەگەڵ كەسێکی نیورۆسی ئەوەیە كەهونەرمەند دەزانێت چۆن شتێکی كۆن بچەسپێنێت بۆ ئەوەی لەو بویەرەدا خۆی بگونجێنێت، بەرهەمەکانیشی وەك خەونەکانی تێرکردنی ئەندێشەی حەزە هەستیەکانێتی، یان وەك خەونەکان هەوڵی خۆگونجاندن دەدات، بۆ ئەوەی لەململانێکان لەگەڵ هێزەکانی چەپاندن ڕزگاری بێت، بەڵام هەوڵەکانی نەرگزە خەون، کەئامانجی وروژاندنی خەڵکانی دیکەیە جیاوازەو لەتواناشیدایە حەزە نەستیەکان بوروژێنێ و قایلیان بکات.

ململانێ سەرچاوەی داهێنانە، ئەركی فەرمانی دەرونی لەرەفتاری داهێنەراندا ئازادکردنی چەپێنراوەکانە بەئەندێشە ڕەهاکان و هزرە پەیوەندیدارەکان بەزیندەخەون و گەمەو یاریەکانی سەردەمی منداڵی، تەنها كەسی داهێنەرە ئەم هزرە ئازادانە پەسەند دەکات، كاتێك کردارە نەستیەکان لەگەڵ خۆیاندا هەماهەنگ دەبن، ئەوا لەگەڵ بەدیهێنانی ئەو بەرهەمانەدا کەبواری سەرکەوتن بۆ وەدەستهێنانی بەرکەماڵی دەرەخسێنێ، فرۆید ئاماژە بەوە دەدات کەخەڵکانی بەختەوەر پەنا بۆ ئەندێشە نابەن، تەنها چەوساوەکانن هزرە برسیەکان دەکەنە سەرچاوەی ئەندێشە، چونکە هەموو ئەندێشەیەك دەبێتە هۆی تێرکردنی یەکێك لەحەزەکان.

ئەو زانایانەی کەگومانیان لەتیۆرەکانی فرۆید سەبارەت بەخەون هەیە، ئەو ئێستا دان بەوە دادەنێن فررید ڕاستی وتووە کەسەرچاوەی خەو حەزێکی شاراوەیە، بەڵام زانایان لەشەستەکاندا گاڵتەیان پێکردو وتیان زۆرماوە (کات) یان دۆزیوەتەوە کەپەیوەندی بەخەوەوە هەیە کەپێی دەڵێن ساتەکانی جوڵەی خێرای چاو، کەبەشێك لەمێشك بەڕێوەی دەبات پەیوەندی نییە بە کردەکانی ئەقڵەوە، کەچی زانایان ئێستا دەڵێن جوڵەی خێرای چاو پەیوەندی نییە بەخەوەوە.لەلێکۆڵینوەیەکی نوێدا (مارك سولم) کەپسپۆری دەمارەکانە لەخەستەخانەکانی سانت بارسولومی و شاهانە لەلەندەن دەڵێت: ناوەندی خەوەکان لەبەشێکی مێشك دایە پێی دەوترێت یەکەکانی دۆبامینی دەماری.

سولم لەکۆنگرەیەکی ساڵانەی کۆمەڵەی پێشکەوتنی زانستی ئەمریکایی لەئەناهایم دەڵێت: ئەوەی کەهەتا ئێستا کراوە بریتیە لەو تێستانەی کەلەسەر٢٦نەخۆش کراوە لەئەو بەشەی

مێشکی توشی زیان بووه کەباسمان کرد، بەڵام لەکۆبوونەوەیەك کەلەسەر ٣٥٠توشبوو کراوه کەناوەندی خەویان کەبریتیە لەتۆڕێك لەلیمف لەبەشی پێشەوەی مێشك زیانی پێگەیشتووه دەرکەوتووه کەئەو توشبووانە خەو نابینن.

سولم دەڵێت: ئەو بەشەی مێشك کەتوشی زیانێك بوو ئەوا چیتر ئەو کەسە خەو نابینێت، هەروەها دەڵێت: یەکەکانی دۆبامینی دەمار کەلەبەشی پێشەوەی مێشکدایە سیستمەکانی حەزو ئارەزوەکان و پاڵنەرەکان، واتە سیستمی ئارەزوەکان ئاگادار دەکاتەوە ئەمەش گەڕانەوەیە بۆ تیۆرەکەی فرۆید..هەروەها سولم ئاماژە دەکات کەوا تیۆرەکەی فرۆید دەڵێت: پرۆسەی بیرکردنەوە هاندەری خەوە، زانایەکی تر کەناوی مۆرتون رایزەرەو پسپۆری دەمارە لەزانکۆی ییل دەڵێت سەرەڕای ئەوەی لێکۆڵەرەوان دەڵێن تیۆرەکەی فرۆید کاتی بەسەر چووەو لەگەڵ دەمارناسی نوێدا ناگونجێت، لەلایەکی دیکەوە لێکۆڵەرەوان دەریانخستووە کەوا ئەو تیۆرە بەتەواوی لەگەڵ دەمارناسی نوێدا دەگونجێت، هەروەها رایزەر دەڵێت: لەوانەیە خەو رۆڵێکی گرنگ ببینێت لەشیکردنەوەی دەرونیدا.

## تەکنۆلۆژیای رەفتار:

**رەفتاری سەرپێچی یان بەفێربوون و وشیاربوونەوە راست دەکرێتەوە یان بەسزا، نەوەیەك سزا ئەدرێ بۆ ئەوەی نەوەی دوای ئەو لێوەی فێر بێت.**

پابەندبوون بە رێساو یاساکانی ژیانی کۆمەڵایەتی و شارستانی و مەدەنی بواری هاتوچۆ، پەروەردە، ژینگەو دارایی و کارگێڕی و...تد نیشانەی رەفتاریماڵیکراوی مرۆییەو ئومێدبەخشی ئایندەیەکی رووناکە، کەدەوڵەت و کۆمەڵ و تاك لەسایەیدا بحەسێتەوە، دەوڵەت لەرێگەی دەسەڵاتە دامەزراوەکانیەوە مافی خۆیەتی یاساکان بەشێوەیەکی توندو کاریگەر بسەپێنێ لەپێناو فێرکردنی دانیشتوان کەچەند پێویستە پابەندی یاسابن لەهەر بوارێکدابێ، ئەم جۆرە فێرکردنە لای زانایانی دەروونی وەکو سکنەرو باڤلوف و زانیاری بواری رەفتارناسی دیکەش پێی دەوترێ تەکنۆلۆژیای رەفتار، کەدەکرێ دامەزراوەکانی دەوڵەت وەکو سەرپێچیکار یان بۆ چارەسەرکردنی رەفتارو هەڵسوکەوتی سەرپێچیکارانی بواری دارایی و کارگێڕی و..تد، کەنابێ دەوڵەت چاوپۆشی لێبکات، وڵاتانی ئەوروپاو بریتانیا بەتایبەتیش کەزیاتر لە۳۰۰ساڵە دەوڵەتە سیستمی سزادانی زۆرکارامەو ئەکتیڤە لەسەرجەم بوارەکانی جیاجیاکانی ژیانی هاوڵاتیانیدا، چونکە بەردەوامبوون لەسەرسزادانی

سەرپێچیکاران  دەبێتە رێچکەیەك و بەئاسانی و بەبێ ترس پەیڕەو دەکرێ، وەك چۆن ئەگەر منداڵ هەڵە بکات و بۆی راست نەکرێتەوە ئەوا خووی پێوە دەگرێ و دەبێتە بەشێك لەکەسێتی، بەو شێوەیەش سەرپێچیکارانی ناو دامودەزگاکانی دەوڵەت وەك خۆیان دەمێننەوەو گۆڕانکارییان بەسەردا نایەت و یاساکانی سزاش وەکو حیبری سەر کاغەز دەمێننەوە بێ ئەوەی پەرەسەندن بەخۆوە ببینن.

پاڤلوڤ و سکنەر رۆڵی خۆیان بینیوە لەچارەسەرکرن و راستکردنەوەی رەفتار، بەتایبەتی لەوڵاتانی وەکو ئەمریکاو روسیاو بەریتانیاو زۆر لەوڵاتانی دیکە، ئەو چارەسەرکردنەش پێی دەڵێن چارەسەرکردنی بەزۆر (العلاج بالاکراە)، کە لەرێگەی پێبژاردن یان هەر سزایەکی دیکە پەیڕەو کراوە، مرۆڤ ئەگەر رکی لەو یاسایەش ببێتەوە، یان ئەنجامی ئەو سزایە مایەی دڵتەنگی و ناخۆشی بێت بۆی ئەوا هەوڵدەدات لەو ئێش و ئازارە پێیگەیشتووە بەهۆی ئەو سزایەوە دوور بکەوێتەوە تا خوو بەرەفتاری راستەوە دەگرێ و توخنی سزادانی پەیڕەوکردووەو سوودیان لێبینیوە بۆ پابەندکردنی تاك بەیاساو رێسکانەوە، بەتایبەتیش یاساکانی هاتووچۆ، کەنیشانەی شارستانیەت و بەمەدەنیبوونی سەرپێچیکارانە، بەتایبەتی لەم دونیا پڕ هەراو جەنجاڵەی ئۆتۆمبیل و رێگاوبان و شوێنە گشتیەکان، ئەو پابەندبوونە بۆتە کلتورو دابونەریتێکی ئارەزوومەندانەو بەبێ چاودێری راستەوخۆی سیستەمی دامودەزگاکانی دەوڵەت مرۆڤ پەیڕەوی دەکات، نهێنی ئەم پەیڕەوکردنەش لەوەدایە کەنەوەیەك بەزەبرو توندوتیژی یاساو رێساکانی بەسەردا سەپێنراوەو پەیڕەوی کردووە، نەوەی دوای ئەویش بەلاساییکردنەوە فێری ئەو پابەندبوونە دەبن و ئیدی دەبێتە کلتورێك لەرەفتاریانداو ئارەزوومەندانە رەفتاری پێدەکەن.

بەڵام بەداخەوە لەکۆمەڵگەی ئێمەدا سیستمی هاتووچۆ یان هەرسیستمێکی دیکەی دامەزراوەکانمان یاساو رێساکان بەتەواوی نەسەپاندووەو جێگیر نەبووە، چونکە نەیتوانیوە دەسەڵاتی تەواوی خۆی بسەپێنێ، کەواتە پێویستی بەدەسەڵاتی جێبەجێکار و شێوازی توند هەیە کەبەیەکسانی سیستەمەکانی خۆی بەسەر هەموو کەسێکدا بسەپێنێ وەکو ئەو پۆلیسە ئینگلیزییە کەتوانی یاسای هاتوچۆی وڵاتەکەی بەسەر (چەرچل) ی سەرۆك وەزیرانی خۆیدا بسەپێنێ، لەوڵاتی ئێمە سەیر نییە ئەگەر بڵێین کەسێك بە شێت لەقەڵەم دەدرێ ئەگەر وەکو کەسانی دیکەی دەوروبەری ترافیکی سوور نەبەزێنێ، یان ئەگەر  وەك خەڵکی دیکە کارەبا چەتاڵ نەکات، یان ئەگەر منداڵێك لەنێو کۆمەڵە منداڵێك دەستوەشێن نەبێت ئەوا بەڕێوی و

ترسنۆکی لەقەڵەم بدەن لەم حاڵەتەدا، کەسی سەرپێچیکار مێگەلیانە رەفتار دەکات، واتە ئەگەر خەڵکانێك سەرپێچی بکەن ئەویش وەکو ئەوان دەکات، بیّ ئەوەی لێکی بداتەوە بۆیە پێویستە یاسای زۆر توند هەبێت و پەیڕەو بکرێت بۆ سەپاندنی یاساو رێساکانی دامەزراوەکانی دەوڵەت، بەتایبەتیش یاساکانی هاتووچۆ و پار استنی ژینگە کە سزایەکی ئەوتۆ پەیڕەو بکریّ کەس توخنی سەرپێچیکردن نەکەوێتەوە، ئیدی ئەم ترس و بەتوخن نەکەوتنە دەبێتە رەفتارێکی پەیڕەوکراو، نەوەکانی دواتریش ئاقڵ دەبن، مێژووش سەلماندوێتی کەوا قۆناغێك لەدیکتاتۆریەت بۆ سەپاندنی یاساکان زەرورە لەپێناو بەرژەوەندی گشتی تا بەتەواوی تاکەکان پەیرەوی دەکەن و تاکەکانی نەوەیەکی دیکەش فێری دەبن.

بەپێی راپرسیەك کەنووسەر لەشاری هەولێر لەسەر٤٣٠ کەس ئەنجامی داوە لەهاوینی ساڵی ٢٠١١دەرکەوتوە رێژەی ٪٩٠سەرپێچی یاساکانی هاتوچۆیان کردووەو زۆربەی زۆری سەرپێچیکردنەکانیش رەگەزی نێرن و رێژەی ٦٥٪ بەشداربووانی راپرسیەکە سەرپێچیکردنی دووبارەیان هەیە، ئەو رێژانە رێژەگەلێکی مەترسیدارن ئەگەر هەروا بەردەوام بێت، کەباشتر وایە وشیاری یاساپارێزی و پابەندبوون پێوەی پێش پێدانی مۆڵەتی لێخوڕینی ئۆتۆمبیل بەو کەسانە بدرێت.

## یەکەم هەستی دڵەڕاوکێ:

**کێشمەکێشی نێوان (من) و (ئەو) سەرچاوەی دڵەڕاوکێیە، تا ئەو کێشمەکێشەش بەردەوام بێت هەرگیز بێ دڵەڕاوکێ نابی.**

دڵەراوکێ (anxiety) هەستی مرۆڤە بەترسێکی بێ پاساو، یان ترسی مرۆڤە لەترس، دەترسێ شتێك رووبدات یان دەترسێت رووبەرووی ترس ببێتەوە بێ ئەوەی پاساوێك لەئارادا بێت، ئەمەش دەبێتە مایەی نائاسودەیی دەروونی و بارگرژی، بیرورای جیاواز هەیە سەبارەت بەدڵەراوکێ کەهەر زاناو هەر قوتابخانەیەك یان هەر بیردۆزێك بەشێوەی جیا دڵەراوکێ لێکدەداتەوە یان هەر کەسەو دڵەراوکێ دەگەڕێنێتەوە بۆ فاکتەرێك یان رەچەیەکی کۆمەڵایەتی یان دەروونی، سیگموند فرۆید پێیوایە دڵەراوکێ دەگەڕێتەوە بۆ هەوڵەکانی (ئەو) بۆ زاڵ بوون بەسەر منی باڵاو تێرکردنی مندا، ئەریك فرۆم پێیوایە تێرنەبوونی پێویستیەکانی مرۆڤ بە ئینتیماو ئاسایشی دەروونی سەرچاوەی دڵەراوکێن، یەکەم هەستی دڵەڕاوکێ یان یەکەم سەرهەڵدانی لای مرۆڤ دەگەڕێتەوە بۆ سەربەخۆبوونی تاك و بەجێهێشتنی قۆناغێك وەکو قۆناغی لەدایکبوون، کەمنداڵ قۆناغی کۆرپەلە (ناوسکی دایك) ی بەجێدێڵێ و دێتە دونیاوە، ئەو ئارامی و هاوسەنگیەی ژینگەی منداڵدان لەدەست دەدات و دووچاری ئێش و ئازارو مەینەتیەکانی ژیان دەبێتەوە، هەر ئەمەشە کەهەندێ لەزاناو فەیلەسوفان بۆی دەچن کەوا ژیان مەرگەساتە، ئەو سەربەخۆبوونە جیابوونەوەی کۆرپەلەیە لەناوکەپەت و پشت بەخۆبەستن بەتایبەتی لەهەڵمژینی ئۆکسجین لەرێگەی کونە

لووت و سیەکانەوە، کەبەهۆی هەوا هەڵمژینی یەکەمجارەوە ئازاری پێدەگات و دەبێتە هۆی گریاندنی منداڵەکە، کە زۆر لەخەڵکی ئەو گریانە بەو مانایە لێکدەدەنەوە گوایە منداڵ دەزانێ ژیان تاڵ و مەرگەساتە پاشان قۆناغی لەشیربڕینەوە، کەسەربەخۆبوونێکی دیکەی منداڵە لەدایك و لەژینگە کەبۆی رەخساوە کاتێ مەمەکە دەگاتە دەمی پێداویستیەکانی دابین دەکرێ  و دوای ئەوە دەبێ پشت بەخۆی ببەستێ، ئەم پشت نەبەستنە بەکەسانی دیکە جۆرە سەربەخۆییەکەو لەهەمانکاتدا ترسیشی لەگەڵدایە، چونکە بۆ ئەو قۆناغێکی نوێیەو لەهەموو شتێکی نوێ مرۆڤ دەترسێ تا لەگەڵیدا رادێت تا بەدیهێنانی ئەو راهاتنە ئەو مرۆڤە لەرەوشتێکی دەروونی ئەوتۆیە، کەپێی دەوترێ دڵەڕاوکێ.

چوونە قوتابخانەو بەجێهێشتنی ژینگەی ماڵ جۆرە دابڕانێکی دیکەی منداڵە لەو ژینگەیەی کە لەگەڵیدا راهاتووە، بەڵام کەئێستا بەرەو قوتابخانە (ژینگەی نوێ) دەکەوێتەڕێ رووبەرووی کۆمەڵێك ئەزموونی تازە دەبێتەوەو پێویستی بەماوەیەك هەیە تا لەگەڵیدا خۆی رادەهێنێ، بۆیە دوچاری دڵەراوکێ دەبێتەوە، هەر لەم قۆناغەدا پێویستە پابەندبێت بەیاساو رێساکانی قوتابخانە لەچوونە ناو پۆل و هاتنە دەرەوەو هاتنی مامۆستاو چوونە دەرەوەی وئەنجامدانی ئەرکەکانی خوێندن و بێدەنگی نواندن و رێزگرتن لەکات کەهەمووی بۆ ئەو نوێیە، دوای ئەو قۆناغی دڵەراوکێیەش منداڵ دەچێتە قۆناغێکی دیکەی ژیانەوە ئەویش بەجێهێشتن وفرێدانی کۆمەڵێ دابونەریتە کەتایبەت بوو بەخۆی، بەڵام کەژیانی هاوسەرێتی پێکدێنێ لەوە دەترسێ کەچۆن لەگەڵ ژیانی بگونجێ و چۆن لەگەڵیدا خۆی رابێنێ، لەم قۆناغەدا بەتەواوی لەژیانی زگوردێتی جیا دەبێتەوەو ترسی ژیانی نوێی لێدەنیشێ، جگە لەئۆرتورلنگ زانایانی دیکەش لەهەمان روانگەوە دەڕواننە دڵەراوکێ لەوانەش فرۆید کەپێشتریش ئاماژەمان پێداو هاوکات پێیوایە دوای لەدایکبوون ئێشوئازار مرۆڤ لەوە وشیار دەکاتەوە کەژیانێکی دیکە دێتە کایەوەو ژیانی پێشتر کەهاوسەنگی و ئارامی بەخۆیەوە بینیوە بەسەر دەچێ و مرۆڤ بەتەواوی لێی دادەبڕێ، نەك لەبەرئەوەی لەدایکی جیادەبێتەوە، بەڵکو بەهۆی مەینەتی و ئازارەوە، لەمیانەی ئەو دابڕانە تاك دووچاری دڵەڕاوکێ دەبێتەوە، هەندێ لەفەیلەسوفانیش پێیان وایە یەکەم گریانی منداڵ دوای لەدایکبوون نیشانەی ماتەم و خەم بوو کەژیانە نوێیەکە چاوەڕێی دەکات، لەلایەکی دیکەوە زانای ئەمریکی ئەریك فرۆم پێیوایە پەیوەندی منداڵ بەدایك و هەستکردن بە ئینتیماو خۆشەویستی و ئاسایشی پێدەبەخشێ، بەڵام لەگەڵ گەورەبوون و پشت نەبەستن پێی لەدابینکردنی پێویستیەکانی تۆوی دڵەراوکێ لەمنداڵدا دروست دەبێ، کاتێکیش منداڵ پشت بەخۆی دەبەستێ لەدابینکردنی پیویستیەکانی لەوەش دەترسێ کەرووبەرووی مەترسیەکانی ژیان ببێتەوە، ئەو مەترسیە دەبێتە مایەی دڵەراوکێ بۆی، منداڵ بەهۆی زەبروزەنگی کەسانی دەوروبەر تواناکانی خۆی دەچەپێنێ، بەڵام لەدوایدا لەکاتی پێویست بوون

بەنیشاندانی ئەو توانایە دوچاری دڵەراوکێ دەبێتەوە، دیارە ئەم هەستکردنەی بەدڵەراوکێ بۆ ئەوەیە نەك لەجێبەجێکردنی تواناکانیدا شکست بێنێ، کارین هۆرنی پێیوایە پاڵنەری شەڕانگێزی سەرچاوەیە بۆ دڵەراوکێ نەك پاڵنەرە سێکسیەکان.

هەندێ لەزانایانیش هەستی دڵەراوکێ دەگەڕێننەوە بۆ بۆماوەو گوایە پەیوەندی بەفێربوون و هەڵوێستی کۆمەڵایەتی و دەرونیەوە نییەو مرۆڤ لەگەڵ لەدایکبوونی دڵەراوکێش لەگەڵیدا لەدایك دەبێت، واتە دڵەراوکێ لەنەوەیەکەوە دەگوازرێتەوە بۆ نەوەیەکی دیکە، هەورەکو چۆن خەمۆکی و شەکرەو شێرپەنجەو نەخۆشی دیکە دەگوزارێتەوە بەهۆی جینەکانەوە، ئاوهاش دڵەڕاوکێ لەرێگەی کرۆمۆسۆمەکانەوە دەگوازرێتەوە، دڵەراوکێ ئامادەباشی لەمرۆڤدا هەیە، بەڵام مەرج نییە ئەو مرۆڤە سیفاتەکانی تێدا دەربکەوێ، خۆ ئەگەر ژینگەکەی لەبارو گونجاو بوو بۆ دڵەراوکێ ئەوا دڵەراوکێ تیایدا سەرهەڵدەدات، هەندێجاریش مرۆڤ ئامادەباشی دڵەراوکێی تێدایە بەڵام مەرج نییە سیفاتەکاتی تێدا دەربکەوێ، چونکە ژینگە ئابووری و دەروونی و کۆمەڵایەتەکانی رێخۆشکەر نەبوون بۆی، هەندێ لەزانایانی بواری سایکۆلۆژی لەوباوەڕەدان کەدڵەراوکێ فێربوونێکی کۆمەڵایەتیە لەئاکامی پەیوەندییەکان لەنێوان تاکەکان، کەرەنگە پەیوەندی نەرێنی بێت وەکو خۆنەگونجانی تاك لەگەڵ دەوروبەر، پاڵنەری سێکسی یەکێکە لەهۆکارەکانی دروستبوونی دڵەراوکێ، کاتێ ئەو پاڵنەرە دووچاری چەپاندن دەبێتەوە لەبری ئەو چەپاندنە دڵەراوکێ لەرەفتاری ئەو کەسەدا دەردەکەوێ، کەواتە لەکۆمەڵگەی کوردەواری خۆماندا بەگوێرەی چەپاندنی زۆری سێکسی زۆر لەتاکەکانی کۆمەڵگە دووچاری دڵەراوکێ دەبنەوە، چونکە زۆربەی گەنجەکانی ئەمە کۆمەڵگایە دوای خوێندن یان دوای ۲۰ساڵی ژیانی هاوسەری پێکدێنن تا ئەو تەمەنەش بێگومان لەوپەڕی حاڵەتی چەپاندندایەو باوەڕیش ناکەم ئەو تاکانە خۆیان لەقەرەی سێکسی قەدەغەکراو بدەن، چونکە توشبوون بەدڵەراوکێ زۆر ئاسانترە لەرووبەرووبوونەوەی دابونەریتەکانی کۆمەڵگا، بەو پێیەش چەپاندن زۆرە، لایەنی گوزەران و ئابووری زۆر کاریگەرە لەسەرهەڵدانی حاڵەتی دڵەەراوکێ، چونکە مرۆڤ بۆ تێرکردنی پێویستیەکانی ژیانی رۆژانەی و زەوق و جوانییش دوچاری دڵەراوکێ دەبێتەوە، لەبەرئەوەی بەپێی پێویست ناتوانێ تێریان بکات، زانای دەرونی ئەمریکی ئەدلەر پێیوایە منداڵ کەهەست بەلاوازی دەکات و خۆی بەکەم دەزانێت، ئەو هەست و خۆبەکەم زانینە سەرچاوەی زیندووی دڵەراوکێن، هەروەها پەروەردەی دایکی لەبەنازکردن یان فەرامۆشکردنی منداڵێکی دیکەی رێخۆشکەرە بۆ چاندنی تۆوی دڵەراوکێ لەمنداڵدا، بەگوێرەی راوبۆچوونی ئەو زانایە وا دەردەکەوێ کەوا دڵەراوکێ زیاتر پەیوەندی بەژیان و باری دەروونی قۆناغی سەرەتای ژیانەوە هەیەو زۆربەی زانایانیش لەو باوەڕەدان هێدمەی لەدایکبوون نموونەی راستەقینەو بنەڕەتی دڵەراوکێیە.

# شێوەناسی:

**سەرزلی نیشانەی زیرەکی نییەو پێی زلیش مەینەتی نییە!**

هەر لەدێر زەمانەوە مرۆڤ هەوڵی ناسینی تاکەکانی دەوروبەری داوە بۆ ئەوەی بتوانێت هەڵسوکەوت و رەفتاریان لەگەڵدا بکات و لەجێی شیاو دایانبنێت، بۆ ئەو مەبەستەش گەلێ رێگەی گرتۆتە بەر کە دوورە لەئەزموون و زانستەوە، وەك شێوەناسی (physiognomy) تێبینی کردن، رێنووس و ئیمزاو هەستی ناوەوە....تاد، هەندێ لەدەروونناسان دەڵێن: مرۆڤەکان مەیلی ئەو کەسانە دەکەن کەهەست دەکەن زیاتر هاوشیوەی خۆیانن لەوانەشە ئەو هاوشێوەبوونە فریودان بێت یان رواڵەت بێت، زورجاریش هەندێ خەڵك زیاتر لەهەندێکی تریان مۆرکێك سەبارەت بەکەسێك وەردەگرن ئەم مۆرك وەرگرتنە پەیوەندی نییە بەزیرەکیەوە، بەڵکو پەیوەندە بەحەدەس (الحدس) ەوە هەیە، حەدەسیش بریتیە لە پەیامێك لەناخی مرۆڤەوە، کەبەهەست هەستی پێ ناکات، ئەو کاتەش پەنای بۆ دەبات کەشتێك نازانێ بێ ئەوەی بزانێ کەچۆن دەیزانێ، حەدەس هەستکردنە بەشتێك کەنابینیرێ و شرۆڤە ناکرێت، زۆرجاریش هەستی سۆزی و مادی بەهێزی لەگەڵدایە واسەیر دەکرێت کە زەنگێکی هۆشدارییە، هێزی دەلالەت لەتێڕوانینی یەکەمجار بۆکەسێك.

شێوەناسی زۆر کۆنە کەدانەرانی هەوڵیان داوە بەلکاندنی ئەندامێك بەئەندامێکی ترەوە پەیوەندی نێوان شێوەی جەستەو میزاجی دەروونی و رەوشت بدۆزنەوە، لەوانەش شێخ ئیبنول عەرەبی کەدەڵێ سپی پێست و چاو شین و پرچ زەرد نیشانەی خیانەت و غەش و کەم عەقڵییە ئەگەر تەویلێشی پان و چەناگەی تەسك بوو ئەوا پێویستە خۆتی لی بپارێزی هەروەکو چۆن خۆت لەمار دەپارێزی، هەروەها لەسەر زاری حەکیمان دەڵێ پرچی زبر نیشانەی ئازایەتی و دروستی مێشکەو پرچی نەرمیش نیشانەی گەوجێتی و جورئەتە، زۆری مووش لەسەر سینگ و سك نیشانەی دڕندەیی و کەم تێگەیشتن و ستەمە، پرچی زەردیش نیشانەی گەوجێتی و زۆر توڕەبوون و زوو زاڵبوونە، پرچی رەشیش نیشانەی عاقڵمەندی و ئارەزووە بۆ دادپەروەری، لەنێوان هەردووکیشیان نیشانەی مام ناوەندییە، ئەوانەی ملیان کورتە حەسودو فێڵبازن و ئەوانەی ملیان درێژە نیشانەی گەوجێتی و ترسنۆکیەو ئەگەر سەریشی لەگەڵدا بچووك بوو ئەوە گەوجێتی و هیچوپوچییە، مل ئەستورییش نیشانەی کەرێتی و زۆرخورییەو سك گەورەش واتە ورگن نیشانەی گەوجێتی و کەرێتی و ترسنۆکییە، سکی بچوك و سنگی تەسك نیشانەی عاقڵمەندی و جوانڕاییە، پانی شان و پشت نیشانەی ئازایەتی و کەم عەقڵییەو ئەوانەی پشتیان خوارە نیشانەی خراپەو پشت راستیش نیشانەی باشەو بەرزی هەردوو شانیش نیشانەی نیەتخراپی و ناشیرینیە، هەردوو قۆڵیش ئەگەر درێژبوون تا سەر ئەژنۆ نیشانەی ئازایەتی و کەرەم و دەروون پاکییەو ئەگەر کورتیش بوو نیشانەی ترسنۆکی و شەڕخوازییە، زانا کرتشمەریش لەو زانایانایە کەویستویانە لەشێوەوە خەڵك بناسن، بەڵام ئەمیش بەرهەڵستکاری زۆر بوو و بیروراکایش کۆدیتایەك بوو بەسەر هزری زانستیدا)، بیروڕاکانی کرتشمەر کەموکورتی تێدا دۆزراوەتەوە، بەڵام لەهەمان کاتدا لەمەیدانی پزیشکیدا سودی لێبینراوە بەپێی بیردۆزەکەی کرتشمەر مرۆڤی لاواز و باریکەلە لەو کەسانەیە کەئامادەباشیەکی زۆری تێدایە بۆ نەخۆشیەکانی سیل و هەوکردنی گەدەو نەخۆشیەکانی گورچیلە و چەند نەخۆشیەکی تر، هەروەها بۆ پزیشکیش گرنگە بزانێت کەسی قەڵەو لەوانەن ئەگەری زۆریان تێدایە بۆئەم نەخۆشیانە: هەوکردنی زراو، پەنکریاس، شەکرە، رەقبونی خوێنبەر و نەخۆشی تر.

بیردۆزەکەی کرتشمەر بەپێی سەرچاوەکان تەنها لەتەشخیسکردن نەوەستاوە بەڵکو لەروی چارەسەریشەوە سودی هەبووە.

بیردۆزی کرتشمەر تەنها لەرووی پزیشکیەوە ئەسپی خۆی تاو نەداوە بەڵکو لەرووی کۆمەڵایەتیشەوە هەنگاوی ناوە لەئاشکراکردنی نهێنیەکانی جەستە، هەروەها زانا بابنیسکی سەبارەت بەکۆئەندامی دەماری دەڵێ هەر سانتیمەترێك لەقەبارەی دەست و هەر پلەیەك لەگۆشەی چەناگەو هەر موویەك لەجەستە واتای خۆی هەیە و گرنگیی خۆی هەیە.

هەروەها ئیمرسون دەڵی ئەوەی چاو دەیڵیت زۆر زیاترە لەوەی زمان دەیڵێت.

بەڵام هەندێکی تریان باوەڕیان بەشێوەناسی نییەو دەڵێن شێوەناسی زانست نییەو بەزانست ناژمێردرێت و ناشگاتە ئاستی زانست، باشترین بەڵگەش بۆ ئەو نازانستیە لێکۆڵینەوەکانی (گۆلتون و بیرسۆن و گۆرنج) ە، کەهەڵەو نازانستی ئەم شێوەناسینەیان سەلماند، شێوەناسی زۆر لەمیللەتان لەژیانی رۆژانەو لەناو خۆیاندا پەیڕەوییان کردووە، کوردیش بەکاری هێناوە کەوتویێتی (سەری زل دەوڵەتەو پێی زل مەینەتە) یان دەڵێن فلانە کەس دەناسین هەر بەچاویدا دیارە، بەڵام بەشێوەی گشتی سیمای دەمووچاو و قەبارەی سەرو بەژن وبالاّ کاریگەری نەستیانە لەهەڵسەنگێنەر دەکات، کەزیرەکی و لێوەشاوەیی و شیاندنی بۆ کارو پیشەیەك لەفەرمانگەیەك ببەستێتەوە بەسیمای دەمووچاو و کاسە سەر، لەراستیشدا هۆی ئەو دیدوبۆچوونە دەگەڕێتەوە بۆ سایکۆلۆژیای مێژوو و کەماوەیەك هێزو بازوو بەگوێرەی تیۆری نەستی کۆمەڵایەتی (یۆنگ) کاریگەری لەسەر هەستی کەسەکان دروست بکات، واتە ئەو بۆچوونە هێشتا ماوە، شێوەی مێشك (phrenology) کەمانای شارەزایی و زانیاری سەبارەت بەهێزەکانی دەروون دەگەیەنێت بەگوێرەی شێوەی کاسە سەر، کاتێك کەناوچەکانی هەست و جوڵە لەمێشکدا دۆزرانەوە هەندێ کەس وای بۆچوون کەشێوەی کاسە سەر شێوەی مێشك دەردەخات، لەئەنجامی ئەوەش ئەدگارە زگماکیەکانی کەسێك بێ تاقیکردنەوەی ئەو گریمانەیە دەردەکەوێت پێیان وابوو شوێنە بەرزو زەقەکانی سەر هەردوو گوێ ئارەزووی وێران کردن و تێکدان دەردەخات، ئەو شوێنە بەرزانە ئەگەر لەجێگای تریشدا بن ئەوا مانای جۆراوجۆر دەبەخشن، بڕواشیان وابوو، کە (٣٥) ئەندامی مێشك یان زیاتر شوێنی بەرزیان هەبێت و هەریەکە لەو شوێنانەش مانای خۆی هەیە، هەروەها پلەی پێگەیشتن، کەلەرێگای ئەو شوێنە بەرزانەوە وەردەگیرێ خاسیەتی ئەخلاقی دیاری کراو دەردەخەن، پاشان ئەو بانگەشانە بەزانستی شێوەی سەر ناوبرا، لەراستیشدا شوێنە هەقیقیەکانی مێشکیش دوورن لەبانگەشەی شێوەناسیەوە، چونکە زانستی نوێ زۆر راستی درکاندووە، کەم تا زۆر لەدەرگای

شێوەناسی نادەن، سەلماندنەکانی شێوەناسیش لەرێگەی شێوەی سەرومل نیشانە بەرزەکان دەرناکەوێت، چونکە ناوچەی جوگرافی و ئاووهەواو ژینگەی خۆراك رۆڵی تایبەتیان هەیە، لەشێوەپێدانی شێوەی سەر، ئەوەتا هندرسون وتویەتی ژینگەی دەوڵەمەند دەبێتە هۆی زیادبوونی کێشی مێشکی جرج (مشکی گەورە)، یان ئەگەر بەشێوەیەکی گشتی بڕوانینە پشتەسەری تاکی کورد سەیر دەکرێت کەتەخت و پانە ئەویش لەئەنجامی بەخێوکردنێتی لەنێو (لانك)، کەچی میللەتانی تر شێوەیان جیاوازە، دانیشتوانی ئێستای فەرنسا (دوایین) سەدە لەدانیشتوانی پێشتری فەرەنسا نزیکەی ٦سم درێژترن لەبەژن و باڵادا هۆی ئەوەش بۆ رادەو چەشنی خۆراك دەگەڕێتەوە.

پشکنینەکانی توێکاریزانی کەلەسەر مێشك ئەنجام دراون ئەوەیان دەرخستووە کەشێوەی دەرەوەی کاسە سەر لەگەڵ رووی مێشك جووت نییە.

شێوەناسان هەوڵی بەردەوام دەدەن بۆ زانینی بنچینەکانی خاسیەتی کەسایەتی وەکو لوتف و رێزو پیاهەڵدان و حەسودی، کەچی ئەو خاسیەتانە مرۆڤ لەژینگەوە فێری دەبێت و شێوەی دەم وچاویش هیچ پەیوەندییەکی بەوەوە نییە، ئەگەر واش نەبوایە ئەوا جیاوازی لەنێوان مرۆڤی نیاندرتاڵ و مرۆڤی کرۆمانیون و مرۆڤی ئێستا نەدەبوو، سەربای ئەوەش ئەو خاسیەتانە دەرهاویشتەی هەڵوێستە دەرونیەکانی ئێستاو رابردووو تەنها هۆیەك وەك بۆ ماوە لێی بەرپرس نییە، لەوبارەیەوە کە کۆنفۆشیۆس (٥٥١-٤٧٨) پ.ز وتویەتی: سروشتی دانیشتوان و خەڵك هەموو هەر یەکن، بەڵام دابونەریتەکان لەیەکیان دووردەخاتەوە، تێستەکانیش ئەوەیان دەرخستووە، کەبناغەیەکی لەیەکچوو هەیە، سەبارەت بەسیفاتە زەینیەکان، بەڵام سەبارەت بە (میزاج) هیچ بەڵگەیەکی یەکلاکەرەوە نییە، کەبوونی جیاوازی زگماکی یان بۆماوەیی لەنێوان گروپەکانی بسەلمێنن، ئەو جیاوازیەش ئەگەر هەبێت ئەوا زۆر کەمترە لەنێوان تاکەکان و گروپەکانی کەژینگە درووست دەکات، چونکە بارودۆخی جوگرافی و ئابوری و ئاینی رۆڵی لەجولاندنی هەڵچوونەکانی مرۆڤ وەك رکوکینەو خۆشەویستی هەیە، نەك جەستەو شێوەی دەموچاو، هەموو خەڵکیش کەلەدایك دەبن هەمان بناغەی داهێنانیان هەیە، تەنها ژینگەیە جیاوازییان تێدا دروست دەکات، هەروەها کەسایەتی و سروشت دوو سیفەتن پەیوەندیان بەرەگەزەوە نیە، لەهەموو گروهێکی مرۆییدا هەموو چەشنە کەسایەتیەك هەیە،

هیچ بەڵگەیەکی زانستی نییە پشتگیری ئەوە بکات گروهێکی مرۆیی لەگروهێکی تر لەرووی کەسایەتیەوە بەهێزتر بێت، جگە لەرۆڵی ژینگە نەبێت.

بەگوێرەی شارەزایانی تایبەتی یۆنسکۆ لەپاریس هیچ بەڵگەیەك نییە ئەوە بسەلمێنێت کە گروهە مرۆییەکان لەرووی خاسیەتە زەینی و زگماکیەکان لەیەکەوە جیاوازبن ئەگەر لەرووی پلەی زیرەکی بووبێ یان میزاج، هەموو بەڵگە زانستیەکانیش ئاماژە بەوە دەدەن، کەمەودای توانستە عەقلیەکان لای رەگەزە جیاوازەکان تارادەیەك یەکن، ئەوانەی نیشانەی جەستەیی شێواویان پێوەیە وەك لێو قڵیشان کە لۆمبرۆزۆ ئاماژەی پێداوە گوایە ئەو کەسانە پیاو کوژن، ئەوەش راست نییە ئەگینا ماقووڵ نییە کوشتن بگەڕێنینەوە بۆ قڵیشانی لێو، هەروەسا ئەوانەی (گوێ) ی نائاساییان پێوەیە یان شەویلاگی سەرەوەیان زۆر ناشیرینە، ئەو سیفاتانە لەهەر کەسێکدا بێت ئەوا لەئەنجامی هەستکردن بەکەمی و بیرکردنەوە لەو حاڵەتە دووچاری شڵەژانی دەروونی دەبن و کار لەرەفتاریان دەکات، ئەگینا ناکرێ نە لەرووی یاساییەوە نە لەرووی ئاینیەوە ئەو جۆرە کەسانە بەکەسانی نائاسایی بێتە ئەژماردن، ئەوانەی لەرووی جەستەییەوە خەوشدارن دەتوانین لەرێگەی هۆشیارکردنەوە هەستێکی ئەرێنیان بدەینێ کەئەو خەوشە نابێتە کۆسپ بۆ پێشکەوتن، چونکە کاریگەرییە کۆمەڵایەتیەکان نەك بۆماوەییەکان زۆر زیاترن بۆ تێکچوونی مێشك و رێگە لەگەشەی مادەی سنجابی کەلەمێشکدایە دەگرن و چالاکی ئەنزیمیشی کەم دەکەنەوە، چیتر شێوەی دەموچاو و کاسە سەر پەیوەندی بەکەسایەتی مرۆڤەوە نییە، بەڵکو ژینگەو بۆماوە پێکەوە کەسایەتی مرۆڤ درووست دەکەن.

دیاریکردنی رەوشت و کەسایەتی لەرێگەی دەموچاوەوە باوەڕێکی لەنگ و شڵەژاوە ئەم نموونەیەش کە لە بلاکفوردو نیوکامبەوە وەرگیراوە نمونەیەکی ترمان دەداتێ سەبارەت بە شێوەی دەرپەڕیوی دەم و چاو کەهێزی ئەقڵی و جەستەیین پێکەوە، کەوا زێدەڕۆیی لەهزردا وا لەدەمووچاوی زێدە دەرپەڕیوو دەکات زیرەکی و لێهاتوویی بەکاریهێنێت، ئاگادارو وریاو چاوکراوە بێت، زوو جوڵەو بەگوڕوتین بێت، شەڕانگێزو بێ سەبربێت، زیادەڕۆیی بکات لەبڕوا بەخۆبوون، هەورەها (دەم) ی دەرپەڕیوی وای لێدەکات بەراشکاوی بپەیڤێت و هەندێکجاریش بەتوندی، بێ ئەوەی گوێ بداتە گفتوگۆ و دیبلۆماسیەت، بەڵام شێوەی دەموچاوی چاڵ بەپێچەوانەی دەرپەڕیو نیشانەکانی ئاکار، رێزوشارستانیە لەبیروڕادا توندنییە، لەهەڵسوکەوتیدا بەدیقەت و لەمیزاجدا لەسەر خۆیە، لەرۆیشتنیشدا چوست و چالاکە، زۆربەی

ئەوانەی دەموچاویان دەرپەڕیوە سورو سپین، تێکەڵبوون و هیواخوازی و گەشبینی و ماندوبوون و ڕێکخستن و داهێنان و ئەدگارەکانی زاڵبوون سیمای سوروسپییەکانە، لەگەڵ جوڵەسوکی و وریایی، هەروەها لایەنی زانستی و سیفاتی شەڕانگێزی بۆ دەم و چاوە دەرپەڕیوەکان، ئەو جۆرە کەسانە لەچەشنی کاروچالاکی دەستدرێژیدان ئەو سیفاتانە هەموو تایبەتن بەروخسارەوە، بەشێوەیەکی گشتی چالاکی و شەڕانگێزی و هێز زیاتر لەمرۆڤە پێست سورو سپیەکان دەردەکەوێت نەك ئەسمەرەکان، هاوکات لەبارەی١٨٧کەسەوە لە (لۆجیەludgateو یترسون pterson) پرسیارکرا کەچۆن ئەو ئەدگارانە کەباسمان کرد بەسەر سورو سپی و ئەسمەرەکاندا دابەش دەکرێن، لەوەڵامدا هیچ جیاوازییەك لەو بارەیەوە دەرنەکەوت، هەروەها زانایان و لێکۆڵەرەوانی شێوەناسی، کەروبەرووی ئەو راستیانە بوونەتەوە لەوانەیە دانیان بەوەدا نابێ، وەتەنها بەروخسارو شێوە ناتوانن کەسایەتی مرۆڤ هەڵبسەنگێنن، بەڵام هەر سوریشن لەسەر ئەوەی کەسیماکانی دەموچاو پێوەوەو زۆر شت دەردەخات، ئەگەر ئەمەش راست بێت کەواتە وێنەی فۆتۆگرافی بەهایەکی هەیە، لەگەڵ ئەوەشدا کاتێك ئەو هەڵسەنگاندنە لەگەڵ هەڵسەنگاندنی هاوڕێیان بەراورد دەکەین، پەیوەندیان لاوازە، لەبەرئەوە پێویستە هەڵسەنگاندنی جوانی و زیرەکی و لووت بەرزی و رالەخۆبوون بێبەڵگە ئاوارتە بکەین، وابڕواش دەکرێ ئەو هەڵسەنگاندنە کەپشت بەئەزموونی راستەقینەی کەسێك دەبەستێت زیاتر متمانەی پێدەکرێت لەوەی کەپشت بەوێنەیەکی فۆتۆگرافی ببەسترێت، کەوا جیاوازیەك لەنێوانیاندا نییە، هەرچەندە شارەزایانی شێوەناسی رووبەرووی هەمو جۆرە هەڵسەنگاندنێك بوونەتەوە کەپشتی بەوێنەی فۆتۆگرافی و تێبینیکردنی راستەقینەی کەسی مەبەست بەستووە، ئەوا بێگومان شێوەناسی پێویستە بەگوێرەی تۆژینەوەی درێژ رێکبخرێت، پێویستە چاوەڕوان نەکرێت کەسی ناشارەزا بڕیاری راست بدات، لەو حاڵەتەدا لەوانەیە شێوەناسان ئارەزووی ئەوە بکەن کەتوانای خۆیان بسەلمێنن، بەڵام تائێستا وادەرناکەوێت ئارەزووی ئەوە بکەن، هول کەیەکێکە لەشارەزایان و زانایانی شێوەناسی داوای لێکرا بەگوێرەی وێنەی هەتاوی خۆی گروپێك لەکیژانی بەشە ناوخۆییەکان هەڵبسەنگێنێ، بۆ تاقیکردنەوەش پێشتر لەلایەن سەرپەرشتکارانی ئەو بەشە ناوخۆییانە لەهۆڵی ناوخۆیی ئەو کیژانە هەڵسەنگێنرابوون، ئەو شێوەناسەش بڕیاری دابوو کەناوی خۆی نەدرکێنێ، ئەگەر لەحاڵێتێکدا سەریش نەکەوێ ئەوا هاوکاری ئەو ئەزمونەش ناکات، هول ئاماژەی بەوەدا کەوا ئەم هەڵوێستە سیمای گشتیە لای

شێوەناسان، ئەو بۆچوونە گومانی تێدایە ئەوە بسەلمێنێ کەوا پشکنینی شێوەناسان کەتایبەتن بە پەیوەندی نێوان دیمەنی تەنیشتی دەم و چاو خاسیەتەکانی کەسایەتی بێ خلتەوخەوش نییە، لەپێناو راستی و درووستی و بانگەشەکانی بلاکفوردو کامبی پێشوو ئیفان بەسەر پەرشتی هول پرسیاری ئاراستەی ٢٥ئەندامی بەشی ناوخۆیی کردووە بۆ ئەوەی کیژانی تر پۆلێن بکەن بەبەراوردو لەگەڵ گروپێك لەئەدگارەکان کاتێك ئەوە تەواو بوو، هەڵسەنگاندنی ١٣ناوبژیوان لەگەڵ ١٢کەسی تر بەراورد کرا، پەیوەندییە بەهێزەکانی نێوان ئەو گروپانە ئەوەیان دەرخست کەوا ئەم رێگەیە لەپۆلینکردنی ئەدگارەکانی کەسایەتی ئەنجامی راست بەدەستەوە دەدات لەنێوان گروپەکان، خشتەی ژمارە ١ماوەی پەیوەندی نێوان ئەم هەڵسەنگاندنانە دەردەخات کەلە١٢پۆل و گروپێکی تر کەلە١٣پۆل

**پێکهاتبوو سەبارەت بە ئەدگارە جیاوازەکانی کەسایەتی.**

لەخشتەی ژمارە ١دا دەردەکەوێت بەرزترین پلە بۆ خوازیاری و زاڵبونە، بەڵام ناوبانگی لەئاستی نزمدایە، ئەمەش مانای وایە ئەو کەسەی وا هەڵبسەنگێنرێت کەخوازیارەو ئارەزووی زاڵبونی هەیە بەرای ژمارەیەکی کەم دەیناسن، لەلایەن زۆربەی ئەوانەی دەیناسنەوە بەخوازیارو زاڵبوو دێتە ئەژماردن، لەکاتێکدا لەوانەیە کەسێك وا هەڵبسەنگێنین کەوا بەناو بانگە لەلایەن هەندێ کەس کەوا دەیناسن، لەوانەشە لەلای هەندێکی تر واهەڵسەنگێنرێ کەناوبانگی نییە.

خوازیاری وزاڵبوون دوو ئەدگاری جێگرن و زیاتر لەناوبانگی، ئەگینا ئێستا باس لەپەیوەندیەکانی نێوان پۆلێنکردنی ئەو کەسایەتیەو پلەی دەرپەڕینی روخساری تەنیشت، یان وێنەی تەنیشت بکەین، ئەوا پەیوەندی لەخشتەی ژمارە ٢دا هەیە، ئەو پەیوەندیانەش کەلەسفرەوە نزیکن بۆدیاریکردنی شیمانەی هەر پەیوەندییەك کەلەریزی چوارمەدایە، کەپەیوەندی نێوان ئەدگارە بەزیووەکان و دەرپەڕینی بەشێك لەدەموچاو لەنێوان شەویلاگی سەرەوەو هەردوو برۆ جگە لە لووت دەردەخات، لەوبارەیەوە خشتەی ژمارە ٢پەیوەندی نێوان ئەدگارە شێوە جیاوازەکان نێوان ژمارەیەك لەئەدگارە کەسایەتیەکان دەردەخات (الجبوری) .

| ئەدگار | ڕێژەی پەیوەندی |
|---|---|
| گەشبینی | ٧٥٪ |
| چالاکی | ٪٨٠ |
| خوازیاری | ٪٩٠ |
| هێزی ویست | ٪٨٢ |
| زاڵبوون | ٪٨٧ |
| ناوبانگی | ٪٨٤ |

خشتەی ژمارە١

| ئەدگارە شێوەییەکان | ئەدگاری کەسایەتی | ئەدگاری کەسایەتی | ئەدگاری کەسایەتی | ئەدگاری کەسایەتی | ئەدگاری کەسایەتی | ئەدگاری کەسایەتی |
|---|---|---|---|---|---|---|
| | گەشبینی | چالاکی | خوازیاری | هێزی ویست | زاڵبوون | سوروسپی |
| ١-دەرپەڕینی هەموو دەموچاو لەگەڵ لووت | ٪١٠ | ٪٥ | ٪١٧ | ١٣٪ | ٪١١ | ٪٢٠ |
| ٢-دەرپەڕینی شەویلاگی سەرەوەو هەردوو برۆ لەگەڵ لووت | ٪١٣ | ٪١ | ٪١٣ | ٪١٣ | ٪٨ | ٪٣ |
| ٣-بەرزی تەوێڵ لەگەڵ هەردوو برۆ | | | | | | |

| | | | | | | |
|---|---|---|---|---|---|---|
| ٤-دەرپەرینی شەویلاگی سەرەوە تاکو هەردوو برۆ جگە لە لوت | ٪١٧<br>٪٢٧ | ٪٢٩<br>٪٣٩ | ٪٢٣<br>٪٣٣ | ٪٣٩<br>٪٣٤ | ٪٢٢<br>٪٢٤ | ٪٢١<br>٪٣ |

خشتەی ژمارە٢

## کەر:

**مرۆڤ هەموو کاتێ ئەو کەسەی خۆش دەوێت کەدەزانێ بەرەنگاری نابێتەوە، هەر ئەوەشە کەسی سادی و مازۆخی پێکەوە دەگونجێن، کەریش ئەو گیاندارەیە کەملکەچی مرۆڤەو داوای هیچی لێ ناکات و لەگەڵیدا دەگونجێ.**

نهێنی جوانی دیمەن و تابلۆی کەر و سەرنجڕاکێشانی بۆ مرۆڤ لەناو شاشەی تی ڤی و لەگۆڤار و رۆژنامەکان و لەژیانی رۆژانەی خەڵك و باسکردنی پەیوەستە بەلایەنی لاشعوری مرۆڤ و چەند شتێکی تر وەکو جوانی کەر بۆ هەندێ کەس، ئاشنابوونی مرۆڤ بەکەر و بەزەیی پێهاتنەوەی، بوونی کەر لەیادەوەری مرۆڤ کەلەبنەڕەتدا مرۆڤ چاوی کردۆتەوە کەری بینیوەو بەهەچەکە ژێریان کردۆتەوەو ئەم ژێرکردنەوەیە هێندەی سواربوونی فڕۆکەیەکی ئێستا تاموچێژی پێبەخشیوە وەك فرۆید دەڵێ مرۆڤ بنەمای تاموچێژ وەك بنەمای ئازار تیایدا بەرجەستەیەو رۆژانە بێ ئەوەی هەستی پێبکات بۆی دەبزوێ.

کەر لەژێر توانای دەسەڵاتی هەموو کەسێکەوەیەو ملکەچە بەتایبەتیش لەلایەن کەسێ بێ دەسەڵات و ئەوانەی ئارەزووی دەسەڵات دەکەن، مرۆڤیش بەپێی بیروڕای زانا مۆرای ئارەزووی ملکەچبوون و ملکەچکردنی هەیە، کەر لەبەرامبەر مرۆڤدا ئەو هەستە بۆ مرۆڤ بەرجەستە

دەكات كەلەمرۆڤ كەمترەو هەم لەمرۆڤێكی بێ عەقڵیش كەمترەو توانای ملكەچپێكردنی هەیە، بەپێی بیروڕای زانایان مرۆڤ ئارەزووی دەسەڵات و سەپاندنی ئەو دەسەڵاتەی هەیەو ئەگەر كەس نەبێ ئەو دەسەڵاتەی بەسەردا بسەپێنێ ئەوا بەسەر نزیكترین كەس و بەستەزمانترینیاندا دەیسەپێنێ كە كەرە، بۆیە كەر سەرنجی رادەكێشێ لەبەرئەوەی خۆی بەسەردا دەسەپێنێ، كەواتە لەم روانگەیەوە كەر پێویستە بۆ مرۆڤ، زۆرجاریش مرۆڤ بۆ دڵدانەوەی خۆی و بوونی خۆی، خۆی بەكەسانیتر بەراورد دەكات، كەریش بۆ ئەم باشترین كەشوهەوای بەراوردكردنە بێ ئەوەی ئەو مرۆڤە هەستی پێبكات، بەڵكو بەشێوەیەكی لاشعوری ئەم میكانزمە دەورنیە جێبەجێ دەكات، ئەوانەش كەخۆیان بەكەم دەزانن یان لەراستیدا كەمن و ئەگەر كەس نەدۆزێتەوە خۆی بەسەردا بسەپێنێ كەدەتوانێت رەشمەی بكات و باری لێ بنێت و دەستدرێژی بكاتە سەر، چونكە شەرمی لێناكات و لەوە ناترسێ كەر هەڵیسەنگێنێ و دەسەڵاتیشی بەسەردا دەشكێ و باجی دەستدرێژیەكەی نادات، بەپێی زانایانی سایكۆلۆژی كەسی ترساو شەرمن بەهەموو كەسێك ناوێرن بەڵام كەر ئەو گیاندارەیە كە دەستدرێژیكار شەرمی لێناكات و بەئارەزووی خۆی دەستدرێژی دەكاتە سەری.

بەلاتەوە سەیر نەبێ، كەفیگەری تابلۆی كەر پارەبكەن و رەواجی هەبێ، هونەرمەندی شێوەكار زۆرجوان دەتوانێ گوزارشت لەژیانی نەستیانەی تاك بكات و زیرەكانە بەرجەستەی بكات و لای زۆر لەهونەرمەندان و نیگاركێشانی گەورەی شێوەكاری گەردوون ئەم هەستە هەبووەو هەیە رێزیان لەكەر ناوە، كەر كەم نییەو سیفاتی سادیزمی تەنها لەگەڵ رەگەزی خۆیدا بەكاردێنێ، كەواتە دەبێ و پێویستە پێزانینمان بۆ كەر بەرجەستە بكەین و باشترین پارە بەو تابلۆیانە بدرێ كەكەر فیگەرێتی، بەزۆری مرۆڤ و كەم تا زۆر سیفاتی كەسێتی سادیزم و ماسۆشیزمی هەیە، لەگەڵ هاوڕەگەزو نا هاورەگەزدا بەكاری دێنێ، بەڵام كەر تەنها لەگەڵ مێیەكەیدا بەكاری دێنێ و لەكاتی جوتبووندا قەباڵی لێدەدات و ئامادەنییە گیانی سادیزمانەی خۆی لەهاوڕەگەزەكەی بەتاڵ بكاتەوە یان بێچووی خۆی ئازار بدات و قووتی بخوات و دزی لێ بكات.

خۆ بەگەورەزانینی مرۆڤ ئەو كاتە زیاتر بەرجەستە دەبێت، كەبزانێ زاڵە بەسەر ئەوی تردا ئەویش بەشێوەیەكی لاشعوریانە لەكەردا دەیدۆزێتەوە، بۆیە رۆژانە لەسەر زمانێتی و بۆ جوێن و خۆشەویستیش بەكاری دێنێ، كە وەكو جنێو بەكاری دێنێ و وەكو جنێو بەرامبەر منداڵە

خۆشەویستەکەی یان کەسێکی خۆشەویستی بەکاری دێنێ کەدەڵێ ( (هەی کەرە) ) یان ( (کەرە گیان وانابێ) )، بۆیە تابلۆکەشی ببینێ بەلایەوە سەرنجڕاکێشە، گیانی سادیزمیانەو غەریزەی شەڕانگێزی و ئازاردانی کەسیتر لەلایەن مرۆڤەوە لەو کەرەدا تێر دەکرێت، لەبەرئەوەی کەر بێدەسەڵاتە بۆیە خۆشەویستەو هەموو گیاندارێکی بەستەزمان و بێدەنگ کە رەخنە نەگرێت و بەدوای مافی خۆیدا نەچێت و یاخی نەبێ خۆشەویستە بەپێچەوانەی کەسی یاخی کەبەرامبەرەکەی پێی خۆش نییە یاخی بێ، بەڵکو پێی خۆشە گوێڕایەڵ بێ وەکو کەر، کەر لەرابردووی تاکی کورددا رۆڵێکی زۆری گێڕاوە وەکو هۆکارێکی گواستنەوە لەژیانی کۆچەرێتی و هەڵهاتن لەدەست رژێمە داپڵۆسێنەرەکان و هەروەسا بۆ خزمەتکردنی رۆژانەی لەراییکردنی کاروباری کشتوکاڵی بەتایبەتی لەناوچە سەخت و شاخاویەکان و شان بەشانی کەریش ئێسترو ئەسپ و رەشەوڵاخ کەئەمانە بەشێکن لەرابردووی تاکی کوردەواری بەئاسانی لەبیری ناکات کەئەمیش پەیوەندی بەژیانی نەستیانەی تاك و کۆمەڵگاوە هەیە، گوستاف لۆبۆن دەروونناسی گەورەی فەرەنسی دەڵێت ژیانی هەستیی مرۆڤ بەشێکی زۆر بچووکە لەچاو ژیانی نەستیانەی، بێگومان ئەو نەستەش بەرابردوو بنیات نراوە، بەهەمان شێوەش شیکردنەوەی دەروونی ئەم راستیەی دووپات کردۆتەوە کەنەستی خەڵك رێژەی ٩٠٪ژیانی پێکدێنێت، نەستی کۆمەڵایەتیش کە زانا یۆنگ ئاماژەی پێداوە بەرامبەرە لەگەڵ نەستی تاك، نەستی کۆمەڵایەتی ئەو دەسکەوت و ئەزموونانەی کۆمەڵگایەکە کەنەوە دوای نەوە دەگوازرێتەوە، بەڵام نەستی تاك ئەو دەسکەوت و ئەزمونانەیە کە ئەو تاکە وەریگرتووە لەژیانی رۆژانەی خۆیدا لەگەڵ خۆی دەیهێنی و کار لەخۆی و پەروەردەی منداڵەکانی دەکات، بەهەمان شێوە زانا هارتمان ئەمەی دووپات کرۆدتەوە.

، بۆیە تاکی کوردیش زۆر شانازی بەرابردووە دەکات و لەگەڵیدا دەژی، کەزۆرترین قسەو باسەکانی کۆمەڵگەی کوردەواری باسی باو باپیرانە هەر لەباسی پیاوەتی و چاکە خوازی و پاڵەوانێتی و دوژمنایەتی و ململانێی لەگەڵ دەوروبەریان و خۆشی و ناخۆشی و هەبوونی و نەبوونییان، تەنانەت لەهونەری گۆرانی و نیگارکێشان و ئەدەبیات و کوردیشدا ئەم لایەنە رەنگی داوەتەوە، لەپەروەردەی منداڵ و بەراوورکردنی نەوەی نوێ بەنەوەی کۆن و ژیانی رابردوو بەژیانی ئێستاوە، رابردوو لەبیر تاکی کوردەوە ناچێت ئەگەر کەسێك ترێکیشی لێ دابێت یان هەر کارێکی ناشایستەی کردبێت ئیدی دەماو دەم لەنێو خزم و کەسوکاریدا هەر دەوترێتەوەو

لەروانگەی ئەوانیشەوە نەوەی نوێش باجەکەی دەدات، ئەگەر باپیرێکی کەسێك کارێکی کردبێ ئەوا نەوەکانی دواتریشی بەو کارەوە ئەتلێنەوەو لەژن و ژنخواستن و کچ بەشودانیشدا کاریگەری هەیە، تەنانەت لەهەڵسەنگاندن و مامەڵەکردنیش ئاوڕێك بۆ دواوە دەدرێـتەوە، تەنانەت بۆنی مەڕو بزن و ئاژەڵانی تریش کەلەرابردوودا تاك لەگەڵیدا ژیاوە ئەو تاکە سۆزی بۆی هەیەو کەئەو بۆنە دێ بەسەریدا پێی خۆشحاڵەو دڵی پێی خۆش دەبێ، جارێکیان لەگەڵ کەسێکدا بەتەمەنتر بوو بەلای مەڕو ماڵاتێکدا تێپەڕین یەکسەر ئەو وتی ئەڵڵا بۆنیان چەند خۆشە، ئەمە نیشانەی ئەوەیە کەرابردوو کەلەنەستدا کاریگەری خۆی لەسەر رەفتارو کردەوەکانی ئەوتاکە دەبێت، لەپەیوەندیە کۆمەڵایەتیەکانیشدا ئەم نەستە کاریگەری خۆی هەیە کەدوو بنەماڵە هاوماڵ و دۆستی یەکتر بوونە ئەو دۆستایەتیە کاریگەری لەسەر نەوەکانی دواتریشیاندا دەبێت، خوا نەخواستە خۆ ئەگەر یەکێك رەفتارێکی خراپی کردبێت ئەوا بێگومان وەکو لەکە بەنێوچەوانی نەوەکانی دواتریشەوە دەلکێ کەهیچ پەیوەندیان بەو پرسەشەوە نییەو رەنگە دووریش بن لەو جۆرە رەفتارو کردارانە تەنانەت لەرووی پیاوەتیشەوە هەمان شێوەیەو کەریش وەك بەشێك لەرابردوو لەهەناوی سایکۆلۆژی تاکدا نوستووە.

## هیبنۆتیزم:

**لەلەشی هەموو مرۆڤێکدا شلە هەیە، بەهۆی ئەو شلەیەوە مرۆڤەکان پەیوەندی ناجەستەیی بەیەکترەوە دەکەن (بیردۆزی** الاثیر)

هیپنۆتیزم یان نواندنی موگناتیسی زاراوەیەکی یۆنانیەو بۆ یەکەم جار ساڵی ١٨٤٣ براید لەپەرتوکەکەی بەناوی نیورۆلۆژی بەکاری هێناو دوای ئەمیش میسمر فرانزی ئەڵمانی لەچارەسەری دەروونیدا بەکاری هێنا، لەمێژووی کۆنیشدا هندیەکان و میسریەکان و بابلیەکان بەکاریان هێناوەو زۆر سودیان لێ وەرگرتووە، سەرەڕای ئەم راستیانەش هەندی لەزانایان پێیانوایە مێژووی هیپنۆتیزم دەگەڕێتەوە بۆ ٢٠٠ساڵ ئەمەش ئەوە دەگەیەنێت کەمێژوویەکی کورتی هەیە لەچاو بوارەکانی تری زانستدا، ئەم زانستە هێشتا ناروونی پێوە دیارەو بووەتە مەتەڵی ئەوانەی گرنگی پێدەدەن لەبواری دەروناسی و پزیشکی دەرونیداو تا نهۆش هەوڵ و تەقەلا بەردەوامە بۆ پەرەپێدانی زانستەکە، هیبنۆتیزم پێناسەیەکی یەکگرتووی نییە، بەڵام زۆربەی پێناسەکان ئاماژە بە عەقڵی دەرەوە (العقل الواعی) و عەقڵی شاراوە (العقل الباطن) دەدەن.

## بۆچی پێی دەوترێ هیپنۆتیزم یان نواندنی موگناتیسی؟

بەپێی تۆژینەوە زانستیەکان هەندێ لەوانەی کەنواندنی موگناتیسیان بەکارهێناوە (خەوێنەران) مادەی موگناتیسیان بەکارهێناوە بۆچارەسەرکردنی نەخۆشیەکانیان بۆیە بەنواندنی موگناتیسی ناوبراوە، هندیەکان یەکەمجار بەکاریان هێناو پاشان میسریەکان کەپەرستگایان دانابوو بەناوی پەرستگای نوستن ئەو کەسە نەخۆش بوایە لەناو پەرستاگاکە رادەکشاو پاشان بەچارەسەرکراوی دەهاتە دەرەوە، لەئەوروپا ڤالانتاین کەناوی بەخۆشەویستیەوە بەستراوە پەنای بۆ نواندنی موگناتیسی بردووە، پاش ئەمیش راهیبێك دەرکەوت کەموگناتیسی بەکارهێنا کەبەسەر شوێنی ئازارەکەدا دەیهێنا بۆئەوەی نەخۆشەکە چاك ببێتەوە، دواتر لەسەدەی هەژدە فرانز مسمر هەمان رێگای بکارهێناو شوێنی ئازارەکەی بریندار دەکردو موگناتیسەکەی پێ دەهێنا و بەنەخۆشەکەی دەوت ئێستا موگناتیسەکە خوێنەکە رادەگرێت بەکردەوەش خوێنەکە رادەوەستا، هەر ئەم پزیشکە جارێکیان رۆیشتوە بۆلای نەخۆشییەك و موگناتیسەکەی لەبیر کردووە بۆیە ناچار بووە دارێك بەکاربێنێ لەجیاتی موگناتیسەکە ئەمجارەش نەخۆشەکە هەر چاك بۆتەوەو بۆی دەرکەوتووە چاکبوونەوەکە پەیوەندی بەموگناتیسەکەوە نییە بۆیە زۆر هۆکاری بکارهێنا بۆ ئەو مەبەستە بۆ ئەم مەبەستەش پشتی بەبیردۆزەکەی نیوتن برد بەناوی بیردۆزی (الاثیر) بەپێی ئەم بیردۆزە وزەی موگناتیسی لەچارەسەرکەرەکەوە دەچێ بۆنەخۆشەکە لەرێگەی (الاثیر) ەوەو چاك دەبێتەوە، بیردۆزی (الاثیر ) دەڵێ: جیهان هەمووی پڕە لەشلە کەدەچێتە ناو تەن و لەش و ماسولکەو دەمارەکانمانەوە لەرێگەی ئەم شلەیەوە مێشك دەبەسترێتەوە بە ماسولکەکان و بەشەکانی تری، کەپێی دەوتری موگناتیسی ئاژەڵی بەو پێیەش کەسەکەکان پێکەوە دەبەسترێنەوە وەك ئەوەی تۆ بیر لەکەسێك دەکەیتەوە دواتر بەکردەوە ئەو کەسە دەبینی و پێی دەڵی (تۆ لەخەیاڵمدا بووی و ئەویش دەڵێ دڵ لەدڵ ئاگادارە)، دیارە ئەم دڵ ئاگاداربوونە پەیوەندی بەو پێکەوە بەستنەوە هەیە کەبەهۆی شلەکەوەیە و جەختکردنەوەیە لەبیردۆزی (الاثیر).

زاراوەی نواندنی موگناتیسی بەتەواوی دەرنەکەوت تا جیمس براید دایڕشت کەنەشتەرگەرێکی سکوتلەندییە، بەپێی بیردۆزەکەی براید ( چاوخستنە سەر تەنێکی جوڵاو

یان جێگیر لەلایەن کەسێکەوە بۆماوەیەك ئەو کەسە دەچێتە حاڵەتی نەستەوە ئەمیش پێی ناوترێ نوستن بەڵکو حاڵەتی دابڕانی نێوان هۆش و بێ هۆشیە، دوای ئەم دۆزینەوەیە براید بوو بەپێشەنگی نواندنی موگناتیسی.

لەهەندستانیش ئبزدایل هاتەئاراوە کە (٥٠٠) کرداری نەشتەرگەری ئەنجام دا بێ بەکارهێنانی سڕکردن، بەڵکو پشتی بە سروشپێدان بەست بەهۆی موگناتیسەوە، پاش ئەویش فرۆید هات کەتائێستاش شیکردنەوە دەورنیەکەی بەکاردێت، لەسەردەمی نوێشدا ملتون ئەریکسون هاتە ئاراوە کەتوانی بگاتە نواندن بێ بەکارهێنانی وشەو ساڵی ١٩٥٠وەك چارەسەرێکی پزیشکی بەکاری هێنا.

## هیپنۆتیزم لەنێوان راستی و باوەڕپێنەکردنی:

بەهۆی زۆری کەناڵەکانی مەعریفەو ئاشکراکردنی راستی و ناراستیەکانی سەبارەت بەنهێنیەکانی ژیان و پەنهانەکانی دەروونی مرۆڤ کاری زۆر کراوەو بەڵگەو نیشانەش زۆرن بۆ باوەڕ هێنان بەبابەتێك و بەرجەستەکردنی، بەکارهێنانی هەر شتێك لەمەیدانی کرداریدا خۆی لەخۆیدا راستی و سەلماندنە بۆ ئەو بوارە، بەکارهێنانەکانی بواری هیبنۆتیزمیش بەڵگەی راستی و رەوینەوەی گومانن بۆ سەلماندنی زانستێتی هیبنۆتیزم و سود لێوەرگرتنی، بۆیە بەدواداچوونی بەکارهێنراوەکانی ئەم بوارە هەر لەمێژووەوە تائێستا بەڵگەن بۆراستی بوارەکە، لەسەدەکانی ناوەڕاستدا هیپنۆتیزم لەلایەن سیحربازو جادوگەرانەوە بەکاردەهێنراو خەڵك بەسیحری رەش ناویان دەبرد، لەبواری هەواڵگری و شتنەوەی مێشك و جەنگەکاندا بەکارهێنراوە بەتایبەتی بۆ ئاشکراکردنی نهێنەکانی جەنگی بەرەی دوژمن لەو سەربازانەی کەبەدیل دەگیران، لەجەنگی جیهامی دووەمدا ونستون چەرچل سەرکوەزیرانی بریتانیا لەکاتی شەواندا بەتەواوی بەخەبەر بوو وەك سروشپێدانێك بەخۆی کەهەمیشەوشیار بێ و لەماندوو بون دوور بکەوێتەوە خۆی دەخستە قۆناغی گۆڕان و وەرچەرخانەوە لەرێگەی دانیشتنی لەسەر کورسی و ژماردن لەسەدەوە بەرەو خوارەوە، لەهەردوو جەنگی جیهانی یەکەم و دووەمدا هیپنۆتیزم وەك چارەسەری دەروونی بەکاردەهێنرا بۆ ئەو کەسانەی بەهۆی شەڕەوە تووشی نەخۆشی عوسابی ببون.

هەندێ لەلێکۆڵەرەوانی بواری موگناتیسی پێیانوایە هیپنۆتیزم کلیلی دۆزینەوەی تواناو ئەزموونەکانی مرۆڤەو دەکرێ وەك مەشق بەکاربهێنرێ بۆ بەرجەستەکردنی ئەو توانایانەی مرۆڤ هەیەتی، زۆریشن ئەو مرۆڤانەی کەزیرەك و بەتوانان، بەڵام بەهۆی گرێی دەروونی و گرفتی تایبەتیەوە ناتوانن تواناکانیان نیشان بدەن یان بەرجەستەی بکەن، بۆیە لەساڵی١٩٦٠ دکتۆر ریکوفی روسیایی توانی بیرۆکەی دەرخستنی تواناکانی مرۆڤ بەرجەستە بکات وا لەکەسانێکی ئاسایی بکات ببنە نیگارکێش یان هونەرمەند بەبەکارهێنانی هیپنۆتیزم، لەساڵی ١٩٨١ سوید

بووە یەکەم وڵات کەمەشقی نواندنی موگناتیسی خستە بەرنامەی قوتابخانەکانەوەبۆ بەرەو پێشبردنی پەروەردەو خوێندن و سود وەرگرتن لەئەزمونی هیپنۆتیزم و بەهێزکردنی تواناکان.

لەبواری تاوان و ئاشکراکردنی تاوانباران و بەدواداچوونی کاری تاوان سوود لەهیپنۆتیزم وەرگیراوە هەر لەمەیدانەدا پۆلیسی لۆس ئەنجلۆس مەشق لەسەر هیپنۆتیوم دەکەن و زۆر سودیان لێوەرگرتووەو پەرەیان بەم لایەنە داوە، لەبواری تەندروستیەوە پسپۆری تایبەتی ئەم بوارە بەکاریان هێناوە بۆچارەسەرکردنی حاڵەتی خەمۆکی و چارەسەرکردنی نەخۆشیە دەروونی و عەقڵی و نەخۆشیە سایکۆسۆماتیەکان، هەروەها لەبواری پەروەردەو خوێندن و چارەسەرکردنی فۆبیاو چۆنێتی مامەڵکردن لەگەڵ دڵەراوکێی تاقیکردنەوەکان و گرفتی خوێندنەوەو خۆبەکەم زانین و بەهێزکردنی پاڵنەری خوێندن، هیپنۆتیزم لەبواری ئاسایش بەکاربێنین بۆ سروشدان بەتاوانبار کەچۆن تاوانەکەی ئەنجام داوەو ددانی پێدا بنێ.

لەپەروەردەو بەرزکردنەوەی پاڵنەرو هەندێ رەفتاری ناوازەدا بەکاری بێنین هیپنۆیزم بەشێکی سروشتیە لەرەفتاری مرۆڤ و کاریگەری بەهێزی هەیە لەئەزموونە دەرونی و کۆمەڵایەتی و بەدەنیەکانی مرۆڤ، بەپێی ئەم راستیانە بێ کە هیبنۆتیزم لەبواری مەیدانیدا بەکاردەهێنرێ کەواتە هیپنویزم هیچ پەیوەندیەکی بە سیحرەوە نییەو هۆکاری خستنەپاڵی سیحر بەهینۆتیزمەوە دەگەڕێتەوە بۆ قەناعەتنەکردنی مرۆڤ بەتوانا لەرادەبەدەرەکانی کەئێستا رۆژ بەرۆژ لەبەرجەستەبووندایە، خەوێنەریش هێزێکی سیحری نییە بەڵکو تواناو کاریگەری کرداری نواندنە لەسەر ئارەزوومەندی خەوێنراو و پاڵنەرەکانی دەبنە هێزێکی لەرادەبەدەر و رۆڵی خۆی هەبێت، کەخەوێنەر توانای ئەوەی هەیە هەر گۆڕانێك لەسیفەتی ئاگابوونی کەسەکە یان پلەی تەرکیزی ئاگا لەو کەسە درووست بکات کە دەبێتە هۆی گۆڕان لە ئەزمونی ناوەکی و دەرەکی ئەو کەسە، جیمس برید ساڵی ١٨٤٢ زاراوەی هیبنۆتیزمی بەکارهێنا بەڵام سەرەڕای ناکۆکی نێوان قوتابخانەکان سەبارەت بەدیدوبۆچنەکانیانەوە هیپنوتیزم وا پێناسە دەکرێ کە دیاردەیەکی سروشتیە وەڵامگۆ لای کەسی خەوێنراو درووست دەکات ئەم وەڵامگۆیەش بەپێی باوەڕبوونی کەسەکەو ئارەزووی بۆ نواندن دەگۆڕێت، جانیت وەکو پاکبونەوەی دەروونی هیبنۆتیزمی بەکار هێناوە، هەروەها فرۆید و بروير بەکاریان هێناوە بەڵام فرۆید لەجیاتی هیبنۆتیزم رووی کردە شیکردنەوەی دەرونی کەهەرچەندە شیکردنەوەی دەروونی لەرووی میکانیزمی ئاشکراکردنی نهێنیەو تواناکانی مرۆڤ جیاوازە لەپرۆسەی هیبنۆتیزمەوە بەڵام لەکۆتاییدا یەك ئامانجی دەبێت، بەڵگەش بۆ ئەمە چارەسەرکردن و دۆزینەوەی پەنهانەکانی مرۆڤە لەرێگەی شیکردنەوەی

دەرونی و ئاشكراكردنی نەست (لاشعور)ە، هەندێ لەپزیشكانی ئەمریكاییش هیپنۆتزمی خودی بەكاردەهێنن ئەمیش جۆرە تەكنیكێكە وەرگیراوە لە سروشی خودی كەیارمەتیدەرە بۆ جۆشدانی كەسێتی و وازهێنان لەهەندی خوی خراپ و وەرگرتنی هەندێك شتی باش ئەم جۆرە تەكنیكەی ئەمریكایەكان بەكاردێت بۆ وازهێنان جگەرەكێشان و خواردنەوەو گرفتی سێكس و ترس و هەستی خۆبەكەم زانین و ئازاری دەروونی و جەستەیی، ئەم رێگەیە بەكاردێت بۆ دروستكردنی تێڕوانێكی ئیجابی بەرامبەر خود، دەنگی خەوێنەر تاكە زاڵبوونێكە لەسەر هەستی كەسی خەوێنراو نەك موگناتیس، ئەو كەسەی خەوێنراوە بەبێ ئیرادەو ئارەزووی خۆی هیچ شتێك ناكات، لەكاتی نواندندا كەسەكە هەردوو چاوی كراوەتەوەو ئاگای لەدەوروبەری هەیە، بەڵام تەنها وەڵامی ئەو كەسە ئەداتەوە كەسروشی ئەداتێ، لەواقیعدا كاتێك مرۆڤ سەیری فیلمێك دەكات بۆ نموونە وەكو گەردەلوول كەپەیوەندی بەژیانی سیاسی كوردەوە هەیە ئەوا تۆ لەواقیع دادەبڕێی لەگەڵ ئەو رۆژگارەدا دەژی كەژیانی پێشمەرگایەتی بووە، یان كاتێك كەسێك باسی بابەتێكی سەرنجڕاكێشت بۆ دەكات و بەلاتەوە گرنگە تۆش بەتەواوی لەدونیا دادەبڕێی ئەوە نیشانەی ئەوەیە تۆ بەرەو نواندن دەڕۆی، زۆریشن ئەو نموونانە لەژیانی رۆژانەمان كاتێ مرۆڤ تەركیز دەخاتە سەر شتێك شتەێكی دیكە بەشێوەیەكی نەستیانە فەرامۆش دەكات و لێی دادەبڕێت، زۆرجار لێرەو لەوێ خەڵكانێك هەن باوەڕیان بەنواندنی موگناتیسی نییە، بەڵام ئەزمونەكان دەریان خستووە كەوا ئەم نواندنە موگناتیسیە ینەمایەكی فسیۆلۆجی زانستی هەیەو كاریگەری تەواوی هەبوە لەچارەسەركردنی زۆر لەنەخۆشیەكان بەتایبەتیش لەكۆنترۆڵكۆدنی ئازارو هەروەها نەخۆشیە سایكۆسۆماتیەكان، لێكۆڵینەوە تازەكانیش ئاماژە بەوە دەكەن كە چۆن هێزی سروشپێدان ئەگەر بەراستی بەكارهێنرا ئەوا كاریگەریەكی زۆری دەبێ لەسەر مرۆڤ، بەپێی لێكۆڵینەوەكان ئەو كەسانەی نواندنیان بۆ كراوە وەڵامگۆیەكی باشیان هەبووە بۆ پرۆسەی نواندنەكەو لەهەمانكاتیشدا دركیان كردووە بەو گۆڕانكاریانە كەبەسەر رەفتاریاندا هاتووە، بەپێی لێكۆڵینەوەكانیش قابلیەتی كەسێك بۆ نواندنی موگناتیسی نەبەستراوە بەسیفاتی دیاریكراوی كەسەكەوە یان ساویلكەیی یان هستریابوونی یان نەخۆشی و باوەڕبەخۆبوون و شەڕانگێزی و ملكەچبوونی و خەیاڵكردن بەڵكو بەستراوە بە ئامادەباشی كەسەكە بۆ نگرۆبوون لەهەندێ چالاكی وەكو خوێندنەوەو گوێگرتن و زیندەخەون، نهێنی پرۆسەكە لەوەدایە ئەو كەسە لەگەڵ خەوێنەر دەپچڕێ ئەم پچڕاندنەش كرۆكی نواندنەكەیە، لەرێگەی بەكارهێنانی هیبنۆتیزمەوە زانایان توانیان هەلوەسەو شێوەگەلێكی ركلێبوونەوەو جۆرە لەبیرچوونەوەیەك لەرەفتاری كەسی خەوێنراو دروست

بکەن، راستی زانستی دەڵێ کاتێك تۆ گوێ لەبەسەرهاتێکی سەیر دەگری و لەگەڵی تێکدەئاڵێی ئەوە تۆ بەشێوەیەکی جوزئی دەخەوی، و هەستنەکردنیشت بەوەی لەدەوروبەرت روو دەدات ئەو راستیە دەسەلمێنێ، پەیوەندیشت بەجیهانی دەرەوە لەکاتی سەیرکردنت لاوازە. بۆ سەلماندنی ئەم راستیە زانایان لەوانەش سیگموند فرۆید عەقڵیان کردە دوو بەشەوە عەقڵی ناوەکی و دەرەکی یان دیارو نادیار، عەقڵی ناوەکی سەرچاوەی هزری خەیاڵیە واتە کاتێك تۆ بیرلەوە دەکەیتەوە کەدەتوانی هێزێکی سیحرییت هەبێ بۆ بەدیهێنانی ئاواتەکانت ئەوا عەقڵی دەرەکی رۆڵی فلتەر دەبینێ و پێت دەڵی واز لەم بەزمانە بێـنە.

عەقلی شاراوە٢٤کاتژمێر لەرۆژێکدا کاردەکات و بەبانکی زانیاری و یادەوەری و ئارەزوو و خووەکان دادنەرێت و توانای تۆمارکردنی٥٠ گرتەی هەیە لەیەك کاتدا.

هیبنۆتیزم زانستێکە دەروونی مرۆڤ دەهێنێتە دواندن لەرێگەی نەستەوە چونکە زۆربەی زۆری ژیانی دەروونی تاك نهێنیەو ئاشکرا ناکرێت بەڵام لەرێگەی نەستەوە دەردەکەون، نواندنی موگناتیسی پرۆسەی چوونە ناو نەستی مرۆڤەوەیە لەداگاکانیش پشت بەنواندنی موگناتیسی نابەسترێ چونکە خەوێنەر دەتوانێ یادەوری و جۆرە زانیاریەك ببەخشێت بەخەوێنراو ئەمیش دەبێتەهۆی تێکچوونی لایەنی مەعریفی و زیادکردنی زانیاریگەلێك کەپەیوەندی بەبابەتێکەوە نەبێ و هەروەها لەبیرچونەوەی هەندێکی دیکە ئەمەش پەسەند نییە لەرووی مرۆیی و شەرعیەوە.

# ئومێدخوازی و گەشبینی:

**ئەم سەردەمە وەك شیرەخۆرەیەك وایە دەمی کردۆتەوە بۆ بێزاربوون (فروم)**

زۆر لەفەیلەسوفانی کۆن و نوێ ئاماژەیان بەململانێ و کێشمەکێشی مرۆڤ لەگەڵ ژیان داوە، لەوانەش ئەریك فرۆمی ئەمریکایی کەپێیوایە ململانێیەکی بەردەوام لەنێوان ئومێدوگەشبینی و ژیان و مەرگدا هەیە، سەراپای ژیانی ئەم چەرخەش یەکپارچە بێ ئومێدی و نیگەرانی و رەشبینی و ئاژاوەی سیاسی و ئابوری و کۆمەڵایەتی و کاری دەستدرێژی و شەڕو هەراوخێرا بەرەو پێشەوە چوونە کەبەچەرخی خێرا دەناسرێت، چەرخی بۆمبی ئەتۆم و کۆمەڵکوژو لێکترازانی مرۆڤەکان و نامۆبوون و خۆکوشتن، ئەم سەردەمە وەك شیرەخۆرەیەك وایە دەمی کردۆتەوە بۆ بێزاربوون، هەر چالاکییەکی ناوەوەی مرۆڤ پێشوازی لەو شتانە دەکات، کەلەخەیاڵی خۆیداپیشەی خۆپاراستنە لەبێزاربوون، پەنابردن بۆجگەرە، خواردنەوە، فیلم، تەلەڤزیۆن، وەرزش...تد، کەبەخەیاڵ کارگەی هەڵکێشانی مرۆڤە لەنیگەرانی کەهەمیشە هەڕەشە لەو مرۆڤە دەکات، لەکۆمەڵگە نوێیەکاندا، مرۆڤ ناچاری ملکەچکردنە بۆ لایەنە کەرەسەییەکان کەلەمرۆڤێکی زیندووەوە دەبێتە کەرەسەیەکی مەرگ، یان ئامێرێکی بێهۆش و بێ سۆز و هەوڵ و تەقەلا تەنهاو تەنها بۆ تێرکردنی سکەو لایەنی رۆحی نەیتوانیەوە بچێتە ئەودیوی سنوری کەرەسازی سەردەمەوە، بۆیە ئەمرۆ پێویستمان بەهیوا پێویستیەکی

دەروونی گرنگە، ئەگەر خواردن و هەوا پێویستی بنەڕەتی جەستە بن وەکو بیرۆدزی هەرەمی پێویستیەکان ئاماژەی پێداوە کەواتە ئومێدو گەشبینی پێویستی بنەڕەتی رۆحی مرۆڤن و هەولێکە بۆ زاڵبوون بەسەر هەستکردن بەرەنج بەخەساری و سوتانی دەروونی، چونکە تاکە رێگەی چارەسەرە بۆ مرۆڤ وکۆمەڵ..بەڵام کام هیوا؟!ئایا بەسانایی دێتە دەست؟!یان تەنها خۆمان دەبینین بەهیوای بێ هیوایی؟!هیواخوازی یان ئومێدەواری پێچەوانەی رەشبینیە، یان بەدبینی، مرۆڤی بەدبین ئەو مرۆڤەیە کەلەبەردەم هەموو کارێکدا ملکەچە، توانای بەرەنگاربوونەوەو قوڕپێوانی نییەو دەروازەی گیانی خۆبەدەستەوەدانی لەسەر پشتە.

رەشبینییش واتە مەرگی لەسەرخۆ کەهیچ شتێکی لەدوادا نییە، لەگەڵ ئەمەشدا ناتوانین بڕیاربدەین، کە رەشبینی بەشێکی جیانەکراوەیە لەدەروونی مرۆڤ، چونکە مرۆڤایەتی مرۆڤ سەرهەڵدانەوە نوێخوازی هەیە، ئەو شتانەش کەبەختەوەری بەمرۆڤ دەبەخشن و رەنگە مرۆڤ خۆی دانی پێدا نەنێت، منداڵە، ژنهێنانە، شووکردنە، خێزان و پەیوەندییە مرۆڤایەتیەکانە، یان ئەو پیشەیەیە کەمرۆڤ تیایدا سەرکەتوو دەبێ و بوونی خۆی تێدا دەبینێتەوە، هەندێکیش دەڵێن بەختەوەری پارەو سامانە، چەند کەسانێکی تر دەڵێن مەینەتی و ماندبوبوونی مرۆڤ سەرچاوەی گرفتە نیشتمانی و جیهانییەکانە، هەندێکیتریش دەڵێن هۆی مەینەتی دەگەڕێتەوە بۆ گوشارو پاڵەپەستۆی دەرەکی، زۆربەی ئەمریکایەکان هۆی مەینەتی دەگەڕێننەوە بۆ جیهانی ناوخۆیان و بەختەوەری و مەینەتیان بەپارەو بارودۆخی دەرەوە بەستووە، ئەم بۆچوونەش دەستنیشانکردنی لایەنی کەمی ناسینی خودە، بەڵام سەبارەت بەچارەسەری دەرونی، ئەوانەی کەهۆی ئازارو ئەشکەنجەو مەینەتی دەگەڕێننەوە بۆ هێزە دەرەکیەکان، ئەمانە پێویستیان بەچارەسەرێکی دەروونی هەیە وەك دەوڵەمەند، بازرگان و خاوەن بەرژەوەندیەکان، بەڵام ئەوانەی کەچەند لایەنێکی دەرونیان لەو ئازارو ئەشکەنجەو مەینەتیە بەدیکردوە زۆربەیان مەیلی چارەسەرکردنێکی دەرونیان هەبووە، بەتایبەتی رۆشنبیران و دانیشتوانی شارو ئافرەتان، ئەو کەسەی کەهۆی ئازارو ئەشکەنجە دەگەڕێننەوە بۆ جیهانی دەرەوە لەوانەیە رزگاری بووبێ لەهەستکردن بەگوناه، بەڵام ئەوە واناگەیەنێت کەرزگاری دەبێت لەنیگەرانی، هۆیەکەشی دەگەڕێتەوە بۆئەوەی کەئەو کەسە هێشتا خۆی نەناسیوەتەوەو وەك ئیشکەرێك و رێکخەرێکی هەموو هێزەکانی، ئەم مرۆڤە هەموو هێزێك لەو شتانە وەردەوگرێت، کەمولکی خۆیەتی نەك لەهێزی خودی و گیانی، زۆرکەسیش مەترسی

لەروبەروبونەوەی خۆیان دەکەن بۆ ئەوەی شتە شاروەکانیان بەرجەستە نەبێت هەر بەشاراوەیی بمێنێتەوە.

کەواتە ئومێد یاخود هیوا هێزێکی رۆشنکەرەوەیە لەناخماندایەو خۆشیمان پێ دەبەخشێت، هیواش لەسەر بنەمای خۆشەویستی ژیان و ئامادەبوونی بەردەوامدایە بۆ گەشەکردن و گۆڕان لەگەڵ زەمەندا، بەم شێوەیە دوو رێگە لەپێشماندایە، یان دەبێت ژیان و ئومێدەواری هەڵبژێرین، یان بەدبینی و مەرگ، ئەوانەی کە ئومێدەواری دەگرنە بەر ئەوانەن کەبڕوایان بەژیان هەیەو توانای گەشەکردن و گۆڕانیان هەیە لەهەموو کات و شوێنێکدا، ئەوانەش کەرکابەرایەتی و کینەو کاولکاری هەڵدەبژێرن ئەوانە بێ باوەڕن و هیچ خۆشییەك بەدی ناکەن لەژیانیاندا.

کەواتە دوو جۆر هیوامان هەیە، یەکەمیان وەستاوە واتە ملکەچبوونە بۆچارەنوس و چاوەڕێکردنی بەردەوام، وەك ئەو کەسەی کەلەسێبەری درەختێکدا بەپشتا کەوتووەو دەمی کرۆدتەوە بەڵکو بەرێك بکەوێتە دەمیەوەو سکی خۆی پێ تێربکات، دووەمیان بزوێنەری مرۆڤە کەپڕە لەتواناو باوەڕکردن بەژیان و پێشکەوتن، ئەو کەسێکەخۆی بەبێ بەخت دەزانێت و واهەست دەکات هەموو دەرگەیەکی لێداخراوە، ئەوا فەرمانی برسێتی و مەرگ بەسەر خۆیدا دەسەپێنێت، مرۆڤ سەرچاوەی هێزی گەشەکردنەو خۆسازێنە لەگەڵ گۆڕانی ژیان و زەمان، بەڵام گرنگ لەوەدایە کەهەست بەبوون وهێزی خۆی بکات و ئامانجەکانی دیاری بکات، خاوەن هیوا ئەو کەسە نییە کەهەموو کارێکی بەبەردەوامی بۆ ناخۆشی و نەهامەتیەکانی ژیان دەگرێت.

ئەو مرۆڤەی کەخاوەن ئومێد بێت ئەوا بارودۆخە ناخۆشەکانی ژیانی بەشتێکی کاتی لەقەڵەم دەدات، وەك ئەزموونی ژیان بۆ رۆژانی ئایندە سودی لێ وەردەگرێت، دەبێت بەشێوەیەك بۆ دوارۆژمان بژین، کەخاڵی دەستپێکردنی ئێستا بێت، دەبێت بەبەردەوامی رووبەڕووی نارەحەتی و نەهامەتی ببینەوە، نەخۆشیك ئەگەر بڕوای بەژیان بێت ئەوا زوتر چاك دەبێتەوە، چونکە هیوای بەژیان هەیە، کەواتە هیوا ئەو ئامرازەیە یان ئەو هێزەیە لەرەشبینی و بێزاری رزگارمان دەکات، رەشبینی لەپێشکەوتن و سەرکەوتن، رەشبینی لەخۆشەویستی و چاکبوونەوە، رەشبینی لەباشترکردنی باری بژێوی ژیان، هیوای بزوێنەری مرۆڤ، بەردەوامبوونە لەئاواتەکانمان و توانستە لەبەربەرەکانی کۆسپەکان و گەشەکردنی ئەو هێزەی لەناخی تاکدایە، وەك خۆشەویستی و تواناو باوەڕ بەخۆبوون و سەرکەوتن.

بەڵام هیوای وەستاو یان رووخاو چاوەڕوانکردنە یان پاڕانەوەیەکی شاراوەیە لەزەمەندا، ئەریك فرۆم سەبارەت بەهیوا لەچیرۆکیکدا دەڵێت: پیاوێك گەیشتبووە ئەو دەرگایەی کەبەرەو ئاسمانی دەبرد، بەڵام پاسەوانی دەرگا رێی لێگرت، کابراش دەستی بەپاڕانەوەو تکاکردن کرد، پاسەوانەکە وتی ئێستا ناتوانم رێت بدەمێ بچیتە ژورەوە دەبێت چاوەڕوان بیت، کابراش رۆژان وساڵانی دەژماردو دەپاڕایەوە، کەبچێتە ژورەوە بەڵام هەر سودی نەبوو تەمەنیش بەرەو پیری پەلکێشی دەکرد و تا دەهات لەمەرگ نزیك دەبۆوە، لەم دوادوایەی تەمەنیدا روی کردە پاسەوانەکەو وتی: بەخوا سەیرە!!تا ئێستا کەسێکی ترم نەبینی غەیری خۆم بیەوێت لەم دەرگایەوە بچێتە ژورەوە، پاسەوانەکەش وەڵامی دایەوە و وتی: لەتۆ زیاتر کەس نەیتوانیەوە بگاتە ئەم دەرگایە چوون تەنها تۆ کڕیاریت و هەنووکەش دەمەوێ دایخەم.

ئەو مرۆڤەی ژیانی بریتی بێت لەدڕندایەتی و هەرەسهێنان و نەخۆشی و رکەبەرایەتی ئەوا خودی خۆی و ژیانی دەڕوخێنێت، چونکە ئەم بیروبۆچوونە بەدبینیە بەرەو نەست دەگوێزرێتەوەو لەدواجاریشدا کاردەکاتە سەر تەندروستی بەشێوەیەکی گشتی.

زۆر کەس هەست بەنیگەرانی و دڵەڕاوکێ دەکەن بێ ئەوەی بزانن هۆیەکەی چییە، گەر واش بێت دەبێت مرۆڤ بیر لەشتی باش و گەشبین بکاتەوە وەك خێرخوازی و سەرکەوتن و لەشساغی و خۆشەویستی و لێبوردن، ئەم جۆرە تێفکرینەش کاردەکاتە سەر هاوسەنگی دەروونی و جەستەیی، باشتروایە مرۆڤ پێش نوستن بیر لەو شتە چاکانە بکاتەوە، چونکە هەر شتێکی چاك یان خراپ گەر لەخەیاڵدا بوو پێش نوستن ئەوا بەرەو نەست دەگوێزرێتەوەو لەوێ جێگیر دەبێت و کاریگەریشی بۆ سەر ئاینده دەبێت.

لەکۆتاییدا دەبێ زاڵ بین بەسەر سێ شتدا: ترس و توڕەبوون و رەشبینی.ترس لەپێش هەموویانەوە دێت چونکە هەڕەشە لەئۆقرگرتنی ملیۆنەها کەس دەکات وەك ترسی لەمردن و نەخۆشی، ترس لەشکستهێنان و بێکاری و جەنگ، ترس لەپەناگیری و جیابوونەوە، بەڵام توڕەبوون کۆئەندامی مێشك دەوروژێنێت و لەشی مرۆڤیش ژەهراوی دەکات، لەکۆتاییدا بەرەنگاری دەروونی کەم دەکاتەوە، رەشبینیش کاتێك روو دەدات، کەوێنەی خود لەدیدی خودەوە دەروخێنێت لەو کاتەدا (بوون) هیچ مانایەکی نابێت، بەڵام هێزی خۆشەویستی و ئومێدو باوەڕ دەتوانن ترس و رەشبینی لەناو بەرن، لەدەرەنجامی گشت تەمەندا دەڵێین مرۆڤ خاوەنی بیروهەستە، زۆربەی خەڵك خۆیان بەگەشبین و دڵخۆش نیشان دەدەن، لەهەمانکاتدا

ئەم خۆنیشاندانە رووبەرووی هۆکارەکانی ترس دەبێتەووە، ئەم ناکۆکیە کەلەنیوان هەستونەستە دەبێتە هۆی هەڵگەڕانەوەی هەڵچوون، واتە دیوەکەی تری هەڵچوون نیشان دەدات، هەندێجاریش بەپێچەوانەوە چونکە هەست و ئەنگێزە نەستی و چەپێنراوەکان کار لە تەندروستی جەستەو دڵ و دەروون دەکەن بەتایبەتی لەدەوروبەری کاتی نوستندا، تاکی کۆمەڵگەی ئێمە زۆر بەلایەوە گرنگە خۆی لەگەڵ کەسێکی دیکە بەراورد بکات بەراوردکردنێکی دوو روو، روویەکی ئەوەیە بەئومێدو گەشبینیەوە خۆی بەراورد دەکات کەکەسێکی نامۆو مات و مەلوول و قەرزار دەبینێ لەم خۆبەراوردکردنەیدا برێك ئەهوەن دەبێتەوەو بەرامبەر ژیان گەشبین دەبێت و رۆحی لەئاسودەییدا دەبینێتەوە، روویەکەی تر کەخۆی بەراورد دەکات لەگەڵ کەسێکی پڕ دەسەڵات و گیرفان پڕ رەشبینی باڵی بەسەردا دەکێشێ و هیچ ئومێدێکی بەژیان نامێنێ و بیرکردنەوەی بیرکردنەوەیەکی مادیانە دەبێت و بەو شێوەیە ئەوەی ناوی ئومێد بێت هەرگیز میوانی نابێت و هەستکردنی بەنائاسودەیی کار لەهۆش و دەوربەریشی دەکات، زۆر گرنگە مرۆڤ خۆی بەراورد بکات لەگەڵ دوێنێی خۆیداو بەشێوەی رەهایانە نەڕوانێتە بەختەوەری و ئومێد.

## فرۆیدیزم و نامۆبوونی مرۆڤ:

**ماتی و مەلوولی بەستراوە بەسروشتی مرۆڤەوە**

**(فروید)**

سیگمۆند فرۆید (١٨٥٦-١٩٣٩) یەکێکەلەناودارترین دەرونناسانی سەدەی بیستەم و دامەزرێنەری قوتابخانەی شیکردنەوەی دەروونیە هەر ئەویشە توانی نەستی مرۆڤ ناوزەد بکات بەپێی دابەشکردنی کۆئەندامی دەرونی کەبەسەر سێ ئاستی دەروونی دابەشکرد وەکو هەست ونەست و پێش هەست، ئەمە سەرەڕای گەلی بەرهەمی گرنگی تری وەکو تیۆری سێکسی و دابەشکردنی ئەنگێزەکانی ژیان ومردن.

فرۆید مرۆڤ دەخاتە گێژاوو سەرسوڕمانەوە نەئەوەتە بخنکێ و نە ئەوتە لێی دەربازبێ، بەڵکو زیاتر مەیلی خۆبەدەستەوەدان و بێ هەڵوێستی (مردن) دەکات، بەرامبەر ململانێی گێژاوەکە، ئەو خۆبەدەستەوەدانەش بە (رەمەکی مردن) ناودەبات.

لەزۆربەی تۆژینەوەو لێکۆڵینەوەکانیدا ئاماژە بەنامۆبوون و گرێدانی ئەو نامۆبوونە بەسروشتی مرۆڤەوە دەکات، مەبەستیشی لەنامۆبوون (الضياع) ە، کە لای مارکسیەکان بە (الاغتراب) بەکارهاتووە، ئەمیش هەستکردنی مرۆڤە بەکەساسی ومەلولی و نەگونجان لەگەڵ دەوروبەری کۆمەڵایەتی بەپێی پێویست و دوورە پەرێزی لەکۆمەڵ و کارلێکنەکردن لەگەڵیدا.

تێگەی نامۆبون لای فرۆید لەناوەڕۆکدا بریتیە لەپەککەوتنی مرۆڤ بۆ خۆ قووتارکردن لەو مەلوولی و مەینەتیە کەبەسروشتی مرۆڤەوە بەستراوە لەئەنجامی ئەو کۆسپانەی دێنەپێشی بۆ ڕێگا چارەیەکی نێوان هەوڵەکانی بۆ گەیشتن بەمەیل و مەرامە غەریزەییەکان بەشێوەیەکی سەربەست و ڕەها لەلایەکەوە، لەنێوان زەرورەتە کۆمەڵایەتی و ڕۆشنبیری و شارستانیەتیەکان لەلایەکی دیکەوە.

ئەنگێزە غەریزەیی و سەرەتاییەکانی مرۆڤ کە لەئەو (الهو) دا کۆبۆتەوە وەکو سێکس و پێداویستیە بایۆلۆژیەکانی ترو بەجێهێنانی لەچوارچێوەی کۆمەڵ و دەوروبەری، واتە ئەو مەرام و ئارەزووانەی کەنەست (لاشعور) ی مرۆڤ پێکدێنن زەحمەتە هەمووی جێبەجێ بکات بەرامبەر ئەو واقیعە کۆمەڵایەتیەی کەهەر لەتەمەنی منداڵییەوە مرۆڤ پابەند دەکات و دەیخاتە ژێر ڕکێفی ئەو واقیعە کۆمەڵایەتیەوە چونکە وەستان دژی ئەو واقیعەو لەبەر چاو نەگرتنی مرۆڤ دەخاتە گێژاوی پێداویستیە بایۆلۆژیەکان و دووبەرەکی نێوان حەزو ئارەزوەکانی مرۆڤ کە بنەمای لەزەت (مبدا اللذه) دەگرێتەوەو نێوان پێوەرو دابونەریتی کۆمەڵ کەبنەمای واقیع دەگرێتەوە کەژیاننامەی مرۆڤ پێکدێنن لای فرۆید، واتە مرۆڤ تا دەمرێت لەململانێدا دەژی و بەحەسرەتی جێبەجێکردنی پێداویستیەکانیەوە سەر دەنێتەوە، هەر لەم سۆنگەیەوە کە مرۆڤ تووشی ڕووخان (احباگ) دەبێت مەیلێکی شاراوە مرۆڤ ڕاپێچ دەکات کەئەویش غەریزەی مردنە، واتە حەزکردن بەگەڕانەوە بۆ ژیانێکی ئاسودەو بێدەنگ (السکون) کە ناو سکی دایکە.

فرۆید نامۆبوونی مرۆڤ دەگەڕێنێتەوە بۆئەو کۆتوبەندەی کەلەپێوەرو یاسا کۆمەڵایەتیەکاندا دەردەکەوێت و لەسەر چالاکیە غەریزەیی و بایۆلۆژیەکانی مرۆڤ لەرێگەی دامەزراوە کۆمەڵایەتی و رۆشنبیری ومادیەکانی کۆمەڵەوە دەسەپێنرێ وەکو پێوەرێك نابێ مرۆڤ لێی لابدات، ئەم نامۆبونەش هەر لەسەرەتای تەمەنی منداڵیەوە دەستپێدەکات چونکە لەسەری پێویستەو پێی دەڵێن (نەکەی!!) یان (عەیبە) ئەمەش خۆی لەخۆیدا دەبێتە ترسێك لەدڵ و مێشکی چەکەرە دەکات و ناچار حەزو ئارەزووەکانی کەبەشێوەیەك یان ئەوی تر گوزارشتی لێدەکرد دادەمرکێتەوەو پشتگوێ دەخرێ بۆئەوەی هاوبەش بێت لەو شارستانیەتەی تیایدا دەژی، ئەم دامرکانەوەش کەئەلتەرناتیڤێکی تری نییە، تووشی دەمارگیری دەکات و وزە شاراوەکانی لەئاست پێشکەوتنی شارستانیەتەدا شاراوەتر دەکات و کەسێکی ناتەباو گۆشەگیر یان ئاڵۆز دەخولقێنێ و دوورە پەرێز دەبێت لەئاست بەشداریکردنی کۆمەڵ بەتوانست و وزەکانیەوە.

ئەنگێزەی سێکس ..کەیەکێکە لەو پێداویستیە بایۆلۆژیانەو دادەمرکێتەوە یان سەرکوت دەکرێ بەرای فرۆید ئەو وزە پەنهان و شاراوەیە بخرێتە خزمەت چالاکیە رۆشنبیری و کۆمەڵایەتیەکان بەرێگای یان شێوەی هەڵکشان (تصعید)، بەڵام ئەم نێوانەش لەسەر حیسابی بنەمای لەزەت دا دەبێت وەکو قەرەبووکردنەوەو ملکەچی یاسا کۆمەڵایەتیەکانە واتە بنەمای واقیع، چونکە ئەنگێزەی سێکس و ئەنگێزە بایۆلۆژیەکانی دیکەش داوای سروشتی مرۆڤن و رۆشنبیری کۆمەڵایەتی کۆسپە لەرووی بەدیهێنانی ئەو داوایانە، بەم شێوەیە کرداری هەڵکشانەوە دەبێتە میکانیزمی بەرگریکردنی دەروونی ناراستەوخۆ، یان فیلێکی بەرگری (حیله دفاعیه) دەروونی بۆ خۆرزگارکردن لەو ئەنگێزەو ئاکامەکانی بۆرازیکردنی داوای خودو واقیعی کۆمەڵایەتی کەهەردوکیان دژ بەیەکن، بەو شێوەیەش لەقاوغی سەرکوتکراوی دوورناکەوێتەوە هەرچەندە خۆی خستۆتە قۆناغی هەڵکشانەوە واتە ناوکرۆکی ناوەوەی مرۆڤ دەمێنێ و دەبێتــە دێوەزمەیەك لەناخیدا.

پاش تەمەنی منداڵی واتە قۆناغی کامڵبوون کاری کۆمەڵ لەسەر ئەو تەمەنە کەمتر کاریگەر دەبێت ئەگەر بەراورد بکرێ لەگەڵ کاریگەری لەسەر تەمەنی خۆگونجاندن و نەگونجانی ئەو مرۆڤانەش بەو پێیی دەگەڕێتەوە بۆ رۆڵی منی باڵا کەلەژێر پەروەردەو پێوەرەکانی کۆمەڵ دروستدەبێت هەر لەتەمەنی منداڵییەوە رەگوریشەی لەناخی ئەو مرۆڤەدا دەکوتێ، ئەم کردارەش وا دەکات مرۆڤ لەتەمەنی پاش منداڵی کەمتر کاری لێبکرێ ئەمیش وادەکات گۆڕانکاری لەژیانی مرۆڤدا نەبێت و تارمایەکیش بخاتە ژیانی ئەو مرۆڤەوەو هەست بەرووخان (احباگ) بکاو بەتایبەتیش ئەگەر سفەتێکی خراپی وەرگرتبێ و یان بەو شێوەیە هەست بکاو نەتوانێ بیگۆڕێ بێگومان هەستی نامۆبوون و کەساسی تیایدا چرۆ دەکات و ئەو مرۆڤە دەروخێنێ.

هەرچەندە فرۆید هەندێ جار ئاماژە دەکات کەگۆڕانی سەرتاسەری دامەزراوو دەزگاکانی کۆمەڵ دەبێتە هۆی گۆڕان لەکارە ناکۆك و دژوارە دروستبووەکانی ناخی مرۆڤ و ئاکامەکانی، بەڵام ئەم گۆڕانکاریە نابێتە هۆی ریشەکێشکردنی یەکجارەکی ئەو ناخە، چونکە گومانی تێدا نییە هەموو شارستانیەتێك و هەموو مرۆڤێکی ئەو شارستانیەتە بەرواڵەت بانگەشەی ئەوە دەکەن یان خۆیان واپیشان ئەدەن کەخۆیان نادەن بەدەستەوەی غەریزەکانەوە، فرۆید بڕواشی نەبووە کەشارستانیەتێك هەبێ و سەرکوتکردنی تیا نەبووبێ لەسەر ژیانی کەسانی کۆمەڵ هەورەها ئەستەمە لای فرۆید کەپەروەردەیەکی بێ سەرکوتکردن هەبێت چونکە ئەو داوایەی

واتە داوای کۆمەڵ کەسەرکوتکردن پاساو دەکات خۆی بەنەمر دەزانێت بەواتایەکی تر تاکە کەس دەبێتە قوربانی کۆمەڵ چونکە کۆمەڵ هەر دەمێنێ.

هەستکردن بەگوناه رۆڵێکی بنەڕەتی دەبینێ لەگەشەپێکردنی رووخانی مرۆڤ، ئەم هەستکردنەش لەسروشتی مرۆڤدا هەیە، کەلە (دڵەراوکێی دەسەڵات) و (دڵەراوکێی منی باڵا) دا دەردەکەوێ کەیەکەمیان گوشار دەخاتە سەر مرۆڤ کەواز بێنێ لەرازیکردنی ئەنگێزەکانی و دووەمیان پاڵ بەمرۆڤەوە دەنێ کەسزای خۆی بەدەستی خۆی بدات چونکە گوناهێکی کردووە واتە هەستی پێدەکات، هەروەها دەڵێ هەست بەگونهاکردن گرفتی سەرەکی شارستانیەتە، چونکە بەهای بێبەشبون لەپێشکەوتنی شارستانیەت لەبری ئەو هەست بەگوناهکردنە دەدەین.

سەرچاوەکانی مەلوولی و نامۆبوونی مرۆڤ بەبۆچوونی فرۆید بەتەنها نابەسترێ بەململانێی هەمیشەیی نێوان رۆحی و مادی مرۆڤ، یان نێوان ئاوەزی و جەستەیی یان ئاکامی توندڕۆیی ئارەزووە مرۆییەکان کەدەبێتەکۆسپ لەبەردەم مرۆڤدا بۆگەیشتن بەپاکیزەیی، بەڵکو ئەنجامی ململانێی جەدەلیانەی نێوان سروشتی مرۆڤ بەغەریزەیەکانیشیەوەو نێوان پێداویستیەکانی ژیان و شارستانیەت و ئەوەی کۆسپ دەخاتە بەردەم بەجێهێنانی ئەو غەریزەو پێویستیە بایۆلۆژیانەو تامردن بەردەوام دەبێت، فرۆید بروای بەوە نییە کەرێگا چارەیەك هەبێت بۆرزگاربوون لەم نامۆییە چونکە ئەو ململانێیە وەکو وتمان بەبەردەوامی لەگەڵ مرۆڤدایە، هەروەها ئاماژە دەکات بەوەی کەئەو رێگاچارە هزری و سایکۆلۆژی و کۆمەڵایەتیانەی کەزۆر فەلسەفەی جودا گوزارشتی لێدەکات ناتوانێ مرۆڤ لەو نامۆییە رزگار بکات و زۆر بەگاڵتەجاڕیشەوە جەخت لەسەر ئەوە دەکات کەسوککردنی کۆتوبەندەکانی ژیانی مرۆڤ و پێشخستنی ژیانی کۆمەڵایەتی ناتوانێ سەرکەوتن بەدەستبێنن بۆریشەکێشکردنی ئەو نامۆییە تەنها کەمکردنەوەی نەبێت، هەروەها دەڵێ دابینکردنی ژیانی مادی و کۆمەڵایەتی مرۆڤ و رێگای بەدەستهێنانی ئەو بەروبوومانەو بەجێهێنانی داوا کۆمەڵایەتیەکان لەمیانەی شۆڕش و دابەشکردنەوەی سەروەت و سامان لەوانەیە نامۆبوون سووك بکات بەڵام لەناوی دەبات.

هەڵکشان (تصعید) یش هەروەکو لەپێشدا باسمانکرد وەگەڕخستنی غەریزەیەکانە بۆ خزمەتکاری ئەفراندن و رۆشنبیری و ژیاری و رێگە چارەیەکە لەبری ململانێی ناوەوەی دەروونی مرۆڤ بەڵام ئەم هەڵکشانەش شێوەیەکە لەچەپاندنی ئەنگێزەی سێکسی و تاکەکەسی رزگارناکات لەدڵەراوکێ و ئەو بێبەشیە کەدەبێــەهۆی روخان و پەککەوتنی و هەندێ جاریش

مردن یان حەزکردن بەمردن بۆرزگاربوون لەو مەینەتیە کەبەدواچارە دادەنرێ کاتێ بنەمای لەزەت سەرکەوت بەدەست ناهێنێ و دەبێتە هۆی مەلولی و کەساسی و نامۆبوونی بەردەوام.

هەر ئەو جۆرە مردنەشە کەفرۆید ناوی دەبات بەحەزی نەستیانەی مرۆڤ بۆ مردن یان بەرەو مەنزڵگای بێدەنگی و ئارامی (السكون) ی سکی دایك کەمرۆڤ تیایدا ساتەوەختەکانی ژیانی دوور لەململانێ بەسەر دەبرد کەلەپێشدا باسمانکرد.

فرۆید..بڕوای وانیە کەپەروەردەی ئاینی بتوانێ ببێتە ڕێگا چارەیەك بۆ قورتاربوونی مرۆڤ لە نامۆبونە کەبە سروشتی ئەو مرۆڤەوە بەستراوە، هەورەها فرۆید هیچ حەسابێك بۆئەو رزگاربوونە ناکات کەبەهۆی پێشکەوتنی کۆمەڵەوە هاتۆتە کایەوە وەکو سەرهەڵدانی ئاین و و شۆڕشی پیشەسازی ئەوروپاو ئاکامەکانی لەژیانی مرۆڤ، ئەم سروشتە مرۆڤایەتیە فرۆید نایگەڕێنێتەوە بۆ داتەپینی دامەزراوو ئۆرگانە کۆمەڵایەتیەکان و چەوسانەوەی مرۆڤ و چینەکان بۆ یەکترو لەپێناو بەرهەموو شتی تر.

بەڵکوکاری شەڕخوازانەی مرۆڤ بەسیفەتێکی سروشتی مرۆڤ لەقەڵەم دەدات و رۆڵی واقیعی کۆمەڵایەتی و پەیوەندییە ئابوریەکان و شەڕوشۆڕو برسێتی و قات و قڕی وەلا دەنێت.

هەرچەندە فرۆید زۆر رەشبینە بەرامبەر سروشتی مرۆڤ بەلاّم نکوڵی لەتوانای خۆگونجانی مرۆڤ لەگەڵ واقیع و پێشکەوتنی دەروونی ناکات وەکو دەڵێ: ئامێری دەرونیمان پێشکەوتنی بەخۆیەوە بینیوە بەتایبەتی لەمیانەی هەوڵەکانی مرۆڤ بۆ خۆدۆزینەوەی جیهانی دەرەوەو بەکارهێنانی تەکنۆلۆژیاو ...هتد کەبۆتە هۆی گۆڕانێکی کەم لەهاوسەنگی و خۆگونجانی مرۆڤ و پێشکەوتنی پاشەڕۆژی، بەلاّم ئەمە گۆڕانێکی ئەوتۆ نییە، کەلەرەشبینیەکەی فرۆید کەم بکاتەوە، کەپێیوایە سروشتی مرۆڤ هەرگیز ناگۆڕێ و وەکو خۆی دەمێنێ.

## سوریالیزم:

**ئامانجی سوریالیەکان رزگارکردنی هزری چەپێنراوە، کەدانیەمۆی رەفتارەکانی تاکە.**

سوریالیزم یان سەرو واقیع رێبازێکی هونەری و ئەدەبی فەرەنسیە لەکارەکانی ئامانجی گوزارشتکردنە لەلاشعور بەشێوەیەك کەهیچ هەقی بەعەقل و مەنتیقەوە نەبێ، ئەم رێبازە میکانیزمێکی دەروونی پوختە بۆ گوزارشتکردن لەسەرقاڵبوونی هزر چ بەزارەکی بێ یان بەنوسین یان هەر رێگایەکی دیکە، ئەم رێبازە لەسەروی سەرجەم بزاڤە شۆڕشگێرەکانە، سوریالیزم دوورە لە هەر تەحەکومێکی دەرەکی یان دورە لەچاودێری عەقل، سوریالیەکان لەنیگارەکانیاندا پشتیان بەشتگەلێکی واقیعی بەستووە کەوەکو سیمبول بەکاری دێنن بۆ گوزارشتکردن لەخەونەکانیان و پەرەپێدانی شێوەکانی سروشت بۆ سەروی واقیعی بینراو.

سوریالیزم بەوە دەناسرێتەوە کە تەرکیز دەکاتە سەر ئەوەی نامۆو ناکۆك و لاشعوریە، ئامانجی ئازادکردنی هزری چەپێنراوو تەسەوراتی خەیاڵی و زاڵبوونی خەونەکانە، سوریالیەکان لەکارەکانیاندا پشتیان بەشیکردنەوەکانی فرۆید بەستووە، هەروەها پشتیان بەناوەڕۆك بەستووە نەك بەشێوەی دەرەوە، بۆیە تابلۆکانیان ئاڵۆزو ناروونە، بەلای ئەمانەوە رواڵەتی دەرەوە کەهونەرمەندانی سەرقاڵ کردووە هەموو راستیەکان دەرنابڕن و گرنگیش نییە، بۆیە بۆ نیگارکێشان و کاری هونەری کاغەزی دڕاو بێکەڵك و شتی فەرامۆشکراویان بەکاردێنا وەك ئەوەی دادائیزم پشتی پێ دەبەست، چونکەسوریالیزم لەسەر

کەلاوەی دادائیزم درووست بووە کەئەویش بزاڤێکی هونەری دژ بەهونەری ئەو سەردەمە بووە کەئامانجی ڕەتکردنەوەی شەڕ بووە، بەو پێیەش ڕەفتارەکانی مرۆڤ بێئەوەی لێکبدرێتەوە شێوەی سوریالیزمیانەی پێوەدیارە، مەرج نییە کاری سوریالی تەنها لەهونەری نیکارکێشاندا بێ بەڵکو لەهەستی شاعیران و ئەدیبانیشدا بەرجەستە دەبێ، خۆ کاری هونەریش هەر هزرە کەواتە شیعرو ئەدەبیش هەر هزرە بەو پێیەش هیچ کەسێك وەکو شاعیران و ئەدیبان سوریالیزمانە گوزارشت لەناخیان ناکەن بۆیە فرۆید ئاماژەی بەوە داوە کەئەوەی شاعیران و ڕۆماننوسان دەیزانن هێشتا زانست پێی نەگەیشتووە، تەنانەت نەك شاعیرو ئەدیب بەڵکو مرۆڤی ئاساییش زۆرجاریش بەدەم ڕۆیشتنەوە سەیری شتەکانی دەوروبەری خۆی ناکات بۆ حومکدان لەسەری بەڵکو ڕاستەوخۆ خەیاڵی بۆشتێکی تر دەڕوات کەلەژێرئەو شتەوە شاراوەتەوە، تەنانەت ئەگەر کەسێك نامۆییانە لێی بڕوانێ ڕەنگە ئەم کابرایە والێکی بداتەوە کەئەو کەسە مەبەستی مۆڕەکردن یان هەستی نەرێنی نییە ڕەنگە بەلای ئەوەوە کارێکی حەسودی بێت یان هەر هەستێکی دیکەی شاراوە، سەیرکردنی  ئاوا شتێکی نامۆیە هەروەکو تابلۆیەکی نامۆ کەسوریالیەکان پێیان وایە لەناوەڕۆکدا شتێکی دیکەیە، سوریالیزم بەرادەیەك نزیکە لەسایکۆلۆژیاوە ڕەنگە وا لێکبدرێتەوە کەبەشێکە لێی یان یەکێکە لەبیردۆزەکانی سایکۆلۆیا بۆیەش زۆر نزیکن لەفرۆیدیزمەوەو فرۆیدیش ئاماژەی بەوە داوە کەسوریالیەکان ئەویان بەگەورەی خۆیان ناسیوە، فرۆید لە تا ساڵی ١٩٣٨لەگەڵ سزوریالیزمدا تەبا نەبووە لەگەلاوێژی ئەو ساڵەدا (ستیفان زەڤاییج) سلفادۆر دالی خستە تەك خۆی و چوون بۆلای فرۆید، بەیانی ڕۆژی داهاتوو فرۆید نامەیەکی بۆستیفان نوسی (صالح)، کەدەڵێت: بەهاتنی دوێنێی تۆو میوانەکەت قەرزار بووم و سوپاست دەکەم، چونکە تا ئەو کاتە سوریالیەکان منیان بەگەورەی خۆیان دەزانی، من بەشێتم لەقەڵەم دەدان، بەڵام ئەو لاوە ئیسپانیە-واتە سلفادۆر دالی میوان، بەراشکاوی و چاوە درەوشاوەکانی و توانا تەکنیەکیەکانی کەنکوڵی لێناکرێت سەبارەت بەخۆیان (سوریالیەکان ) کاری لەراوبۆچوونی من کرد، زۆر پێمخۆشە کارە هونەریەکانی شیبکەمەوە، سوریالیزم درێژەپێدەری دادائیزمەو لەسەر بنحی ئەو رواوە.

ئەندریە بریتون پێیوایە دادایزم گەیشتە لوتکەی پەرەسەندن، لەهەمانکاتدا وەك پاپۆڕێك لەکارەسات نگرۆ دەبێت، جەختیشی لەسەر پێویستی گەڕان بەدوای ئاراستەیەکی نوێدا دەکردن بریتون پرانسیبەکانی ئەم ئاراستە نوێیەی لەشیکردنەوەی دەرونی بینی و ئەمەش بەراشکاوی لەمانیڤیستی یەکەمی سوریالی کەپێش ١٤ساڵ لەیەکتر بینینی فرۆید و دالی دەرچووە دووپاتکردەوە، کەتیایدا هاتووە (بەئاشکرا دەردەکەوێت کەتیشك خراوەتە سەر ئەو

بەشە گەورەیەی جیهانی ئاوەز کەلەجیهانی نەستە، ئەو نەستەی کەخەڵك بایەخی پێنەداوە گرنگیەکی مەزنتر پێکدێنێت بەرامبەر ئەو دۆزینەوەیەش پێویستە سوپاسی فرۆید بکرێت ئەو دۆزینەوەیەی فرۆید بەشێکی گرنگی بوونی مرۆڤایەتی پێکدێنێت کەپابەند نییە بەژیربێژی و عەقڵەوە، سوریالیەکانیشی وروژاندووە، چونکە گەورەترین دۆزینەوەیە لەناخی مرۆڤدا، بەهۆیەوە وەك خۆیان دەڵێن واتای وشەکان و زیندەگییان دەدۆزێتەوە بەتایبەتی لەبواری وێژەدا، چونکە ئەوان پێیانوایە مرۆڤ لەژیاندا بۆ تێگەیشتنی جیهانی بویەر و دۆزینەوەی راستی چەندان سەدەی بەسەربردووە، ئەگەر چی لەو رێگەیەوە شتێکی گەورە یان بچووك بەهادار یان بێ بەهای دۆزیبێتەوە ئەوا پێشتر هەرگیز ناخی ئەو جیهانەی ناوەوەی نەدۆزیوەتەوە، ئێستاش کاتی ئەوە هاتووە بچێتە ناخی ئەو جیهانەو راستیەکانیشی دەربخات) بیرۆکەی سوریالیزم وەك بریتۆن دیاری کردووە ئامانجی گەڕانەوەی تەواوی هێزە دەرونیەکانمان نییە بۆ هۆیەك، کەتەنها رۆچوونێکی خێرایە بۆ ناوەوەی خودو روناککردنەوەی گۆشە تاریك و لێڵەکان و خۆپاك راگرتنی  یەکجارەکی لەناو جەرگەی ناوچە یاساغکراوەکە، بریتۆن ئاماژە بەوە دەدات کەئێمە تا هەنوکەش لەسایەی ژیربێژییدا دەژین، بەلاّم شێوازە لۆژیکیەکانی ئێستاو لێکۆڵینەوەکانی فەیلەسوفێکی سوریالی بۆ چارەسەرکردنی کێشە لاوەکیەکان نەبێت جێبەجێ ناکرێت.

ئاوازێکی رەها کەتا ئێستا باوە گوێ ناداتە ئەو روداوانەی کەپەیوەندیەکی بڕواپێکراوی بەئەزمونەکانەوە نەبێت، ئەزمونەکانیش لەچوارچێوەیەکدا دەخولێتەوە، لەسایەی دۆزینەوەکانی فرۆید لەمەڕ نەستەوە، رەوتی رای گشتی وێنەیەکی کێشاوە، کەپشکێنەری مرۆڤ لەسایەیدا دەکارێت لەپشکنینەکانی قووڵ بێتەوە.

تایبەتکردنی لێکۆڵینەوەکانی فرۆید بۆ خەون شتێکی پێویست بوو، چونکە شیاو نییە ئەم بەشە گرنگەی چالاکی دەرونی وەلا بنرێت و لێی نەکۆڵدرێتەوە) .

نەست لای سوریالیەکان بنەمای داهێنانی هونەرییە، بەو پێیە سوریالیەکان بۆ دۆزینەوەی نەست پشت بە هەردوو رەمەکی مردن و ژیان دەبەستن، کەئامانجی جیهانی دەخوازێ و بیروڕا وێناندن و وڕێنەی سوریالیەکان تێدا دەردەکەوێت، کەبەدوو رێگە نەبێت رێگەی میکانیکی و خەونەکان، هەردوو رێگەش بۆ تەکنیکی شیکردنەوەی دەروونی چوون یەکن وەك لێگەرانی ئازادو شیکردنەوەی خەونەکان.

بەڵام سروشتی زانستی پەیوەندیەکانی نێوان تەکنیك و فرۆیدیزم سوریالیزم پتر ئاڵۆزەو تێچوونی زۆرترە، یان وەك فرۆید تێی دەڕوانێت شتی نەستەق لەبارانۆیا نییە، کەسوریالیەکان بانگەشەی بۆ دەکەن، بەڵکو لەرێگەی خودی ئەو بانگەشەکردنەوە دەردەکەوێت، لەیەکەم مانیفێستی سوریالیدا (بریتۆن) وەك قوتابیەکی نۆشداری مەشقی کردووە، ئەو بانگەشانەی تێیدایە کەنوسینی خۆڕسکی رێگەیەکە فرۆیدیەکان لەکاتی شەڕی جیهانی لەگەڵ هەندێ نەخۆشدا سروشیان پێداوە، ئەو پێیوایە رێگەی مۆنۆلۆگی ئازاد بەخێرایی گەورەتر دووبارە دەبێتەوە بەشێوەیەك، کەئاوەز ناکەوێتە ژێر رکێفی هیچ رێکخەرێکەوەو هیچ بەربەستێك، یان بەرگریەکی لەرووی هزرەوە لەئارادا بووە کەدروست ناکات، ئەمەش رێخۆشکەرێکە، کەئاوەز بەهۆیەوە دەتوانێت شتەکانی خۆی بخاتە مەیدانەوە.

بریتون جەختی لەسەر ئەوە کردەوە، کەسوریالیزم لەپێناو پاککردنەوەی یەکجارەکی لەخلتەوخەوشی وێژەیی پێویستە پشت بەرێگەی خۆڕسکە نوسین ببەستێت)، بریتون خۆڕسکە نوسین و لێکۆڵینەوەکانی خەونی بەچارەسەری هزری هەموو نەخۆشییەك دادەنێت چونکە بەبەراورد لەگەڵ هەموو شتەکانی هاوتای خۆیان کەمتر فرتوفێڵی لێدەکرێت و زانینی راست بەمرۆڤ دەبەخشێت، سەبارەت بەتواناکانی و پاشان ئەو کلیلانەیە کەدەتوانێت ئەو بوخچە جەنجاڵە کەپێی دەوترێت مرۆڤ بکاتەوە.

چەمکی سوریالیزم سەبارەت بەنەست تا چ رادەیەك لەسەر شێوەی چەمکی فرۆیدزم رۆنراوە؟!

فرۆید پێیوایە دروستی ئاوەز لەهاوسەنگی داینامیکی نێوان هەست و پێش هەستی وەلاناوەو ویستوێتی بیردۆزەکەی بەبیرۆکەی گەشتی بۆنەست دیاری بکات، چەمکی نەستە داهێنان نویٚ نییە، ئەگەر سەبارەت بەو کەسانە بێت کەپێش فرۆید کەوتوون یان لەنێوان هونەرمەندان و هونەردا، ئەوا فرۆید ئاماژەی بەوە داوە هەستی لەئاکامی ئاوەزو هونەری رەچەی زێدەڕۆیی ناگرێتەبەر، بەڵام سەبارەت بەکەسانێك وەك گۆتەو هلموهولتز، کەتوانایان لەرادەبەدەر بووە بۆمان دەردەکەوێت کەناوەڕۆکی داهێنانەکانیان پێشتر نەخشەی بۆ نەکێشراوە، فرۆید جەختی لەسەر بەستنەوەی راستەوخۆی نێوان خەونەکان و نەست کردووە، لەمیانەی ئەو خەونانەدا هەلێك بۆ ناوەڕۆکەکانی نەست دەڕەخسێت، کەرێگەیەك بەرەو خودو هەست بگرێتە بەر، هەروەها خەونەکان باشترین هەل بۆ دۆزینەوەی نەست دەڕەخسێنێت، ئەم

دۆزینەوەیەش سەرنجی سوریالیەکانی راکێشا، پاشان بریتون لەمانیفسیتە سوریالیەکەیدا داوای هەڵوەشاندنەوەی ئەو کۆتانەی کردووە کە سنور بۆ چالاکی هونەرمەند دادەنێت، هەروەها بانگەشی جاویدانی بۆ جیهانی خەونەکان کردووە، کە لەو بڕوایەدابووە چارسەری هەموو گرفتەکان دەکات.

خەون لای سیگمۆند فرۆید نا ئاوەزەکییەو بەدیهێنانی حەزە چەپێنراوەکانە، بەو پێیەی کەبویەری دەروونی لەروانەگەی ئەوەوە وێنەیەکە لەوێنەکانی بوون و ناشێت جیاوازی لەنێوان ئەو بویەرە دەرونیەو نێوان بویەری کەرەستەیی نەکرێت، هیچ پاساوێك بۆ دورکەوتنەوەی خەڵکی نییە، کەبەرپرسێتی نەبوونی رەوشت لە خەوندا بخەنە سەرشان، ئەمەش سەبارەت بەسوریالیەکان بایەخێکی هەمەلایەن بۆرزگارکردنی ئەزمونەکە لەتەلبەندی سوود وەرگرتنی راستەوخۆ و هەستکردنی گشتی گرێدراو بەژیربیێژی و شیاو پێکدێنێت، چونکە ئاوەزو شیاو لەروانگەی سوریالیەکانەوە بۆ چارەسەرکردنی بنەڕەتی ژیانی هاوچەرخی بیٚ دەسەڵاتن، هەروەها بەرپرسیش نین، بەڵگەشیان بۆ ئەوە جەنگی یەکەمی جیهانییە، بەڵام فرۆید بانگەشەی ناژیربیێژی لەپێناو ناژیربیێژی نەکردووە، هەورەها خەونەکانیش بەو پێیەی کەبەدیهێنانی ئارەزووەکانن ئەوە نین، کەسوریالیەکان بەواتا فرۆیدیەکەی لێی تێگەیشتوون، بریتون لەو باوەڕەدایە، یەکلاکردنەوەی هەردوو دۆخی خەون و بویەر، کە لەروخساردا وەك ناکۆك بەیەك دەردەکەون و بەشێوەی بویەری رەها دێنە ئەنجام، کەئەویش سوریالیزمە، کەزۆر پێناسەی بۆ کردووە وەك: ( چەشنێکە بۆ چێکردنی ئەفسانەیەکی هاوبەش) یان (پردێکی زۆر بچوکی سەرهەڵدێرەکە) یان هەمەلایەنتر، (خۆڕسکبوونی دەرونییە، کەئامانجی گوزارشتکردنی زارەکییە یان نوسینە یان هەر رێگەیەکی دیکەیە، لەبویەری هزردا بەرێگەیەك ملکەچی ئاوەز نابێت و سەر بەخۆشە لەهەر بەهەند هەڵگرتنێکی رەوشتی یان ئیستاتیکا) .

ئەمەش ئەوە دەگەیەنێت کەئاوەز لەتێڕوانینی بریتۆنەوە دەتوانیٚ بگاتە دۆخێکی یەکگرتن، کەهێزە ناکۆکەکان تیایدا لەهێزێکدا تێکەڵ بەیەك دەبن، مردن لەگەڵ ژیان تێکەڵ دەبێت، رابردوولەگەڵ ئایندە، خەون لەگەڵ بویەردا، لەبویەری رەهاشدا کەبویەری سوریالیزمە، (دەتوانین ئومێدی ئەوە بکەین، کەشاراوە نادیارەکان بۆ نادیاری مەزنتر ڤاڵابکەین، منیش-بریتون—باوەڕم بەچارەسەری ئایندە بۆ ئەم دوو دۆخە ناکۆك بەیەکە هەیە، لەروخساردا

هەردوکیان خەون و بویەرن، لەچەشنی بویەری رەها لەسوریالیزمدا، واتە بویەریەکی لەرادەبەردەر، سوریالیەکان بەکاریان هێنا .

جوان بیرۆ بۆمان روون دەکاتەوە کەچۆن نیگاری تابلۆی لەدایکبوونی جیهانی کێشاوە، هەروەها دەڵێت کاتێك نیگار دەکێشم، بەدیاریکردنی ئەوەی نیگار دەکێشم دەست پێناکەم، لەگەڵ دەسپێکردنم بەکێشانی وێنەیەك شێوەی وێنەکە خۆی خۆی دیاری دەکات، یان وێنەکەخۆی لەگەڵ فڵچەکە سروشم دەداتێ، شێوەکە لەوانەیە ببێتە نیشانەی ئافرەتێك، یان پەلەوەرێك، یان ...تد، قۆناغی دووەم، قۆناغی کۆکردنەوەیە، کەبەوردی ئەنجام دەدرێت، (ماسۆن) یش زیرەکی و خوێندنەوە فراوانەکانی لەبیرمەندو فەیلەسوفی سوریالی بریتۆنەوە نزیکە، کەپشتی بەبنەمای خۆڕسکی بەستووە، بەمکوڕییەوە دەستی لەسەر کاغەزی وێنەکە دەهێڵێتەوە، تاوەکو ئەندێشەیەکی بۆ دێت، پاشان بۆ پێگەیاندنی ئەو ئەندێشەیە هەنگاو دەنێت، بەڵام ماسۆن شێوەیەك لەشێوەکانی تێکەڵ و پێکەڵکردن لەخۆڕسکی دۆزییەوە، کەدەبێتەهۆی رووخان و نەزۆکی، پاشان دوای چەندساڵێك ئەو شێوەیەی بەجێهێشت.

## ئۆدیب لەنێوان فرۆم و فرۆیددا:

**پەیوەندی نێوان باوك وكوڕ بەرهەمی كۆمەڵگەی باوكسالارییە، بەتایبەتی كاتێك كوڕ بەموڵكی باوك دادەنرێت و ناچار دەبێت كەلەخزمەتی بەرژەوەندی باوكدا بێت هەروەكو كالاّیەك یان ئاژەڵێك بۆ بارگواستنەوە (فرۆم)**

ئەریك فرۆم رای وایە كە نابێت ئەفسانەی ئۆدیب وەك سیمبولی پەیوەندی سێكسی تاپۆكراو لەنێوان دایكوكوڕ لێكبدرێتەوە، بەڵكو وەك شۆڕشێكە لەلایەن كوڕەوە دژی دەسەلاّتی باوك لەخێزانی باوك سالاری، خواستی دایك (جوكاستا) لەلایەن ئۆدیبی كوڕییەوە توخمێكی لاوەكییە لەرۆمانەكەدا، واتە تەنها رەمزی سەركەوتنی كوڕە بۆ جێگرتنەوەی باوك و وەرگرتنی مافەكانی ئەو باوكە.

ئەگەر ئەفسانەكە گوزارشتێك بێت سەبارەت بەپەیوەندی سێكسی تاپۆكراو نێوان منداڵ و دایكەكەی، ئەی بۆچی هیچ ئاماژەیەك لەئەفسانەكەدا نەكراوە كەئۆدیب لەرووی سێكسیەوە سەرنجی راكێشرابێ یان كەوتبێتە داوی جوكاستاوە؟!لەگەڵ ئەوەشدا دەشیخوازێ و دەچێتە سەر تەختی پاشایەتی زۆربەی روایەتیەكانیش یەكێكیان نەبێت وادەگێڕنەوە كەئۆدیب هەرگیز دایكی نەخواستووە، لێرەدا پرسیارێك سەر هەڵدەدات ئەگەر ئۆدیب ئەو پاڵەوانە ئازاو

بەسەلیقەیە بێت کەبەسەر ئەبی هۆل • دا سەردەکەوێت کەواتە چ ئازایەتیەك و چ پێویستیەکی بەوەیە ئەو تاوانە ئەنجام بدات کەبەگەورەترین تاوان لەقەڵەم دەدرێت؟!

ئەو سێ تراژیدیایە کەپەیوەستن بەم کێشەیەوە نەك تەنها ئۆدیبی پاشا کەفرۆید باسی کردووە، دەبینین بابەتی هەرسێکیان بریتیە لەکێشەی نێوان باوکوکوڕ ئەم کێشەیە لەرۆمانی ئۆدیبی پاشا لەکوشتنی لایۆس (کوڕ) دەردەکەوێت، لەرۆمانی ئۆدیب لەکۆلۆنۆس کێشەکە لەنێوان ئۆدیب و هەردوو کوڕەکەیدا دەردەکەوێت، هەروەها لەرۆمانی ئەنتیگۆن کێشەکە لەنێوان کریۆن و هیمۆن دا دەردەکەوێت، هیچ گرفتێکی خواستنی تاپۆکراو (الزواج المحرم) لەنێوان کوڕانی ئۆدیب و دایکیاندا نییە، یان لەنێوان هیمۆن و دایکیدا نییە، کەواتە راستە بڵێین کێشەی نێوان باوکوکوڕ لەرۆمانی ئۆدیبی پاشا گرفتی راستەقینەیە نەك حەرام زادەیی.

فرۆم دەڵێت ئەگەر هەرسێ رۆمانەکەی ئۆدیب شیبکەینەوە ئەوا دەبینین کێشەی سەرەکی خەباتە دژی دەسەڵاتی باوکایەتی رەگوڕیشەی ئەم خەباتەش دەگەڕێتەوە بۆ ئەو خەباتە کۆنەی نێوان باوك سالاری و دایکسالاری کۆمەڵگا.

جگە لەمانە ئۆدیب و هیمۆن و ئەنتیگۆن حوکمی دایك دەنوێنن لەجیهاندا ئەم نوێنەرایەتیەی حوکمی دایکیش هێرش دەکاتە سەر سیستمی کۆمەڵایەتی و ئاینی کەبەندەلەسەر هێزو مافەدانراوەکانی باوك کەئەمیش لایۆس و کریۆن دەنوێنن .

فرۆم لێرەدا بیردۆرزەکەی (باخۆفن) کەپەیوەندە بەمافی دایکەوە وەك بنچینەیەك بۆ لێکدانەوەی ئەفسانەی ئۆدیب بەکاردێنێت، هەروەسا دەڵێت باوکسالاری بەیەك ژنی و دەسەڵاتی باوك لەخێزانداو رۆڵی بنچینەی پیاوان لەکۆمەڵگایەکی رێکخراو لەسەر بنەمای ئاین وەسف دەکرێت، ئاینیش لەگەڵ سیستمی کۆمەڵایەتی هاموڕایە لەکۆمەڵگای باوکسالاری، ئۆدیب لەزۆربەی رۆمانە ئەفسانەییەکان کەسۆفۆکلیس کتێبەکەی لەسەر داناوە هەمیشە بەستراوە بەسیستمی ئاینی کەبەندە لەسەر پەرستنی خواکانی سەرزەمین، ئەوسیستمەی کە باخۆفن بڕوای وابوو ئاین حوکمی دایك دەنوێنێت چیرۆکی ئەبولهۆل وەك فرۆم

---

• ئەبولهۆل: گیاندارێکی خورافیە لەئەفسانە یۆنانیەکان کەسەری ژنێکەو سنگ ولاشەی شێرە یان سەگەو باڵی هەیە، وابڕوا بوو ئەم گیاندارە هەڵدەستێ بەکوشتنی ئەو کەسەی نەتوانێت چیرۆکەکە هەڵبێنێت، ئەفسانەکە دەڵێت ئۆدیب توانی مەتەڵەکە هەڵبێنێت و بووە هۆی کوشتنی ئەبولهۆل

تێیدەگات ئاماژە بەپەیوەندی نێوان بنەمای حوکمی دایك و ئۆدیب دەکات، چیرۆکەکە دەڵێت کاتێك ئۆدیب گەیشتە (تیبە) ئەبوهۆل گەنج وکچانی تیبەی راودەنا، وازیشی لێنەدەهێنان تاکو کەسێك بدۆزێتەوە چیرۆکەکە (مەتەڵەکە) هەڵبێنێت، مەتەڵەکەش دەڵێت: ئەو شتە چییە کەیەکەمجار لەسەر چوار قاچ دەڕوات پاشان لەسەر دوو قاچ و پاشتریش لەسەر سێ؟بڕیاریش وابوو کەوا هەر کەسێك چیرۆکەکە هەڵبێنێت و شارەکە رزگار بکات لەو کارەساتە ئەوا دەبێتە پاشای وڵات و شاژنیش دەخوازێت، ئۆدیب زانی وەڵامەکەی هەڵبێنێت ئەویش ئەمەیە: (مرۆڤ بەکۆرپەیی لەسەر هەردو دەست و هەردوو قاچی دەڕوات کە دەکاتە چوار پاشان لەسەر هەردوو قاچ و و پاشتر کەپیر بوو گۆچان بەکار دێنێت لەگەڵ هەردوو قاچەکەی دەبن بەسێ) کاتێك ئۆدیب مەتەڵەکە هەڵدێنێت ئەبوهۆل خۆی فڕێ دەداتە دەریاو شاری تیبەش رزگاریان دەبێت لەکارەساتەکەو ئۆدیبیش دەبێتە پاشای وڵات و شاژن (جوکاستا) کەداکێتی دەخوازێت لەرۆمانەکەدا جوکاتستا توشی هەلاکەت دەبێت لەجیاتی سەرکەوتن، گریمان بەشێوەیەکی رەمزی بنەمای دایکایەتی دەنوێنێت، بەڵام دەبێت بپرسین بۆچی توشی هەلاکەت دەبێت؟هەلاکەتبوونی دەگەڕێتەوە بۆ فەشەلهێنانی لەرۆڵی دایکایەتی کاتێك ئامادەبوو کوڕەکەی بکوژێ لەپێناو رزگاربوونی مێردەکەی، ئەمیش کارێکی شەرعیە لەروانگەی حوکمی باوکەوە، بەڵام لەروانگەی حوکمی دایکەوە تاوانێکە لێخۆشبوونی نییە (جوکاستایە کەدەست دەکات بەو تاوانە، زنجیرەیەکی رووداو کەلەکۆتایدا دەبێتە هۆی هەلاکەت بوونی و رووخانی مێردەکەی و کوڕەکەشی بەگوزارشتێکی تر وادەردەکەوێت کەوا فرۆم دەیەوێت بڵێت سۆفۆکلیس کەوا بنەمای حوکمی دایك دەنوێنێت وا لەجوکاستا دەکات هەلاکەت بێنێ، چونکە چارەنوسی دایك کەوا کوڕەکەی دەکوژێت لەکۆمەڵگایەکدا کەدایك حوکم دەکات مردنە، جگە لەمە هەرچەندە ئەم کارە بەگەورترین تاوان دادەنرێت لەکۆمەڵگایەکدا دایك حوکمی دەکات کاریسە روو دەدات بۆ دەوروبەری، ئەمەش لەرووی سایکۆلۆژیەوە کاریسەیەکی ترە بەنیسبەت ئەوەوە واتە جوکاستا) .

ئەوەی ئاشکرایە لەرۆمانی ئەنتیگۆنادا هەردوو بنەماکە کە کریۆن و ئەنتیگۆن تیایدا سەردەکەون ئەو دوو بنەمایەیە کە باخۆفن بەدەسەڵاتی دایك جیای کردۆتەوە، کریۆن بنەمای دەسەڵاتی باوك بەسەرکەوتنی یاسای دەوڵەت و ملکەچی دەسەڵات بەسەر پەسەنکردنی

ناموس و سروشتی مرۆیی دەنوێنێت و هەروەها باشتر پەسەندکردنی پەیوەندی ناڤ ژن و مێر و سەردارو ژێردەست لەسەر پەیوەندیەکانی خوێن .

بەڵام ئەنتیگۆن سەردەکەوێت بۆ بنەمای حوکمی دایك کەبەندە بە بەپەیوەندی خوێن کەبەپیێزنرین و درێژترین پەیوەندیەو یەکسانی نێوان خەڵك و رێز بۆ ژیانی مرۆڤایتی و خۆشەویستی پەسەند دەکات لەبەر ئەوە ئەنتیگۆن ئەو دوژمنەیە کەسەر دانانەوێنێت بۆ کریۆن، ئەم یاسایانەش کەدایدەنیّ بۆ هەموو کاتێکە، کەسیش نازانیّ ئەم یاسایانە کەی دانراون، ئەمانیش یاسای دەوڵەت نین کەملکەچی بسەپێنێت، یاسای شاردنەوە (دفن) یە کەئەنتیگۆن زۆور بەگەرمی پەسەندی دەکات، واتە گەڕانەوەی جەستە بۆ زەوی لەسایەی پرانسیبە ئاینیەکانی حوکمی دایك دروست دەبێت، سروشتی ئەو یاسایەش هەروەك ئەنتیگۆن دەڵێت خۆشەویستیە نەك رکلێبوونەوە، سەردەکەویّ بۆ یەکگرتنی مرۆڤ لەگەڵ مرۆڤ و لەپێناو خۆشەویستی هەمەلایەنەی دایك بۆ هەمووان.

بەهاکانی کریۆن بەهای دەسەڵاتە لەخێزانداو بەهای دەسەڵاتیشە لەدەوڵەت و بەیەکەوە بەستنیان، رۆڵەکانی خێزان موڵکی دایکوباوکیانن وەزیفەشیان ئەوەیە کەبەکەڵك بن بۆ ئەو دایکوباوکانە، هاولاتیانیش موڵکی فەرمانڕەوایی دەوڵەتن و ملکەچ نەبونیشیان بەڵگەی شەڕخوازیە، هیمۆن لەکۆتاییدا بەسەر ئەم پرانسیبانەو دەسەلاتی باوکدا شۆڕش دەکات، پشت بەستنیش بەویستی میللەت و ئەقڵ جوانترین شتە لەئارادابێت، کاتێك تراژیدیایەکە لەکۆتایی نزیك دەبێتەوە کریۆن زیندەبەچاڵی ئەنتیگۆن دەکات، ئەمەش گوزارشتێکی رەمزی ترە لە پەیوەندی بەزەوی و خواکانی زەویەوە.

بۆئەوەی کریۆن هەست بەتاوانەکەی بکات، ئەنتیگۆن و هیمۆن و یۆربیدس ژنی کریۆن دەکوژن، کریۆنیش پرانسیبەکانی شکست دێنێت و جیهانەکەشی دەڕوخێت.فرۆم پێی وایە فرۆید سیّ تێبینی راستی سەبارەت بە گرێی ئۆدیب پێشکەش کردووە، بەڵام ئەو رێگەیەی ئەم سەرنجانەی پیّ شیکردۆتەوە هەڵەن:

سەرنجی یەکەم: بوونی مەیلی سێکسیە لەکوڕاندا.

سەرنجی دووەم: ئەو پەیوەندییانەیە کە کوڕ بەدایك و باوکەوە دەبەستێتەوە زۆرجاریش ناپسیّ، بەڵام پێویستە وەك دەرەنجامێکی سروشتی بۆ پێشخستن و گەشەسەندنی بەرەو سەربەخۆیی بپسیّ، فرۆید بینی کەوا پابەندبوونی نالۆژیکی کوڕان لەسەر دایك وباوك و

لەهەموو جۆرە نیورستێکدا هەیە، ئەویش یەکێکە لەفاکتەرەکانی تووش بوون بەنیورۆسیس و ئەدگاری کەسی نیورۆستیك، گرێی ئۆدیب کەوا فروید گوزارشتی لێکردووە ناوکی هەموو نیورۆسیستێکە.

سەرنجی سێیەم: هەستی کردووە کەوا کێشەی نێوان باوکوکوڕ لەنیشانەکانی کۆمەڵگە باوکسالاریەکانە، هەروەها سەرنجی ئەوەشی داوە کەچۆن شۆڕشی شکستخواردووی کوڕ، دژی دەسەڵاتی باوك و ترسی کوڕ لەدواجاردا دەبێتە هۆی هەڵاتن و پاشان بنچینەیەك بۆ گەشەی نیۆرۆستیك دادەنێت.

سیگمۆند فرۆید ئەم هەموو سەرنجانەی بەگریمانەیەك لێکداوەتەوە کەوا پەیوەست بوون بەدایکەوە بەستراوە بەمەیلە سێکسیەکانی زاروکەوە، قەیرانی نێوان باوکوکوڕ لەئەنجامی رکەبەرایەتی مەیلی سێکسیە، بەڵام ئەو زانیاریانەی کەوا هەندێك لەشیکەرەوانی دەروونی و پسپۆران کۆیان کردوونەتەوە لەدەروناسی زاروکان، هەروەسا ئەو زانیاریانەی کەوا زانایانی ئەنترۆپۆلۆگی سەبارەت بەراستی ئەم لێکدانەوانە، گومانیان درووست کردووە.

فرۆید ئاماژە بەزانیاریە نوێیەکان دەکات، کەدەریانخستووە کەوا تیۆری فرۆیدیزم کەتایبەتە بەگرێی ئۆدیبەوە لەسەر هەمووان ناچەسپێ، رکابەرایەتی نێوان باوکوکوڕ لەو کۆمەڵگایانە روونادات کەدەسەڵاتی بەهێزی باوکی تیا بەدی ناکرێت، پاشان پەیوەندی بەدایکەوە پێویستیەکی سێکسی نییە، لەحاڵەتێکدا کەمەیلی سێکسی منداڵ دانامرکێتەوە، ئەم مەیلە سێکسیە لەجیاتی ئەوەی بەپلەی یەکەم رووەو دایك بێت، کەچی بەشێوەیەکی سروشتی لەرێگەی لەزەت لەخود بینین و تێکەڵ بوون لەگەڵ کوڕانی تردا تێر دەبێت، سەرباری ئەمەش وادەردەکەوێت پابەندبوون یان پشت بەستنی نائاسایی بەدایك دەگەڕێتەوە بۆ بۆچوون و تێڕوانینی زاڵی دایك، کەدەتوانێت وا لەمنداڵ بکات پەککەوتە بێ و زۆر پێویستی بەپاراستن و خۆشەویستی ئەو دایکە بێت.

بەو پێیە قەیرانی نێوان باوکوکوڕ بەرهەمی کۆمەڵگەی باوکسالارییە، بەتایبەتی کاتێك کوڕ بەموڵکی باوك دادەنرێت و ناچار دەبێت کەلەخزمەتی بەرژەوەندی باوکدا بێت هەروەکو کاڵایەك یان ئاژەڵێك بۆ بارگواستنەوە، لەبەرئەوەی تێڕوانینی ئاواو هەڵسوکەوتی باوك بۆ کوڕ کەلەسەر ئەو تێڕوانینە دروست بووە، دژی ئارەزووی مرۆڤە کە حەز دەکات ئازادو سەربەخۆ بێت، لێرەوە بەپێی پێویستی کێشە ئەگەر بەروخسارو یان بە نەست بێت دروست دەبێت،

هەرچەندە گوشاری باوك لەسەر كوڕ زیاد بێت بۆ ئەوەی ببێتە هۆیەك بۆ مەبەستە تایبەتیەكانی، ئەم كێشەیەش روو لەزیادبووندا دەبێت.

فرۆید نیورۆسیس و گرێی ئۆدیب وەك دەرەنجامی كێشەی نێوان واقیع كەدایك و باوك و كۆمەڵ دەنوێنێت و نێوان شاوەتە نامەقوڵەكانی منداڵ لێكدەداتەوە، بەڵام فرۆم گرێی ئۆدیب و نیورۆسیس وەك گوزارشت لەكێشەی نێوان خەباتی رەوای مرۆڤ لەپێناو ئازادی و سەربەخۆیی نێوان بارودۆخی كۆمەڵایەتی كەهەوڵی مرۆڤ لەبار دەبات لەپێناو خودبەدیهێنان و بەختەوەری سەربەخۆیی لەقەڵەم دەدات.

كاتێك بارودۆخی كۆمەڵایەتی كەكۆسپ لەرێی خودبەدیهێنان و سەربەخۆیی سەردەكەوێت ئەوسا دەتوانێت سۆزێكی روخێنەر بۆ مرۆڤ دروست بكات، پاشان دەبێت سەركوتی بكات بەهێزێكی دەرەكی یان ناوەكی.

ئەریك فرۆم بەكورتی دەڵێت: كاتێك دەگەینە ئەوەی كۆمەڵگەیەكی وامان هەبێت كە رەچاوی كەسایەتی منداڵ و هەموو تاكێك بكات، ئینجا گرێی ئۆدیب وەك ئەفسانەیەك دەبێتە پاشماوەكانی رابردوو.

سەرەتای دەسپێكی ركوكینەی كوڕ (منداڵ) لەدیمەنی تێكەڵبوونی دایكوباوك لەبەرچاوی منداڵ دەركەوت، كاتێك ئەو منداڵە واهەست دەكات ئەو دایك وباوكە لەشەڕدان بەتایبەتی كەنازانێت خۆشی دەرهاویشتەی ئەو تێكەڵبوونەیە، لەئەنجامی ململانێكانی دایكوباوك ئەگەر هۆكارێكی ئابوری بووبێ یان هەر هۆكارێكی تر وەك تەندروستی ئەوا پاشماوەی خراپی بەجێهێشتووە، چوون بەر لەئاینەكان پەیڕەوی ماوەی بێنوێژی نەكراوە، ئەگەر بەسودفە ئەو دیاردەیە لای منداڵ بینرابێ ئەوا ركوكینەی لا دروست دەبێت یان دژی دایك، باوك یەكەم ركابەرە، منداڵ دەیەوێت دایك بەهەموو شێوەیەك بۆ ئەو بێت، بوونی باوك مایەی بێزاربوونە بۆ ئەو، كاتێك باوك لەدایك نزیك دەبێتەوە توڕە دەبێت و بەگژباوكیدا دەچێت، بەدیارنەبوونیشی شادومانە، زۆرجار ئەو منداڵە، گوزارشت لەهەست و سۆزی خۆی دەكات بەبەڵێن و وشە كەدایكی دەخوازێت وەك خواستنی (جوكاستا) لەلایەن ئۆدیبی كوڕیەوە، ئەم جۆرە كارەش هەر لەئەنجامی ئەو ململانێیانە بوو، كە لەنەستی پاڵەوانەكاندا (باوك، دایك، كوڕ، كچ) دابوو، باوكەكە بۆ نەمری خۆی ماوەیەكی زۆر بەئاواتی ئەوەوە بوو وەجاغێكی هەبێ چوون ژنەكەی نەزۆك بوو، پاشان لەخەوندا پێیان وتووە كەكوڕێكی دەبێ، بەڵام باوكی

خۆی دەکوژێ، لەبەرئەوەی کەکوڕەکەی دەبێ لەترسی ئەوەی نەیکوژێ دووری دەخاتەوە، بەڵام کە گەورە دەبێ دەگەڕێتەوە بۆ وڵاتەکەی خۆیی و لەرێگە تووشی باوکی دەبێت و لەشەڕێکدا باوکی خۆی دەکوژێت بێ ئەوەی بزانێت ئەوە باوکیەتی، پاشان دایکیشی دەخوازێت، ئەو کاتەی کەخەڵك لەسەر شێوەی خێڵی بچووك بچووك کۆدەبنەوە هەر یەکەیان پیاوێکی بەهێز بەڕێوەی دەبردن کە گەورەی خێڵەکە بوو، لەهەمان کاتیشدا باوکیان بوون، هەموو ژنانی هۆزی قۆرخدەکرد، سزای هەموو نێرەکانی دەدا، کەهەوڵی نزیکبوونەوەی ژنەکانیان دەدا ئەوەش بەدەرکردن لەخێڵ و دوورخستنەوەیان بۆ جێگەیەکی دوورتر لەوێ کۆدەبنەوە پاشان ئەو رۆڵە دەرکراوانە هەستان بەکوشتنی ئەو باوکە دڵڕەقە بەمەبەستی زاڵبوون بەسەر ژنانی خێڵ و دابەشکردنیان لەنێوان خۆیاندا، پاش کوشتنی باوکەکە کێشە کەوتە نێوان کوڕەکانەوەو بۆ جێگرتنەوەو دابەشکردنی  ژنەکان، ئەمەش پاڵی پێوە پێوەنان بۆ رێککەوتن لەنێوان خۆیاندا لەسەر عەقدێکی کۆمەڵایەتی کەبەپێی ئەم عەقدە تاپۆکردن هاتە ئاراوە، یاسای ژنهێنانی دەرەکی دانراو لەئەنجامی ئەمەش سیستمی تەوتەمیزم هاتەئاراوە، کەواتە هەر خێڵێك گیاندارێکی پیرۆزی هەبوو، نابێ کەس توخنی بکەوێ، چوون ئەوە وێنەی باوکی کوژراو دەگەیەنێت، بەمەبەستی پڕکردنەوەی ئەو هەست بەگوناهکردنەو زاخاوی دەروون، پاش کوڕە دەرکراوەکانی کۆمەڵگەی  تەوتەمیزم هەستان بەکوشتنی باوکە دڵڕەقەکە.

هەست بەگوناهکردن و کوشتنی باوك لەناخی مرۆڤدا بەرجەستە بوو، ناخێك کەبەزەیی بەباوکە دڵڕەقەکە دێتەوەو خۆشی دەوێت، ناخێکیش رکی لەم باوکەیە لەبەرامبەر ئەو بێبەشبوونە لەلەزەتی سێکسی لەنەستدا کەباوك بۆتە لەمپەر، لەلایەکەوە مرۆڤ حەز دەکات ئازاری خەڵکی تر بدات (باوك بکوژێت) ئەمیش تەواو سیفەتەکانی سادیزمە لەلایەکی تریشەوە حەز دەکات تۆڵەی کوشتنی باوکی لێبکرێتەوە کاتێك هەست بەگوناه دەکات واتە حەز دەکات بارودۆخی خۆئازاردان یان بەدەستەمۆیی  یان بەدەستی خەڵکی تر لەبار بکات، کەئەمیش سیفاتی ماسۆشیزم بەرجەستە دەکات، ناچار مرۆڤ گەیشتە ئەوەی کەتاپۆیەك تەوتەمێك درووست بکات کەباوکی کوژراو بنوێنێت، واتە مرۆڤ هەرگیز رزگار نەبووە، لێرەدا پرسیارێك دێتە ئاراوە، ئایا هەر تەنیا باوکە دەبێــتە لەمپەر؟

ئاخۆ کەسانی تر یان سیستمی تر نابنە لەمپەر بۆ نەگەیشتن بەو لەزەتە؟لەکۆمەڵگەی ئێستای ئێمەدا لەجیاتی دەرکەوتن و هەستکردن بەگوناه دڵپیسی پەیدا بووە، ئەگەر جاران

تاپۆ دروست بوو لەنێوان ژنەکان و کوڕەکان، ئەمڕۆ کەسانی تر هەن بوونەتە جێی مەترسی و جێگەی باوك دەگرنەوە، ڕەنگە ئەو هەستەی کۆمەڵگەی تەوتەم بۆ ئێمە مابێتەوە، بێگومان گواستنەوەی مۆرکە کۆنەکانی کۆمەڵ بەرێگەی نەستی کۆمەڵایەتیەوە وردە وردە دەگوازرێتەوە بۆ نەوەکانی تر، واتە ئێمەو کۆمەڵگەی تەوتەم هیچ جیاوازیەکمان نییە لەرووی میکانیزمی پەیوەندی پیاو بەژنەوە، لەئەنجامی ئەو ململانێیانەو هەموو قۆناغەکانی کۆمەڵگەی مرۆیی نەیتوانیوە پەیوەندی ژن ومێرد بەشێوەیەکی راست ودروست و لەچوارچێوەیەك دروست بکات تەنها ئاینەکان نەبێ کەنەوە بۆ باوك دەگەڕێننەوە، چونکە دایکی منداڵ هەر دەناسرێتەوە، بەڵام باوك ئەگەر هەر یەك باوك نەبێت لەخێزاندا ئەوا سەروەری ئەو خێزانە تێکدەچێت، کەواتە رۆڵی ئاین بۆ چەسپاندنی یەك باوك پێویستیەکی شارستانی بوو، ئەگینا جوانترین و پیرۆزترین خانەی مرۆیی کەخێزانە هەڵدەوەشێتەوە، بۆمانەوەی ئەو خێزانەش دەبێت هەندێك لەپەیوەندیەکانی تەوتەمیزم بپارێزرێت، وەکو دەستبەسەرداگرتنی تاکەکان لەلایەن باوکەوەو هێنانەوەی کوڕە لەماڵ دەرکراوەکانی و وێڵبوونی هەندەران بەمەرجێك پیرۆزیی خێزانی رەچەڵەکی خۆیان پارستبێ و پەسەندکردنی سەرکردایەتی خێزان لەلایەن دایك و باوکەوە بەهەند وەربگرن .

## خوێندنەوەیەکی دەروونی فرۆم بۆ کۆمەڵگای نوێ:

**مرۆڤایەتی لەکایەیەکدایە برایەتی و بەختەوەری و قەناعەتی تێدا نییە، بەڵکو ئاژاوەی رۆحی و ونبوون کەلەشێتیەوە نزیکە بەسەرماندا زاڵە، ئەو شێتیەش لەشیزۆفرینیا دەچێت، کەپەیوەندیمان لەگەڵ واقیعی ناوەوەدا نەماوە**

**(فرۆم).**

ئەریك فرۆم دەبێژێ هیچ چاخێك وەك ئەم چاخەی ئێستامان مرۆڤ لەبەدیهێنانی خەونەکانی نزیك نەبۆتەوە بەهۆی دۆزراوە زانستی و دەستکەوتە تەکنیکیەکانەوە، ئەمڕۆکە مرۆڤایەتی کۆمەڵگەیەکی یەکگرتوو پێکدێنێت چیدیکە لەشێوەی کییانی جیا جیا ناژین، مرۆڤ پێویستی بەهەزاران ساڵ بوو بۆ ئەوەی بەو شکڵە توانست و بڕستە زەینیەکان و تواناکانی بۆ رێکخستنی کۆمەڵ و وزەکانی بەرەو ئامانج بخاتە گەڕ، بەو شێوەیە مرۆڤ گەردوونێکی نوێی وای دروست کردووە یاسای تایبەتی و چارەنووسی خۆی هەیە، ئەگەر بڕوانێتە داهێنانەکان مافی خۆیەتی شانازی بەوە بکات کەدروستی کردووە، بەڵام چی دەڵێت ئەگەر بڕوانێتە خودی خۆی ئایا لەبەدیهێنانی خەونی بەرکەماڵبوونی مرۆڤ نزیك بۆتەوە، ئەو مرۆڤەی کەدراوسێکەی خۆشدەوێت بەیەکسانی ناوبژیوانی دەکات و راستگۆیەو ماهیەتی خۆی

بەدیهێناوە، وروژاندنی پرسیارەکە دەبێتە هۆی شەرمەزاری چونکە وەڵامەکە روون و ئاشکرایە لەکاتێکدا شتی سەرسامان دروستکردووە کەچی خۆمان بەشایستەی ئەو کۆششە لەرادەبەدەرە نازانین و لەئاستیدا ورین، لەکایەیەکیشداین برایەتی و بەختەوەری و قەناعەتی تێدا نییە، بەڵکو ئاژاوەی رۆحی و ونبوون کەلەشێتییەوە نزیکە بەسەرماندا زاڵە، ئەو شێتیەش لەهستیریا ناچێت کەلەچەرخەکانی ناوەڕاستدا بوو، بەڵکو شێتیەکە لەشیزۆفرینیا دەچێت، پەیوەندیمان لەگەڵ واقیعی ناوەوەماندا نییە، هزرو بیریش جیابوونەوەی خۆی لەویژدان راگەیاندووە، ئەم شیکردنەوەیەی فرۆم تەواو ئەوە دەگەیەنێت کەمرۆڤ جەستەو رۆحی لەیەك جودایەو بیرکردنەوە بەدۆڵێکدا دەیبات و سۆزو ویژدانیش بەدۆڵێکی دیکەدا، دەرەنجامی ئەم لێکجوادبوونەوەیەش قەیرانێکی سایکۆلۆژی بۆ خاوەنەکەی چێ دەکات.

ئەم شیکردنەوەیەی فرۆم لەوەدا بەرجەستە دەبێت کە دەڵێ با وا لەقەڵەمی بدەین کە لەچەند هەواڵێك وردبینەوە کەلەرۆژنامەکاندا بەرچاو دەکەوێت پێشنیاری نوێژکردن بۆ کەم ئاوی لەنیویۆرك کراوە کەهاوکات باران بارێنەران بەهۆکاری کیمیاوی هەوڵی باران بارین دەدەن...هەوڵەکانی دەفرە فڕیوەکان تا ساڵێك یەك لەدوای یەك بڵاو دەبنەوە، هەندێ کەس نکوڵی لەبوونی دەکردن هەندێکی دیکە بڕوایان پێ بوو دەیانگوت بەشێکە لەچەکەکانی جەنگ یان چەکی وڵاتانی بیانییە، لایەنی سێیەمیش بەهەموو بڕوایەکەوە دەڵێن ئەو دەفرانە ئامێرن دانیشتوانی هەسارەکانی تر دەینێرن، هەندێکی دیکەش پێمان رادەگەیەنن ئایندەی ئەمریکا بەو شێوەیە کەلەنیوەی سەدەی بیستەمدا هەیە، روناك نییە، هاوکات لەهەمان لاپەڕە مشتومڕ لەسەر شیمانەی هەڵگیرساندنی شەڕ هەیە، زانایانیش لەسەر ئەوە مشتومڕیانە ئایا چەکی ئەتۆمی دەبێتە هۆی تێکدانی گۆی زەوی یان نا؟خەڵك روودەکەنە کڵێساکان بۆ بیستنی ئەو ئامۆژگاریانەو پرەنسیبەکانی خۆشەویستی و چاکەخوازی دەکەن، ئەو خەڵکانەش خۆیان بەگەوج یان خراپتر دادەنێین، ئەگەر لەفرۆشتنی شمەکێك دوو دڵ بوون کەزانیان کڕیارەکە توانای کڕینی نییە، منداڵانیش لەقوتابخانەکانی یەکشەمەدا فێری ئەوە دەبن کەئەمانەت و دەستپاکی و بایەخدان بەرۆح پێویستە ئەو پرەنسیبانە بن کەرێنیشاندەری ژیانن، هاوکات ژیان ئەوەمان فێر دەکات کەگرتنەبەری ئەو پرەنسیبانە وامان لێدەکات خەوبین بین نەك واقیع بین، ئێمەش لەرۆژنامەو ئێستگەو تەلەڤزیۆن سەرسوڕمانترین توانای

پەیوەندییمان دەبێت بەڵام لەگەڵ ئەوەشدا رۆژانە لەسەر ورێنەیەك كەزیرەكی منداڵ هەرسی ناكات ئەگەر لەگەڵ شیرخواردنیان نەبێت لەمەمكی دایكیانەوە مشتومڕمانە.

زۆر خەڵكیش دەنگ بەرز دەكەنەوە و بانگەشەی ئەوە دەكەن كەوا رێبازی ژیانمان مایەی بەختەوەریمانە بەڵام چەندن ئەو كەسانەی لەم چەرخەدا بەختەوەرن؟

بۆ زاخاوی مێشك بالە گرتەیەكی سەرپێی كەگۆڤارێك بڵاوی دەكاتەوە سەبارەت بە كۆمەڵە خەڵكێك چاوەنواڕی رەنگی سەوز دەكەن لەسەر شۆستەكانەوە، ئەوەی لەم گرتەیە سەرنج رادەكێشێت و لەهەمانكاتدا رایدەچڵەكێنێت ئەوەیە ئەو خەڵكەی كەنیشانەی داهێزراون و ترسیان لێ نیشتووە رووداوێكی ئاوا تۆقێنەریان نەبینوە، بەڵكو هاوڵاتی ئاسایی بوونەو بەرەو كارەكانیان دەڕۆن.

ئەریك فرۆم بەردەوام دەبێت و ئێژێ ئێمە خۆمان بەو باوەڕەی خۆمان هەڵدەكێشین كەبەختەوەرین، واش بەگوێی منداڵەكانمان دەچرپێنین كەلەنەوەكانی پێشترمان زیاتر پێشكەوتوترین، لەدوماهیدا هیوایەكمان نەماوە بەدی نەهاتبێ، شتێكیش نییە بەدەستیەوە گیرمان خواردبێ، هەموو نیشانەكانیش لایەنگیری ئەو باوەڕە دەكەن كە بێ پچڕانەوە لەدەروناندایە بەڵام ئایا منداڵەكانمان گوێبیستی ئەو دەنگە دەبن كەبەرەو ئەو ئاراستەیان دەكات، ئەو ئامانجە چییە كەلەپێناویدا دەژین؟ئەوان بەشێوەیەك هەست دەكەن وەك هەستكردنی خەڵكانی دیكە كەدەبێت ژیان واتایەكی هەبێت، بەڵام چییە؟ئایا لە شتە ناكۆكەكان و وتە دوو روو و خۆبەدەستەوە دانە گاڵتەپێكردنەكاندا دەردەكەوێت كەوا لەهەر تێوەگلانێك دەیگەینێ؟ئەوان پەرۆشی بەختیاری و دادوەری و خۆشەویستی و راستین، پەرۆشی بابەتێكن بیپەرستن، ئایا لەتوانای ئێمەدایە ئەو پەرۆشیەیان تێر بكەین؟

فرۆم پێیوایەی ئێمەش وەك ئەوان بێ دەسەڵاتین، بەڵكو وەڵامدانەوەش نازانین، چونكە ئەوەشمان لەبیركردووە كەپرسیارێ بكەین، بانگەشەی ئەوەش دەكەین كەژیانمان لەسەر بناغەیەكی پتەو دامەزراوە، خۆمان گێل دەكەین لەشەپۆلەكانی خەم و دڵەراوكێ و دەستەوەستان، كە هەنووكەش باڵی بەسەرماندا كێشاوە، هەندێ كەس پێیانوایە گەڕانەوە بۆ ئاین چارەسەرە، نەك لەبەر ئەوەی چالاكیەكە لەچالاكیەكانی باوەڕ بەڵكو خۆ قورتاڵكردنێكە لەو گومانەی چارەسەری دیكەی نییە، ئەو كەسانەش ئەو بڕیارە نادەن وەك پەرستن، بەڵكو گەڕانێكە بەدوای ئاسایش، ئەوەی لەم دیمەنە هاوچەرخەی كۆڵیوەتەوە كەمەبەستی كلێسا

نییە، بەڵکو مەبەستی رۆحی مرۆڤە لەم هەنگاوە نیشانەیەك لەنیشانەكانی پەشێوی نیورۆستیانە دەبینێت و رۆحی جلەو كردووەو لەو جلەوكردنە تروسكایەك بەدی نەكرێ ونەبینرێ جگە لەخۆبەدەستەودان و ئینتیحاری شكۆی دەروونی نەبێت، بەڵام ئەوانەی لەهەتوانێك دەگەڕێن بەگەڕانەوە بۆ ئاینی ئاسایی دەكەوێتە ژێر كاریگەری ئەوبڕوایەی كەزۆرجار پیاوانی ئاینی بانگەشەی بۆ دەكەن، ئەویش ئەوەیە كەلەنێوان ئاین و رێگەی ئەو ژیانەی كە تەنیا خەمی تێركردنی پێویستیە غەریزەیەكان و ئاسودەییە مادیەكانێتی، ئێمەش ئەگەر باوەڕمان بەخودا نەبێت، ئەوا هیچ پاساوێكمان نییە، هیچ هەقیشمان نییە كەباوەڕمان بەرۆح و پێداویستیەكانی هەبێت، ئالێرەوە قەشەو كاهینەكان واخۆیان دەردەخەن كەتەنیا توێژی لەپێشن كەبایەخیان بەرۆح دابێت و تەنیا ئەوان باس لەبەها بەرزەكان دەكەن وەك خۆشەویستی و هەق و دادوەری، بەڵام لەرووی مێژووییەوە هەمیشە ئەم كارە بەم شێوەیەنیە، كەكاتێك كاهینەكانی هەندێك لەشارستانیەكان وەكو شارستانیەتی میسری كۆن نوشداری رۆحی بوون فەیلەسوفەكان بەم كارە هەڵدەستان یان هیچ نەبوایە بەبەشێك لەم كارە هەڵدەستان، لەهەندێك لەشارستانیەتی دیكە وەك شارستانیەتی یۆنانی سوكرات و ئەفلاتۆن و ئەرستۆ بانگەشەی ئەوەیان دەكرد كەبەناوی هەر سروشێكەوە بدوێن، بەڵكو بەناوی دەسەڵاتی عەقڵەوە خەمیان بۆ بەختەوەری مرۆڤ و كردنەوەی رۆحی دەخوارد، هەروەها بەشێوەیەك بایەخیان بەمرۆڤ دەدا كەمەبەستە لەخودی خۆیدا، بەو سیفەتەی بابەتێكی پڕ لێكۆڵینەوەی پڕ واتایە زیاتر لەهەر بابەتێكی تر، لەهەمان كاتدا لێكۆڵینەوەكانیان سەبارەت بەفەلسەفەو رەوشت لێكۆڵینەوەیە لەدەروونناسی.

ئەو نەریتە كەلەنەریتەكانی چەرخە كۆنەكانە لەچەرخی رێنیسانس بەردەوام بوو لەشتە جیاكەرەوەكانیش یەكەم پەرتووك كەزاراوەی دەروونناسی دەكاتە ناونیشانی خۆی، كەناونیشانێكی لاوەكی هەڵدەگرێت (ئەویش لەسەر بەركەماڵبوونی مرۆڤە)، ئەم نەریتەش لەچەرخی رۆشنگەریدا گەیشتە لوتكە لەسۆنگەی باوەڕیان بە عەقڵی مرۆڤەوە، فەیلەسوفەكانی چەرخی رۆشنگەری كەهاوكات لێكۆڵەرەوەی رۆحی مرۆڤ بوون جەختیان لەسەربەخۆیی مرۆڤ لەكۆت و بەندی سیاسی و كۆت و بەندی گۆشەگیری و نەزانین كرد؟

هەروەسا ئەوەیان فێری مرۆڤ كرد چۆن ئەو بارودۆخەی ژیان لەناو ببەن كەپێویستی بەمانەوەی خەیاڵ هەیە، لێكۆڵینەوە دەرونیەكانیش رەگوریشەی لەناخەوە داكوتاوە بۆ

دۆزینەوەی مەرجەکانی بەختەوەری مرۆڤایەتی، دەیانگوت بەختەوەری نایەتەدی تا مرۆڤ ئازادی شاراوەی ناخی بەدی نەهێنن، تەنیا لەم کاتەدا لەوانەیە لەرووی عەقڵیەوە تەواو بێت، بەڵام رەچەی عەقلانیزمی چەرخی رۆشنگەری لەنەوە کەمەکانی دوای ئازادی گۆڕانکاری یەکلاکەرەوەی چەشتووە، لەبەر ئەوەی مرۆڤ تامی خۆشگوزەرانی نوێی مادی و سەرکەوتنی بەسەر سروشتدا دەکات، چیدیکە ناڕوانێتە خۆی بەو سیفەتەی بابەتی یەکەمە لەژیان و تۆژینەوەی تیۆری، عەقڵیش کشانەوەی خۆی نواند پاش ئەوەی هۆیەك بوو بۆ دۆزینەوەی راستی و بەرجەستەبوون لەروکەشەوە بۆ ماهیەتی دیاردەکان، تەنیا بووە ئامرازێك بۆ بەکاربردنی شتەکان و خەڵك، چیدیکەش مرۆڤ باوەڕی بەتوانای عەقڵ نییەکەدروستی پێوەرەکان و هزرە تایبەتیەکان بەرەفتاری مرۆڤەوە دابمەزرێنێت.

ئەو گۆڕانەی کەبەسەر کەشی زەینی و سۆزی مرۆڤدا هاتووە جێ پەنجەیەکی بەهێزی لەسەر پێشکەوتنی سایکۆلۆژیدا بەو سیفەتەی زانستێکە بەجێ هێشتووە.

ئەگەر چاوپۆشیمان لەکەسایەتیە ئاوارەتەکان وەکو نیتشەو کیرکگۆرد کرد، ئەوا دەتوانین بڵێین ئەو واقیعە باوەی کەسایکۆلۆژیا وا لەقەڵەم دەدات کەلەرۆحی بکۆڵێتەوە، لێکۆڵینەوەیەکە بایەخ بەچاکەخوازی و بەتەوەری ئەو مرۆڤە بدات، ئەو باوەڕە بەتەواوی پشتگوێ خرا، دەروونناسی ئەکادیمیش لەهەوڵەکانی بۆ شان لەشاندانی زانستە سروشتیەکان و شێوازە ئەزمونگەریەکان لەقەڵەم بدرێت و حیسابی بۆ بکرێت، ئەو زانستە وای لێهات بێجگە لەرۆح هەموو شتێك چارەسەر بکات، کەوا هەوڵی تێگەیشتنی ئەو دیاردانەی مرۆڤیدا کەلەتاقیگەدا تاقیدەکرێتەوە، بانگەشەی هەست حوکمەکانی بەهاو زانینی خێروشەڕی کرد کەوا ئەوانەی وێناکردنی میتافیزیکی دەکەوێتــە دەرەوەی گرفتەکانی دەرونناسی، زۆرجاریش بایەخی بەو گرفتە هیچوپوچانە دەدا، کەلەگەڵ رەوتی زانستی بانگەشکراو دەڕۆیشت، ئەویش لەبەرئەوەی لەجیاتی پێڕەوی نوێ بۆ لێکۆڵینەوەی گرفتە گرنگەکانی مرۆڤ دابنێ، بەو شێوەیە دەرونناسی بووە زانستێك بەڵام بۆ بابەتێکی سەرەکی کەئەویش رۆحە، دەرونناسی زیاتر مەبەستی میکانیزم و پێکهاتەکانی پەرچەکردار و غەریزەکان بوو، بێ ئەوەی بایەخ بەدیاردە مرۆییەکان بدات، کەمرۆڤی پێ جیادەکرایەوە وەکو خۆشەویستی، عەقڵ و هەست و بەهاکان، فرۆم لەکتێبەکەیدا ئاین و شیکردنەوەی دەروونی دەڵێت من پێمباشە وشەی رۆح لەم بابەتە

لەجیاتی هەردوو وشەی دەرون یان عەقڵ بەکاربێنم ئەویش لەبەر ئەوەی پێویست بووەکان لەئارادان کەدەیانەوێت هێزە باڵاکانی مرۆڤ لەخۆبگرن.

پاشان فرۆید دوا نوێنەری مەزنی عەقڵانیزمی سەردەمی رۆشنگەری هات کەیەکەم کەس بوو کەموکورییەکانی ئەو رەچەیەی روونکردەوە، زۆر بوێرانەش تەپڵی سەرکەوتنی عەقڵی موجەرەدی لەلێدان خست، ئەوەشی سەلماند کەعەقڵ بەنرخترین و تایبەتمەندترین هێزی جیاکەرەوەی مرۆڤە بەڵام دەکەوێتە ژێرکاریگەری سۆزەکانەوە، تەنیا تێگەیشتنی سۆزەکانی مرۆڤە کەدەکرێ عەقڵ رزگار بکات بۆ ئەوەی ئەرکی خۆی بەشێوەیەکی راست جێبەجێ بکات، هەروەسا فرۆید توانی هێزی عەقڵ و لاوازی عەقڵ وەکو یەك دەربخات، ئەم رستیەش (راستی دەبزوێ) کردە پرەنسیبی رێپیشاندەر لەهونەری نوێ بۆ چارەسەری دەرونی، لەسەرەتاوە فرۆید پێیوابوو تەنیا بەچەند شێوەیەکی دیاریکراو خۆی لەنەخۆشی و چارەسەرکردن گەیاندووە، بەڵام وردە وردە بۆی دەرکەوت کەزۆر چۆتە قوڵایی پاش بواری پزیشکیەوە، بەشێوەیەکی واش دەستپێکردووە کەوا دەروونناسی بەو سیفەتەی لەرۆحی مرۆڤ دەکۆڵێتەوە بنچینەیەکی تیۆرییە بۆ ژیان و بەدیهێنانی بەختەوەری، پەیڕەوی فرۆید لەشیکردنەوەی دەرونیدا توانیوێتی لێکۆڵینەوەی رۆح بکاتە لێکۆڵینەوەیەکی ورد، لەتاقیگەی شیکەرەوەی دەروونی هیچ دەزگاو ئامرازی تاقیکردنەوە نەبووە، بۆیە ئەوەی دەدۆزرێتەوە پێوانە ناکرێت، بەڵکو ئەوەی وەردەگرت تەنیا لەرێگەی خەون و خەیاڵکردن و گەڕان بەدوای واتاکان بوون دەگەیشتە ئارەزووە شاراوەکان و هەموو جۆرە دڵەراوکێیەك کەدووچاری نەخۆشەکانی دەبوو، لەتاقیگەکەشیدا کەوا تەنیا پشتی بەتێبینی عەقڵ و شارەزایی خۆی دەبەست بەو سیفەتەی بوونەوەرێکی مرۆییە ئەوەی دەرخست کەنەخۆشی عەقڵی بەدوور لەگرفتە رەوشتیەکان روون نابێتەوە، هەروەها نەخۆشەکەشی دەردی هەیە چونکە داواکاریەکانی رۆحی پشتگوێ خراوە، شیکەرەوەی دەرونییش لاهوتی یان فەیلەسوف نییە، لەم بوارانەش پێویستی بەتوانایەکی وا نییە، بەڵکو پزیشکی رۆحی بایەخ بەهەمان ئەو گرفتانە دەدا، کەفەلسەفەو لاهوت بایەخی پێدەدەن، کەئەوانیش رۆحی مرۆڤ و چارەسەرکردنەکانێتی، ئەگەر ئەرکی شیکردنەوەی دەروونی بەو رێگەیەزانی، ئەوا بۆمان دەردەکەوێت کە دوو گروپ هەن بایەخ بەپیشەی بایەخدانی رۆح دەدەن، ئەوانیش قەشەکان و

شیکەرەوە دەرونیەکانن، کەواتە پەیوەندی ئاڵوگۆڕی نێوانیان چییە؟ئایا شیکەرەوەی دەرونی هەوڵی داگیرکردنی بواری قەشە دەدات، ئایا بەرهەڵستکاری نێوانیان شتێکی حەتمییە؟

یان هەردووکیان هاوپەیمانن و بۆهەمان مەبەست هەوڵدەدەن و تەواکەری یەکترن؟هەوڵی زانینی بواری یەکتر دەدەن لەرووی تیۆری و پراکتیکەوە، تێڕوانینی یەکەم لێکۆڵەرەوە دەرونیەکان و نوێنەرانی کڵێسە پێکەوە لایەنگری بوون، بەڵام پەرتوکی ئایندەی خەیاڵی فرۆید و پەرتوکی شین واتە ئارامی رۆح هەردووکیان جەخت لەسەر بەرهەڵستکاری دەکەنەوە، هەروەها نوسینەکانی ك، گ یۆنگ، رای لیمان هەوڵەکانی رێکەوتن لەنێوان شیکردنەوەی دەروونی و ئاین دەنوێنن، ئەمەش راستیەکە ژمارەیەکی زۆر لەپیاوانی ئاینی خەریکی لێکۆڵینەوەن لەشیکردنەوەی دەروونی، ئەمەش ئەوە دەگەیەنێت کەبڕوایەکی زۆر هەیە بۆ تێکەڵکردنی ئاین لەگەڵ شیکردنەوەی دەرونی لەبواری رێورەسمی کەهنوتیەکان.

کارل گوستاف یۆنگ کەدەروونناسێکی دیارو بەرچاوی سەدەی بیستەمە وەکو فرۆید سەبارەت بەنەست کەفرۆید باسی دەکات وتوێتی نەست پێکهاتویەکی جیاو سەربەخۆیە وەکو هەست، هەرودوکیان هەست و نەست خودی مرۆڤایەتی دروست دەکەن، ئەم نەستە لەسەرووی ئەو تونایەیە کە مرۆڤ وێنای دەکات بەڵام هەیەو کاراوئەکتیڤە، ئەم نەستە مرۆیی و کۆمەڵایەتی و خۆڕسکیە کەهەموو مرۆڤایەتی تیادا بەشدارە لەسەر تێرکردنی پێویستیەکانی مرۆڤ بەندە لەمیانەی باوەڕی ئاینی و دابگێڕانەکانی .

زانا یۆنگ دەڵێ گومان لەبیروباوەڕی خەڵکدا نییە سەبارەت بەباوەڕی ئاینی ئەوەی باوەڕی ئاینی هەیە خێری زۆرە، کەئەویش بنەمایەکی مەزنە بۆ ژیان بۆ واتاو جوانی و هەروەها رووناکی بەجیهان و مرۆڤایەتی دەبەخشێت.

## سەرچاوەکان:

١- فروم، اريك: الانسان بين الجوهر والمظهر، ترجمة سعد زهران، مراجعة وتقديم لطفي فطيم، ١٩٨٩الكويت عالم المعرفة العدد١٤٠

٢- فروم، اريك، الدين والتحليل النفسي، ترجمة فؤاد كامل، منتدي مكتبة الاسكندرية٢٠، مكتبة غريب ٢٠٠٣:

٣- فروم، اريك، تشريح التدميرية البشرية، ج١وج٢ ترجمة محمود منقذ الهاشمي، دمشق ٢٠٠٦

٤- حجازي، د.مصطفي الانسان المهدور دراسة تحليلية نفسية اجتماعية، المركز الثقافي العربي بيروت لبنان

٥- حجازي، د.مصطفى: سيكولوجية الانسان المقهور الطبعة الاولي٢٠٠٥

٦-يونغ ـ البنية النفسية عند الانسان، ترجمة نهاد خياطة، حلب ١٩٩٤

٧- نويل، جان بيلمان: التحليل النفسي والادب، ترجمة حسن المودن ١٩٩٧المجلس الاعلي للثقافة

٧-فرويد، سيغموند: الطوطم والحرام ترجمة جورج طرابيشي، بيروت لبنان

٩-كمال.د.علي: النفس، انفعالاتها و امراضها و علاجها، الطبعة الثالثة١٩٨٣ص١٤٢

١٠- جعفر، د.نوري: طبيعة الانسان في ضوء فسلجة بافلوف، الطبعة الثانية ١٩٧٨الناشر مكتبة التحرير

١١- هورني، د.كارين: صراعاتناالباطنية.، ترجمة عبِدالعلي، دار الشؤون الثقافيةالعامة.١٩٨٨

١٢- كرم.د.يوسف : تاريخ الفلسفة اليونانية. دارالاداب١٩٩٨٦.

١٣- ملاهي، باتريك: عقدة اوديب في الاسطورة وعلم النفس، مكتبة المعارف، بيروت.١٩٨٦

١٤- ابراهيم، د.ريكان، علم النفس والتاريخ، دار الشؤون الثقافية العامة، بغداد١٩٨٧

١٥- فرويد سيغموند، التحليل النفسي والفن،، بيروت، لبنان١٩٨٩.

١٧- الوردي، د.علي: شخصية الفرد العراقي، الطبعة........٢٠٠١ دار الوردي/لندن

١٨- السندي، د.بدرخان طبيعة المجتمع الكردي، دراسة نفسية اجتماعية، الجزء الاول...........

١٩-العبيدي و الداغري، د.صالح حسن و د.ناظم هاشم : الشخصية والصحة النفسية، ١٩٩٩دار الكندي للنشر والتوزيع، الاردن

٢١-راجح، د. احمد عزت: اصول علم النفس، بيروت، (دارالعلم) ......

٢٢-شرارة، عباللطيف: الموسوعة النفسية/عرض وتلخيص /داراجيال العلوم بيروت ١٩٨٣

٢٣- عبدالرحيم، عدنان فرويد و سروشتي مرؤظ: وةرطيَراني كمال فاروق ٢٠٠٨هةوليَرضاثي يةكةم

٢٤- الحفني، د.عبدالمنعم: موسوعة علم النفس والتحليل النفسي، مكتبة مدبولي......

٢٥- جعفر، د.نوري : جذور الابداع لدى كل الناس. بغداد١٩٨٦

٢٦- الهيتي، د.هادي نعمان: ثقافة الاطفال.، الكويت ١٩٨٨

**٢٧- جعفر، دنوري الخيال العلمي في ادب الاطفال- مطابع ثنيان ١٩٨٥**
**٢٨- -ريد، هيربرزت التربية عن طريق الفن- الهيئة المصرية العامة للكتاب ١٩٩٦**
**٢٩- ابو سماحة، دكمال: تربية الموهوبين والتطور التربوي- -دار الفرقان١٩٩٢**
**٣٠-صالح، قاسم حسين: الابداع في الفن، دار الرشيد للدراسات والنشر ١٩٨٩**
**٣١-العيسوي، د.عبدالرحمن : علم النفس الشواذ والصحة النفسية، دار الراتب الجامعية١٩٩٩م.**
٣٢-گەمە لەژیانی منداڵ، کۆمەڵێ نووسەر: وەرگێڕانی کەمال فاروق، خانەی وەرگێڕانی هەولێر٢٠٠٩
**٣٣- اسماعيل، عزت سيد : علم النفس التجريبي، وكالة المطبوعات/الكويت، ٢٠٠١**
**٣٦- فروم، اريك: ثورة الامل-دار الاداب١٩٩١**
**٤٠-الجبوري، محمد محمود: الشخصية في ضوء علم النفس، -مطبعة دار الحكمة بغداد ١٩٩٠**
**٣٣- مقدمة ابن خلدون، الباب الاول من الكتاب الاول في العمران البشري علي الجملة**
**٣٤- توينبي، منهج التاريخ وفلسفة التريخ، دار الحرية للطباعة بغداد ١٩٧٧**
**٣٥-ديوي، جون: الطبيعة البشرية والسلوك الانساني، دار الطليعة بيروت**
**٣٦- ابن العربي، شيَخ : التدبيرات الالهية في اصلاح المملكة الانسانية.**